# کۆمەڵێك بەسەرهاتی کاریگەر

# لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ

## پێك هاتووە لە (٤٠٠) بەسەرهاتی ڕاستەقینە

ئامادەکردنی
عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد







چاپی یەکەم
١٤٣٥ ك -٢٠١٤ ز

# کۆمەڵێك بەسەرهاتی کاریگەر لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ)

## پێك هاتووە لە (٤٠٠) چیرۆك و بەسەرهاتی ڕاستەقینە

ئامادەکردنی

عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمد

چاپی یەکەم

١٤٣٥ ك

٢٠١٤ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

- ناوی کتێب : کۆمەڵێك بەسەرهاتی کاریگەر لە ژیانی پێغەمبەردا ( ﷺ )
- ئامادەکردنی : عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد
- نۆرەی چاپ : یەکەم
- ساڵی چاپ : ٢٠١٤ ز
- شوێنی چاپ : سلێمانی – کوردستان
- چاپخانە : چاپەمەنی زانا – سلێمانی شەقامی مەولەوی
- دیزاین : دیزاینی ناوەوە (ئومێد عبدالرحمن) سلێمانی شەقامی مەولەوی
- هەڵەچن : ڕێبوار هەوارەبەرزەیی
- ژمارەی سپاردن : ١٤٩٩ی ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

## لە تایبەتمەندییەکانی ئەم کتێبە

یەکەم  پێك هاتووە لە (٤٠٠) چیرۆك و بەسەرهاتی ڕاستەقینە لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) .

دووەم : تێکڕای ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە ڕاستەقینەن لە فەرموودە صەحیحەکان و سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە وەرگیراون.

سێیەم : هەر چیرۆك و بەسەرهاتێك کەلەم کتێبەدا خراوەتە ڕوو ئاماژە بەو سەرچاوەیە کراوە کە لێوەی وەرگیراوە .

# پێشەکی

## بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرمان (ﷺ) وە یار و یاوەرانی بەگشتی تا ڕۆژی دووایی ، بەڕاستی ماوەیەك بوو بیرم لەوە دەکردەوە کە کتێبێك بنوسم تایبەت بێ بە چیرۆك و بەسەرهاتەکان لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) سوپاس بۆ خوای گەورە ئاواتەکەم هاتە دی توانیم کۆمەڵێکی زۆر لە چیرۆك و بەسەرهاتە کاریگەرەکان ئامادە بکەم و بیانخەمە بەر دیدەی خوێنەران چونکە لە هەموو کات و سەردەمێکدا خەڵك بە گشتی حەزی لە چیرۆك و بەسەرهاتە ، کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر دڵ و دەروونی مرۆڤ ئەگەر بە ووردی سەیری ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەین هەموو هەڵسوکەوتوو گوفتار و ڕەفتارێکی سەرنجی تێڕامانە و دەرس و پەندی تایبەتی لێ وەردەگیرێ چونکە هەموو ئاکار و هەڵسوکەوتێکی پڕە لە حیکمەت و ژیری و خوای گەورە بە وەحی پشتگیری کردووە ، جا بۆیە زۆر پێویستە کە بڕواداران شارەزای چیرۆك و بەسەرهاتەکانی ژیانی ئەو زاتە پایەبەرزە ببن بۆ ئەوەی ژیانیان بەپێی ئەو ڕێنماییانەی ئەو جوان و ڕازاوە بکەن و خۆشی و شادییەکانی دنیا و دوواڕۆژ بۆخۆیان مسۆگەر بکەن بە شێوانی خوای گەورە و میهرەبان .

جا خوێنەری بەڕێز ئەم کتێبەی بەر دەستت پێك هاتووە لە کۆمەڵێك چیرۆك و بەسەرهاتی کاریگەر کە لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕوویانداوە، وە تێکڕای ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانەش ڕاستەقینەن و لەفەرموودە صەحیحەکان و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانەوە وەرگیراون جا هیوادارم تۆی بەڕێزیش ئەم کتێبە بە چاوی دڵ بخوێنیتەوە و لە ئاکاری ڕۆژانە و شەوانە و ناختدا ڕەنگ بداتەوە . منیش داوا لە خوای پەروەردگار دەکەم کە ئەم کتێبەم بۆ بکاتە تێشوی ڕۆژی قیامەت ، وەخوای گەورە وامان لێ بکات هەرچی کە دەیڵێین و دەینوسین تەنها مەبەستمان ڕەزامەندی زاتی پاکی ئەو بێت.

عەبدولڕزاق ڕەزاق ئەحمەد

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهد الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ(آل عمران:١٠٢)

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا(النساء:١)

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا.(الاحزاب: ٧٠-٧١)

أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله تعالى، وخير الهدى هدى محمد – صلى الله عليه وسلم –، وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

## ١. ﴿ هەر پێغەمبەرێك وەك ئەوەی هێنابێت گەلەکەی ئازاریان داوە﴾

زوهری دەڵێ: لە عوروەوە لە عائیشە دایکی بڕوادارانەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: یەکەم شت کە پێغەمبەرﷺ بینیویەتی خەونی ڕاست بووە ئەوجار گۆشەگیری لەلا خۆشەویست بووە دەچووە ئەشکەوتی حەراو چەندەها شەو دەمایەوە و عیبادەتی دەکرد زادو زەخیرەی بۆ خۆی دەست دەخست ئەوجار دەگەڕایەوە لای خەدیجەی خێزانی تا کاتێك کە بەرنامەی هەق و ڕاستی بۆ هات کە ئەو لە ئەشکەوتی حەراو دابوو فریشتە هاتە لای وتی: بخوێنە دەفەرمووێ: وتم خوێندەواریم نیە دەفەرمووێ: توند گوشیمی بەخۆیەوە ئەوجار بەریدام دیسان وتی: بخوێنە دەفەرمووێ: وتم من خوێندەوار نیم دیسان توند گوشیمی بە خۆیەوە ئەم جار بەریدام دیسان وتی: بخوێنە دەفەرمووێ: وتم خوێندەوار نیم دیسان بۆ سێیەم جار توند گوشیمی بە خۆیەوە ئەوجار بەریدام وتی:( اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ)العلق:١-٥. پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە لای خەدیجە فەرمووی:دامبپۆشن ئەویش دایپۆشی تا ترسەکەی لەسەر لاچوو هەواڵەکەی دا بە خەدیجە و فەرمووی: زۆر دەترسم لە خۆم خەدیجە وتی: نا هیچ نیە بەڵکو مژدەت لێ بێ سوێند بەخوا خوا قەت تۆ سەر شوڕ ناکات چونکە تۆ پەیوەستی بە جێبەجێ کردنی پەیوەندی خزمایەتی وە ڕاستگۆییت و قسەکانت هەموویان ڕاستن ئەمجار بەڕێ کەوتن پێغەمبەرﷺ و خەدیجە بۆ لای ئامۆزاکەی خەدیجە وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە یەکێك بوو لە شوێنکەوتوانی ئاینی نەصرانی لە نەفامیدا وە بەزمانی عەرەبی شتی دەنوسی وە ئینجیلیشی بە زمانی عەرەبی نوسیبۆوە چەندێ: توانیبێتی وە پیرێك بووە کە کوێر بوو بوو خەدیجە پێی وت گوێ لە کوڕی برای خۆت ڕابگرە وتی:

ئەوی کوڕی برام چیت بینیوە؟ ئەویش هەواڵی پێدا وەرەقە وتی: ئەو فریشتەیەکە هاتە خوارەوە بۆ لای موسا وتی: خۆزگە بە توانا بامایە لە کاتێکدا کە قەومەکەت دەرت دەکەن یارمەتیم بدایتایە فەرمووی: بۆچی گەلەکەم دەرم دەکەن؟ وتی: بەڵێ هەر پێغەمبەرێك وەك ئەوەی تۆی هێنابێت گەلەکەی دەریان کردووە و ئازاریان داوە وتی: ئەگەر بگەمە ئەو ڕۆژە زۆر بەچاکی یارمەتیت دەدەم و سەرت دەخەم بەڵام وەرەقە فریای ئەوە نەکەوت مرد[١].

---

[١] أخرجه البخاري١/٣ و٨٤/٤و٢١٤/٦, ٢١٥ و ٢١٦ و ٣٧/٩ ومسلم١/٩٧-٩٨و غيرها وانظم طبقات ابن سعد١/١٩٤ وابن هشام ١/٢٣٤.

## ٢. ﴿ ئەگەر ئەهلی ئاگر بوایە جلی غەیری سپی لەبەردا دەبوو ﴾

ترمزی ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە(خوای لێ ڕازی بێت) وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرەقە تۆی بەڕاست زانی و بڕوای پێکردی بەڵام مرد پێش دەرکەوتنی پێغەمبەرایەتی تۆ فەرمووی: لە خەودا بینیم کە جلی سپی لەبەردابوو ئەگەر ئەهلی ئاگر بوایە جلی غەیری سپی لەبەردا ئەبوو[٢]

## ٣. ﴿ پێغەمبەر ﷺ زۆر بەتوندی پەیوەست بووە بەو وەحیەی کە بۆی دەهات ﴾

لە هەردوو صەحیحەکە دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو وەحیەی کە بۆی دەهات زۆر بەتوندی پەیوەست بوو پێیەوە تاکو لەبیری نەچێتەوە هەردووك لێوی دەبزواند و لەگەڵ جبریل دەی وتەوە تا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند(لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ) ، فەرمووی کۆی دەکەمەوە لە سنگت،( فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) واتە: گوێی بۆ بگرە،( ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ) واتە: کاتێك جبریل هات بۆ لات گوێی بۆ بگرەوە کە ئەو ڕۆیی بیخوێنەوە وە هەروەك خوای گەورە عزوجل بەڵێنی پێداوی.[٣]

## ٤. ﴿ جبریل لەسەر تەختێك بوو بە حەواوە ﴾

جابیر (خوای لێ ڕازی بێت) باسی ئەو ماوەیەی دەگێڕایەوە کە سروش بڕان بوو، سروش نەدەهات بۆ پێغەمبەر ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ئەوا بەڕێوەم دەڕۆم لەپڕ دەنگێکم بەر گوێ کەوت لە ئاسمانەوە، کە چاوم هەڵبڕی ڕوانیم وا ئەو فریشتەیەی کە لە ئەشکەوتی حیراو هات بۆ لام لەسەر کورسیەك دانیشتووە لە نێوان ئاسمان و زەویدا، ئیتر منیش لێی تۆقیم و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە وتم دام پۆشن دام پۆشن، جا لەپاشان خوای گەورە ئەم ئایەتانەی

---

[٢] أخرجه ترمذي (٢٣٩٠).

[٣] صحيح البخاري:(٥) و صحيح مسلم:(٤٤٨).

نارده خوارەوە(يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ * وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ * وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ) واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت بە نوێنی ناومالْ پێچاوەتەوە هەڵسە تێبکۆشە کەی کاتی نوستن و پالْکەوتنە، ڕاپەڕە ئەو خەڵکە بێ ئاگایە بێدارکەرەوە و لە سزا و تۆڵەی خوا بیان ترسێنە، تەنیا خوای خۆت بە گەورە بگرە و ڕێزی بگرە و هەر ئەو بە خوای گەورەی خۆت بزانە و هەرگیز هاوبەشی بۆ پەیدا مەکە، وە جل و بەرگی خۆت پاك و تەمیز ڕابگرە، وەك هەمیشە و تاسەر واز لە بتو بتکاری بێنە، یا دەست لە گوناح هەلگرە ئیتر لەوە بەدوا سروش بەگەرمی دەهات و پەیتا پەیتا لە دوای یەك دەهاتە خوارەوە[٤]

وە هەروەها یەحیا(خوای لێ ڕازی بێت) وتی: پرسیم لە ئەبو سەلەمە: کام سوورەتەی قورئان لە پێشدا هاتۆتە خوارەوە؟ وتی: ( يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ) وتم: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ) یاخود(إقرأ)، جابیر وتی: من پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووە ئەوتان بۆ دەگێڕمەوە، فەرمووی ماوەی مانگێ لە ئەشکەوتی حیرادا خەڵوەم دەکێشا و خوا پەرستیم دەکرد، کە خەڵوەکەم تەواو کرد لە چیاکە دابەزیم تا گەیشتمە ناو شیوەکە، ئەوەندەم زانی یەکێ بانگم دەکات منیش سەیری ئەم لا و لاو بەردەم و پشت و ڕاست و چەپی خۆمم کرد کەچی کەسم نەدی، دیسان یەکێ بانگی لێ کردمەوە، کە کە تەماشام کردەوە دیسان کەسم نەدی، هەمدیسانەوە یەکێ بانگی لێ کردمەوە ئەمجارە سەرم بەرزکردەوە تەماشام کرد وا جبریل لەسەر تەختێکە وا بە حەواوە ئیتر لەرزێکی گران دایگرتم و بەدەم لەرزەوە چوومەوە بۆ لای خەدیجە و وتم: دام پۆشن، ئەوانیش دایان پۆشیم و هەندێ ئاویان پیاداکردم، ئنجا خوای گەورە و سەرومر ئەمەی نارده خوارەوە: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنْذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ * وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ)[٥]

---

[٤] رواه البخاري ومسلم والترمذي.

[٥] بخاري بدء الوحي:٣، مسلم إيمان:٤٠٤.

## ٥. ﴿ بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێك بڕوای بە پێغەمبەر ﷺ هێنا ﴾

بانگ کردنی ئەبوبکر بۆ لای ئیسلام بانگی کرد و هاوڕێکەی کە جێگەی متمانەی و پارێزەری نهێنیەکانی بوو ئەویش ئەبوبەکری ڕاستگۆ)ەزای خوای لێبێت) بێ هیچ دوو دڵیەك و گومانێك بڕوای بە پێغەمبەر ﷺ کرد و یەکەم بانگەوازکار بوو لە ئیسلام دا وە بە هۆی بەرەکەتی ئەوەوە هاتنە ناو ئیسلام یەکەم کاروانی هاوەڵان کە لە ئیسلامدا گەورەترین هەوڵ و تێکۆشانیاندا خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێ ئەوانەش بریتی بوون لە عوسمانی کوڕی عەففان خاوەنی دوو نورەکە، وە زوبەیری کوڕی عەووام [illegible] پێغەمبەری خوا ﷺ وە صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب، وە عبدالرحمانی کوڕی عەوف، وە سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاص، خاڵی پێغەمبەر ﷺ وە تەلعەی کوڕی عوبەیدوڵڵە وە هەموو ئەوانەی هاتنە ناو ئیسلام لەسەر دەستی ئەبوبەکر لە دە کەسە موژدە پێدراوەکان خوای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت.[٦]

## ٦. ﴿بەسەرهاتی یەکەم کەس قوڕئانی بەدەنگ خوێند دوای پێغەمبەر ﷺ﴾

ئیبن ئیسحاق دەڵێ: بۆی گێڕامەوە یەحیای کوڕی عوروەی کوڕی زوبەیری لە باوکیەوە کە دەڵێ یەکەم کەس کە قورئانی بە دەنگ خوێند بێ دوای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بوو(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ڕۆژێك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کۆبونەوە وتیان بەخوا قورەیش گوێیان لە قوڕئان خوێندن نەبووە بەدەنگی بەرز هەرگیز ئەرێ کام پیاو دەتوانێ قوڕئان بدا بە گوێیان دا؟عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود وتی: من وتیان: ئێمە دەترسین لەبارەی تۆ ئێمە دەمانەوێ پیاوێك ئەم کارە ئەنجام بدات کە خاوەن هۆز بێت کە هۆزەکەی بەرگری لێبکەن و بیپارێزن لە بت پەرستانی قورەیش ئەگەر ویستان ئازاری بدەن وتی:وازم لێبێنن خوای گەورە دەمپارێزێ دەڵێ بەیانی ئیبن مەسعود هات تا گەیشتە

[٦] وقفات تربوية:ص٦٧

مەقام لە چێشتەنگاودا قورەیش لە شوێنی کۆبونەوەیان کۆبوو بوونەوە هات تا گەیشتە مەقام ئەوجار خوێندی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)دەنگی بەرز کردەوە سوورەتی: (الرَّحْمَنُ * عَلَّمَ الْقُرْآنَ) دەڵێ چوونە پێشەوە لێی دەوریان دا دەیان وت ئەوە چی دەڵێ کوڕی ئوم عەبد؟ ئەمجار وتیان ئەوە دەخوێنێ هەندێك لەوەی کە بۆ موحەممەد هاتووە بۆی هەستان لێیان دا لەدەم و چاوی ئەویش بەردەوام بوو لە خوێندن تا ئەوەی خوا حەز بکات خوێندنی لەپاشان گەڕایەوە بۆ لای هاورێکانی شوێنەواری لێدانەکەی بەدەم و چاویەوە بوو وتیان ئێمە ئا لەوە دەترساین لێت وتی: ئەگەر دەتانەوێ بەیانیش دەچم بە وێنەی ئەمڕۆ دەکەم و وتیان بەسە چونکە بەڕاستی ئەوەی ئەوان پێیان ناخۆش بوو بە گوێت دان دان[٧]

## ٧. ﴿ بەسەرهاتی یەکەم کەس کەسەلامی کرد لە پێغەمبەر ﷺ بە سەلامی ئیسلامەتی ﴾

لە عەبدوڵڵای کوڕی صامتەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ئەبو زەر(خوای لێ ڕازی بێ) وتی: دەرچووین لەناو هۆزەکەمان غەفار حاڵیان وابوو لە مانگی حەررامدا کۆچ و باریان دەکرد، من و ئونەیسی برام و دایکم هاتین بووین بە میوانی خاڵێکمان، ڕێزی لێگرتین و چاکەی لەگەڵ کردین قەومەکەی حەسودیان پێ بردین وتیان: هەرکات تۆ خێزانت جێ دێڵی ئونەیس دەچێتە لایان خاڵەکەمان هات ئەوەی پێی وترا بوو دەری بڕی بۆمان منیش پێم وت: ئەو چاکەیەت کە ڕابوورد بەڕاستی لێڵت کرد، ئیتر ئێمە لەگەڵت دانانیشین بڕکە و وشترەکەمان هێنایە نزیکمان و بارمان کرد خاڵیشمان بە جلەکانی خۆی سەری داپۆشی و دەستی کرد بە گریان و ڕۆیشت هەتا گەیشتە نزیك مەککە ئونەیس گرەوی کرد لەگەڵ شاعیرێکدا لەیەر بڕکە وشترەکەی ئێمە ئەوەندەی ئەوەی ئێمە چوونە لای فاڵچی و پرسیاریان لێکرد ئونەیس بەچاك دانا گرەوەکەی بردەوە ئونەیس بڕکەکەی خۆشمان و ئەوەندەی تریشی هێنایەوە دەڵێ: ئەی برازام من نوێژم دەکرد بەرلەوەی بگەم بە پێغەمبەر ﷺ بەسێ ساڵ

[٧] ذكره القرطبي في تفسيره ١٤٧/٧، عن عروة بن الزبير ذكره الطبري في تأريخه ٣٣٤/٢،٣٣٥

وتم: بۆ کێ؟ وتی: بۆ خوا وتم: ڕوت دەکردە کوێ؟ وتی: ڕووم دەکرد بۆ هەر شوێنێك کە خوا ڕێکی بخستایە نوێژی عیشام دەکرد هەتا شەو درەنگ دەبوو دەکەوتم وەك پەلاسی سەرکونە هەتا خۆر بەرز دەبۆوە بەسەرمدا ئونەیس وتی: کارێکم هەیە لە مەککە تۆ ئیشەکانی من بکە ئونەیس ڕۆیی بۆ مەککە درەنگ هاتەوە کە هاتەوە وتم چیت کرد؟ وتی: گەیشتم بە پیاوێك لە مەککە لەسەر دینی تۆیە دەڵێ: خوای گەورە ناردویەتی وتم: خەڵك چی پێ دەڵێن؟ وتی: دەڵێن شاعیرە، کاهینە، جادوگەرە ئونەیس کە خۆی یەکێ بوو لە شاعیران وتی: من قسەی کاهینەکانم بیستووە ئەو گوفتارە لە قسەی ئەوان ناچێت، وتەکەیم بەراورد کردووە لەگەڵ ڕێبازەکانی شیعردا نە لەگەڵ شیعری من و نە لەگەڵ زمانی هیچ شاعیرێکدا جگە لە من ناگونجێ کە ئەوە شیعریش بێت سوێند بە خوا ڕاست دەکات و ئەوان درۆ دەکەن ئەبوو زەر دەڵێ وتم: تۆ ئیشەکانی من بکە تا دەچم بزانم چیە؟ هاتمە مەککە پیاوێکم بە هەژار و بێ وەی زانی پێم وت: ئەو پیاوەی ناوی دەبەن صابیئی لە کوێیە؟ ئاماژەی بۆ من کردو بە خەڵکەکەی وت: ئەوە صابیئیە خەڵکی ئەو دۆڵە پەلاماریان دام بە هەموو خشت و ئێسکێك لەو ناوە هەبوو هەتا کەوتم کاتێ هەڵسامەوە هەر لە بتی سورکراو بە خوێن دەچووم هاتمە سە زەمزەم و خوێنەکەم لە خۆم شۆرد و ئاوم لێ خواردەوە پانزە شەو و پانزە ڕۆژ مامەوە ئەی براکانم هیچ خۆراکێکم نەبوو جگە لە ئاوی زەمزەم کەچی قەڵەو بووم هەتا لۆچی سکم شۆڕ بوویەوە و هەستم بەلاوازی و برسیەتی نەدەکرد لەکاتێکدا خەڵکی مەککە لە شەوێکی مانگە شەوی سایەقە و سافدا بوون گوێیان ئاخنرا بوو بە خەوێکی قورس و یەك کەس لە دەوری کەعبە نە دەگەڕان دوو ئافرەتیش لەوان لە (اساف) و (نائلە) دەپاڕانەوە لە کاتی گەڕانیاندا دایان بەلای مندا وتم یەکێکیان مارەببڕن لەوەی تریان هەر وازیان نەهێنا و هاتنەوە بەسەرمندا وتم: هینێکی ڕەقی وەك دار بەلام بە [illegible] نەم وت ڕۆیشتن بەدەم وەلوەلەوە و دەیانوت خۆزگە لێرەدا یەکێ لە کۆمەڵی خۆمان لابوایە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر کە لە ڕاکردنی نێوان صەفا و مەروا دا دەهاتنە خوار هاتن بەرەو ڕوویان فەرمووی: ئەوە چیتانە؟ وتیان: صائیبیەك لە نێوان کەعبە و پەردەکانیدایە فەرمووی: چی پێ وتن؟ فەرموویان قسەیەکی پێ وتین پڕ بەدەم ناوترێت پێغەمبەر ﷺ هات کە هەتا دەستی دا

لەبەردە ڕەشەکە و خۆی و هاوەڵەکەی تەواف بەیتیان کرد و دوای ئەوە نوێژی کرد کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد ئەبو زەڕ دەڵێ: من یەکەم کەس بووم سەلامم بە سەلامی ئیسلام وتم:( السلام علیکم یا رسول الله) فەرمووی ( وعلیك ورحمة الله) پاشان فەرمووی تۆ کێی؟ وتم: لە غەفارم دەستی دانەواند و پەنجەکانی خستە سەر ناوچەوانی لە دڵی خۆمدا وتم: پێی ناخۆش بوو لە غیفارم چووم بۆ لای دەستی بگرم هاوڕێکەی گرتمی ئەویش شارەزا تربوو بە حاڵی من لەدوا سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: لەکەیەوە لێرە دای؟ وتم سی شەو و ڕۆژە واتە پانزە شەو و پانزە ڕۆژ وتی: کێ خۆراکی دایتێ؟ وتم خۆراکم نەبوو جگە لە ئاوی زەمزەم قەڵەویش بووم هەتا لۆچی سکم شۆڕ بوەتەوە لەسەر جەرگیشم هەست بە لاوازی و برسیەتی ناکەم فەرمووی: بەڕاستی زەمزەم پیرۆزە هەر کەس بیخواتەوە تێری دەکات ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگام بدە ئەمشەو من خۆراکی بدەمێ پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر ڕۆیشتن منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم ئەبوبەکر دەرگایەکی کردەوە بەمشت مێوژی تائیفی ئەداینێ ئەوە یەکەم خۆراك بوو خواردم لە مەککە دا دوای ئەوە مامەوە ئەوەندەی کە مامەوە چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من لە خەودا خاکێکی خاوەن دار خورمام پیشان دراوە لە یەپریب بەولاوە بە هیچ شوێنێکی تری نازانم ئایا تۆ دەنگم دەگەیەنیت بە هۆزەکەت؟ بەڵکو خوا بە هۆی تۆوە سودیان پێبگەیەنێت و تۆیش پاداشتت دەست کەوێتبەهۆی ئەوانەوە دەڵێ: هاتمەوە بۆ لای ئونەیس وتی: چیت کرد؟ وتم ئەوەم کرد کە موسڵمان بووم و باوەڕم هێنا وتی: منیش لە دینی تۆ لا نادەم بەڕاستی منیش موسڵمان بووم و باوەڕم هێنا هاتین بۆ لای دایکمان وتی: من لە دینی ئێوە لانادەم ئەوا منیش موسڵمان بووم و باوەڕم هێنا ماڵمان بارکرد هەتا گەیشتینە لای هۆزەکەمان غیفار نیوەیان موسڵمان بوون ئیمای کوڕی روخصەی ڕیش سپیان بوو کە پێش نوێژی بۆ دەکردن نیوەی تریان وتیان هەرکات پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە موسڵمان دەبین ئەمجار پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە نیوەکەی تریشیان موسڵمان بوون هۆزی ئەسلەمیش هاتن وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان برای ئێمەن ئێمەش موسڵمان دەبین لەسەرئەوەی ئەوان لەسەری موسڵمان بوون

هەموویان موسڵمان بوون پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:(غەفار خوا لێیان ببورێ، ئەسلەم خوا سەلامەتیان بکات)[٨]

وە هەروەها هەر لەبارەی موسڵمان بوونی ئەبو زەر لە صەحیحی بوخاریشدا ئاوا هاتووە، لەدوای ئەوەی دەنگوباسی پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئەبو زەر بە براکەی وت سواربە و بڕۆ بۆ لای ئەو دۆڵە واتە: مەککە بزانە ئەو پیاوە کێیە کە دەڵێن دەنگوباسی لەئاسمانەوە بۆ.دێ گوێ بگرە لە قسەکانی دوایی بگەڕێرەوەو هەواڵم بدەرێ لەبارەیەوە براکەی دەرچوو بەرەو مەککە هەتا گەیشتە ئەوێ وە گوێی گرت لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دوایی گەڕایەوە بۆ لای ئەبو زەڕ وتی: بینیم فەرمان دەکات بە ڕەوشتی بەرز و پایەدار وەقسەکانی شیعر نین ئەبو زەڕ وتی: ئەوەی من دەمەوێ بەتەواوی بۆت ڕوون کردمەوە توێشوی کۆکردەوە و ئاوی لەکۆڵ خۆی هەڵدا هات تا گەیشتە مەککە چووە مزگەوت پێغەمبەری ﷺ نەناسی وە پێشی خۆش نەبوو کە پرسیار لەوبارەیەوە بکات تا بەشێك لەشەو ڕۆیی ئیمامی عەلی بینی زانی کە غەریبەیەو ڕێبوارە بەدوای خۆی داو شوێنی کەوت لەگەڵی چووەماڵەوە هیچیان لەبارەی ئەویتریان پرسیاریان لە یەکتری نەکرد تا بەیانی داهات ئەمجار کۆڵی توێشوەکەی بەکۆڵ خۆی دادا بەرەو مزگەوت ڕۆیی مایەوە ئەو ڕۆژەش پێغەمبەری ﷺ نەبینی تا ئێوارە داهات گەڕایەوە شوێنی پشوودانی ئیمامی عەلی بەلای دا ڕۆیی دیسان هەستا و لەگەڵی ڕۆیی دیسان هیچ کامیان لەبارەی ئەوی تریان پرسیاریان لەیەکتری نەکرد تارۆژی سێیەم گەڕایەوە بەرەو مزگەوت وەك جارەکانی تر دوایی ئیمامی عەلی لێی پرسی ئەرێ پێم ناڵێی تۆ لەبەرچی هاتویتە ئێرە؟ وتی: ئەگەر بەڵێن و پەیمانم پێبدەی کە ڕێنمونیم بکەی ڕێنمونیم بکە دەنگ و باسی هاتنی خۆی بۆ باس کرد ئیمامی عەلی وتی: بەڵێ ئەو ڕاست دەکات بەڕاستی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەگەر بەیانی داهات شوێنم کەوە ئەگەر شتێکت بینی لێی ترسایت ئەوا وەك ئاو بڕێژم هەڵوەستە دەکەم ئەگەر ڕۆیشتم شوێنم بکەوە هەتا من لەکوێ چووە ژوورەوە تۆیش بێیتە ژوورەوە دوایی دوام کەوە تا دەگەینە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوتن تا چوونە لای پێغەمبەر وە گوێی گرت لە وتە پیرۆزەکانی هەر لەوێدا موسڵمان بوو پێغەمبەر ﷺ پێیفەرموو: بگەڕێرەوە بۆ لای قەومەکەت هەواڵیان بدەرێ تا فەرمانی منت پێ دەگات وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە لەناو کۆڕ و کۆمەڵی قوڕەیش دا تەوحید بەدەنگی بەرز ئاشکرا دەکەم هاتە دەرەوە و خۆی گەیاندە مزگەوت تاتوانی بەدەنگی بەرز قیڕاندنی: (أَشْهَدُ

---

[٨] پوختەی صەحیحی موسلیم لاپەڕە٨٤٦ تا ٨٤٩.

أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) خەڵکەکە بۆی هەستانەوە ئەوەدەیان لێدا هەتا دایان بە زەوی دا عەبباس هات لەژێر دەستی ئەوان دەری هێنا و پێی وتن هاوار بەماڵتان ئایە ئێوە نازانن ئەوە غەفارییە و ڕێگای بازرگانیەکەتان بەرەو شام بەلای ئەوان دایە دەی ڕزگاری کەن و وازی لێبێنن دیسان بەیانی گەڕایەوە بۆ لایان و هەمان هەڵوێستی دووبارە کردەوە دیسان عەبباس فریای کەوت و لەدەستی ئەوان ڕزگاری کرد[٩]

## ٨. ﴿ بەسەرهاتی یەکەم وتار دەر کە بانگەوازی خەڵکی کرد بۆلای خواو پێغەمبەر ﷺ ﴾

ئەبوبەکری ڕاستگۆ داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد خۆیان و بانگەوازەکەیان ئاشکرا بکەن ئەمەش لە کاتێکدا کە ژمارەی بڕواداران گەیشتبوو سی و هەشت کەس پێغەمبەری خواش ﷺ وەلامی ئەدایەوەکە هێشتا موسڵمانەکان کەمن ئەی فەرموو: (يا أبابكر إنا قليل) ئەبوبەکری صدیق بەردەوام ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارە دەکردەوە هەتا ماوەی دان دەرچن و بچنە مزگەوتی حەرام ئەوە بوو موسڵمانەکان هەرپیاوێك لەگەڵ عەشیرەتی خۆی دا لە کەعبە دا بلاویان لێ کرد و ئەبوبەکر لەناو خەڵکەکەدا هەستایەوە و دەستی بە وتاردان کرد و پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشتبوو و ئەبوبەکر یەکەم وتاردەرێك بوو کە بانگ بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات موشریکەکانیش بەگژی ئەبوبەکر و موسڵمانەکان دا هەڵچوون ئەوەبوو لە هەموو لایەوە موسڵمانەکان لێدانێکی توندیان لێ دراو کافران نیشتنە مل ئەبوبەکر و زۆریان لێدا عوتبەی کوڕی ڕەبیعەش بە جوتێ نەعلی ئەستورەوە دەستی بە لێدانی کرد و ئەویش کێشان بەدەم و چاوی دا هەتا لە هۆش خۆی چوو چەند پیاوێکی نەوەی تەیم هەڵیان گرت و بردیانەوە ماڵەوە و وتیان: ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت ئێمە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ئەکوژین ئەبوو قوحافەی باوکی و خزمەکانی خەریکی بانگ لێکردنی بوون تا ئەوە بوو لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا هۆشی بە خۆی داهاتەوە داخۆ ئەبوبەکر هۆشی بە خۆی داهاتبێتەوەو چی کردبێت؟ یەکەم وتەیەك کە بەدەمیا هات ئەوەبوو کە وتی: پێغەمبەری خوا

---

[٩] (رواه البخاري٧/١٧٣) ٦٣ كتاب مناقب الانصار ٢٣٠٠ باب إسلام أبي الغفاري.

ﷺ چی كرد؟ چ باوكی چ خزمەكانی لەم هەواڵە پرسینەی بێزار بوون كاتێ كە تەنیا دایكی لەلایدا مابویەوە لێی پرسی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی كرد؟ وتی: بەخوا ئاگام لە هاوەڵەكەت نیە فەرمووی: بچۆ بۆ لای ئوم جەمیل واتە: فاتیمەی كچی خەتتاب و پرسیاری لێبكە ئەویش هێشتا موسڵمان بوونی خۆی ئاشكرا نەكردبوو دایكی ئەبوبەكر چوو بۆ لای و وتی: ئەبوبەكر هەواڵی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلای هاوەڵێت لێ ئەپرسێ وتی: نە ئەبوبەكر دەناسمو نە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلاش جا ئەگەر پێت خۆشە بێم لەگەڵت دا بۆ لای كوڕەكەت ئەوا دێم وتی: بەڵێ لەگەڵیا ڕۆیشت و ئەبینێ وا ئەبوبەكر لە جێگا كەوتووە و هیلاكە ئوم جەمیل لێی نزیك كەوتەوەو بە دەنگی بەرز هاواری كرد: بەخوا ئەوانەی ئاوەها لێیان داوی كۆمەڵێكی فاسق و كافرن و هیواداریشم خوا تۆڵەت لێیان بستێنێ فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی كرد؟ وتی: ئەوە دایكتە گوێی لێیە و وتی: خەمی ئەوت نەبێ وتی: ساغ و سەلامەتە وتی: لە كوێیە؟ وتی: وا لەماڵی ئەرقەمە فەرمووی: مەرج بێت تا نەگەمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەنان و نە ئاو تام نەكەم وازیان لێ هێنا تا هات و چۆ كەم بویەوە كۆڵانەكان چۆڵ بوون دوای ئەوە هەردوو ئافرەتەكە چوونە ژێر هەردوو باڵی ئەبوبەكر و گەیاندیانە خزمەتی پێغەمبەری خواش ﷺ خۆی دا بەسەری دا و ماچی كرد و موسڵمانەكانیش ماچیان كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەزەیی پێدا هاتەوە و ئەبوبەكر وتی: دایكم و باوكم بە قوربانت بن جگە لەوەی كە ئەو فاسقە دای لە دەم و چاوم هیچم نیە ئەمەش دایكمە لەگەڵم چاكە تۆیش موبارەكی بۆ لای خوا بانگی بكە و دوعاشی بۆ بكە بەشكو خوای گەورە بەهۆی تۆوە لە ئاگر ڕزگاری بكات پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ كرد و بۆ ئیمان هێنان بە خواش بانگی كرد و موسڵمان بوو.[١٠]

## ٩. ﴿ عەمرى كوڕى عەبەسە بانگەشەی کە ئەو چواریەکی ئیسلامە ﴾

سەددادی کوڕی عەبدوڵلا وتویەتی: ئەبو ئومامە وتی: ئەی عەمری کوڕی عەبەسە چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە تۆ چواریەکی ئیسلام بیت؟ وتی: لەسەردەمی نەفامیدا خەڵکم بە گومڕا دەزانی و بتەکانیشم بە هیچ دا دەنان پاشان دەربارەی پیاوێك دەنگ و باسم بیست کە لە مەککە دا هەندێك هەواڵ بڵاو ئەکاتەوەو باسی هەندێك شتیش دەکات سواری ووشترەکەم بووم و هاتم هەتا گەیشتمە مەککە ئەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ بەبێ دەنگ کار دەکات ؤ قەومەکەشی دەستاین بەسەریدا دەڕوات، منیش خۆم دەرنەخست و چوومە خزمەتی وتم تۆ چیت؟ فەرمووی:(أنا نبي الله) وتم: پێغەمبەری خوا چیە؟ فەرمووی: (رسول الله) دەڵێ وتم: خوا ناردوتی؟ فەرمووی: بەڵێ وتم: بەچی ناردوتی؟ فەرمووی: (بأن يوحد الله ولا يشرك به شيء وكسر الأوثان، وصلة الرحم) فەرمووی: ئەوەی کە خوا بە تاكو تەنیا بپەرسترێو هیچ شتێك نەگرێتە شەریكو بتەکان بشکێنن و سیلەی ڕەحمیش بە جێ بهێنرێ وتم: لەمەدا کێت لەگەڵە؟ فەرمووی: ئازادێكو بەندەیەك ئەبینم ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە بیلالی بەندەی ئازادکراوی ئەبوبەکری لەگەڵ دایەو وتم: دەی من شوێنت دەکەوم فەرمووی: (إنك لاتستطيع ذلك يومك هذا ولكن أرجع إلى أهلك فإذا سمعت بي قد ظهرت فالحق بي ) واتە: فەرمووی: ئەمڕۆ تۆ توانای ئەوەت نیە بەڵام بە موسڵمانیەتی بگەڕێوە بۆ ناو کەس و کارتو خەریکی ئاینداری خۆت بە هەتا کاتێك بیستت من سەرکەوتووم ئەوا خۆت بگەڕێوە بۆ لام دەڵێ: بە موسڵمانیەتی گەڕامەوە بۆ ناو کەس و کارم ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی بۆ مەدینە کرد و منیش هەر هەواڵم دەپرسی تا ئەوبوو لە یەپریبەوە کاروانێك هات و وتم: ئەم مەککەییە چیە هاتۆتە ناوتان؟ وتیان: قەومەکەی ویستویان بیکوژن کەچی نەیان توانیوە دەستیان پێ نەگەیشتووە کە ئێمەش هاتین خەڵك بەپەلە دەچوون بۆ لای عەمری کوڕی عەبەسە دەڵێت منیش سواری ووشترەکەم بووم هەتا گەیشتمە مەدینە و بە خزمەتی گەیشتمو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دەمناسیتەوە؟ فەرمووی: (نعم ألست أنت الذي أتيتني بمكة؟) فەرمووی: بەڵێ ئەو پیاوە نیت کە لە مەککە هاتیتە لام؟ دەڵێ: وتم بەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کە خوای گەورە فێری کردویت من نازانم فێرم بکە[11]



---

[11] اخرجه أحمد ١١٢/٤، ومسلم ٢٧٥/١

## ١٠. ﴿ پیاوە ئێراشیەکە قەرزەکەی لە ئەبو جەهل وەرگرتەوە ﴾

ئبن ئیسحاق ریوایەتی کردووە و ووتیەتی : پیاوێکی هۆزی ئیراش بەچەند سەر وشترێکەوە هاتە مەککە و ئەبو جەهل لێی کڕی بەڵام دەستی دەستی بە کابرا ئەکرد و پارەکەی نەئەدایە کابرای ئیراشی هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ هاتە لای کۆڕ و کۆمەڵی قورەیش و پێغەمبەری خواش (ﷺ ) لەلایەکی مزگەوتەوە دانیشتبوو ووتی ئەی کۆمەڵی قورەیش چ پیاوێکتان ئامادەیە ئەو حەقەم لەلای ئەبولحەکەمی کوری هیشام بۆ وەربگرێتەوە ؟ من غەریب و رێبوارم و حەقەکەم ناداتێ پیاوانی کۆڕەکە ووتیان ئا ئەوە ئەبینی ؟ ئاماژەیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ ) کرد چونکە ئەیانزانی لە نێوان ئەو و ئەبوجەهلدا چ دوژمنایەتیەك هەیە وتیان : برۆ بۆ لای حەقەکەت بۆ وەرئەگرێتەوە ئەیان ویست گاڵتەی پێ بکەن ، کابرای ئیراشی هاتە سەر سەری پێغەمبەر (ﷺ) باسەکەی دا بە گوێی دا ئەویش پیاوانە هەستایەوە و پێکەوە رۆیشتن کە پیاوانی کۆڕەکە چاویان لێ بو هەستایەوە و لەگەڵیا رۆیشت بە پیاوێکیان کە لەگەڵیاندا بوو ووت : شوێنی بکەوە و بزانە چی ئەکات ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆیشت هەتا گەیشتە لای ماڵی ئەبوجەهل و تەقەی لەدەرگادا ووتی ئەوە کێ یە ؟ فەرمووی (محمد فخرج) واتە موحەممەدم وەرە دەرەوە دەرەوە کە هاتە دەرەوە ڕەنگی زەرد هەڵگەرابوو فەرمووی (أعط هذا الرجل حقه) واتە : هەقی ئەم کابرایە بدە ووتی : مەرۆ هەتا چی لە لامە بیدەمێ چووە ژورەوە و هاتەوە و پارەکەی بۆ هێنا و دایە دەست دووای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەرایەوە بە کابرای ئیراشی فەرموو: (الحق لشأنك) واتە برۆ بەلای کاری خۆتەوە کابرای ئیراشی هاتەوە بۆ لای کۆڕەکە و ووتی خوا پاداشتی بە چاکە بداتەوە هەقەکەم وەرگرتەوە کاتێ ئەو پیاوەی کە ناردیان تا بزانێ ئەبو جەهل چی ئەکات گەرایەوە و پێیان ووت : ماڵت کاول بێ چیت بینی ؟ ووتی شتێکی یەکجار سەیرم بینی بەخوا هەر ئەوەندە بوو کە تەقەی لە دەرگاکەی دا هاتە دەرەوە و گیانی تیا نەمابوو ووتی : هەقی ئەو کابرایە بدە ئەویش پێی دا ئەوەندەی پێ نەچوو ئەبو جەهل هاتوو ئەوانیش لۆمەیان کردوو بە گاڵتەوە پێیان ووت دەبەخوا ئەوەی تۆ کردوتە تا ئێستا نەمان دیووە ووتی ماڵتا کاول بێ هەر ئەوەندە بوو کە تەقەی لە دەرگاکەم دا دەنگێکم بیست و ترس و لەرز دایگرتمەوە و نێرە وشترێکیش بەسەر سەریەوە بوو کە هەرگیز نێرە ووشترم لە شێوەی کەللەسەر و مل و کەڵپەی ئەو وشترەدا نەدیوە دەبەخوا ئەگەر بە گوێم نەکربایە دەیخواردم ئیتر شێوەی ئەو نێرە وشترە هەرگیز لە مێشکی ئەبو جەهل دەر نەئەچوو [١٢]

---

١٢ ابن اسحاق ریوایەتی کردووە

## ١١. ﴿ هانی کوڕەکەی ئەدا تا کۆمەکی ئاینی تازە بکات ﴾

یەکێکی تر لەمانەی کە کەوتنە شوێن پێغەمبەری ئازیز ﷺ و بەرگریان لە خۆی و بانگەوازەکەی کرد گەنجێك بوو بە ناوی گولەیبی کوڕی عومەیر کاتێك گولەیب موسڵمان ئەبێت ئەگەڕێتەوە لای دایکی و پێی دەڵێ: موسڵمان بووم شوێن موحەممەد ﷺ کەوتووم پاشان ئەکەوێتە بانگ کردنی دایکی بۆ سەر ئیسلام و ئەڵێت: بۆچی موسڵمان نابیت و شوێنی ناکەوی خۆ حەمزەی برات(خوای لێ ڕازی بێت) موسڵمان بووە؟ دەڵێت: چاوەڕوان دەکەم تا بزانم خوشکەکانم چی دەکەن؟ دوای منیش وەك ئەوان دەکەم گولەیب دەڵێت: لەبەرخاتری خوا داوات لێ دەکەم کە بچیتە خزمەتی و سەلامی لێ بکەیت و تەصدیقی بکەیت و شاهێدی بدەیت کە جگە لە زاتی خوا خوایەکی تر نیە دایکی وتی:(فإني أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمداً رسول الله) ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە ئەروا کە دایکی گولەیب بوو بەرگری لە پێغەمبەری برازای دەکرد و گولەیبیش هەڵ ئەنا تا کۆمەکی ئاینی تازە بکات و فەرمانەکانی بە جوانی جێ بەجێ بکات لە ڕیوایەتەکەی تردا لە ئەبوو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە ئەگێڕنەوە کە وتویەتی: گولەیبی کوڕی عومەیر(خوای گەورە لێی ڕازی بێت) لەماڵی ئەرقەم موسڵمان بوو و کە هاتە دەرەوە چووە ماڵەوە لای دایکی کە ئەڕوای کچی عەبدولموتەلیب بوو وتی: موسڵمان بووم و چومە سەر دینی (رب العالمین) دایکیشی وتی: شایانترین کەس کە تۆ یارمەتی بدەیت و کۆمەکی بکەیت خاڵۆزاکەتە بە خوا ئەوەی کە لە پیاوان دێت لە ئێمەش بهاتایە شوێنی دەکەوتین بەرگریشمان لێ ئەکرد دەڵێ: وتم: دایە بۆچی موسڵمان نابیت گولەیب کە موسڵمان بوو بووە ئەندامێکی لێهاتووی شوێنکەوتەی قورئان و بەسەر و ماڵ بەرگری لە پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەکرد ئەوەبوو جارێکیان ئەبو جەهل و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی ڕێیان بە پێغەمبەر ﷺ گرتو ئازاریان دا کە گولەیب ئەوەی بیست خۆی گەیاندە لای ئەبو جەهلو دەستی بە لێدانی کرد تاسەری شکاندو گرتیان ئەبو لەهەبی خاڵی هەستایەوە تا بەرگری لێ بکا ئەم دەنگو باسە گەیشتەوە لای ئەڕوای دایکی و ئەویش وتی: چاکترینی ڕۆژانی تەمەنی ئەو ڕۆژەیە کە پشتگیری لە خاڵۆزاکەی کردووە بە ئەبو لەهەبیان وت: ئەڕوای خوشکت لە دین وەرگەڕاوە ئەویش چوو بۆ لایو لۆمەو گلەیی لێ کرد ئەڕواش وەڵامی دایەوە: لە پشت سەری برازەکەتەوە بووەستە جا ئەگەر سەرکەوت ئەوا بۆ تۆش چاکە ئەگەر نا لەلایەن برازاکەتەوە گلەیت نایەتە سەر ئەبو لەهەب وتی: جا ئێمە دوژمنایەتی هەموو عەرەبمان پێ دەکرێ؟ ئەوە دینێکی تازە بابەتی داهێناوە[١٣، ١٤، ١٥، ١٦]

---

١٣ الإستيعاب ٤/٢٢٥

## ١٢. ﴿کە ووتەی ڕاهیبەکەی گێڕایەوە پێغەمبەر ﷺ بەوە دڵخۆش بوو﴾

حاکم لە (المستدرك) دا (٣٦٩/٣) لە ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی تەلحەوە هێناویەتی کە وتوویەتی: تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (خوای لێ ڕازی بێت) پێمی وت: گەیشتمە بازاری بوصرا ئەبینم وا ڕاهیبێك لە پەرستگاکەی دایە و ئەڵێ: لە خەڵکی هاتووی ئەم وەرزە پرسیار بکەن بزانن ئایا کەسێکی خەڵکی حەرەمی مەککەیان تیادایە؟ تەڵحە وتی: بەڵێ من وتی: ئایا ئەحمەد دەرکەوتووە؟ ئەڵێ وتم: ئەحمەد کێیە؟ وتی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەلیبە ئەمە ئەوکاتەیە کە تیایدا دەردەکەوێ و دوا پێغەمبەریشە لە حەرەم دا دەردەکەوێ و بۆ شوێنی دار خورما و بەردی ڕەش و کوناوی خۆڵی ئاودار و خوێیوایی کۆچ ئەکات ئەکەی بهێڵی کەس پێشت بکەوێت بۆ لای تەڵحە دەڵێ ئەو قسەیەی چووە دڵمەوە بۆیە بەپەلە کەوتمە ڕێ هەتا گەیشتمەوە مەککە وتم: هیچ شتێکی تازە ڕووی داوە؟ وتیان: بەڵێ موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای ئەمین داوای پێغەمبەرایەتی دەکات کوڕی ئەبو قوحافەش شوێنی کەوتووە دەڵێ لەماڵ دەرچووم خۆم گەیاندە لای ئەبوبەکر(خوای لێ ڕازی بێت) وتم: شوێنی ئەم پیاوە کەوتووی؟ فەرمووی: بەڵێ: تۆش بچۆ بۆ لای شوێنی بکەوە چونکە بۆ سەر هەق بانگت دەکات لەوێ تەڵحە هەواڵی ڕاهیبەکەی بۆ ئەبوبەکر گێڕایەوە و ئەبوبەکر هەستا و تەڵحەی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و تەڵحە موسڵمان بوو وتەی ڕاهیبەکەشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە و پێغەمبەری خواش ﷺ بەوە دڵخۆش بوو جا کە ئەبوبەکر و تەڵحە موسڵمان بوون نەوفەلی کوڕی خوەیلیدی عەدوەی گرتنی و بەپەتێك هەردووکیانی بەست بەیەکەوە و ئەوەی تەیمیش بەرگری لێیان نەکرد نەوفەلی کوڕی خوەیلید نازناوی شێری قورەیشی لێنرابوو و قورەیشیش ئەبوبەکر و تەڵحەی ناونان (القرينين) واتە جوتە بەیەکەوە بەستراوەکە لەڕیوایەتەکەی بەیهەقی دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (اللهم اكفلنا شر بن العروية) فەرمووی: خوایە شەڕی نەوفەلمان لێ لابدەی.

---

١٤ شرح حياة الصحابة ١/٣٣٨-٣٣٩.

١٥ الإصابة٤/٢٢٧.

١٦ شرح حياة الصحابة ١/٤٥٣.

## ١٣. ﴿بەسمە ئەگەر هیچی تریش نەبیستم باكم نیە﴾

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەكەی دا لە صەعصەی كوڕی موعاویەی مامەی فرزدەقەوە ڕیوایەتی كردووە كە دێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەویش ئەم ئایەتە دەخوێندەوە: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ) صەعصەعە وتی: بەسمە ئەگەر هیچی تریش نەبیستم باكم نیە واتە: ئەمەم بەسە تا لە حیكمەتی هاتنی قورئان تێبگەم چاكە و خراپە تەنها یەك زەڕڕەشیان نافەوتێ هەروەها ڕیوایەت كراوە كە كاتێك ئەعرابیەك ئەم دوو ئایەتەی لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ دەبیستێ دەڕوا و دەڵێت: زەڕڕە، زەڕڕە واتە: ئەوەی كە ئایەتەكە باسی دەكات هەر كەسێك بەقەد میسقالە زەرەیەك چاكە و خراپە بكات دەیبینێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:( لقد فقه الرجل) فەرمووی كابرا لە ئیسلام تێگەیشت.

## ١٤. ﴿فەرمانی كرد بە كچەكە كە سینگی داپۆشێ و ترس بە دڵی دا نەیەت﴾

تەبەرانی لە حارثي كوڕی حاریثە وە تەخریجی كردووە: بە باوكم وت: ئەم كۆمەڵە خەڵكە چین؟ وتی: ئەمان لە دەوری پیاوێكی لەدین وەرگەڕاوی خۆیان كۆبوونەتەوە دەڵێت: ئێمەش دابەزین و ئەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵكەكە بۆ ناسینی خوای گەورە بە تاك و تەنیاو ئیمان هێنان بانگ دەكات و ئەوانیش بەپەرچی قسەكانی ئەدەنەوەو ئازاری پێ ئەگەیەنن هەتا ڕۆژ نیوە بوو و خەڵكەكەی دەوری بڵاوەیان لێ كردو ئافرەتێك كە سەرووی سنگی دەركەوتبوو هات و دۆلكەیەك و دەسڕێكی پێ بوون‌و پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرت‌و ئاوی خواردەوەو دەست نوێژیشی گرت و پاشان سەری بەرزكردەوە بۆ لای‌و فەرمووی: ( یا بنیة خمری علیك نحرك ولا تخافي على ابیك ) واتە: كچەكەم سینگت داپۆشەو بۆ باوكت ترست بەدڵ دانەیەت وتمان ئەمە كێیە؟ وتیان: ئەمە زەینەبی كچیەتی(خوای لێ ڕازی بێت)[17]

---

[17] قال الهيثمي ٦/٢١، رجاله ثقات وشرح الحياة الصحابة: ١/٤٤٣

## ١٥. ﴿ کەسێکم نەبوو بەرگریم لێبکات تا بچم بەدەمیەوە ﴾

بەزار و تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە(خوای لێ ڕازی بێت) هێناویانە کە وتوویەتی: لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دابوو ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و شەیبەو عەتبەی کوڕی ڕەبیعەو عوقبەی کوڕی أبی موعیط ئومەییەی کوڕی خەلەف و دوو پیاوی تر وەلیدی کوڕی عوتبەو عومارەی کوڕی وەلید بوون کە حەوت پیاو بوون لە حیجرداو پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی دەکرد کە سوجدەی برد درێژەی بە سەجدەکەی دا ئەبو جەهل وتی: کێتان دەچێ پاشەڕۆکی وشترەکانی ئەوەی فلان بێنێ و تا هەڵی ڕێژن بەسەر شان و ملی موحەممەدا؟ لە هەموویان بەدبەختر عوتبەی کوڕی أبی موعیگ هەستا چوو هێنای‌و خستیە سە هەردوو شانی‌و پێغەمبەری خواش ﷺ لە سەجدە دابوو عەبدوڵڵای کوری مەسعود ئەڵێت: منیش وەستا بووم و نەم ئەتوانی قسە بکەم چونکە کەسێکم نەبوو بەرگریم لێ بکا تا بچم بەدەمیەوە ئەوەبوو فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبووی‌و هات بە دەمیەوەو ئەوەی خرابویە سەرشانی دای گرت پاشان ڕووی لە قوڕەیش کردو قسەی پێ وتن کەچی ئەوان وەلامیان نەدایەوە پێغەمبەری خواش ﷺ وەك هەموو جارێك کە لە سەجدە ئەبوویەوە سەری بەرز کردەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بۆوە فەرمووی: ( اللهم علیك بقریش ثلاثا علیك بعتبة وعقبة وأبي جهل و شیبة) فەرمووی: خوایە تۆڵە لە قوڕەیش بستێنی (سێ جار) وای فەرموو: خوایە تۆڵە لە عوتبەو عوقبەو ئەبو جەهل‌و شەیبە بستێنی پاشان لە مزگەوت دەرچوو و ئەبولبوختەری کە قامچییەکی بە دەستەوە بوو تووشی بوو کە پێغەمبەری ﷺ بینی لەدەم‌وچاویدا هەستی بە شتێك کرد بۆیە وتی: ئەوە چیتە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی وازم لێبێنە وتی: بەخوا بەرت نادەم هەتا هەواڵم بدەیتێ چیتە؟ شتێکت توش بووە کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ زانی بەری نادات هەواڵی دایەو فەرمووی: (إن أبا جهل أمر فطرح علي فرث) واتە: ئەبو جەهل فەرمانی دا پاشەڕۆکیان خستە سەرشانم‌و ملم ئەبولبوختەری وتی: بابڕۆین بۆ مزگەوت ئەوەبوو پێغەمبەرو ئەبولبوختەری پێکەوە چوون بۆ مزگەوت پاشان ئەبولبوختەری ڕووی لە ئەبو جەهل کرد وتی: ئەوبولحەکەم تۆ فەرمانت داوە پاشەڕۆك بخرێتە سەر شان‌و ملی موحەممەد؟ وتی بەڵێ دەڵێ: قامچی یەکەی بەرزکردەوە دای بە تەوقە سەری دا پیاوەکان دەستیان بە هەڵمەت دان بۆیەکتری کرد خێرا ئەبوجەهل قیڕاندی : ماڵتان کاول بێ ئەوەش بۆ ئەو موحەممەد ویستی دوژمنایەتی بخاتە نێوانمانەوەو خۆی‌و هاوەڵانیشی دەرباز بن لە ڕیوایەتەکەی ئیمام ئەحمەد دا وەها هاتووە کە عەبدوڵڵا وتویەتی: هەموویان بینی لە ڕۆژی بەدردا کوژرابوون.[١٨]

---

[١٨] البدایة٣/٤٤ شرح الحیاة الصحابة ١/٤٤٩-٤٥٠.

## ١٦. ﴿ ئەوانەی پێغەمبەری خوایان ئازار دەدا خوای گەورە تۆڵەی لێ سەندنەوەو سوكو ڕیسوای کردن ﴾

لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە( خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا بەو کارەی کە خوای گەورە پێ ی سپاردووە ئەویش گەیاندنی ئایەتەکانی ئاینەکەیەتی بە بێ باوەڕانی قوڕەیش پێغەمبەر ﷺ بەئارام بوو چاوەڕێی پاداشتی دەکرد لە خوای گەورەو ئامۆژگاریەکانی پەروەردگاری دەگەیاند بە خزمانی خۆی تاکو بەرەو ڕووی هەموویان دەبووەوەو ئەوان ئازاریان دەداو گاڵتە جاڕیان پێ دەکردو بە درۆیان دەخستەوە عوروە دەڵێ: ئەوانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد پێنج پیاوی سەرکردەو ناودارو کەسانی خۆیان بوو لە کورانی بەنی ئەسەد ئەبو زەمعە کوڕی ئەسوەدی کوڕی موتەلیب، وە لەبەنی زوهەیری موغیرە وە لەبەنی سەهم عاصی کوڕی وائلی سەهمی وە لە بەنی خوزاعە حارسی کوڕی طلاطل دەڵێ: کاتێ ئەوانە درێژەیان بەو کارە خراپەی خۆیاندا وە گاڵتەجاڕیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد تاکو خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ( إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ ★ الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ )الحجر(٩٥-٩٦) واتە: بەڕاستی ئێمە گاڵتە چیانمان لەکۆڵ کردیتەوە ئەوانەی لەگەڵ خودا پەرستراوێکی تر دادەنێن جا دواتر دەزانن چۆن سزایان دەدەین پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خوای گەورەوە بەڵێنی پێ درابوو کە تۆڵەی بۆ بکاتەوە لەوانەی گاڵتەجاڕیان پێ دەکردو لەناویان بەرێت جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لای کەعبە بوو جبریل هات بۆ لای و وەستا لە لایەوە پێغەمبەریش ﷺ گاڵتەجاڕیەکەی ئەوانی بۆ گێڕایەوە دەفەرمووێت: ئەو پێنج کەسە کاتێك دەسوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا ئەسوەدی کووری موتەلیب بەلایدا تێپەڕی جبریل سەلامی خوای لێبێت پەڕە سەوزێکی بۆ هەڵداو کوێر بوو ئەنجا ئەسوەدی کوڕی عەبدیە غوث لەلایدا جبریل سەلامی خوای لێبێت بە پەنجەی دەستی ئیشارەتی کردو پاش ماوەیك توشی سك چونێکی زۆر سەخت بوو وەسکی بای کردو تا مرد پاشان وەلیدی کوڕی موغەیرە بەلایدا تێپەڕی وە جبریل سەلامی خوای لێبێت ئیشارەتی کرد بۆ لای برینێك لە پاژنەی قاچیەوە چەند ساڵێك بوو توشی ببوو بەشەلی دەڕۆیشتو عەباکەی دەخشاند بە زەویدا وە ئەو برینە کولایەوە دیسان کێمو جەراعەتی لێوە دەهاتە دەرەوەو هەتاکو کوشتی وە عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بەلایدا تێپەڕی و جبریل سەلامی خوای لێبێت ئیشارەتی کرد بۆ بنی پاژنەی پێیو ئەویش پاش ماوەیەك سواری گوێ

درێژێكی خۆی بوو كە بچێت بۆ لای باخەكانی لە طائیف لەوێ لای خەرمانێك ویستی دابەزێت قاچی چوو بەدرێكدا وە ئەو دڕكە بوو بەهۆی كوشتنی ئەو پیاوە حارسی كوڕی طه لاطل بەلایدا تێپەڕی و جبریل ئیشارەتی بۆ كرد بۆ لای سەری‌و پاش ماوەیەك سەری لەناوەوە تووشی كێم‌و جەراعەی تێكی زۆر بوو لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ئیشارەتی كرد بۆ لای سكی‌و توشی ئاوی زەرد بوو تاوای لێهات پیساییەكەی لەدەم و لوتی یەوە دەهاتە دەر تا دوا جار كوشتی ئابەو جۆرە خوای گەورە بەڵێنی خۆی هێنایە دی بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ كە دەفەرمووێت:( إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ)الحجر ٩٥.[19]

## ١٧. ﴿ هەتا لە ژیاندا بوو توشی لەرزۆكی بووبوو ﴾

لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕۆیشتایە بە ڕێگادا حەكەمی كوڕی عاص لاسایی ڕۆیشتنەكەی پێغەمبەری دەكردەوە چۆن بڕۆشتایە ئەویش ئەوا دەڕۆیشت لە پێش چاوی خەڵكیدا لاسایی دەكردەوە بۆ ئەوەی لەناو خەڵكدا گاڵتەی پێ بكات كاتی پێغەمبەر ﷺ بینی بەو شێوەیە لاسایی دەكاتەوە فەرمووی: (فكذلك كن) واتە هەتا هەتاییت هەر وابیت ئەوە بوو هەتا ئەو كابرایە لە ژیانیدا بوو توشی لەرزۆكی بووبوو.[20]

---

[19] أنظر سيرة ابن هشام١/٢١، ٢٩٢ وقال محقق: إسناده صحيح الى ابن زبير وابن جرير ٧/٥٥٠(٢١٤١٧) والبيهقي في (السنن الكبرى)(٨/٩) و في الدلائل (٣١٦/٢) وقال الذهبي في السيرة ص١٤٣ حديث صحيح وحسن اسناده الشيخ الألباني عن طريق البيهقي: كما في صحيح السيرة ص ٢٢٢

٢٠ اخرجه الحاكم(٦٢١/٢) وصححه البيهقي في (دلائل النبوة) ٢٣٩٨/٦ وقال الحافظ العراقي في (تخريج الأحياء)(٣٨٨/٢): رواه البيهقي في الدلائل بإسناد جيد، وقال الحافظ في الإصابة(١٧٨١) في إسناده نظر.

## ١٨. ﴿ خوا زیندوت دەکاتەوەو دەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخ ﴾

لەفەرموودەی ئیبن عەبباسدا هاتووە (خوای لێ ڕازی بێت) کە دەڵێ عاصی کوڕی وائل ئێسکێکی لە (البطحاء) دەست دایەو ووردی کرد بە دەستی ئەوجار بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئایە خوا ئەمە زیندوو دەکاتەوە لە دوای ئەوەی ئاوا فەوتاوە ئەما پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ خوا دەت مرێنێت ئەوجار زیندوت دەکاتەوەو دەتخاتە ناو ئاگری دۆزەخ وە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی یاسین لەبارەی ئەوەوە هاتە خوارەوە ئایەتەکانیش ئەمانەن: (أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ * وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ * قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ * الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ * أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ * إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ * فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ)یس(٧٦-٨٣). واتە:ئایە ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك درووست کردووە کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار دەمەقاڵێ کەرێکی ئاشکرایەو نموونەمان بۆ دێنێتەوەو بەدیهێنانی خۆی لەبیرچۆتەوە ئەو بێ بڕوایە دەڵێ کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون ئەی موحەممەد ﷺ بڵێ ئەو زاتە زیندویان دەکاتەوە کە لەیەکەم جارەوە بەدی هێناون‌و ئەومیە بە هەموو درووست کراوێك زاناو ئاگایە زاتێ کەلە درەختی سەوز ئاگری بۆ درووست کردوون ئیتر ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە ئایا زاتێ کە ئاسمانەکان‌و زەوی بەدی هێناوە ناتوانێ وێنەیان دروست بکات؟ بەڵێ دەتوانێ‌و هەر ئەویش دروستکاری زانایە بەڕاستی کاری ئەو (خوا) ئەومیە هەر کاتێ بیەوێ شتێك بە دیبێنێ پێی دەڵێ: ببە دەست بەجێ ئەو شتە دەبێت جا پاك‌و بێگەردە ئەو خوایەی کە موڵکایەتی هەموو شتێك بەدەست ئەوەو بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە[٢١]

---

٢١ (اخرجه الحاكم ٢/٤٢٩) من طريق عمر بن عون و قال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه و قال ابن كثير في التفسير أخرجه ابن أبي حاتم.

## ١٩. ﴿ ئەی خزمەکانم فریای خۆتان بکەون ﴾

لە عائیشەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: کاتێك ئایەتی (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) هاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستاو وتی: ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد یا صافیە کچی عەبدولموتەلیب ئەی کوڕانی عەبدوولموتەلیب من هیچم پێ ناکرێ لەلای خوا بۆ ئێوە کەواتە فریای خۆتان بکەون‌و ڕوو لە بەرنامە ڕاستەکەی خوا بکەن وە لەماڵەکەم هەر شتێکتان دەوێ داوام لێ بکەن[٢٢]

## ٢٠. ﴿ وەلیدی کوڕی موغەیرە دان دەنێ بەڕاستی بەرنامەی ئیسلام ﴾

وەلیدی کوڕی موغەیرە دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش قورئانی بۆ دەخوێنێ وەك ئەوەی دڵی نەرم ببێ ئەوا دەگاتەوە بە ئەبو جەهل دێتە لای دەڵێ ئەی مامە گەلەکەت دەیانەوێ ماڵ‌و سامانت بۆ کۆ بکەنەوە وەلید وتی: بۆچی؟ ئەبو جەهل وتی: تا بت دەنێ چونکە تۆ چویتە لای موحەممەد تا یارمەتیت بدات‌و ماڵ‌و سامانت بداتێ وەلید وتی:خۆ قوڕەیش ئەوەچاك دەزانێ کە من لە هەموویان زیاتر ماڵ‌و سەروەت‌و سامانم هەیە ئەبو جەهل وتی:دە قسەیەك بڵێ لەبارەی موحەممەد کە بەگەلەکەت بگاتەوە کە تۆ ڕقت لە لەوەو ئەوت ناوێ وەلید وتی: جا نازانم چی بڵێم؟ سوێند بە خوا هیچ پیاوێك لەناو ئێوە دا نیە کە لە من شارەزا تر بێت لەبارەی شیعرەوەو تێیاندا نیە لەبارەی ڕەجەزی شیعر لە من شارەزا تر بێ وە لە شیعرەکانی جینیش سوێند بە خوا ئەوەی ئەو دەیڵێ لە هیچ شتێك لە مانە ناچێ سوێند بە خوا قسەکانی شیرینیەکیان تێدایە وە قسەکانی بەردارو خاوەن بەروبومن بەرزیەکیان هەیە ئەوەی ژێر خۆیان تێك دەشکێنن ئەبو جەهل وتی: قەوکەکەت ڕازی نابن تا شتێك لە بارەیەوە نەڵێی وتی: وازم لێ بێنە تا بیرێك دەکەمەوە لە بارەیەوە لە دوایدا وتی: ئەوە سیحرێکی کاریگەرە ئەوجار ئایەتی: (ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا * وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَمْدُودًا * وَبَنِينَ شُهُودًا) لەبارەیەوە هاتە خوارەوە.[٢٣]

---

٢٢ رواه مسلم في الصحيح كتاب الإيمان باب قوله(وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) رقم ٢٠٥

٢٣ البداية والنهاية الجزء الثالث:ص٥١.

## ٢١. ﴿ قورەیش لای ئەبو تالیب سکاڵایان کرد لە بارەی پێغەمبەر ﷺ ﴾

ئیمامی بوخاری لە مێژووەکەیدا ڕیوایەتی کردووە پاش ئەوەی کە قورەیش چەندەها جار سەردانی ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەریان کردو سکاڵایان لەلا کرد دەربارەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش ناردی بەدوای پێغەمبەردا ﷺ پێی وت: ئەوی کوڕی برام گەلەکەت هاتونە لام واو وایان وتوە واز بێنە شتێك مەکە کە هەم منو هەم تۆش نەتوانین بەرگەی بگرین واز لە گەلەکە بێنە ئەو قسانەیان بۆ مەکەو پێیان مەڵێ پێیان ناخۆشە پێغەمبەر ﷺ وای زانی کە مامی دەیداتە دەست بێ باوەڕەکانو توانای ڕاوەستان لەگەڵی داو پشتگیری کردنی نەماوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (یا عم لو وضعت الشمس في یمیني والقمر في یساري ما ترکت هذا الأمر حتی یظهره الله تعالی أو أهلك في طلبه) واتە: ئەی مامە ئەگەر خۆر بخەنە لای ڕاستمەوەو مانگیش بخەنە لای چەپمەوە واز لەو بانگەوازە ناهێنم تا خوا سەری دەخات یاخود لە پێناویدا تیادەچم، لە دوایی پێغەمبەر ﷺ گریا ئەبو تالیب وتی: ئەی کوڕی برام بڕۆ بەشوێن کاری خۆت داو بەردەوام بە ئەوەی خۆت پێت خۆشە ئەنجامی بدە سوێند بە خوا بە هیچ شێوەیەك تۆ نادەمە دەست ئەوان.

## ٢٢. ﴿ نەفامیو سەرگەشی ئەبو جەهل بێ ئەندازە بوو ﴾

ئەبو جەهل ڕۆژێك وتی: وەك گاڵتە کردن بە پێغەمبەر ﷺو ئەو پەیامە ڕاستەقینەی کە بۆ ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە هاتووە، وتی ئەی کۆمەڵی قورەیش موحەممەد ڕای دەگەیەنێ ئەو سەربازانەی خوا ئێوە ئازار دەدەن لەناو ئاگری دۆزەخ دا نۆزدە فریشتەن وە ئێوەش خەڵکێکی زۆرن لە ژمارەدا ئایە هەر سەد پیاو لە ئێمە دەرەقەتی یەکێك لە ئەوان نایەت؟ خوای گەورە لەبارەی ئەبو جەهلی نەفام ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: (وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلَّا مَلَائِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا وَلَا يَرْتَابَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْكَافِرُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا كَذَلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ يَشَاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ)المدثر: ٣٠-٣١.

واتە: هەر فریشتەمان کردووە بە کاربەدەستی دۆزەخ وە ژمارەی ئەو فریشتانەمان نەگێڕاوە مەگەر بۆ تاقی کردنەوەی ئەوانەی بێ باوەڕن تا ئەوانەی کتێبیان پێدراوە دڵنیا بن وە بڕوا دارەکان بڕواکەیان زیاد بکات وە هیچیان دوو دڵ نەبن ئەوانەی کتێبیان پێدراوەو ئیماندارانیش وە تا بڵێن ئەوانەی کە نەخۆشی ناپاکی یان لە دڵایە وەبێ بڕواکان خوا چی مەبەستە بەم ژمارەیە کە لە غەریبیدا وەك مەسەل وایە ئابەو جۆرە خوا ئەو کەسەی کە بیەوێ گومڕای دەکاتو ئەوەی بیەوێ ڕێ نموونی دەکات وەکەس ژمارەی لەشکرانی پەروەردگاری تۆ نازانێ مەگەر هەر خۆی وە ئەم ئایەتانە هەر ئامۆژگاری و پەندن بۆ ئادەمی[٢٤]

## ٢٣. ﴿شەیتانە دۆڕاوەکەی قوڕەیش تەنها خەجاڵەتیو سەرشۆڕی بۆ مایەوە﴾

نەزری کوڕی حاریس یەکێك بوو لە شەیتانانی قوڕەیش چوو بوو بۆ حیرە فێری سەرگوزشتەی مەلیکەکانی فارسو چیرۆکی ڕۆستەمو ئیسپەندیار بوو کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشت لە کۆڕێك ئامۆژگای دەکردن بە ترسان لە خواو کردنی یادی خواوە گەلەکەی دەترسان لەو سزاو ئازارەی کە گەلانی پێشوو توشیان بوو بوو بە هۆی وازهێنان لە ڕێبازی خوا دادەنیشت لە تەنیشت کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ جا دەی وت: سوێند بەخوا ئەی کۆمەڵی قوڕەیش لە فەرمایشتەکانی ئەو چاترم لەلایە وەرن بۆ لام من بۆتان باس دەکەم چاکتر لەباسکردنی ئەوجار بۆی باسی چیرۆکی مەلیکەکانی فارس و ڕۆستەم و ئیسپەندیار دەکردن ئەو،جار دەی وت بە چ شێوەیەك موحەممەد لە من چاکترتان بۆ باس دەکات[٢٥]

---

٢٤ أخرجه ابن جرير الطبري في التفسير ٩/١٠٠ من حديث ابن عباس رضي الله عنه.

٢٥ السيرة النبوية لإبن هشام.

## ٢٤. ﴿ بەسەرهاتی قەرزەکەی خەبباب کە لەلای عاصی کوڕی وائل بوو ﴾

خەبباب (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: قەرزێکم لای عاصی کوڕی وائل بوو چووم بۆلای داوام کردەوە پێی وتم: نات دەمەوە تا بێ باوەڕ نەبیت بە موحەممەد دەڵێ: منیش پێم وت: هەرگیز بێ باوەڕ نابم بە موحەممەد تا دەمریت پاشان زیندوو دەبیتەوە وتی: جا من زیندوو دەبمەوە پاش مردن؟ کەوابوو لەوێ دەت دەمەوە کاتێ گەڕامەوە لای ماڵو منداڵ وەکیع دەڵێ: ئەعمەشیش هەر وای وتووە: دەڵێ: ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا) واتە: ئایە ئەو جۆرە کەسانەت دیوە کە باوەڕی بە ئایەتەکانی ئێمە نیەو دەڵێت: سوێند بە خوا من سامانو نەوەم پێدەدرێت ئایا ئەو ئاگادار بووە بەسەر نهێنیەکاندا یان بەڵێنی لە خواوە وەرگرتووە نەخێر وانیە ئەوەی دەیڵێت دەینوسینو لەسەری سزای دوورو درێژی دەدەین ئەوەی کە دەڵێت بە میراتی لێی دەستێنینەوەو خۆی بەتنها دێتەوە بەردەستمان[٢٦]

## ٢٥. ﴿سوێند بەخوا ئەگەر بانگی هاوڕێکانی کردبا فریشتە زەبر بەدەستەکانی سزا دەیانگرت﴾

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ئەبو جەهل بەلای پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی لە کاتێکدا نوێژی دەکرد ئەبو جەهل ووتی: ئایە قەدەغەم نەکرد لێت کە نوێژ ئەنجام بدەی؟ تۆ خۆت دەزانی هیچ کەسێك وەك من هاوڕێو هاودەمی نیە پێغەمبەری خوا ﷺ تێی خوڕیو لێی تووڕە بوو جبریل فەرمووی:( فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ * سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ)العلق١٧–١٨. واتە: ئینجا با ئەو بانگی هاوڕێکانی خۆی بکات ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بەدەست دەکەین سوێند بەخوا ئەگەر بانگی هاوڕێکانی خۆی کردبا فریشتە زەبر بەدەستەکان سزایان دەدا[٢٧]

---

٢٦ اخرجه البخاري البيوع: ١٩٨٥

٢٧ رواه أحمد والترمذي وصححه والنسائي.

## ٢٦. ﴿ هاوبەش پەرستان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ سوجدەیان برد ﴾

ڕۆژێك لە ڕۆژان پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چووە ناو مزگەوتی پیرۆزی حەرام لە مەککەدا نوێژی کردو سورەتی نەجمی خوێند کاتێك گەیشتە فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ( أَزِفَتِ الْآزِفَةُ * لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ * أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ * وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ * وَأَنْتُمْ سَامِدُونَ * فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا)النجم ٥٧-٦٢

واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بۆتەوە بێجگە لە خوای گەورە کەس نیە بەرگری بکات ئاشکرای بکات جا ئایا لەم ووتە کە قورئانە سەرتان سوڕ دەمێنێ؟ وە پێ دەکەنن‌و ناگرین وە ئێوە سەرگەرم‌و بێ ئاگان دەی سوژدە بەرن بۆ خواو پەرستشی بکەن پێغەمبەر ﷺ سوژدەی برد وە هاوەڵەکانی لەدوایەوە سوژدەیان برد پێغەمبەرو هاوەڵەکانی وا گومانیان بردکە بینیان قورەیش موسڵمان بوون بۆیە ناردیان بۆ لای کۆچ کردوەکانی حەبەشە موسڵمانانی ناو مەککە چوونە پێشوازیان کە دەنگ‌وباسی گەڕانەوەی ئەوانیان پێ گەیشت تانزیك مەککە بوونەوە پێیان ڕاگەیاندن ئەوەی دەوترێ لەبارەی ئیسلام بوونی ئەهلی مەککە ڕاست نیە کە ئەوەیان زانی هیچ یەکێك لەوان نەچووە ناو مەککە بە پەنهانی نەبێ[٢٨]

## ٢٧. ﴿ دارێك سەلامی کرد لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ﴾

لە ئەنەسەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: جبریل سەلامی خوای لێبێت جارێکیان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا دانیشتبوو زۆر غەمبار بوو وە زۆر شوێنی خوێناوی بوو بوو لەبەرئەوەی کە هەندێك خەڵکی مەککە ئازاریان دابوو جبریل پێ فەرموو: ئەوە چیتە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوانە ئاوایان لێ کردووم ، جبریل سەلامی خوای لێبێت پێی فەرمووی: پێت خۆشە نیشانەیەکت نیشان بدەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ فەرمووی: تەماشای ئەو دارە بکە ئەویش تەماشای کرد لەوپەڕی شیوەکەوە بوو جبریل (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی بانگی ئەو دارە بکە با بێت بۆ لات پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردوو دارەکە

---

٢٨ السيرة النبوية لإبن هشام ١/٣٠٠.

هات بۆ لای تا هاتە بەردەمی پاشان وەستاو جبریل(سەلامی خوای لێبێت) بە پێغەمبەری فەرموو: پێی بڵێ با بگەڕێتەوە جێی خۆی ئەویش پێی ووت و دارەکە گەڕایەوە شوێنی خۆیو پێغەمبەر ﷺ بۆ دڵنەوایی خۆی فەرمووی: ئەمەم بەسە[٢٩]، وە هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا کە لە عومەری کوڕی خەتتابەوە (خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە حجون بوو واتە: شاخەکەی پشت مەککە بێ باوەڕەکان بەرپەرچیان دایەوەو ئازاریان دا ئنجا دووعای کردوو فەرمووی خوایە گەورە ئەمڕۆ نیشانەیەکم نیشان بدە هەرکەس بە درۆم بخاتەوە دوای ئەم نیشانەیە هیچ باکم نەبێت ئینجا جبریل (سەلامی خوای لێبێت) هات بۆ لای پێی ووت ئەو دارە دوورەی ئەو لا بانگ بکە؟ پێغەمبەریش ﷺ دارەکەی بانگ کرد بەسەر زەویدا بە خشکە خشکە هات تا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ وە دارەکە ووتی:(السلام علیکم یا رسول الله) پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کە بچێتەوە جێگەی خۆی دارەکەش چووەوە جێگەیو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئیتر باکم نیە هەرکەس لە خزمانم ئەگەر لەمەو دوا بەدرۆم بخەنەوە[٣٠]

## ٢٨. ﴿ ئیبنو زەعبەری نەیتوانی بە پەرچی پێغەمبەر ﷺ بداتەوە ﴾

لە ئیبن عەبباسەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ) الانبیاء(٩٨)، واتە: ئێوەو ئەوەی دەیپەرستن جگە لە خوای گەورە هەردوولاتان سوتەمەنی دۆزەخنو پێی دەگەن ئیبن عەبباس دەڵێ: بێ باوەڕانی قوڕەیش ئەمەیان زۆر بەلاوە سەخت بوو ووتیان: موحەممەد جوێنی بە خواکانی ئێمە داوە یەکێ لە ناودارەکانیان کە ناوی ئیبنو زەعبەر بوو هاتە لای قوڕەیشو پێی وتن

---

٢٩ أخرجه:أحمد(٣/١١٣)(١٢١١٢) و قال محققه إسناده قوي على شرط مسلم والدارمي(٢٣) و صححه الشيخ الأرناؤوط على شرط مسلم في تعليقه على صحيح ابن حبان(١٤/٤٣٧). وصححه الشيخ الالباني في صحيح ابن ماجه (٣٢٥٤)

٣٠ أخرجه: أبو يعلى(٢١٥) والبزار(٢٤١٠)، والبيهقي في(دلائل النبوة) ١٥٤/٢ وقال الهيثمي في (مجمع الزوائد)(٩/١٠): رواه البزار و أبو يعلي و إسناد أبي يعلي حسن، و حسن إسناده السيوطي في (الجامع الكبير) كما في منتخب كنز العمال) (٤/٢٩٨).

ئەوە چی بووە؟ ووتیان: موحەممەد جوێنی بە پەرستراوەکانی ئێمە داوە، وتی: چی ووتووە؟ وویتان ووتویەتی هەر شتێك بپەرسترێت جگە لە خوا لەگەڵ پەرستراوەکەش هەردووکیان سوتەمەنی دۆزەخ دەبن، ووتی: خەمتان نەبێت من موحەممەدتان بۆ بێ دەنگ دەکەمو خۆم دەمەقاڵەی لەگەڵ دەکەم وتی: بانگی بکەن بۆم؟ ئەوەبوو بۆیان بانگ کردو ئیبن و زەعبەری پێی وت: ئەی موحەممەد ئایا ئەمەی تۆ دەیڵێیت تایبەتە بە بتەکانی ئێمە یان تایبەتە بە هەموو شتێك کە پەرستراوە جگە لە خوای گەورە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ ( بل لكل ما عبد من دون الله عزوجل)، واتە: بۆ هەموو شتێکە کە پەرسترابێت جگە لەخوای گەورە ئەویش ووتی: سوێند بەخوا زاڵ بووین بەسەریداو بردمانەوە باشە تۆ دەڵێیت عیسا بەندەی خوایەو پیاو چاکەو فریشتەکان بەندەی چاکن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەویش وتی: کەواتە گاورەکان عیسا دەپەرستن و جولەکەکان عوزەیر دەپەرستن ئەوەتا کوڕانی بەنی تەمیم فریشتەکان دەپەرستن کەواتە هەر هەموویان لە دۆزەخدان (عیسا و فریشتەو عوزەیریش) دانیشتوانی مەککە زۆر زۆر خۆشحاڵ بوون بەم ووتەیەی ئیبن و زەعبەری وە ووتەکە کەوتە دەمی هەموو خەڵکی مەککەوەو ویستیان بەمە بەرپەرچی پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە تا خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە: (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ)الانبياء ١٠١[٣١]، واتە: ئەوانەی پێش وەخت لەلایەن ئێمەوە مژدەی چاکیان پێ دراوە ئەوانە دوورن لە دۆزەخ کەواتە ئەوان بێ ئەقڵ بوون چونکە پێغەمبەر عیساو عوزێر( سەلامی خوایان لێبێت) بە هیچ جۆرێك ڕازی نەبوون کە بپەرسترێن وە هەروەها فریشتەو پێغەمبەران(عليهم السلام) بەرین لە هاوبەش پەیداکەرانەوە ئەوە کاری ئەو بێ باوەڕانەیە کە ئەوانیان کردووە بە جێ تکا کردن و کردویانن بە هاوبەشی خوا بە نەزانین.

---

٣١ أخرجه: الطحاوي في مشكل الاثار (١/٤٣١-٤٣٢) والطبراني في المعجم الكبير(١٢/١٥٣(١٢٧٣٩)) والحاكم(٢/٣٨٤) و صححه و وافقه الذهبي، وقال ابن القيم في (شفاء العليل) (ص٦٥) إسناده صحيح وقال الشخ مقبل في الصحيح المسند من اسباب النزول (ص١٥٣) حديث صحيح لغيره.

## ٢٩. ﴿ وتیان دەنگ بەرز بکەینەوەیان نزمی بکەینەوە هەر دەیبیستێت ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ( خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: جارێکیان من لە ژێر پەردەی کەعبە دا بووم پیاوێکی پەقەفی خەڵکی گائیف لەگەڵ دوو زاواکەی خۆی کە خەڵکی مەککەو قورەیشی بوون لەوێدا دانیشتبوونو کەوتبونە قسەکردنو ئەوان زۆر قەڵەو بوون لەگەڵ ئەوەشدا بێ عەقڵ بوون یەکێکیان وتی، تۆ بڵێی خوای گەورە ئەم قسانەی ئێمە ببیستێت؟ ئەوی تریان وتی، ئەگەر دەنگ بەرز کەینەوە دەیبیستێ بەڵام ئەگەر دەنگ بەرز نەکەینەوە نایبیستێ ئەوی تریان وتی، بەخوا دەنگ بەرز کەینەوە دەیبیستێ نزمیشی کەینەوە هەر دەیبیستێ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەم هەواڵەم پێ ڕاگەیاند خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِنْ ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِمَّا تَعْمَلُونَ) فصلت:٢٢[٣٢]، واتە: ئێوە خۆتان نەدەشاردەوەو نەدەپاراست لە گوناحو لە شایەتی گوێو چاوو پێستی لەشتان لە دژتان بەڵکو وا گومانتان دەبرد کە خوا نازانێ بەزۆرێك لەو کارانەی کە دەیکەن، خوای ڕوونی کردەوە کە گومانی خراپیان بردووە بە خوا کەوایان زانیوە خوای گەورە لە زۆربەی ئیشەکانیدا ئاگای لێیان نییە وە ووتەکانیان نابیستێت بەڵام بەهەڵە داچوون وە لەگەڵ ئەو هەموو دەمە قاڵە کردنە کە بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیان دەدا لە ناخی دەروونیانەوە باش دەیانزانی کە درۆزن نییە وە چاکتر دەیانزانی ئاینەکەی ئاینی خوایەو هەقە بەڵام بەهۆی فیزو خۆبەزل زانینیان پێیان خۆش نەبوو کە بچنە ڕیزی بیلالو سوهەیبو هاوەڵانی تری پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەوەشدا دەیان زانی ئەم قورئانە لای خوواوە هاتووەو پێیان خۆش بوو گوێی بۆ بگرن،

---

٣٢ اخرجه: أحمد (١/٢٧٦)(٢٤٩٥) وقال محققه الأرناؤوط: إسناده صحيح علي شرط الشيخين والبخاري في (خلق أفعال العباد) ص:٢٤، والترمذي (٣٢٤٥) و قال حديث حسن صحيح والطبراني في (المعجم الكبير) (١٢٣٧٧) والحاكم ٢/١٠ (٤١٠) وصححه علي شرطهما و وافقة الذهبي و صحيح إسناده الحافظ في الفتح(١/٥١) و حسنه الشيخ الالباني في (صحيح الترمذي)(٢٥٥٢) و صححه علي شرطهما الشيخ مقبل من طريق أحمد في( الصحيح المسند مما ليس في الصحيحين) (٦٣٩).

## ٣٠. ﴿ خوای گەورە ڕێگری لێکرد کە دەریان بکات ﴾

لە ڕوانگەی خۆبەگەورە زانینو لافرتێ کردنی بەکەسانی تر موشریکەکان بە پێغەمبەریان وت ئێمە ڕازی نابین لە مەجلیسو کۆڕی تۆدا دابنیشین کە وێنەی ئائەمانەی تیایدا بێ وەك سوهەیبو بیلالو خەبباب ئەوانە لە دەوری خۆت دەرکە پێغەمبەر ﷺ تەماعی ئەوەی کرد لەپێناو موسڵمان بونی گەلەکەیو ئەوانیش ئەم کارە بکات بەڵام خوای گەورە ڕێگری ئەوەی لێکرد قورئانی دابەزاندو فەرمووی:( وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ)الأنعام:٥٢[٣٣] واتە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستنو هاواری لێ دەکەن بە بەیانیانو ئێواران دا ڕەزامەندی خوایان دەوێو لێپرسینەوەی هیچ شتێکیان لەسەر تۆ نیە وە لێپرسینەوەی هیچ شتێکی تۆش لەسەر ئەوان نیە جا ئەگەر دەریان کەیت دووریان خەیتەوە ئەوە لەستەمکاران دەبیت.

## ٣١. ﴿ یاخی بوو باوەڕی نەهێناو ووشەی یەکتاپەرستی نەووت ﴾

ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە موسەیەبی کوڕی حەزەنەوە دەڵێ : کاتێك ئەبو تالیب لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای کە ئەبو جەهلیشی لەلا بوو لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوممەییەی کوڕی موغەیرە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی مامە بڵێ:( لا إله إلا الله) بەو ووشە پیرۆزە من شایەدیت بۆ دەدەم لەلای خوا، ئەبو جەهلو عەبدوڵڵای کوڕی ئوممەیە ووتیان: ئەی ئەبو تالیب ئایە تۆ واز لە دینی لە ئاینی عەبدولموتەلیب بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ووشە پیرۆزەی یەکتاپەرستی بۆ دەخستە ڕوو داوای لێ دەکرد موسڵمان بێو بۆی دووبارە دەکردەوە کەوا بڵێ هەتا لە دوایدا کۆتا قسەی ئەوەبوو کە وتی من لەسەر ئاینی عەبدولموتەلیبم وە یاخی بوو نەی ووت(لا إله إلا الله) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی سوێند بەخوا داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەم مادام قەدەغە نەکرێم لەوە بەڵام خوای عزوجل ئەو ئایەتەی دابەزاند: (ما كان لِلنَّبِي وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ ما تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ)التوبە:١١٣، واتە: ڕەواو

---

٣٣ نضرة النعيم(١/٢٢٧) بتصرف.

شایستە نیە بۆ پێغەمبەر و بڕواداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران یا خزمی نزیکیشیان بن لەپاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە کە بێگومان ئەو هاوبەش دانەرانە هاوەڵو پێڕی دۆزەخن وە هەروەها خوای عزوجل لەبارەی ئەبو تالیب ئەو ئایەتەشی دابەزاند فەرمووی بە پێغەمبەر ﷺ (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)القصص:٥٦، واتە: بەڕاستی ئەی موحەممەد ﷺ تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشت بوێ ڕێنمونی بکەیت بەڵام خوا هەر کەسی بوێ هیدایەتی دەداتو ئەو خوایە زانا ترە بەوانەی ڕێنموونی وەردەگرن.

## ٣٢. ﴿ خۆڵەکە بە هەرکەسێکیان کەوت بە بێ باوەڕی کوژرا ﴾

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: تاقمی سەرکردایەتی قورەیش لەنزیك حیجری پەنا کەعبە کۆبونەوەو پەیمانیان بەستو سوێندیان خوارد بەلاتو عوزاو مەنات و نائلەو ئیساف ئەگەر موحەممەدیان بەرچاو کەوت هەر هەموویان بەیەکجار بەیەکەوە لێی بدەنو ئازاری بدەن وە بەجێی نەهێڵن تا دەیکوژن ئەم هەواڵە بلاّو بۆوە تا گەیشتە گوێی فاتیمەی کچە خۆشەویستەکەی پێغەمبەر ﷺ وە برگریانەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو هەواڵەکەی بە باوکی ڕاگەیاندو پێی وت: کۆمەڵانی سەرکردەی قورەیش پەیمانیان داوە دژ بە تۆ وە هەریەکەیان بەشی خۆی دیاری کردووە لە بژاردنەوەی خوێنی تۆ دوای کوژرانت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یا بنیة اریني وضوء) واتە: ئەی کچی خۆشەویستم ئاوێکی دەست نوێژم نیشان بدەنو بۆم بهێنە دەڵێ: ئاوی بۆ هێناو دەست نوێژی شۆردو چوو بۆ کەعبە کاتێك بێ باوەڕەکان پێغەمبەریانﷺ بینی هەر لە دووردوە ووتیان: ئەوەهات سەریان کز کردوو ملیان شۆڕ کرد لە جێی دانیشتنەکانیان دابێ دەنگ بوونو هەر نەشیان وێرا تەماشای بکەنوە هیچ پیاوێکیان نەیدەوێرا بۆی هەستێ پێغەمبەر ﷺ بەرێکەوت تا گەیشتە لای سەریانەوە ئەنجا مشتێك خۆڵی هەڵگرتوو فەرمووی:(شاهت الوجوه) واتە: چاوانتان کوێر بێت دەڵێ: خۆڵەکەی گرتە ئەو کۆمەڵە قورەیشیەی کە لەوێ ئامادە بوون بە هەر کەسێکیان کەوت بە بێ باوەڕی کوژرا لە جەنگی بەدردا.[٣٤]

---

[٣٤] (اخرجه أحمد (١/٣٠٣) رقم(٢٧٦٢) و قال محققه الأرناؤوط: إسناده حسن وكذلك صححه الشيخ أحمد شاكر في (تحقيق المسند)(٤/٢٦٩) و اخرجه أبو نعيم في (الدلائل) ص١٣٩ والحاكم ١٦٣/١ و صححه ووافقه الذهبي والبيهقي في ( الدلائل)٦/٢٤٠ وابن حبان(٢: ٦٥) قال محققه حديث صحيح وقال الهيثمي في (مجمع

## ٣٣. ﴿ ناڕەحەتترین کاری قوڕەیش بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ ﴾

ئیبو ئیسحاق دەڵێ: یەحیای کوڕی عوڕوە لە باوکیەوە کە عوڕوەی کوڕی زوبەیرە بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاصی وتووە: ئەری عەبدوڵڵا چ دیمەنێکی زۆر سەختت چاو پێکەوتووە لەو دوژمنکاریانەی کە بێ باوەڕانی قوڕەیش ئەنجامیان دەدا بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ؟ ئەویش وتی: ڕۆژێك من لەناویاندا بووم سەرکردەکانی قوڕەیش کۆبوونەوە لای (حجر) باسی موحەممەدیان دەکرد دەیان وت: کەسمان نەدیوە سەیرتر لەم پیاوە کە بیروباوەڕمان پوچ دەکاتو جوێن بە باب‌و باپیرانمان دەداتو ڕەخنە لە ئاینمان دەگرێتو کۆمەڵگاکەی پارچەپارچە کردووین‌و جوێن بە پەرستراوەکانمان دەدات بەڕاستی لەسەر شتێکی گەورە خۆمان ئارام گرتووە لێی دەڵێ: لەم قسانە دابوون پێغەمبەر ﷺ هات بەرەو کەعبە بۆ لای (حجر)و تێپەڕی بەلایاندا تەواف کرد بەدەوەری کەعبەدا هەرکاتێ دەگەیشتە لای ئەوان لەوێوە تێدەپەڕی هەندێ توانج‌و ووشەی ناشیرینیان پێ وت: زانیم پێی ناخۆش بوو وەڕۆی و تەوافی کردەوەو لەو سەرەوە هاتەوە بۆ جاری دووەم تێپەڕی بەلایاندا هەمان جوێن‌و ووتەی ناشیرینیان پێووتەوە پێغەمبەر ﷺ دیاربوو بە ناوچاوانیەوە کە پێی ناخۆشە بەم شێوەیە سێیەم جاریش ئەم ڕەفتارەیان نواندەوە پێغەمبەر ﷺ وەستا بەرەو ڕوویان فەرمووی:( أتسمعون يامعشر قريش أما والذي نفسي بيده لقد جئتكم بالذبح)، واتە: گوێتان لێ بێت ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش سوێندبەوەی گیانی منی بەدەستە من هاتووم بۆ ئەوەی هەر هەمووتان بەسەربڕین ببەم، دەڵێ: ئەم ووتەیە کاری لە هەر هەموویان کرد تاکو هەر هەموویان بێ دەنگ بوون لە جێی خۆیان سست بوون هەتا یەکێکیان هات‌و پێغەمبەری ئارام کردەوەو ووتەی نەرمی لەگەڵ بەکارهێناو هەتا دەیووت: بڕۆ ئەی ئەبو قاسم ئەوا ئێمە نەفام‌و بێ ئەقلین خۆ تۆ مرۆڤێکی ئاقڵی تۆ چۆن لەگەڵ ئێمەدا قسە دەکەی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتەوەو دیسان بەیانی لای (حجر) کۆبونەوەو دەڵێ: منیش لەناویاندا بووم‌و گوێم لێ بوو هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەوت: ئەوە ئێوە ئاگاتان لێ نیە دوێنێ چیتان دەووت: و

---

الزوائد)٢٨/٨: رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح وقال الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٢٨٢٤): إسناده جيد وقال الشيخ مقبل في الصحيح المسند(٦٥٧): حديث حسن.

چیتان دەکرد بە موحەممەد ئەویش چی وت: بەرامبەرتان هەتا هەڕەشەی لێکردن و وەستا بەرامبەرتان ئێوە لە ترسان وازتان لێ هێنا دەڵێ: لەم قسانە دابووین پێغەمبەر ﷺ هات بۆ کەعبە بینیان هەموویان لێی ڕاست بونەوەو چواردەوریان گرت و پێیان وت: تۆ دەڵێی ئاواو ئاوا پێغەمبەریش ﷺ بێ ترس و ئاشکرا فەرمووی: بەڵێ منم وا دەڵێم دەڵێ: پیاوێکم بینی یەخەی کراسەکەی پێغەمبەری ﷺ گرتبوو ئەبوبەکر هات و دەستی گرت و دووری خستنەوەو بەگریانەوە دەیفەرموو: ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێ پەروەردگارم (الله)یە ئنجا هاوبەش پەیداکەرەکان بڵاوەیان لێکرد ئەوە دوژمن کارترین دیمەن بوو کەمن چاوم پێ کەوتووە ئەنجامیان دابێ بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ.[٣٥]

## ٣٤. ﴿ گیرا بوونی نزای پێغەمبەر ﷺ لە قورەیش ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(خوای لێ ڕازی بێت ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی قورەیشی دەکرد هەموویان بەدرۆیان خستەوەو باوەڕیان پێ نەدەهێناو دوژمنانەوە ناهەموارانە دەوەستان بەرامبەری ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اللهم اعني عليهم بسبع كسبع يوسف) واتە: خوای گەورە یارمەتیم بدەو توشی گرانیەکیان بکە وەك گرانیەکەی یوسف(سەلامی خوای لەسەر بێت) دەڵێ: گرانیەکیان توش بوو هیچ شتێکیان بەدەستەوە نەما تا کەوتنە ئێسك خواردن هەتاوایان لێهات پیاوێکیان لێ هەڵدەستە دیمەنی ئاسمانی وەك دووکەڵ دەهاتە پێش چاو لەتاو هیلاکی و برسیەتی هەتا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت:( فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ (١٠) يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) الدخان(١٠-١١)، واتە: جا چاوەڕوان بە ڕۆژی ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێ هەموو ئادەمی دادەگرێ و دەڵێن ئەمە بەڵایەکی سەختە دەڵێ: دوا بەدوای ئەوە ئەبو سوفیان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد خزمەکانت لەناوچوون داوا لە خوا بکە ئەوەمان

---

[٣٥] (أخرجه:أحمد في(المسند)(٢١٨/٢) وفي (فضائل الصحابة)(٦٣٩) وقال محققه: إسناده حسن، وابن أبي شيبة(٤٤١/٨) و أبو يعلي(٧٣٣٩) و أبو نعيم في (دلائل النبوة)(١٥٩) والبغوي في شرح السنة(٣٧٤٠) والبيهقي في(دلائل النبوة) ٢٧٥/٢ وسيرة ابن الهشام ٣٨٨/١(٢٠٦) وقال محققه: اسناد القوي وقال الهيثمي في(مجمع الزوائد)١٨/٦: رواه أحمد وقد صرح ابن إسحاق بالتحديث وبقية رجاله رجال الصحيح وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة)(ص/١٤٨): إسناده حسن.

**بەسەرەوە لابەرێت وەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:** ( رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ)الدخان:١٢، **واتە:** ئەی پەروەدگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە بەڕاستی **ئێمە باوەڕدارین پاشان پێغەمبەر** ﷺ دوعای بۆ کردن‌و بارانیان بۆ باری‌و **خوای گەورە ئەو برسیەتی قات‌و قڕیەی لەسەر لابردن‌وە ئەو نایەتەی دوایی بۆ دابەزاند کە دەفەرمووێت:**( إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ)الدخان:١٥، **واتە:** بێگومان بۆ ماوەیەکی **کەم ئەم بەڵایە لادەبەین بێگومان ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ بێ باوەڕی** ئنجا خوای گەورە فەرمووی:( يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ)الدخان:١٦، **واتە** ڕۆژێ دێت پەلاماریکی بەهێزو **هەرە گەورەیان بۆ دەبەین بەڕاستی ئێمە تۆڵە** سێنین لە کافران لە جەنگی بەدردا واتە: **تۆڵەی هەرە سەخت‌و گەورەیان ئەو تۆڵەیە یەکە لە** شەڕی بەدردا چاوەڕێیان دەکات[٣٦]

## ٣٥. ﴿ئەبو تالیب پێغەمبەری خوا ﷺ ناداتە دەستی بێباوەڕان﴾

**قوڕەیش کە بینیان ئەبو** تالیب چارێك بۆ برازاکەی نەدۆزیەوەو **قەدەغەی نەکرد لەبڵاوکردنەوەی نایینی تازە** بێ باك ماوەی دا کاری خۆی بکات دۆزینەوەی **پلانێك کە چۆن چارەیەك بۆ ئەو کارەی پێغەمبەر** ﷺ بدۆزنەوە لە ئەنجامدا هاتنە سەر ئەو **ڕایە کە کوڕێکی گەنجی پێ کەوتوو دیاری بکەن تا لەگەڵ** موحەممەد دا بیگۆڕینەوە وە ببێتە **کوڕی ئەبو تالیب ئەبو تالیبیش برازای خۆی ڕادەستی** ئەوان بکات **تا** لەسەر نەوەی لە نایینی **موشریکەکان لای داوە بیکوژن بۆ ئەوە عیمارەی کوڕی وەلیدی کوڕی** موغەیرەیان هەڵبژارد **لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ لای ئەبو تالیب‌و پێیان وت:** ئەبو تالیب ئەوە عیمارەی **کوڕی وەلیدە کە بەهێزترین‌و جوانترین گەنجی قوڕەیشە** وەری بگرەو ژیری و نازایەتیەکەی **پێشکەشت بێت‌و بیکە بە کوڕی خۆت‌و ئەم** برازایەشت کە لەدینی باب‌و باپیرت پاشگەزبۆتەوەو **قەومەکەتی پەرتەوازە کردون‌و پیاوە ژیرەکانی بەبێ ئەقڵ** لەقەڵەم داون ڕادەستمان بکە **تا بیکوژین ئەبو تالیب سەرنجی دا قوڕەیشیەکان کارێکی منداڵانە** دەکەن‌و بیرکردنەوەکەیان **زۆر ناتەواو و**

---

**٣٦ (أخرجه أحمد(١/٤٤١)، البخاري ٤٨٢١، ٤٨٢٤، واللفظ له مسلم ٢٧٩٨ والترمذي ٣٢٥٤ والبيهقي في دلائل النبوة ٣٢٧/٢ وابن حبان ٤٧٦٤.**

هەڵەیە بۆیە پێی وتن: بە خوا رێك كەوتنێكی خراپە كوڕەكەتانم ئەدەنێ تا بەخێوی بكەم بۆتانو منیش كوڕكەمتان بدەمێ تا بیكوژن؟ بەخوا هەرگیز ئەوە رێك ناكەوێت موطعیمي كوڕی عەدی كوڕی نەوفەل كە ئامۆزای ئەبو تالیب بوو وتی: بەخوا ئەبو تالیب خزمەكانت ئەوپەڕی ویژدانیان لەگەڵدا بەكارهێناو هەوڵی تەواویشیان دا تا لەوەی كە پێت ناخۆشە رزگارت بكەن بەڵام وا نابینم كە تۆ هیچیان لێ وەربگریت ئەبو تالیب بە موگعیمی وت: بەخوا ویژدانیان لەگەڵم دا بەكار نەهێنا بەڵام تۆ بڕیارت داوە كە پشتی من بەربدەیتو خەڵكم لە دژ هەڵبنێیت جا چیت پێ خۆشە درێخی مەكە پاشان ئەبو تالیب دژی موطعیم و ئەو خزمانەشی لەنەوەی عەبدمەناف كە پشتیان بەرداو هەروەها دژی ئەو هۆزە قوڕەیشیانەش كە دژایەتیان كرد وتی:

ألا قل لعمرو والوليد والمطعم　　　　ألا ليت حظي من حياطتكم بكر

واتە: بڵێ بە ئەبو جەهلو ولیدو مگعم خۆزگە لە جیاتی ئێوە وشترێكم ببوایە چونكە ئەو لە ئێوە بەكەڵكترە بۆم كە ئەبو تالیب بۆ ئەوە لەگەڵیان رێك نەكەوت نێوانیان تێكچوو بەو پەڕی بێ ویژدانییەوە ئازاریان دەدان ئەبو تالیب سەرنجی دا قوڕەیش بڕیاری تەواویان بۆ دژایەتی موحەممەدی برازایو موسڵمانەكان داوە بە هیچ شێوەیەك دەستیان لێ ناپارێزن بۆ ئەوە بانگی كردە نەوەی هاشمو نەوەی موتەلیب تا ئەوانیش كۆمەكی بكەنو بە هەموویانەوە موحەممەدی خزمیان بپارێزن ئەوانیش هاتن بەدەمیەوە هەموویان بڕیاری بەرگریان دا جگە لە ئەبو لەهەب ئەبو تالیب لە ستایشی خزمەكانیدا قەصیدەیەكی دانا تیایدا دەست خۆشی لێ كردن هەوەها ئەبو تالیب كە سەرنجی دژایەتی قوڕەیشی دا ترسی ئەوە بە دڵیا هات كە عەرەبەكان هەر هەموویان هەڵوێستی قوڕەیش بگرنە بەرو دژایەتیان بكەن بۆیە قەصیدە ناودارەكەی وت تیایدا پەنا بە حەرەمی مەككە ئەبات وە رێزو خۆشەویستی بۆ پیاو ماقوڵانی قەومەكەی دەردەخاتو باسی ئەوەش دەكات كە هەرگیز دەست بەرداری پێغەمبەری خوا ﷺ نابنو ئامادەیە بەخۆیو بەنەوەی هاشم وە هەر هەموویان لە بەرگری پێغەمبەری ئازیز تیابچن.[٣٧]

---

٣٧ (سيرة ابن هشام١/٢٧٢-٢٨٠، البداية والنهاية: ٣/٥٣-٥٧)

## ٣٦. ﴿ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) پەنادانی ئیبن و دوغنەی ڕەت کردەوە﴾

ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) لەبەر بڕوا هێنانیو لەسەر ئەوەی کە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەکردەوە تووشی ئازارو ناڕەحەتی هات بە ڕادەیەك کە ناچار بوو بە دوای موسڵمانە کۆچکەرەکان ئەویش کۆچ بکا بۆ حەبەشە کە گەیشتنە شوێنك پێی دەوترا (برك الغماد) توشی ئیبن و دوغوننەی سەرداری هۆزی قارە بوو ئەویش لێی پرسی: نیازی کوێت هەیە ئەبوبەکر؟ وتی: خزمەکانم دەریان پەڕاندمو دەمەوێ بڕۆم بەوڵاتدا تا بتوانم پەروەردگارم بپەرستم وتی: پیاوی وەك ئەبوبەکر نابێ دەرچێتو نابێ دەریش بکرێت پیاوی وەك تۆ کە دەست گرۆیی پێ ئەوا دەکەیتو سیلەی ڕەحم بەجی ئەهێنیو یارمەتی بارگرانو دەست کورت دەدەیتو میوانداری ئەکەیتو فریای لێقەماو دەکەویت من پەنات ئەدەم وەرە بگەڕێوە لە وڵاتی خۆت دا خواپەرستی خۆت بکە ئەبوبەکر لەگەڵیا گەڕایەوەو دانیشتەوە ئیبنو دوغنە لەسەر پیاو ماقوڵانی قوڕەیش داگەڕاو پێی وتن: پیاوی وەك ئەبوبەکر نابێ دەرچێتو نابێ دەریش بکرێت ئایا ئێوە پیاوێکی وەها دەرئەکەن کە دەست گرۆیی بێ ئەوا ئەکاتو سیلەی ڕەحم بەجێ ئەهێنێو یارمەتی بارگرانو دەست کورتو میوانداری ئەکاتو فریای لێقەوماو ئەکەوێت؟ قوڕەیشیەکان بۆ ئەوەی پەناکەی ئیبنو دوغنە وەربگرن وتیان: بە ئەبوبەکر بڵێ با لەماڵی خۆی دا بۆخۆی خوا پەرستی بکاو چەندی پێ خۆشە نوێژ بکاو قوڕئان بخوێنێ نەك بەئاشکرا بەجێیان بهێنێو ئێمەیان پێ ئازار بدات چونکە ئێمە لەوە ئەترسین ماڵ و منداڵمان لەدین وەربگێڕێ ئیبنو دوغنە ئەوەی بە ئەبوبەکر گەیاندو ئەویش ماوەیەك لە ماڵەوە نوێژو خواپەرستی بەجێ ئەهێنا لە هیچ شوێنێکی تر نە نوێژی ئەکردو نە قورئانی ئەخوێند دوای ماوەیەك وای بەچاك زانی لەپەنای دیواری ماڵەکەی دا مزگەوتێك دروست بکاتو بۆ خۆی خواپەرستی تێ دابکات جا چونکە خاوەنی خاوەنی دڵو دەرونێکی پاكو ناسك بوو هەر کە قورئانی بخوێندایە خۆی پێ نە ئەگیرا بەخوڕ فرمێسکی لەچاوی جۆگەلەیان دەبەستو ژنو منداڵی بت پەرستەکانیش لەدەوری جەمیان ئەخواردو بەوپەڕی سەرسامییەوە سەرنجی خواناسی ڕاستەقینەی ڕەوشت بەرزیان ئەداو ئەم واتایانە ئەکەوتنە مێشکیانەوە: ناسینی خوا بەتاكو تەنیاو دەست بەردار بوونی بتەکانی ئەمانەش لەو بارودۆخەدا و لە غەریبیو نامۆیەدا پیاوی تەواو بەهێزیان ئەویست بتپەرستەکانیش هاواریان بردەوە بەر ئیبنو دوغنە تا سەرێکی مەککە بدات کە هات پێیان وت: ئێمە بە پەنادانی تۆ ئەبوبەکرمان پەنادا بەو مەرجەی بچێ لەماڵەکەی خۆی دا خواپەرستی بکات کەچی وا

لەپەنای دیواری ماڵەکەی دا مزگەوتێکی درووست کردووەو بەئاشکرا نوێژی تێدا دەکاتو قورئانی تیَ دا نەخوێنیَو ئێمەش ئەترسین ژنو منداڵەکانمان بخەڵەتێنیَ بۆیە دەمانەویَ ئەوەی لیَ قەدەغە بکەیت ئەگەر پێی خۆشە با لەماڵی خۆی دا خوا پەرستی بکاتو ئەگەر وا نەکاتو بە ئاشکرا بەجێی ئەهێنیَ داوای لێبکە با پەناکەت بۆ بگێڕێتەوە چونکە ئێمە لامان جوان نەبوو پەیمانی تۆ بشکێنینو لەهەمان کاتیش دا ئێمە ماوەی ئەوە نادەین ئەبوبەکر بەئاشکرا خواپەرستی بکات ئیبنو دوغنە هات بۆ لای ئەبوبەکر پێی وت: خۆ ئەزانیتو لەیادتە من چ بەڵێنو پەیمانێکم پیَ دایت جا یا بەو شێوەیە بکە یان پەناکەم بۆ بگێڕەرەوە چونکە من پێم ناخۆشە عەرەبەکان دەنگو باسی ئەوەم ببیستن کە من پەنایەکم داوە کەچی شکێنراوە ئەبوبەکر خێرا سەرنجی دا پەنای ئیبنو دوغنە واتە: زەوت کردنی سەربەستی بیروباوەڕەکەی واتە: بیَ ئیمان نەخشەی خوا پەرستی بۆ بکێشیَ بیَ ئیمان ماوەی بداو ڕەزامەندی شوێنی خواپەرستی دیاری بکات هەر کاتێکیش ویستی لەسەر نەبوو ئەو مافەی لیَ وەر دەگرێتەوە بۆیە بڕیاری پەناکەی بۆ ئیبنو ددوغنە بگێڕێتەوە تەنها داوای یارمەتی لە خوا بکات.[٣٨]

## ٣٧- ﴿ بەسەرهاتی مۆسڵمان بوونی حوسەینی کوڕی عوبەیدەی خوزاعی ﴾

حوسەین کە باوکی عیمرانی کوڕی حوسەین یەکێك لە هەرە پیاو ماقوڵ و ناوداری هۆزی خۆی پیاوێکی گەورە و زانا ودانا بوو ناردیان بۆ ئەوەی لێکوڵینەوە ئەنجام بدات لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) سەبارت بە ئەو ئاینەی پێی هاتووە تا ئەوە بووە هۆی مۆسڵمان بوونی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) عیمرانی کوڕی حوسەین خوای لیَ ڕازی بیَ – دەڵی قوڕەیش هاتنە لای حوسەین و بە گەورەیان دەزانی پێیان وت بێۆ گفتوگۆمان بۆ بکە لای ئەو پیاوە کە بە خرا پە باسی پەرستراوەکانی ئێمە دەکات

عیمران دەڵێت : لە گەڵیدا هاتم تا نزیکیان کردەوە لە ماڵی پێغەمبەردوە (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای وفەرمووی : ( أوسعوا للشيخ ) واتە: جێیگەی ئەم پیاوە بەتەمەن وناوادارە بکەنەوە عیمران وهاوەلانی تر کە موسڵمان بوون هەموویان لەویَ بوون حوسەین سەرەتا وتی

---

[٣٨] ژیانی ئازیزمان ﷺ بەرگی یەکەم لاپەڕە ٣١٨-٣٢٠

**: ئا ئەمە چیە پێمان گەیشتوە لە لایەن تۆوە كە بە خراپە باسی پەرستراوەكانمان دەكەیت ئەی موحەمەد؟**

**عەبدولموتەلیب چاكتر بوولە تۆ بۆ خزم وهۆزەكەی خۆی عەبدولموتەلیب جگەرو پیوی دەرخوارد دەدان بەلاَم تۆ سەریان دەبڕێت ؟**

**پیغەمبەر (ﷺ) پێ فەرموو :( یا حسین كم تعبد من إله) واتە ئەی حوسین چەند پەرستراو دەپەرستیت ؟ وتی حەوت شەشیان لە زەوی ویەك لە ئاسمان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :(فإذا أصابك ال ر من تدعوا ؟ ) واتە ئەگەر تووشی زیانێك هاتیت هاوار لە كامیان دەكەیت ؟ وتی : هاوار لە وەیان دەكەم كە لە ئاسمانە پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی : (فإذا هلك المال من تدعوا ؟) واتە ئەگەر پارەت نەما هاوار لە كامیان دەكەیت ؟ وتی : هاوار لە وەیان دەكەم كە لە ئاسمانە پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی تەنها ئەوەی ئاسمان هەموو شتێكت بۆ جێ بە جێ دەكات بەلاَم لە گەڵ ئەوەشدا ئەوانەی زەویش هاوبەش دەكەیت لە گەڵیدا ئایا رازی دەبیت كە سوپاسیان بكەیت یان لەوە دەترسیت كە لەو پەرستراوانەی زەوی زاڵ ببن بە سەرتدا حوسەین وتی : ئەوانە هیچیان نیە حوسەین دەڵێت زانیم كە ئەو پیاوە وەكو هیچ پیاویكی تر نیە من قسەم لەگەڵدا كرد بێت دوای ئەوە پێی وتم : ئەی حوسەین موسڵمان بە سەلامەت دەبیت وتم من كەس وهۆزێكم هەیە حوسەین دەڵێت دوای ئەوە ویستم بڕۆم وتم : چی بڵێم ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :( اللهم قنی شر نفسی واعزم لی علی ارشد امری ) واتە : بڵێ خوایە پەنام بدەی لە شەڕی نەفسی خۆم وە جێگیرم بكەیت لە سەر چاكترین ڕەفتاری خۆم حوسەین ڕۆیشت وهێشتا موسڵمان نەبوو بوو دوای ماوەیەك موسڵمان بوو پاشان گەڕایەوە ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من هاتم بۆلاَت و پێم وتی فێرم كە تۆیش ئەو ووتەیەی پێشوو فێركردم ئێستا موسڵمان بووم چی بڵێم ؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە پەنام بدەی لە شەری نەفسی خۆم وە لەوگوناهانەشم خۆش بە كە پەنامەكی و بە ئاشكراو بە هەڵەو بە ئەنقست و بەزانین و بەنەزانین كەئەنجامم داون.**[٣٩]

[٣٩] اخرجة: أحمد ٢٤٤٤/٤ (١٩٩٩٢) وقال محققه اسنادة على شرطها. والنسائي في (السنن الكيرى) (١٨٣٠-١٨٣٢) وإبن أبي شيبة في (المصنف) (٢٦٧/١٠ وابن حنان (٨٩٩) وقال محققه إسناده صحيح على شرط البخاري وإبن حذيفة (١٦٨٩) الحاكم ٥١٠/١ والقضاعي في(مسندشهاب)(١٤٨٠)وقال الحافظ في الأصابة ٣٣٧/١ و ١٧٣٥ رواه أحمد والنسائي باسنادصحيح وقال الهيثمي في المجمع (١٧٤٣)رواه أحمد؟؟؟؟؟؟الصحيح وللفظ لابن ؟؟؟؟؟؟ والزيادات للنسائي.

## ٣٨ – ﴿ جبریل سەلامی خوای لێ بێ لەناو پەڵەهەورەکەدا بوو﴾

لە عائیشەوە – خوای لێ رازی بێ – دەڵێ بە پێغەمبەمبەرم (ﷺ) وت: ئایە هیچ رۆژێك هاتووە بەسەرت دا سەخت تر بوو بێت لە شەری ئوحود؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی تووشم بوو بەلاّم سەخترینیان لای من رۆژی عەقەبەوو کاتێ چووم بۆلای کورەکەی عەبد یالیل بۆ ئەوەی خۆمی پێ بناسێنم بەلاّم ئەو ولاّمی نەدامەوە و منیش بەخەفەت باریەوە گەرامەوە و ئاگام لەخۆ نەبوو تاگەیشتمە لوتکەی(ریوی)یەکان کەسەرم بەرزکردەوە پەڵە هەورێکم بینی بە سەرمەوە بوو سێبەرەکەی بەسەرمداهات تەماشام کرد جبریلی تێدایە بانگی لێ کردم و فەرمووی: خوای گەورە قسەی خزمەکانتی بیست کە چییان وت: بەرامبەر بەتۆ وەخوای گەورە فریشتەی شاخەکانی بۆ لای تۆ ناردووە بۆ ئەوەی کەبەویستی خۆت چی فەرمانێکی پێ دەکەیت برامبەر خزمانی خۆت تا بۆت جێ بەجێ بکات ئەنجا فریشتەی شاخەکان بانگی لێکردم و سەلامی لێکردم وتی: ئەی موحەممەد ئەمە لەویستی خۆت دایە با هەردوو شاخەکە بێنمەیەك و لەناویان بەرم پێغمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەخێر هیوادارم خوای گەورەوە کە ساتێك دروست بکات لەنەوەی ئەوان کە خوا ببەرستن و هیچ جۆرێك شەریکی بۆ بریار نەدەن.

## ٣٩. ﴿ هەر لەو رۆژەوە نازناوی راستگۆی لێ نرا﴾

عائیشە-خوای لێ رازی بێت –دەڵێ: شەو رەوی کرا بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مزکەوتی ئەقصا کە بەیانی بوەوە بۆ خەڵکانی گێرایەوە کە چی هەندێك لەوانەی کە باوەریان بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنابوو وە بەراستیان زانیبوو پاشگەزبوونەوە و کافر بوون و چون بۆلای ئەبو بەکر پێیان وت: نابینی هاوەڵەکەت وا رادەگەیەنێت کە ئەمشەو شەو رەوی پێکراوە بۆ (بیت المقدس) ئەبوبەکر وتی: وای فەرمووە ؟ وتیان بەڵێ: وتی: وتی ئەگەر وای فەرمووبێت راستدەکات وتیان: چۆن تۆ بەراستی دەخیتەوە کەبەیەك شەو چووبێتە ئەوێ و گەرابێتەوە پێش ئەوەی بەیانی بەسەردا هاتبێت؟ وتی من لەوە دوورتریش بە راستی دەخەمەوە کەهەواڵی ئاسمانی بۆ دێت لەبەرە بەیانێکدا یان لە ئێوارەیەکدا دەفەرموویت: هەر لەو رۆژەوە ئەبو بەکر نازناوی (الصدیق) ی لێ نرا.[41]

---

[40] أخرجه: البخاري(٣٢٣١) ومسلم(١٧٩٥) وأبو نعيم في(الدلائل) (٢٠١٣) وابن حبان(٦٥٦١) وقال محققه إسناد صحيح على شرط مسلم.

[41] أخرجة الحاكم (٣/ ٦٢) وصححة ووافقة الزهبي والبيهقي في ( الدلائل) (٢/ ٣٦٠-٣٦١) والنسائي في (الكبرى) (١١٢٨٣) (١٠٣٠) وقال محققه: أخرجه الحاكم والبيهقي باسناد صحيح وصححه الشيخ الألباني في (السلسلة الصحيحة)(٣٠٦).

## ٤٠ ﴿ یەکەم وشتر لە پێشیانەوە ئەو وشترە بوو کە پێغەمبەر ( ﷺ ) وەصفی کردبوو ﴾

هەر لە بارەی ڕووداوی گەورەی ئیسراو میعراجەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی بە هاوبەش پەرستەکان نیشانەی ڕاستی وتەکانم ئەوە یە من تێپەریم بەلای کاروانێکی ئێوەدا لە فلاَن جێگەو وشترێکیان لێ وون بوو بوو وە فلاَنە کەس گرتبوویەوە بۆیان وەئەوان ئیستا لە ڕێ ڕۆشتنە کەیاندا گەیشتونەتە فلاَن جێگەو لە فلاَن جێگە لایان داوە ولە ڕۆژی ئەوەندەو ئەوەندەدا دەگەڕێنەوە ووشترێکی سپی کە کۆپانێکی ڕەشی بەسەر پشتەوەیە لە گەڵ دوو مەشکەی ڕەش دا پێش کاروانەکەوە دەگەڕێتەوە لاتان بۆ ناو شاری مەککە لە فلاَن ڕۆژ وفلاَن ڕۆژدا کوڕی ئەوس دەڵێ کاتێ ئەو ڕۆژە هات کە پێغەمبەر(ﷺ) دیاری کرد بوو بۆ گەڕانەوەی قافڵەکە خەڵکان لە سەربان و شوێنە گشتیەکان تەماشایان دەکرد تا نزیکی نیوە ڕۆبوو کاروانەکە لە دوورەوە دیار بوو کە گەڕایەوە یەکەم وشتری لە پێشیانەوە ئەو ووشترە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ)وەسفی کرد بوو.[٤٢]

## ٤١.﴿ عوسمانی کوڕی مە ظعون ڕازی نەبوو بە پەنادانی بتپەرستان ﴾

هاوەڵی پایەدار عوسمانی کوڕی مظعون – خوای لێ ڕازی بێ- لەوەو پێش وەلیدی کوڕی موغیرە پەنای دا بوو قوڕەیشی لەو پەنادانە ئاگادار کردبوو کە هیچ کەسێك دەست بۆ عوسمان نەبات ، عوسمان سەرەنجی دا موسڵمانە بێ کەس وبێ دەرەتانەکان هەر لە بەیانیەوە هەتا ئێوارە لە سەر لمە سوورەوە بووە کەی مەککەدا سزا دەدرێن ڕۆژێك ودوان نیە مانگ وساڵ تێ دەپەڕن وئەو بەستەزمانانە لە ژێر ئازاردا دەتلێنەوە موسوڵمانەکانی بەو حاڵەوە ئەبینی وخۆشی بێ خەم وبێ ترس دەهات ودەچوو بە بۆنەی پەنای سەر زلێکی قوڕەیشەوە کە هەتا لە سزادان وئازاردانی دڵی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) درێخی نەئەکرد بۆ ئەوە بە خۆی وت بەخوا ئەم هات و چۆیم بەیانیان وئێواران لە پەنای پیاوێکی موشریك داو لەولاوە هاوەڵانم و هاودینانم سزاو ئازار وبەلاَیان بەسەردا ئەبارێ ومن هیچم تووش نابێ ئەوپەڕی ناتەواوی یە بۆ من بۆ ئەمە چوو بۆلای وەلیدی کوڕی موغیرە وپێی وت ئەی ئەبو عەبد شەمس ماوەی پەناکەت تەواو بوو وامنیش پەناکەتم گێرایەوە بۆت دەڵێ جا بۆچی ئەی

---

[٤٢] (أخرجة الطبراني في الكبير(١٧١٤٢) والبيهقي في(الدلائل) ٢/ ٣٥٥ وقال. إسناد صحيح.

کوڕی برام ؟ بۆچی هیچ خزمێکم ئازاری داوی ؟ وتی نەخێر .بەلأم من پێم خۆشە لە پەنای خوای گەورەو بە دەسەلأت دابم ونامەوێ بچمە پەنای غەیری ئەوەوە وەلید وتی : دەی با بچین بۆ مزگەوت ولەوێ وەك بە ئاشکرا پەنام دای بە ئاشکرا پەناکەم بۆ بگێرەوە دەڵێ : پێکەوە رۆێشتیم هەتا گەیشتنە مزگەوت و وەلید بە خەڵکەکەی وت : ئەمە عوسمانە وهاتووە پەناکەم بۆ ئەگێڕێتەوە ئەویش پێی وتن راست دەکا ووەفای نواند وبە رێزەوە پەنای دام بەلأم من وام پێ خۆشە کە جگە لە خوا لە پەنای هیچ کەس دا نەبم بۆیە پەناکەیم بۆ گێرایەوە دوای ئەوە عوسمان رۆیشت و لەبیدی کوڕی رەبیعەی کوڕی مالیکی کوڕی کیلابی قەیسی لە کوڕی قوڕەیش دا بوو وشیعری بۆ دەخویندنەوە عوسمانیش چوو لە گەڵیان دانیشت لەبید بە شێوەی شیعر وتی :

(الا کل شئ ما خلا الله باطل)

عوسمان وتی : راست دەکەیت لەبید وتی :

(وکل نعیم لا محالة زائل)

عوسمان وتی راستت نەکرد نازو نیعمەتی ئەهلی بەهەشت تیادا ناچێت لەبیدی کوڕی رەبیعە وتی ئەی کۆمەڵی قوڕەیش بەخوا هەر کەس لە کوڕی ئێوەدا دابنیشتایە ئازاری نەئەدرا ئەوە کەی واتان لێ هاتووە ؟

پیاوێکی کۆڕەکە وتی ئەوە یەکێکە لەو سەفیهانەی کەوازیان لە دینەکەمان هێناوە بەقسەی ئەو خەمبارو نارەحەت مە بە عوسمانیش وەلأمی دایەوە و دەنگیان بەرز بوو یەوە ئەو پیاوە هەستایە وە و زیلەیەکی لە چاوی عوسمان دا وشینی کردەوە و وەلیدی کوڕی موغیرەش لە نزیکەوە چاوی لێ بوو کە عوسمان چی بەسەر هات وتی دە بەخوا ئەی کوڕی برام پێویستی نەدەکرد ئەو چاوەت وەهای بەسەر بێ چونکە تۆ لە پەنایەکی پارێزراودا بووی : عوسمان وتی : بەڵێ بەخوا چاوە ساغەکەم بەستەزمانە کە وەك هاوەڵەکەی لە رێی خوادا وەهای بەسەر نەهاتووە ومن ئیستا وام لە پەنای یەکێك دا لە تۆ پایەدارتر وبە تواناترە ئەی ئەبو عەبد شەمس ئیتر ئەوە بوو عوسمان – خوای لێ ڕازی بێ- دەربارەی لێ درانی ئەو چاوەی شیعرێکی وت.[٤٣]

---

[٤٣] شرح حیاة الصحابة ١/ ٤٨٨ – ٤٩٠

## ٤٢. ﴿ بەسەر هاتی مەیسەرەی کوڕی مەسروق لە گەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) ﴾

ئەبو نەعیم لە (الدلائل)(١٠٢) دا لە عەبدوڵڵای کوڕی وابیصەی عەبەسی یەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی کە وتوویەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی هێنا بۆ شوێنی بارخستنمان لە میناو ئیمەش لە (جمرە) ی یەکەم کە لە دوای مزگەوتی (خیف)ە وە دێت بارمان خستبوو بەسواری وشترەکەی تەشریفی هێناو زەیدی کوڕی حاریثە شی لەگەڵ بوو ئەوە بوو بانگی کردین دە بەخوا نەهاتین بە دەمیەوە وئەو چاکەیە مان دەست گیرنەبوو دەڵێت : باسی خۆی وبانگەوازەکەیمان لە وەرزی حەجدا بیستبوو تا ئەوە بوو هاتە لای ئێمەش وبانگی کردین وکەس نەچوو بە دەمیەوە ئەو کاتە مەیسەری کوڕی مەسروقی عەبەسیشمان لەگەڵ دا بوو وتی : سوێند بەخوا ئەخۆم ئەگەر لە گەڵ ئەو پیاوەدا راست بکەین وبی بەینەوە لە گەڵ خۆمان داو لە نێوانمان دا بمێنیتەوە ئەوە رای راستە دیسان سوێندیش بەخوا ئەخۆم کە کاری ئەو پیاوە سەردەکەوێ و دەگاتە هەموو شوێنێك خەڵکەکە وتیان

وازمان لێ بێنە تووشی بەزمێکمان مەکە کە توانامان بە سەری دا نەشکێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەمای کردە مەیسەرە بۆ بڕوا هێنان وفەرمایشتی لە گەڵ دا کرد مەیسەرەش وتی : ئای کە قسەکانت جوان و نوورانین بەڵام خزمەکانم بە گوێم ناکەن وپیاویش بە خزمەکانیەوە بەندە ئەگەر ئەوان پشتیوانی لێ نەکەن غەریبە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی بردو خەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ ناو کەس وکاریان لە ڕێی دا مەیسەرەیش وتی با لابد ینە ناوایی فەدەك جوولەکەی لێنە ودەربارەی ئەم پیاوە پرسیاریان لێ دەکەین خەڵکەکە لایان دایە لای جوولەکەکان وئەوانیش بەشێك لە بەشەکانی تەوراتیان دەرهێناو کردیانەوە دەستیان بە دیراسەی باسی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد پێغەمبەری نەخوێندەواری عەرەبی کە سواری ووشتر دەبێت وبە پارچەیەك نان قەناعەت دەکات ونەدرێژە ونەکورت ونە قژی لولە ونە خاو لە چاوانی دا سووریەك تێکەڵی بە سپی بووە جا ئەگەر ئەمەیە ئێوەی بانگ کردووە ئەوا بچن بە دەمیەوە وشوێن دینەکەی بکەون وئیمەش حەسوودی پێ ئەبەین وشوێنیشی نا کەوین ولەچەندین شوێنیش دا بە دەستیەوە تووشی بەڵای گەورە گەورە دەبین عەرەبیش هەر هەموویان یان شوێنی دەکەون یان لەگەڵیدا دەجەنگن جا ئێوە لە مانە بن کە شوێنی دەکەون مەیسەرە وتی : خزمینە ئەم کارە ڕوون وئاشکرایە خەڵکەکە وتیان دەتەوێ بگەڕێینەوە بە

دوای خۆمان دا وبچینە لای ؟ هەموو جارێك دا بەرەو وولآتی خۆیان گەڕانەوە وپیاوە ناودارەکانیان نەیان هێشت بچنە خزمەتی وتاقە کەسێکیان موسڵمان نەبوو کاتێك کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی بۆ مەدینە کردو حەجی ماڵ ئاوایی ئەنجام دا مەیسەرە تووشی بوو وناسی یەوە وتی ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا لەو کاتەوە کە تەشریفت هێنایە ناومان هەتا ئێستە سوور بووم لە سەر شوێن کەوتنت تا ئەوەی کە رووی دا خوای گەورە ویستی وەها بوو موسڵمان بوونم وەك دەیبینی ئاوەها دوا بکەوێ وزۆربەی ئەوانەش کە ئەو کاتە لە گەڵم دا بوون مردن دەبێ شوێنی ئەوانە کوێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی (كل من مات على غير دين الإسلام فهو في النار) واتە هەر کەسێك لە سەر غەیری ئاینی ئیسلام بمرێ لە ئاگردایە، مەیسەر وتی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە رزگاری کردم ئەوە بوو موسڵمان بوو بەڵآم موسڵمان بوونێکی چاك بەرادەیەك کە خاوەنی پایەو سەنگی تایبەتی بوو لەلای ئەبو بەکر –خوای گەورەی لێ ڕازی بێ.

## ٤٣.﴿بە ئافرەتەکەی وت پێغەمبەرێك نێردراوە داوێن پیسی قەدەغەکردوە﴾

جابری کوری عەبدوڵلا –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ یەکەم هەواڵێکی هاتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەدینەدا بڵآو بۆوە ئەوە بوو ئافرەتێك لە شاری مەدینە جنۆکەیەکی هەبوو کە هەواڵی پێ رادەگەیاند جارێکیان بە شێوەی کۆترێکی سپی هات ونیشتەوە لەسەر دیواری ماڵیان ئافرەتەکە پێ وت ئەوە دانابەزیت بۆ لامان تا قسەت لەگەڵ دا بکەین وقسەمان لە گەڵدا بکەیت وهەواڵمان بدەیتێ و هەواڵت بدەینێ ئەویش بە ئافرەتەکەی وت پێغەمبەرێك نێردراوە لە شاری مەککە داوێن پیسی حەرام کردووە ئارامی لە بەر بڕیوین.[٤٥]

---

[٤٤] ( البداية) ٣/ ١٤٥

[٤٥] أخرجة : أبو نعيم في (الدلائل) (٢٩) وحسن إسنادة الشيخ الالباني في صحيح السيرة (٨٣).

## ٤٤. ﴿ ئەیاسی کوڕی مەعاز لە گوێ گرتنی بۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) موسڵمان بوونی پێوە دیاربوو ﴾

وەفدی یایە بەرزانی ئەنصار بۆ یەکەم جار گەیشتنە ناو شاری مەککە ئەم وەفدەش کۆمەڵێك بوون لە کوڕانی ئەوس کە ژمارەیان کەم بوو وە دژایەتی یەکی سەخت هەبوو لە نێوان ئەوان وخەزرەجی یەکانی ژمارە زۆر وخزمانی بەنو قەینوقاع وبەنو نە ضیر و بەنو قوریضە بەلاّم هۆزی ئەوس هاو پەیمانیان نەبوو ئەوانیش بە ناچارانە ڕوویان کردە مەککە بۆ ئەوەی داوای پەیمان بەستن بکەن لە گەڵ قوڕەیش کە یاریدەدەری ئەوس بێت دژ بە خەزرەج بەلاّم خوای گەورە لەو هاو پەیمانیتە چاکتری پێ شکەش کردن ئەویش موسڵمان بوونیان وڕێنموونیان بوو وە ناسینی پێغەمبەری پایەدار(ﷺ)بوو ئەم بەسەر هاتەش (موحەمەدی کوڕی لەبید) دەیگێڕێتەوە ودەڵێ : کاتێ ئەبو لحەسیر ئەنەسی کوڕی ڕافع گەیشتە مەککە لە گەڵ هەندێك لە کوڕانی بەنی عەبدولئە شهەل کە ئەیاسی کوڕی مەعازیان تیادا بوو بۆ ئەوەی پەیمان ببەستن لە گەڵ قوڕەیشدا دژ بە هۆزی خەزرەجی خۆیان پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی گەیشت کە ئەو کۆمەڵە لە مەدینەوە گەیشتونەتە مەککە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) خێرا خۆی گەیاندە ئەو کۆمەڵەو لە گەڵیاندا دانیشت وپێ ی وتن ئایا شتێکی چاکترتان دەوێت لەوەی کە بۆی هاتوون ؟ ووتیان : بەڵێ چی یە ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أنا رسول الله بعثني إلى العباد أن يعبدوا الله ولا يشركوا به شيئا وأنزل علي الكتاب) واتە : من پێغەمبەری خوام وخوای گەورە ناردوومی بۆلای سەرجەم بەندەکانی خۆی کە تەنها ئەو بپەرستن وشەریکی بۆ بڕیارنەدەن وکتێبی بۆ هێناومەتە خوارەوە پاشان دەفەرموویێت ، پێغەمبەر(ﷺ) ئیسلامی بۆ

ڕوون کردنەوە وقورئانی بە سەردا خوێندنەوە ئەیاسی کوڕی مەعاز کە لە هەموویان منداڵ تر بوو وتی: ئەی خزمان وەڵاهی ئەمە چاکترە لەوەی بۆی هاتووین ئەبو لەحەسیریش چنگێك خۆڵی هەڵ گرتوو پرژاندی بە ڕوویدا ووتی: وازمان لێ بهێنە ئەی ئەیاس بەتەمەنم ئێمە بۆ ئەمە نەهاتووین بەڵکو هاتووین بۆ کارێکی تر پاشان ئەیاس بێ دەنگ بوو پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بەجێ ی هێشت ونەوان گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە وتووشی شەری (بعاث) هاتن مەحمودی کوڕی لەبید وتی: ئەو خزمانەی مەعاز لە کاتی سەرەمەرگدا گوێیان لێ بوو کە موعاز هەر ( سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله)

دەووت تا وەفاتی کرد وخزمانیان گومانیان نەبوو لە وەی کە بە موسڵمانی مردووە و ووتیان : ئیمە هەر لە گوێ گرتنەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ)موسڵمان بوونمان پێوە بینیبوە.[٤٦]

---

[٤٦] اخرجة أحمد(٤٢٧) (٢٣٦١٩)وقال محققة: إسنادة حسن، والطبراني الكبير(١٨٠٥)، والحاكم٣/ ١٨٠ وصححة على شرط مسلم، والطبرى٢/ ٣٥٢ والبخاري في التاريخ الكبير ١/ ٤٢٢، والبيهقي في الدلائل٢/ ٤٢٠ وسيرة إبن هشام٢/ ٣٧ قال الهيثمي في مجمع الزوائد٣/ ٣٦ رواة أحمد والطبراني ورجالة رجال ثقات وقال الحافظ في الاصابة١/ ٩١ صحيح وقال الارناؤوط في تحقيق(زاد المعاد) ٣/ ٤٠ سندة حسن رجاله ثقات

## ٤٥.﴿ پیاوێکی جوولەکە وتی: بەخوا ئێوە بەختتان لە دەست داوە ﴾

ئەبو نەعیم ووتویەتی   موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی کەسیر لە ئیبن روومان وعەبدوڵلای کوڕی ئەبو بەکر وغەیری ئەوانیشەوە- خوالێیان رازی بێ- بۆی گێڕاومەتەوە کە ووتویانە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی هات بۆ ناو هەوارگەی کیندە لە بازاڕی عوکاظ دا بەلاّم نەچوو بووە لای هیچ هۆزیکی عەرەب کە ئەوەندەی ئەوان نەرم ونیان بێ کاتێك کە نەرم ونیانی وزمان پاراوی وروو خۆشی ئەوانی بمینی دەستی دایە فەرمایشت لە گەڵیاندا ودەی فەرمود: (أدعوكم إلى الله وحدة لا شريك له وأن تمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم فإن أظهر فأنتم بالخيار)      واته : فەرمووی بانگتان دەکەم بۆ ئیمان هێنان بە خوای تاك وتەنیا وبێ شەریك وخوتان لە هەرچی دەپارێزن منیشی لێ بپارێزن جاك ە سەرکەوتم ئیتر بەویستی خۆتانە زۆربەیان وتیان: ئەم ووتەیە چەند جوانە بەلاّم ئیمە خەریکی پەرستنی ئەو پەرستراوانەین کە باب وباپیرمان دەیان پەرستن ئەو کەسەی کە لە هەر هەموویان بچوك تر بوو هاتە زمان و وتی: خزمینە پێش هەموو کەسێك ئیمان بەو پیاوە بهێنن بەر لەوەی خەڵك پێشتان بکەوێ دە بەخوا ئەهلی کیتاب باسی ئەوە دەکەن کە کاتی نزیك بۆتەوە لە حەرەم دا پێغەمبەرێك روانە بکرێ لە ناو خەڵکەکەدا پیاوێکی یەك چاو هەبوو وتی: تکایە بێ دەنگ بن کابرا عەشیرەتەکەی دەری کردووەو ئێوە جێی دەکەنەوە ئێوە ئەتوانن جەنگی هەر هەموو عەرەب بگرنە ئەستۆ ؟ نانا ئیتر ئەوە بوو بەخەمبارىەوە بەجێی هێشتن وخەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ ناو خزمەکانیان و هەواڵیان دانێ پیاویکی جوولەکە وتی: بەخوا ئێوە بەختتان لە دەست داوە دەڵێت : پەلەبکەن وهەوڵ بدەن بەختی خۆتان دەست بکەوێ تا رێی راست بگرنە بەر دوایین پێغەمبەرە ئەگەر پێش هەموو کەس ئیمان بەم پیاوە بهێنن ئەوا دەبنە سەرداری عەرەب ئێمە لە کتێبەکانمان دا ناوونیشانەکانی دەبینین هەرچی جوولەکەکە سیفەتەکانی هەڵ ئەدات ئەوانەی کە چاویان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتبوو دانیان دەنا بە راستی سیفەتەکانی پاشان جوولەکەکە وتی: ئەبینن کە لە مەککە دەبێتە پێغەمبەرو شوێنی کۆچ کردنیشی خەڵکەکە بە یەك دەنگی هاتنە سەر ئەوە کە ساڵی داهاتو لە حەج دا بێنەوە خزمەتی بەلاّم ئەوە بوو سەردارێکیان لە حەجی ئەو ساڵە دوای خستن ویەك کەسیان حەجیان نەکرد ئەوە بوو پیاوە جولەکەکەش مرد لە سەرە مەرگی دا ئەوەی لێ بیستنرا کە پێغەمبەری بە ڕاست زانیوە وباوەری پێ ئەهێنا.[٤٧]

---

[٤٧] (أخرجة: أبو نعيم في (الدلائل) ١٠٣) الصحيح: ٨/ ٢٣٢)).

## ٤٦. ﴿ مەفروقی کوڕی عەمر کە گوێ بیستی ووتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو ووتی بەخوا ئەمە ووتەی دانیشتوانی زەوی نییە﴾

ئەبو نەعیم لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە—خوایان لێ رازی بێ- کە ووتوویەتی :

گەیشتینە کۆڕێك کە هێمنی و ویقار باڵی کێشابوو بەسەریاو دەبینین پیاوی ریش سپی خاوەن رێز تیایدا دانیشتبوون ئەبو بەکر پێش کەوت وسەلامی کرد ئیمامی عەلی وتی : ئەبو بەکر لە هەموو کاتێکدا پێش دەکەوت ئەبو بەکر پرسیاری لێ کردن ئەم هۆزە کێن ؟ وتیان : ئیمە نەوەی شەیبانی کوڕی ثە علەبەین ئاوڕی دایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: دایك وباوکم بە قوربانت بن کەس نەوەندەی ئەمانە لە ناو قەومەکەیان دا دەستە لأتدار نیە ئەوە بوو مەفروقی کوڕی عەمرو وهانئی کوڕی قەبیصەو موثننای کوڕی حاریثە ونوعمانی کوڕی شەریکیان لە ناودا بوون ونزیك ترین کەسیشیان لە ئەبو بەکرەوە مەفروقی کوڕی عەمر بوو مەفروق بە رەوان بێژی وزمان پاراوی لە پێیش هەموویاندا بوو دوو پەلکەشی هەبوون گەیشتبوونە سەر سنگی ولە دانشتنی کۆرەکەش دا لە هەموویان نزیك تر بوو لە ئەبو بەکرەوە ئەبو بەکر پێی وت : ژمارەتان زۆرە ؟ وتی: لە هەزار کەس زیاترین وهەزاریش لە بەر کەمی ناشکێن فەرمووی : ئەی پارێزگاری لە ناوتان داچۆنە ؟ وتی: لەسەرمان پێویستە توانای خۆمان بەخت بکەین وهەموو کۆمەڵێکیش خۆیان وبەختیان ئەبو بەکر وتی: ئەی جەنگتان لەگەڵ دوژمنتان دا چۆنە ؟ مەفروق وتی: کاتێك کە بە دوژمن دەگەین لە هەموو کەس تووڕەترین وکاتێکیش کە تووڕە دەبین لە هەموو کەس ئازاترین وئیمە ئەسپی تیژمان لە منداڵانمان

وچەکیشمان لە ووشتری گوان پڕ لە شیر خۆشتر دەوێن وسەرکەوتنیش لای خوایە جارێك سەرمان دەخات وجارێکیش ژێرمان دەخات لەوە دەچێ تۆش کاکەی قورەیشی بێت ؟ ئەبو بەکر وتی: ڕەنگە دەنگو باسی پێغەمبەری خواتان(ﷺ) پێ گەیشتبێت ئەمە ئەوە مەفروق وتی: پێمان گەیشتووە کە ئەو شتانە باس دەکات پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا و وتی: کاکی قورەیشی بانگەواز بۆچی دەکەی ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە پێشەوە ودانیشت وئەبو بەکریش هەستایە سەرپێ و بەکەراسەکەی سێبەری بۆ دەکرد پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : (أدعوكم إلى الشهادة أن لا إله إلا الله وحدة لا شريك لة وأني رسول الله وأن تؤوني وتمنعوني وتنصروني حتى أؤدي عن الله تعالى ما امرني بة، فإن قريشا قد تظاهرت على أمر الله وكذبت رسوله واستغنت بالباطل عن الحق والله هو الغني الحميد) واتە فەرمووی بانگتان بۆ ئەوە دەکەم کە شاهێدیی بدەن جگە لە زاتی (الله) هیچ خوایەکی ترنیە وتاك وتەنیا وبێ شەریکەو منیش پێغەمبەری خوام وجێم بکەنەوە وبم پارێزن وکۆمەکیم بکەن هەتا ئەو فەرمانە جێ بەجێ بکە مکە خوا خستوویەتیە ئەستۆم چونکە قورەیش لە دژی فەرمانی خوا یەکیان گرت وپێغەمبەرەکەی ئەویان بە درۆ خستەوە وبە شوێن کەوتنی ناڕەوادا وەهایان دانا کە پێویستیان بە هەق وراستی نیە خوای گەورە خۆی دەوڵەمەندو سوپاس کراوە مەفروق وتی: بۆچی تر بانگەواز دەکەی ئەی کاکی قورەیشی ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتانەی خوێند: (قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْس الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ {١٥١} وَلاَ تَقْرَبُواْ

مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ {١٥٢} وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ {١٥٣}) (الانعام:١٥١-١٥٣)

**واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) بڵێ وەرن با بخوێنمەوە بۆتان ئەوەی پەروەردگارتان یا ساغی کردووە لە سەرتان فەرمانیداوە کە وا هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەش بۆی ولەگەڵ باوك ودایکدا چاك ورەفتار جوان بن ومنداڵەکانتان مەکوژن لەبەر هەژاری ونەبوونی ئێمە ڕۆزی ئێوە وئەوانیش دەدین وە نزیکی گوناه و کردەوە زۆربەدەکان مەکەونەوە ئەوەی کە ئاشکرا دەکرێ لەو خراپانە ئەوەش پەنهان دەکرێ وە ئەو کەسە مەکوژن کە خوا حەرامی کردووە مەگەر هەق بێ بکوژرێتەوە لە تۆڵەدا خوا ئەوانەی بەئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی تێ بگەن وژیری خۆتان بە کاربهێنن ومنزیکیماڵی هەتیوان مەکەونەوە مەگەر بەو شێوەی کە جوانترو چاکتر بێت تا بالغ دەبێت ودەگاتە هێزی خۆی وەپێوانەو کێشانە بێ زیاد وکەم ئەنجام بدە نبە دادگەری داوای ئەرك لە کەس ناکەین مەگەر بەئەندازەی توانای خۆی وەکاتێ بۆ شایەتی دان وشتی تر قسەتان کرد دادوەر وڕاست بن با لە دژی خزمی نزیکی خۆشتان بێت ومبەڵێن وپەیمانی خوا بە چاکی ببەنە سەر خوا ئەو شتانەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە فەرمانی داوە کە بێ گومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست ودروستە کەواتە شوێنی بکەون وشوێنی ڕێچکەکانی تر مەکەون چونکە دوورتان دەخەنەوە ولاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا خوا ئەو شتانەی بۆ ئێوە راسپاردووە بۆ ئەوەی پارێزگار بن  مەفروق وتی: بۆ چی تر**

بانگەواز دەکەی ئەی کاکی قورەیشی ؟ دەبەخوا ئەمە ووتەی دانیشتوانی زەوی نیە چونکە ئەگەر قسەی ئەوان بووایە ئێمە دەمان زانی دیسان پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی بە قورئان خوێندن کردەوە: (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ {٩٠}) النحل

واته : بە راستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەری وبە چاکەو بە بەخشین بە خزم وخوێش وە خوا بەرگری دەکات لە داوێن پیسی وخراپە ودەست درێژی ، ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی پەند وەرگرن وبیر بکەنەوە مەفروق وتی: کاکی قورەیشی بەخوا بانگەوازت بۆ رەوشت بەرزی وکردەوەی چاك کردووە وهەر کۆمەڵێکیش هەوڵیان دابێ بە درۆت بخەنەوە ودژت یەکیان گرتبێ ناهەقی یان کردووە جا پێی خۆش بوو کە هانیئی کوڕی قەبیصەش لە باسەکەدا بەشداری بکات بۆیە وتی : ئەمەش هانیئی کوڕی قەبیصەی ریش سپی وسەرداری دینمانە هانیئ وتی: کاکی قورەیشی وتەکانتم بیستن وتەصدیقیشم کردن بەڵام من وەهای دەبینم کە ئەگەر ئێمە واز لە دینی خۆمان بهێنین وشوێن دینەکەی تۆ بکەوین هەر تەنها بە دانیشتنێکت لە گەڵماندا کە نەبیرێك لە کارەکەت بکەینەوە ونەسەرنجی سەرەنجامی ئەوەش بدەین کە بانگمان دەکەی بۆی ئەوپەڕی بێ سەلیقەیی وکەم ئەقڵی وکورت بینی سەرەنجامە دیارە پێ هەڵکەوتنیش لە پەلەکردن دایە کۆمەڵە خەڵکانێکیشمان بەجێ هێشتوون پێمان ناخۆشە بێ ئەوان هیچ پەیمانێك ببەستین بەڵام وا چاکە تۆ بگەڕێیتەوە و وورد بیتەوە وئیمەش بگەڕێینەوە و ووردبینەوە جا پێی خۆش بوو کە موپەننای کوڕی حاریثە ش لە باسەکەدا بەشداری بکات بۆیە وتی: ئەمەش موثە ننایە کە ریش سپی و فەرماندەی جەنگمانە موثە

نناش وتی: وتەکانتم بیست بە چاکیشم لە قەڵەم دان کاکی قورەیشی ئەوەی کە باست کرد پێی موعجیب بووم و وەڵامیش هەر ئەوەیە کە هانیئی کوڕی قەبیصە دایەوە ئێمە لە وەڵاتی خۆمان دا لە نێوان دوو ئاودا بارمان خستووە کە یەکێکیان یەمامەیە وئەوی کەشیان سەمامەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی : (وما هذان الصيران ؟) فەرمووی : ئەو دوو ئاوە چین ؟ وتی  یەکێکیان بەرزایی یە وشکەکان وزەوی وزاری عەرەبە وئەوی تریشیان زەوی وزاری فارس ورووباری کیسرایە ئێمەش لە لایەن کیسراوە پەیمانمان لێ وەرگیراوە کە هیچ شتێکی تازە دانەهێنین وکۆمەکی هیچ داهێنراویکیش نەکەین ولەوەش دەچێ ئەو کارەی کە تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی پادشایان رقیان لێی بێ جا هەرچی کارێك لە وولأتی عەرەبدا روو بدات ئەوا چاوپۆشی لە تاوانی خاوەنەکەی دەکرێت وبیانووشی لێ وەردەگیرێت بەلأم هەرچی کارێك لە وولأتی فارس دا روو بدات ئەوا چاو پۆشی لە تاوانی خاوەنەکەی ناکرێت وبیانووشی لێ وەرناگیرێت جا ئەگەر بتەوێ لە هەر کارێکدا کە پەیوەندی بە وولأتی عەرەبەوە کۆمەکیت بکەین ئەوا بە سەر چاو ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ما أسألتم الرد إذا سمعتم بالصدق إنه لا يقوم بدين الله إلا من حاطه من جميع جوانبه) واتە: بەخراپ وەڵامتان نەدایەوە بەوەی کە راستیتان دەربڕی بەلأم مەگەر کەسیك بتوانێ دەست بە دینی خواوە بگرێ کەلە هەموو لایەنەکانیەوە دەستی پێوەبگرێ پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستاو دەستی ئەبو بەکری گرت وگەڕانەوە.[٤٨]

---

[٤٨] أخرجه: أبو نعيم في (الدلائل) ص ٩٦) والبداية: ٢/ ١٤٤

## ٤٧.﴿ دوو رۆژی ترم نەدیتن کە لە و دووانە بچن ﴾

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە کە ووتوویەتی: لە گەڵ منداڵان دا رام ئەکردو خەڵکی دەیان وت: موحەمەد هات : هەرام نەکردو هیچم نەدی دیسان دەیان وت : موحەممەد هات ومنیش هەر رام دەکردو هیچم نەئەدی تا ئەوە بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبو بەکری هاوەڵی هاتن ونێمەش لە یەکێك لە کەلاوەکانی مەدینەدا خۆمان حەشاردا دوای ئەوە هەردووکیان پیاوێکی دەشتەکی یان نارد تا یارمەتی دەران لە هاتنیان ئاگادار بکات ئەوە بوو نزیکەی پێنج سەد پیاوی یارمەتی دەران هاتنە پێشوازیان وگەیشتنە لاما نوبە پێغەمبەرو ئەبو بەکریان وت: بە سەلامەتی وگوێڕایەڵی کراوی بفەرموون ئەوە بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵەکەی لە نێوانیان دا هاتن وخەڵکی مەدینەش هەموو هاتنە دەرەوە هەتا گەنجەکانیش بە سەر بانەکانەوە سەیریان دەکردو دەیان وت کامیان ئەوە ؟ تا ئیستە دیمەنی وەهامان و ئەو رۆژەش کە کۆچی دوایی کرد ئاگادار بووم دوو رۆژی ترم نەبینین لەو دوو رۆژە بچن .

## ٤٨. ﴿ پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش موسڵمان بوونیان ناوی دوو دزەکەی گۆڕی بە جووتە ڕێز لێگیراوەکە﴾

ئیمامی ئەحمەد(٤/ ٧٤) لە ئیبن سەعدی ئەسلەمی یەوە کە ئەو سەعدەیە ڕێنیشان دەری کۆچ کردن بووە هێناویەتی کە ئیبن سەعد ووتوویەتی؛ باوکم بۆمی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ ئەبو بەکر (خوای لێ رازی بێ) تەشریف دێنن وئەبو بەکریش کچێکی شیرە خۆری لە لامان بوو پێغەمبەری خواش(ﷺ) دەی ویست ڕێگای مەدینە کورت بکاتەوە ئیبن سەعد وتی: ئەمە ڕێگای غائیرە کە لە رەکووبەوە بۆی ئەچێت ودوو دزی ئەوەی ئەسلەمی لێیە کە پێیان ئەوترێت (المهانان) واتە: جووتە سووکە کە جا ئەگەر بفەرمووی لەلای ئەوانەوە دەرۆین پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی؛ (خذ بنا عليهما) واتە لە لای ئەوانەوە بمان بە سەعد دەڵێ: کەوتینە رێ تا ئەوە بوو لە شوێنێکی بەرزەوە ڕوانیمان بەسەریاندا و یەکێکیان بە هاوڕێ کەی وت: ئەوە کابرای یەمەنی یە پێغەمبەری خواش(ﷺ) بانگی کردن وباسی ئیسلامی بۆکردن وئەوانیش هەردوو کیان موسڵمان بوون پاشان لێی پرسین کە ناویان چیە؟ وتیان؛ ئێمە ناومان (المهانان) ە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بل أنتما المكرمان) واتە: بەڵکو ئێوە جووتە ڕێز لێ گیراوەکەن فەرمانیشی دا لە مەدینە سەری لێ بدەن .

## ٤٩. ﴿ بورەیدەی کوڕی حەصیب بەخۆی و هەشتا ماڵ موسڵمان بوون لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ)﴾

ئیبن سەعد (٤/ ٢٤٢) لە عاصمی کوڕی ئەسلەمیەوە هێناویەتی کە ووتوویەتی : کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککەوە کۆچی بۆ مەدینە کردو گەیشتە غەمیم لەوێ بورەیدەی کوڕی حەصیب لە هەردووك صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتووە کە بورەیدە لە گەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەشداری شازدە غەزای کردووە ولەسەردەمی خەلیفە عوسماندا چووە بۆ غەزای خۆراسان ولەوێوە رووی لە مەرۆناوە ولەوێ نیشتە جێ بووە تا ساڵی شەست و دوو یان سێ لەوێ کۆچی دوایی کردووە ودوا هاوەڵێش بووە کە لە خۆراسان کۆچ بکات جا ئەو بورەیدەیە هاتە خزمەتی وپێغەمبەری خواش(ﷺ) بانگی دەکات بۆ سەر ئیسلام و ئەویش بە خۆی وئەوانەشەوە کە لەگەڵی دا بوون موسڵمان بوون کە نزیکەی هەشتا ماڵ دەبوون ئەوە بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی عیشای بۆ کردن وئەوانیش لە پشتی سەریەوە نوێژەکەیان بەجێ هێنا .

## ٥٠. ﴿پاش ڕێنموونی خوا چەند قسەیەکی جوولەکەکان بۆ هۆکاری موسڵمان بوونیان﴾

لە عاصمی کوڕی عومەرەوە کە ئەویش لە هەندێ پیاوە ڕیش سپیەکانی مامۆستایانی خۆیەوە کە دەڵێن : ئەوەی هانی داین بۆ ئیسلام بوونمان دوای ڕەحمەت وڕێنموونی خوا ئەو قسانە بوو کە دەمان بیست لە جوولەکەکان چونکە ئێمە کەسانێکی موشریك بووین وبتمان دەپەرست بەڵام ئەوان کەسانێکی ئەهلی کیتاب بوون وزانستیان لا بوو ئێمە هەندێ جار ئەگەر زیانمان پێ بگەیاندنایەو یاخود سەریکە وتینایە بەسەریاندا ئەوان پێیان دەووتین نزیکە کاتی هاتنی پێغەمبەرێك وئێمە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا بەوکوشتنەتان دەبەین کە خوای گەورە قەومی عاد وئیرەمی پێ لە ناوبردووە وزۆر جار ئەوهەڕەشەیەمان بەرگوێ دەکەوت لە لایەن ئەوانەوە کاتێ خوای گەورە ، پێغەمبەری (ﷺ) نارد ئێمە دەست پێشخەریمان کرد بۆ باوەڕ هێنان پێی کە بانگی کردین بۆلای خوای گەورە زانیمان ئەو پێغەمبەرەیە کە جوولەکەکان هەڕەشەیان لێدەکردین پێ ی پێش ئەوەی ئەوان خۆیانی پێ بگەیەنن ئێمە خۆمان گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) وباوەڕمان پێ هێناو بەڕاستمان زانی بەڵام جوولەکەکان بێ باوەڕبوون بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) وسەبارەت بە ئێمە وئەوان ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: (وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ {٨٩}) البقره.[٤٩]

واتە : کاتێك کە نامەیەکیان بۆ هات کە قورئان لە لایەن خواوە کە پشتیوانی تەوراتەکەی ئەوانە پەسند کەری ئەو تەوراتەی کە لایانە وەئەوان جوولەکەکان لەو پێش داوای زاڵ بوونیان ئەکرد لە خوا بەسەر ئەوانەی کە بێ بڕوابوون کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەی دەیان ناسی بۆیان هات بێ بڕوابوون پێی کەواتە نەفرینی خوا لە بێ بڕوایان بێ .

[٤٩] أخرجه: إبن إسحاق أنظر(سيرة ابن هشام)(١/ ٢٠٣)وقال الشيخ الألباني في (صحيح السيرة)(ص:٧٥) إسناد صحيح، وقال الشيخ مقيل في (صحيح المسند من أسباب النزول)(ص:٢٦)حديث حسن

## ٥١. ﴿ موصعەبی کوڕی عومەیر لەشاری مەدینەدا ناز ناوی قورئان خوێنی لێ نرابوو ﴾

لە ڕیوایەتی ئیبن ئیسحاق دا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە موصعەب کرد کە قورئان بخوێنێت بۆ خەڵکی مەدینەو ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنێت ولە ئاینی پڕخێرو بەرەکەت و لە پیرۆزی ئیسلام شارەزایان بکات موصعەبیش –خوای گەورە لێی رازی بێ- هەر لە شاری مەدینەدا ناز ناوی قورئان خوێنی لێ نرا بوو ئەویش یەکەم جار چووە لای کوڕانی بەنی غەنەم بۆلای پیاوی پایەبەرز ئەسعەدی کوڕی زورارە لە ماڵی ئەوانەوە بە نهێنیانە خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام تا بانگەوازەکەی بڵاوبۆوە وشوێن کەوتوانی زۆربوون ئەوانیش هەر بەنهێنی بەردەوام بوون تا ڕۆژێك ئەسعەد لەگەڵ موصعەبدا هاتنە لای بیری(مەرق) نزیك بەو شوێنە لە نزیك دارخورماکاندا دانیشت وهەندێ لە خاوەن زەوی موسڵمانی ئەو شوێنەیان بانگ کرد بە نهێنی وکۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ کردن لەو کاتەدا موصعەب قسەی بۆ دەکردن وبەسەر هاتی بۆ دەگێڕانەوە هەواڵی ئەو کۆبوونەوەیە گەیشت بە سەعدی کوڕی موعاز لە ڕیوایەتێکی کەی ئیبن ئیسحاقدا دەڵێت : ئەو ڕۆژ ئەسعەد ونوسەید دوو گەورەی هۆزی خۆیان بوون لە کوڕانی (بنی عبد الاشهل) کە هێشتا هەر موشریك بوون ولە سەر ئاینی خزمانی خۆیان بوون کاتێ کە گوێیان لێ بوو کە یەکێك لە مەککەوە هاتووە وبانگەواز بڵاو دەکاتەوە لەو شارەدا سەعد بە نوسەیدی وت: باوکت لە دەست نەچێت بچۆ بۆلای ئەو دوو پیاوە کە هاتوونە تە ناو ئەو خانوانە بۆ ئەوەی لاوازەکانمان بێ ئەقڵ بکەن بجۆلێیان توورە بیەو داوایان لێ بکە دەست لەوکارە هەڵگرن ونزیکمان مەکەونەوە چونکە تۆ دەزانی کە ئەسعەد

چەند خزمایەتیەکی نزیکی هەیە لەگەڵمداو هەروەها دەزانی کە کوڕی پورمەو من ناتوانم بچم وهەڵ کوتمە سەری ئەگەر وانە بوایە خۆم دەچووم وپێویستی نە دەکرد کەتۆ بچیت ئوسەیدیش ڕمەکەی هەلگرت وبەرەولای ئەوان چوو کاتێ کە ئەسعد لای موصعەب دانیشتبو وبینی وا ئوسەید بەرەو ئەوێ هات بە موصعەبی وت  ئەوە سەرکردەی هۆزەکەی خۆیەتی کەهات بۆلات بەڕاستی ئیسلامی پێ بگەیەنە واتە: زۆر سووربە لەسەر ئەوەی کە ئەم پیاوە لە ئیسلام حاڵی ببێ موصعەبیش-خوای لێ ڕازی بێ- وتی: گەر دانیشت لامان قسەی لەگەڵ دەکەین ئوسەید هات ولایان وەستاو بە توڕەییەوە پێی وتن: چی وای لێ کردوون بێن بۆلای ئێمە تا لاوازەکانمان بێ ئەقڵ بکەن وفریویان بدەن و دوورکەونەوە لێمان ئەگەر خۆتان لا خۆشەویستە موصعەبیش وتی ئەی بۆ دانانیشت گوێ بگریت ئەگەر رزی بویت بە شتێك وەری بگرە وئەگەر پێت ناخۆشە لێت دوور دەخەینەوە ئەویش وتی: بەڕاستی قسەکەت دادپەروەرانەیە ئەنجا ڕمەکەی چەقاندو دانیشت لایان ومەصعەب ئیسلامی تێگەیاندو بۆی ڕوون کردەوە وقورئانی بەسەردا خوێندەوە دوایی مەصعەب وئەسعەد وتیان: وەڵاهی پێش ئەوەی ئوسەید قسە بکات ئێمە ئیسلامەتیمان دەبینی لە ڕوویدا دیار بوو پێش ئەوەی شایەتمان بێنێ چونکە ڕووی زۆرگەش بووە جوان حاڵی ئەبوو وەبەباشی گوێی بۆ گرتبوو بۆ بانگەوازەکە کە بۆمان ڕوون کردەوە لە کۆتایدا وتی: ئەم قسەیەی کە تۆ دەیڵێیت جوانە وزۆرچاکە ئەوەچی دەکەن کە بتانەوێت بچنە ناو ئەم ئاینەوە ؟  هەردوو کیان پێیان وت: دەبێت خۆت بشۆیت وهەردوو جلەکەت پاك وخاوێن بکەیت وپاشان شایەتی بەهەق بدەیت ودوورکات نوێژبکەیت ئەنجا ئەویش هەستاو ئەوانەی جێ بەجێ کردو وتی: پیاوێکم بەجێ هێشتووە لە دوامەوەیە گەر ئەو موسڵمان بێت هیچ کەسێکی ئێرە دواناکەوێت لە موسوڵمان

بوون ومنیش ئێستا دەچم دەیهێنمە لاتان وئەویش سەعدی کوڕی موعازە ئەنجا ڕمەکەی هەڵگرت و چوو بەرەو لای سەعد سەعدیش لەگەڵ خزمانی خۆی دانیشتبوو لەجێگە دانیشتنی خۆیدا کە کاتێ سەعد ئوسەیدی بینی بە ڕمەکەیەوە گەڕایەوە بۆ ئەوەی بە هاو دانیشتوەکانی خۆی وت: سوێند دەخۆم بەخوا ئوسەید هاتەوە لامان وبەو دەم وچاوەی یەکەم جاری کە ڕۆی نەهاتەوە ئوسەید کاتی هاتە لایان و وەستا سەعد پێی وت: چیت کرد ؟ وتی: قسەم لەگەڵ دوو کەسەکە کرد وشتێکی واخراپم لێ نەبینین وداوام لێ کردن کە دەست لەو کارەیان هەڵگرن ئەوانیش وتیان: ئەوەی تۆ پێت خۆشە ئەوە دەکەین بەڵام هەواڵم پێگەیشتوە کە کوڕانی بەنی حاریس هەموو چوون بۆ لای ئەسعەدی کوڕی زورارە بۆ ئەوەی ڕقی تۆی پێ هەڵسینن وپەنای تۆی پێ بشکێنن پاشان سەعد تووڕە بوو هەستا ئەوەك کوڕانی بەنی حاریسە ئەسعەد بکوژن ورمەکەی لە دەست ئوسەید سەندو وتی: وەڵاهی وابزانم هیچ سوودێکت نەبوو پاشان چوو بۆ لایان ونزیك بۆوە وئەسعەدی کوڕی زورارەی کوڕە پووری خۆی بینی لەگەڵیاندا دانیشتبوو وە هیچ ترس وباکیان نەبوو وە هیچ شەڕێك لە ئارادا نەبوو ئینجا بە تووڕەییەوە لای هەردووکیان وەستاو بە ئەسعەدی خزمی خۆی وت: ئەبوو ئومامە وەڵاهی خۆت باش دەزانیت ئەو خزمایەتیەی کە هەیە لە نێوان من وتۆدا گەر ئەوە نەبوایە تۆ وات نەدەکرد بەرامبەر بە من ئەوە بۆچی ئەو تاکە کەسە دەرکراوە وبێ هاوتا وغەریبەت گرتوتە لای خۆت بۆ ئەوەی کەم هۆش ونەزانە کانمان تێك بدات وە دواجار ئێوەش تێك دەدات من وای بە باش دەزانم کە لێ نزیك نەبینەوە ئەنجا بە موصعەبی وت: بۆچی دێیتە ناو خانووەکانمان وشتی ناڕەحەتمان بەرامبەر دەکەیت ؟ پێش ئەوەی سەعد بچێت بۆلات ئەگەر شوێنت کەوێت هیچ کەس لەهۆزەکەی دواناکەوێت لە شوێن کەوتنی بۆ ئاینی ئیسلام موصعەبیش بە سەعدی وت: گوێ

بگرە ئەگەر شتێك تیێ باش بوو ئەوا وەری بگرە وئەگەر شتێك تیێ ناخۆش بوو ئەوا لێتیێ دوور دەخەینەوە سەعد وتی: قسەکەت زۆر داد پەروەرانە بوو ئەنجا ڕمەکەی چەقاندو دانیشت لە لایان وموصعەبیش ئیسلامی پێ ڕاگەیاند ئەسعەد هەندێك نەرم ونیانی بینی لەلایەن سەعدەوە وپێی وت: ئەی پورزام گوێ بگرە لە قسەکەی ئەو وە ئەگەر گوێشت لە شتێکی ڕاست بوو ئەوا ملکەچ وگوێڕایەڵی ببە سەعد بە ئەسعەدی وت: موصعەب چی دەڵێ؟ موصعەبیش سەرەتای سورەتی زخرفی بۆ خوێندەوە کە دەفەرمووێت: ({١} وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ {٢} إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ {٣}) الزخرف

هەردووکیان ووتیان: وەڵاهی ئیسلامە تیمان دەبینی لە ڕووی گەشی سەعدی کوڕی موعاز پێش ئەوەی قسەبکات دوای ئەوەی موصعەب لە قسەکانی تەواو بوو سەعد بە هەردووکیانی ووت: چی دەکەن گەر بتانەوێت موسڵمان ببن بچنە ناو ئەو ئاینەوە ؟ ووتیان: هەستەو خۆت بشۆ وهەردوو بەرگەکەت خاوێن بکە وشایەتی بەهەق بدە ودووڕکات نوێژ بکە ئەویش ئەوانەی جێ بە جێ کرد وپاشان ڕمەکەی هەڵگرت وبەپەلە گەڕایەوە بۆلای قەوم وهۆزەکەی خۆی ئەسعەد دەڵێت : کە گەلەکەی خۆی بینی سەعد ونوسەید گەڕانەوە بۆلایان هەر لەوێ پێش گەیشتنی ئەودووانە بۆلایان ووتیان: سوێند بەخوا سەعد بە ڕوویەکەوە گەڕاوەتەوە بۆلامان لە ڕووی جارانی جیاوازتر بوو کە لێرەوە ڕویشت ئەنجا سەعد هات و وەستا لە لایان وپێی ووتن: کوڕانی عەبدول ئەشهەل قسەی من چۆنە لە ناو تاندا ؟ ئەوانیش ووتیان : تۆ گەورەمانی وبۆچونت لە بۆچوونی هەمووومان چاکترە و تۆ لە هەمووومان گەورەترو بەرزتری: سەعد وتی: گوێ بگرن قسەکردنی نافرەتانتان وپیاوانتان لەسەرم حەرام بێت تا باوەر نەهێنن

بەخواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) وە هەرکەسێك گومانی هەیە لەم ئاینەدا لە بچووك وگەورەتان وە لە پیاوان وئافرەتانتان با شتێکی چاکترمان بۆ بهێنێت لەم ئاینەی کە پێی هاتووە وەڵاهی فەرمان وئاینێك هاتۆتە پێشەوە سبەی ڕۆژ ملەکانی لە سەر هەڵدەکەنرێن عوروە دوڵێ: وەڵاهی ئێوارەی پێ نەچوو تا خانوویەك لە خانووەکانی بەنو عەبدول ئەشهەل نەما چ پیاو وە چ ئافرەت تا هەموویان سەرجەم لە ڕێ ی سەعدەوە- خوای گەورەی لێ ڕازی بێ- موسڵمان بوون وەئەسعەدو موصعەب گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان واتە: بۆ ماڵی ئەسعەدی کوڕی زوورارە پاشان بە ئاشکرا ئیسلامیان دەگەیان بە خەڵکان تا خوای گەورە کەسانێکی زۆری لە سەر دەستی دا ڕێنموونی کرد تا ماڵێك نەما بوو لە ماڵەکانی یارمەتی دەراندا کە کەسانێکی لێ موسڵمان نەبوو بێت بەسەر کردەکانیانەوە وەك: عەمری کوڕی جەموح وە ئەو موسڵمانانەش کەوتنە شکاندنی بتەکان وەکەسانێکی خاوەن دەسەڵات بوون ژمارەیان زۆر بوو لە شاری مەدینە دا.

## ٥٢. ﴿موصعەب بۆ یەکەمین جار نوێژی هەینی کرد لە مەدینە دا﴾

لە ڕیوایەتێکی ئیبن عەبباس دا-خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: خوای گەورە ڕێگای دا بوو بە پێغەمبەر(ﷺ) کە کۆبوونەوەی هەینی جێ بە جێ بکات لە پێش ئەوەدا کۆچ بکات بۆ مەدینە بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) نەیتوانی جومعە بکات لە شاری مەککەدا بۆیە هەواڵی بۆ موصعەب نارد کە لە مەدینەدا بوو وپێی فەرموو تەماشا بکە ئەو ڕۆژەی کە جوولەکەکان بە

[50] (انظر سيرة ابن هشام: رواية إبن إسحاق ٢/ ٤٣(٣١٣)وقال محققه: إسناده صحيح مرسل، والطبري في(التاريخ)٢/ ٣٥٧،والبيهقي في(الدلائل)٢/ ٤٣٠ -٤٧٣

ئاشکرا زەبووری تیادا دەخوێنن ئافرەتان وکوڕانتان لەو ڕۆژەدا کۆبکەنەوە کاتێك کە گەیشتنە نیوە ڕۆو خۆر لایدا ئا لەو کاتەدا دوو ڕکات نوێژ بکەن تا نزیك بنەوە لە خوای گەورە دەڵێت : یەکەم کەسێك کە نوێژی هەینی کرد بێت بۆ خەڵکی پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەدینە موصعەب بوو تا دوا جار پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو خەڵکانی ناو شاری مەدینەی کۆ کردەوە وبە ئاشکرا ئەو نوێژەی ئەنجامدا.[٥١]

## ٥٣. ﴿سەرناکەومە سەربانێك تۆ لە ژێریدا بیت﴾

لە ئەبو ئەیوبەوە- خوای لێ ڕازی بێ- کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی ئەودابەزی پێغەمبەر(ﷺ) لە قاتی خوارەوە نیشتە جێ بوو ئەبو ئەیوبیش لە قاتی سەرەوە شەویك ئەبو ئەیوب بە ئاگا هات و وتی: ئێمە بەسەر سەری پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ها توو چۆو بکەین ؟ چوونە سوچێکەوە ولەوێ ئەو شەوەیان بردە سەر پاشان بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) ووت : خوارەوە ئاسانترە وتی: سەرناکەومە سەربانێك تۆ لە ژێریدا بیت پێغەمبەری خوا(ﷺ) گواستیەوە بۆ قاتی سەرەوە وئەبو ئەیوب هاتە خوارەوە هەموو جارێك خواردنی درووست دەکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەرکە خواردنەکەی بهێنایە بۆی پرسیاری دەکرد لە شوێنی پەنجەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دواتر ئەویش لەجێ پەنجەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەیخوارد جارێکیان خواردنێکی بۆ درووست کرد کە سیری تێدا بو وکاتێ بۆی گەڕایەوە پرسیاری کرد لە جێگە پەنجەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پێی وترا نەیخوارد ئەبو ئەیوب ترساو شڵە ژاو چووە سەرەوە بۆ خزمەتی وعەرزی کرد ئایا حەرامە ؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: نەخێر بەڵکو من خۆشیم لێی نایە ئەویش وتی: منیش خۆشیم نایە لەوەی کە تۆ خۆشت لێی نایە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەحی بۆ هات حەزیشی نەدەکرد کە لەو کاتەدا بۆنی دەمی ناخۆش بێت.[٥٢]

---

[٥١] أخرجه: الدار القطني بإسناد حسن كما قال الشيخ الالباني في(إرواء الغليل٣/ ٦٨ رقم ٦٠٨

[٥٢] پوختەی صەحیحی موسلیم لاپەڕە (٦٦٣).

## ٥٤. ﴿خانووەکەی ئەبو ئەیوب هەرماوە ونزیك مزگەوتی پێغەمبەری خوایە﴾

ئەو خانووەی ئەبو ئەیوب کە ئەو ڕێزو شەرەفەی دەست کەوت دوای کۆچی دوایی خۆی کەوتە دەست (ئەفلح)ی خزمەت گوزاری وموغیرەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حاریسەی کوڕی هیشام لێی کڕی بە هەزار دینار واتە: هەزار مسقاڵ ئاڵتەن ودەستێکی پیادا هێناو ڕێك و پێکی کردەوە وپاشان بە خانەوادەیەکی هەژاری دەست کورتی بەخشی ئەو خانووە ئێستاش هەر ماوە ولە نزیك مزگەوتی پێغەمبەری خوادایە(ﷺ) ومیوانان بۆ بیرەوەری مێژووی پڕ سەروەری موسڵمانان وخزمەت کردنیان سەری لێ دەدەن.

## ٥٥. ﴿جوولەکەکان پەیمانیان دا بەڵام بەڵێنەکەیان نەبردە سەر﴾

جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)و ووتیان: ئەی ئەبا قاسم ئێمە پرسیارت لێ دەکەین سەبارەت بە هەندێ شت ئەگەر وەڵامت داینەوە شوێنت دەکەوین وبەڕاستت دەخەینەوە وباوەڕت پێ دەهێنین ؟ پێغەمبەر(ﷺ) پەیمانی لێ وەرگرتن بەو پەیمانەی کە ئیسرائیل لە (یەعقوب) وەری گرتبوو لە کوڕەکانی ئەوانیش دوای پەیمانەکە ووتیان: ( الله علی ما نقول وکیل) واتە: خوای گەورە وەکیلە لەم پەیمانە ماندا کە ئێمە پابەند دەبین ودەیهێنینە دی یەکەم پرسیاریان ووتیان: پێمان بڵێ نیشانەی پێغەمبەر چی یە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :(تنام عیناه ولا ینام قلبه) واتە: نیشانەی ئەوەیی کە چاوی دەخەوێت ودڵی ناخەوێت ووتیان: ڕاست دەکەیت، پێمان بڵێ سکی ئافرەت هەندیك جار کوڕ

[٥٣] ژیانی ئازیزمان(ﷺ) بەرگی دووەم لاپەڕە(٤٨١).

دەبێت وهەندیك جار کچ دەبێت ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( يلتقي الماأن فإن علا ماء المرأة ماء الرجل أنثت، وإن علا ماء الرجل ماء المرأة أذكرت) واتە: هەردوو ئاوەکە بەیەك دەگەن ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە بەرز بوو بەسەر ئاوی پیاوەکەدا ئەوا کچ دەبێت وئەگەر ئاوی پیاوەکە بەسەر ئاوی ئافرەتەکەدا سەرکەوت وبەرز بوو ئەوا کوڕ دەبێت ووتیان: ڕاست دەکەیت وپێمان بڵێ سەبارەت بە هەوره بروسکە چیە ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ملك من الملائكة الله عز وجل موكل بالسحاب في يده مخلاف من النار يسوق بها السحاب حيث شاء الله) واتە: ئەوە فریشتەیەکە لە فریشتەکانی خوای گەورە کە کاری هەوره بروسکەی پێ سپاردووە وگورزێکی ئاگری بە دەستەوەیە هەورەکان هاتوو چۆ پێ دەکات بۆ ئەو شوێنەی کە خوای گەورە ویستی لێیەتی ووتیان: ئەی ئەو دەنگە چیە کە گوێمان لێیەتی؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زجرة السحاب إذا زجره حتى ينتهي به الى حيث أمر) واتە: ئەوە تووڕەبوونی فریشتەیەکە کە لە هەورەکە توڕە دەبێت ودەیانبات تاکو ئەو شوێنەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە ئەو هەورانە بگەیەنێتە ئەوێ ووتیان: ڕاست دەکەیت، پێمان بڵێ ئیسرائیل واتە: (یەعقوب) ئەو شتانەی کە حەرامی کرد بوولە سەر خۆی چی بوو؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (كان يسكن البدو فأشتكى عرق النساء فلم يجد شيئا يلائمه إلا لحوم الإبل وألبانها فلذلك حرمها ) واتە: ئەو نیشتە جێ لادێ بوو تووشی نەخۆشی (عرق النساو) بوو کە ڕەگێکە لە قاچدا یە و وادەکات ئەو کەسە نەتوانێ بەڕێگادا بڕوات وهیچ شتێکی نەبینی کە پێ ی بکەوێت وپێ ی چاك بێتەوە تەنها گۆشت وشیری ووشتر نەبێت لەبەر ئەوە حەرامی کرد لەسەر خۆی ، ووتیان: ڕاست دەکەیت ئینجا لە کۆتایی قسەکاندا ووتیان : پێمان بڵێ کێ وەحیت بۆ دەهێنی هەر ئەم پرسیارەمان ماوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: جبریل – سەلامی

خوای لێ بێ- ووتیان: ئەو کەسەی کە شەڕو سزادێنێتە خوارەوە ئەوە دوژمنی ئێمەیە گەر بتوتبایە میکائیل کە ڕەحمەت وباران وڕواندنی زەوی بە دەستە ئەوا باوەڕمان پێ دەهێنایت وشوێنت دەکەوتین خوای گەورە سەبارەت بەوان ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێت: ( قُلْ مَن كَانَ عَدُوّاً لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللّهِ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ {٩٧} )البقرة.

واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) پێیان بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیلە با بزانێت کە هەر ئەوجوبرەئیلەیە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بە ڕاست دادەنێت ورێنموونی بۆ چاکە دەکات ومژدە بە ئیمانداران دەدات.[٥٤]

## ٥٦. ﴿ڕووداوێك ڕووی دا لە نێوان ئەبو بەكرو فینحاصی جوولەكەدا﴾

ئیبن ئیسحاق دەیگێڕێتەوە ودەڵێ: ڕۆژێك ئەبو بەكر- خوای لێ ڕازی بێ- چووە (بيت المدارس) واتە: قوتابخانەیەکی جوولەكەكانە کە تەوراتی تیادا دەخوێنن کە ئەبو بەکر چوو بینی کۆمەڵێکیان لە پیاوێکی زانایان کۆبوو نەتەوە کە ناوی فینحاص بوو جگە لەویش یەکێك لە زانایانی تریشیان کە ناوی ئوشیع بوو لەگەڵ یاندا بوو ئەبو بەکر بە فینحاصی وت: لە خوا بترسە موسڵمان بە تۆ دەزانیت کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە(ﷺ) بە هەق هاتووە لە لایەن خواوە ودەیبینیت لە تەوراتی خۆتاندا ناوی هاتووە ؟ فینحاص بە ئەبو بەکری وت: ئەی

---

[٥٤] اخرجه: احمد (١/ ٢٧٤-)٢٤٨٣ وقال محققه الأرناؤوط: حديث حسن، وابن سعد في (الطبقات) (١/ ١١٥) والطيالسي( ٢٧٣١ )والترمذي( ٣١١٧ )والنسائي(٩٠٧٢) والطبري في( التفسير) (١/ ٣٤٢) والطبراني في (الكبير) (١٢٤٢٩) وأبو نعيم في (الحلية) (٤/ ٣٠٤) وقال الهيثمي في (المجمع) (٢/ ٢٤٢) رجاله ثقات، وصححه الشيخ الألباني في صحيح الترمذي (٢٤٩٢) وفي السلسلة الصحيحة (١٨٧٢)

ئەبو بەکر ئێمە هەژار نین بەڵکو خوا هەژارەو پێویستی بە ئێمەیە ئەو جوولەکە نەفام وبێ ئیمانە وتی: ئێمە لە خوا ناپاڕێینەوە خوا لە ئێمە دەپاڕێتەوە وتی: ئێمە پێویستمان بە خوا نیە وخوا پێویستی بە ئێمەیە ئەگەر پێویستی بە ئێمە نەبوایە داوای قەرزی لێ نەدەکردین وەکو موحەمەدی لای ئێوە دەڵێت ؟ ئەبو بەکریش خۆی بۆ نەگیراو کەوتە لێدانی فینحاص ودوایی فینحاص خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەریش(ﷺ) ئەبو بەکری بانگ کردوو پێی وت: چی وای لێ کردیت تا وای لێ بکەیت؟ ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو دوژمنەی خوا قسەی زۆر ناشیرینی دەوت بە خوای گەورە ودەیوت: کە خوا فەقیرە وئێمە دەوڵەمەندین وەمنیش لە پێناوی خوای بەرزو بێ وێنەدا تووڕە بووم ولە فینحاسمدا فینحاص وتی: نەخێر من قسەی وام نەکردووە وهەرگیز شتی وام نەووتووە سەبارەت بەم ڕوداوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (لَّقَدْ سَمِعَ اللّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاء سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ الأَنبِيَاء بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ الْحَرِيقِ {١٨١} ) سورە ال عمران.[٥٥]

واتە: بەڕاستی خوابیستی ووتەی ئەو جوولەکانەی کە ووتیان بێ گومان خوا هەژارە وئێمە دەوڵەمەندین چونکە داوای قەرزمان لێ دەکات ئەوەی کە ووتیان دەینوسین وە دەینوسین کوشتنی ئەوانە بۆ پێغەمبەرەکان بە ناڕەوا وەپێیان دەڵێین بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر .

[٥٥] أخرجة ابن هشام ٢/( ٤٣٧١٥٤ ) والطبري في التفسير(٨٣٠٠) وقال الحافظ في الفتح(٨/ ٢٣١) رواه ابن أبي حاتم وابن منده بإسناد حسن وقال السيوطي في (لباب النقول) ص: (٦٢) إسناده حسن

## ٥٢. ﴿سوێندی خوارد کە لە کتێبەکەیاندا سیفەتی پێغەمبەری تیادا یە﴾

ئەبو صەخوی عەقیلی لە پیاوێك لە پیاوانی ئەعراب دەیگێڕێتەوە ودەڵێت جەڵەبێك ئاژەڵم هێنا بۆ شاری مەدینە لە کاتی ژیانی پێغەمبەر دا(ﷺ) وکاتێ کڕین وفرۆشتنم تەواوکرد وتم: دەبێ بچم بۆلای ئەم پیاوە ولێ ی نزیك ببمەوە وگوێ بگرم لێی ڕۆیشتم پێغەمبەر(ﷺ)بەرەو ڕووم هات وئەبو بەکرو عومەری لەگەڵدا بوو دوای ئەوە ڕۆیشتن ومنیش شوێنیان کەوتم وچوون بۆلای پیاوێکی جوولەکە تەوراتەکەی بلآوکرد بۆوە ودەیخوێندەوە ودڵخۆشی خۆی پێ دەدایەوە سەبارەت بە کوڕێکی جوان چاکی خۆی کە لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە پیاوەکە: ( أنشرك بالذي أنزل التوراة هل تجد في كتابك ذا صفتي ومخرجي ) واتە: سوێندت دەدەم بەو خوایەی کە تەوراتی ناردۆتە خوارەوە ئایە لە کتێبەکەتاندا وەصفی من وجێیگەی کۆچکردنی من دەبینێتەوە تیادا ؟ ئەویش بەسەر ئاماژەی کردو وتی: نەخێر کوڕەکەشی کە لەسەرە مەرگدا بوو وتی: بەڵێ سوێن دبە خوا کە تەوراتی هێناوەتە خوار لە کتێبەکەماندا سیفەتی تۆی تیادایە وسیفەتی مەدینەی تیادایەو منیش شاهێیدی دەدەم کە خوای گەورە تاك وتەنهایەو تۆش پێغەمبەری خوایت(ﷺ) .

ئەنجا کوڕەکە وەفاتی کرد ومرد پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوە فەرمووی: (أقيموا اليهودي عن أخيكم ) واتە: ئەو جوولەکەیە لە براکەی خۆتان دوور بخەنەوە پاشان بە نەریتی ئیسلام شوردراو کفن ودفن کرا پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی لە سەر کرد [٥٦]

---

[٥٦] أخرجه: أحمد في (المسند) (٥/ ٤١١)(٢٣٤٩٢)وابن كثيرفي (السيرة)(١/ ٣٢٣)وقال إسناده جيد وقال في التفسير(٢/ ٢٥١)وقال الشيخ الالباني في الصحيحة(٣٢٦٩) إسناده صحيح

## ٥٨. ﴿پیلانەکەی شاشی کوڕی قەیس سەری نەگرت﴾

جوولەکەکان هەمیشە لە گێڕانی پیلاندا بوون بۆ تێکدانی ڕیزی موسڵمانانی یارمەتیدەران بە تایبەتی وکۆچەران بە گشتی( شاشی کوڕی قەیس) کە جوولەکە بوو ڕۆژێکیان تێپەڕی بەلای کۆمەڵانێکی ئەنصاریدا کە دانیشتبوون وتەبایی وبرایەتی وخۆشەویستی لە نێوانیاندا بوو ئەو خۆی ئەوانی دەناسی کە پێش ئیسلام بوونیان دوژمنی سەر سەختی یەکتر بوون وشەڕی بوعاث ڕوویدا بوو لە نێوانیاندا سەرکردە کانیشیان کوژرا بوون ئێستاش دەبینێت برایەتی وئاشتی وتەبایی هەیە لە نێوانیاندا لە بەر ئەوە زۆری پێ ناخۆش بوو بانگی یەکێك لە جوولەکەکانی کرد کە بچێتە ناویان ودابنیشێت ولە قسەکرد ندا ڕۆژی بوعاپیان بەبیر بهێنێتەوە ئەو شەڕەی کە چاکیان لە یەکتر کوشتوە تیایدا وبۆ ئەوەی ئەو برینەیان بکولێنێتەوە و دیسان هۆزایەتیان تیادا زیندوو بکاتەوە وئاشوبەو شەڕێك لە نێوان ئەوس وخەزرەجدا درووست بکات ئەوە بوو هاوار بەرز بوویەوە لە هەردوو لایەنەکە وخۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕکردن تا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ئاژاوەیەی شاشی کوڕی قەیسی کوژاندەوە وبرایەتی وتەبایی گێڕایەوە ناو ڕیزی ئەوس وخەزرج لە لایەك ولە لایەکی ترەوە لە نێوان کۆچەران ویارمەتی دەران دا.[٥٧]

---

[٥٧] أخرجه : ابن هشام في (السيرة) (٢/ ١٥١) والطبري في التفسير (٧٥٢٤)

## ٥٩. ﴿پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ستایشی یارمەتی دەران دەکات﴾

**ئەوە ڕوون بۆتەوە بۆ هەموو کەسێك یەکەم کەسانێك کە موسڵمان بوون لە خەڵکی مەدینەدا یارمەتی دەران بوون کە ئەوپلە بەرزە وپایەداریە یان دەست کەوت لە دونیاو دوارۆژدا هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ:** (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَداً ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {١٠٠} ) **سوره التوبه.**

**واتە: پێشکەوتووە یەکەمەکان لە کۆچەران و یاریدەران ئەوانەش زۆر بە چاکی پەیڕەوی ئەوانیان کردووە وشوێنیان کەوتوون خوالێیان ڕازیە ئەوانیش لە خوا ڕازین وە خوا بە هەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون کە ڕووبارەکان دێن ودەچن بە ژێریاندا تێیدا دەمێننەوە بێ بڕانەوە ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی گەورە وەهەر وەها قورئان دەفەرمووێ:** (وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ {٩} ) **سوره الحشر.**

**واتە: بۆ ئەو هەژارانەی کە لە پێش کۆچکەراندا نیشتە جێ بوون لە مەدینە وکردیان بە بارەگای باوەڕ ئەوەی کۆچ بکات بۆ لایان خۆشیان دەوێ وە شك نابەن لە دڵی خۆیاندا هیچ جۆرە حەسوودی وبەخیلیەك لە بەر ئەوەی بە کۆچەران دراوە باوی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا با خۆشیان زۆر پێویست بن پێی وە ئەوکەسەی خۆی لە ڕژدی دەروونی بپارێزێت بە ڕاستی هەر ئەوانن سەر فرازان وەپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەگەر لە بەر کۆچکردن نەبوایە من وا خۆم دادەنا کە یەکێکم لە یارمەتی دەران.**[٥٨]

---

[٥٨] ( رواه البخاري والنسائي من حديث أبي هريدة ).

## ٦٠. ﴿دادوەریەکی ڕاست وڕەوای کرد لە نێوان دوو کەسەکەدا﴾

هەر شەش زانای فەرموودە دەگێڕنەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە وتی: زوبەیری کوڕی عەوام گێڕایەوە کە لەگەڵ پیاوێکی ئەنصاری کە بەشداری غەزای بەدری کرد بوو ناکۆکی وکێشەی هەبوو لە گەڵیدا لە سەر ئاوی شیوێك کە هەردوو کیان ئاوی باغیان پێ دە دێرا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی زووبەیر ئاوی باغەکەت بدێرەو پاشان بەرەڵای بکە بۆ دراوسێکەت پیاوە ئەنصاریەکە لەم حوکمە ڕقی هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەبەر ئەوەی کە پووزای خۆتە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) ڕەنگی گۆڕاو فەرمووی زوبەیر ئاوەکەت بدێرە پاشان ئاوەکە بگرە تا جۆگەکان پڕ لە ئاو دەبێت پێغەمبەر(ﷺ) مافی تەواوی ئاودێرانی بە زوبەیر بەخشی بەلأم پێشتر رایەکی نیشان زوبەیردا کە بۆ زوبەیر وئەنصاریەکەش باش بوو جا کاتێ ئەنصاریەکە دەستی لە مافی هەڵدەگرت پێغەمبەریش(ﷺ) مافی تەواوی ئاودێرانی دابە زوبەیر بە بریارێکی روون وبێ پێیچ وپەنا ئینجا عوروە دەڵی : زوبەیر دەڵێت : وادەزانم ئەم ئایەتە لە سەرمن وئەو ئەنصاریەدا بەزی کە خوای گەورە دەفەرموویێت: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً {٦٥}) (النساء ) واتە: سوێن د بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئازەوە ودوو بەرەکی یەکی نێوانیان دا لە پاشان هەست نەکەن لە دەروو نیاندا بە هییچ بێزاری یەك لەو برپارەی تۆ داوتە وملی کەچ نەکەن بە ملکە چیەکی تەواو .

## ٦١ ﴿یەکسەر بڕوایان هێنا بە قورئان وچاویان پڕ بوو لە فرمێسك﴾

ئیبن ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەب وئەبو بەکری کوڕی عبدوڕەحمان وعوروەی کوڕی زوبەیرەوە ووتیان: پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەمری کوڕی ئومەییەی  نارد بۆ لای نەجاشی ونامەیەکی دایە بۆی هەر کە گەیشتە لای نەجاشی نامەکەی خوێندەوە وپاشان ناردی بەدوای جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب سورەتی مەریەمی بە سەردا خوێندەوە یەکسەر بڕوایان هێنا بە قورئان وچاویان پڕ بوو لە فرمێسك ئا ئەمانە ئەوانە بوون کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی لە بارەیانەوە نارده خوارەوە کە دەفەرمووێ: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَاناً وَأَنَّهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُون {٨٢} وَإِذَا سَمِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَى أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ الْحَقِّ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ {٨٣} ) (المائدە ).

واتە : سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لە خۆشەویستی بۆ بڕوا داران ئەوانەن کە دەیان وت، ئێمە گاوورین ئەوەش لە بەر ئەوەیە بێگومان لە ناویاندا قەشە وگۆشە گیرانێك هەن کە بە ڕاستی ئەوانە خۆیان بە زل وگەورە دادەنێن هەر کاتێ گوێیان لێ بوایە ئەو قورئانەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەبینی چاوەکانیان لە فرمێسك پڕ دەبێ ودەڕژێت لە بەر ئەو ڕاستیەی کە زانیویانە وبۆیان دەرکەوتووە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دە تۆش لەگەڵ شایەت دەران ناومان بنوسە .

## ٦٢ ﴿جامە دزراوەکە وەرگێرایەوە لێیـان﴾

بوخاری دەگێریتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە وتی: لە تەمیمی داریەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ( یایها الذین امنوا شهادة بینکم) دەگێڕێتەوە دەڵێ هەموو خەڵك لێ بێ بەری بوو جگە لە من و عەدی کوڕی بەرئا جا ئەوان کە هەردووکیان نەصرانی بوون وهات وچۆی شامیان دەکرد ودەچوون بۆ مەککە وزۆر دەمانەوە وە لەوێ ئینجا لە پاش کۆچ کردن بۆ مەدینە شوێنی بازرگانیەکەیان گواستەوە بۆ مەدینە جارێکیان لەوێ دەرچوون بۆ شام وگەنجێك لە بەنی سەهم لە گەڵیان هات لە شوێنیکدا گەنجەکە مرد کە موسڵمانی تیادا نەبوو وەسیەتی کرد بۆیان کە ئەو ماڵەی پێیەتی بیدەنەوە بە خاوەنەکەی ئەوانیش دایانەوە بەڵام جامێکی زیوی تیابوو هەڵیان گرتوو فرۆشتیان بۆ خۆیان لە پاش سوێند خواردن سوێند دانیان جامەکە لە مەککە دۆزرایەوە ئەوانەی کریبویان لە تەمیم وعەدیمان کڕیوە پاشان دووکەس لە میرات گرانی مردووەکە هاتن وسوێندیان خوار دکە جامەکە هێنی فلاّن مردووە وشایەتەکەی ئێمە ڕاسترە لە شایەتیەکەی ئەوان وئێمە دەست درێژیمان نەکردووە دەفەرمووێ: جامەکە وەرگێرایەوە لێیان .

## ٦٢ ﴿خوای گەورە هەورە بروسکەیەکی بۆناردو سوتاندی﴾

بەززار لە ئەنەسەوە –خوای لێ ڕازی بێ- گێرایەتەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك لە هاوەڵانی نارد بۆلای پیاوێکی گەورە لە بێ باوەڕان تا بانگی بکات بۆ سەر ئاینی ئیسلام پیاوەکەش وتی: ئەو خوایەی تۆ منی بۆلا بانگ دەکەی چیە؟ ئاسنە؟ مسە؟ زیوە؟ ئاڵتونە؟ ئەنەسیش هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وهەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە وپێغەمبەریش جارێکی تر ناردیەوە بۆلای پیاوەکە وبانگی کرد بۆلای خوا ئەویش ووتەکەی پێشووی دووبارەکردەوە ئەنەس گەڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) بۆجاری سێیەم ئەنەسی ناردەوە بۆلای پیاوەکە هەمان ووتەی پێشوی دووبارە کردەوە ئەنجا ئەنەس هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر وهەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە جا خوای گەورە هەورە بروسکەیەکی بۆن نارد ئەو پیاوەی سوتاند پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بە ئەنەس خوای گەورە هەورە بروسکەیەکی نارد بۆ هاوەڵەکەت وسوتاندی ئەنجا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێ: (وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَاءُ وَهُمْ يُجَادِلُونَ فِي اللّهِ وَهُوَ شَدِيدُ الْمِحَالِ {١٣})سورە الرعد.

واتە: پەروەردگا هەورە بروسکەکان دەنێرێ ودەیدات لە هەرکەسێ کە بیەوی لە کاتێکدا ئەوانە دەمە دەمێ دەکەن دەربارەی خوا وئەو خوایە هێزو توانای زۆر بە تینە

## ٦٤. ﴿ڕەبیعە داوای کرد ببێتە هاوڕێ ی پێغەمبەر( ﷺ ) لە بەهەشتدا﴾

ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە ئەبو فیراس ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی- خوای لێ ڕازی بێ- کە خزمەت کاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەڵێ شەو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەمامەوە ئاوی دەست نوێژو پێویستیەکانیم بۆ دەهێنا فەرمووی: داوام لێ بکە؟ وتم: داوات لێ دەکەم هاوڕێت بم لە بەهەشتدا فەرمووی : جگە لەوە داوایەکی ترت هەیە وتم: هەر ئەو داوایەم هەیە فەرمووی : کەواتە تۆش یارمەتیم بدە بە نوێژ کردنی زۆر بۆ ڕاهێنانی نەفست لە سەر عیبادەت .

## ٦٥. ﴿بەسەرهاتی عەرەبە دەشتەکیەکە لەگەڵ پێغەمبەردا( ﷺ )﴾

بوخاری وموسلیم دەگێڕنەوە لە ئەنەسەوە- خوای لێ ڕازی بێ- وتی: من لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەڕۆیشتم پێغەمبەر عەبایەکی نەجرانی قەراغ ئەستوری لە سەر شان بوو عەرەبێکی دەشتەکی پێ ی گەیشت وزۆر بە توندی بووردەکەی ڕاکیشاو منیش سەیری شان وملیم کرد قەراغی بوردەکە سوری کردبۆیەوە بە هۆی توند ڕاکێشانی بوردەکەوە پاشان عەرەبە دەشتەکیەکە وتی: ئەی موحەمەد(ﷺ) فەرمان بکە بەشم بدەن لەو ماڵەی خوا کە لاتە پێغەمبەریش(ﷺ) لای کردەوە بە لایدا وپێکەنی ئینجا فەرمانی دام ماڵی پێ بدەن .

## ٦٦ ﴿خۆزگە ژێر خەرێکی نەرممان بۆ دا نایتایە﴾

ئیمامی ترمذی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سەر حەسیرێك خەوتبوو پاشان لە خەو هەستاو شوێنی قامیش وداری حەسیرەکە بە تەنیشتیەوە دیار بوو ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگە ژێر خەرێکی نەرممان بۆ دانایتایە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: من چیم داوە لە دونیا ومن دونیام بۆ چیە؟ من لە دونیادا تەنها وەك وولاَخ سوارێك وام لە بەر گەرما چووبێتە سێبەری درەختێك وپاش ماوەیەك بڕوات وبە جێ ی بێڵێ .

## ٦٧. ﴿پێغەمبەر( ﷺ ) مۆڵەتی نەدا بە مرثد کە عەناق مارە بکات﴾

ترمذی لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پیاوێك هەبوو ناوی(مرثد بن أبي مرثد) بوو بەندکراوی لە مەککەوە دەگوێزایەوە بۆ مەدینە دەڵێت: لە مەککەدا ئافرەتێکی زیناکار هەبوو ناوی عەناق بوو دۆستی مرپد بوو پێش موسڵمان بوونی مرثد دەڵێ پەیمانم دا بوو بە پیاوێکی گیراو لە مەککە کە رزگاری بکەم دەڵێت: شەوێکی مانگە شەو هاتم بۆ مەککە ولە پاڵ سێبەری دیوارێکدا خۆم شاردەوە لەو کاتەدا عەناق هات وتارمایی سێبەرەکەمی بینی لە نزیك دیوارەکەدا کاتێك کە نزیکم کەوتەوە ناسیمی ووتی: مرپد وتم: بەڵێ مرشد ووتی: سلاَوت لێ بێت وبەخێر بێیت وەرە ئەمشەو لام بمێنەرەوە دەڵێ: منیش وتم ئەی عەناق خوای گەورە داوێن پیسی حەرام کردووە ئەنجا وتی: ئەی خەڵکینە ئەم پیاوە دەیەوێت گیراوەکانتان ببات ورزگاریان بکات مرپد دەڵێت هەشت

کەس شوێنم کەوتن منیش ڕام کرد وبەرەو کێوی خەندەمە ڕۆیشتم تاکو گەیشتمە ئەشکەوتێك وچوومە ناویەوە ئەوانیش هاتن هەتا کو نزیك ئەشکەوتەکە کەوتنەوە بەڵام خوای گەورە چاویانی لە ناستی من کوێرکرد دەڵێت پاشان گەڕانەوە بۆ مەککەو منیش گەرامەوە بۆلای هاوڕێکەم وهەڵم گرت کە پیاوێکی زۆر قورس بوو پاشان هاتم بە دوای یەکێکی تریاندا ودەست وپێوەندەکەیم کردە وە ئەویشم هەلگرت ویارمەتی دام هەتاکو بمباتەوە بۆ مەدینە و چوومە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دومەوێت عەناق بخوازم ومارەی بکەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێدەنگ بوو هیچ وەلامێکی نەدامەوە هەتا کو ئایەتی: (الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ {٣})سوره النور.

واتە: پیاوی زیناکەر مارە ناکات تەنها ئافرەتی زیناکەر وئافرەتی موشریك نەبێ وە ئافرەتی زینا کار مارەی ناکات پیاوی زینا کەر یا پیاوی موشریك نەبێ ئەو مارە کردن وشووکردن بە زینا کەرە قەدەغە کراوە لە سەر ئیمانداران کە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی: ئەی مرپد ئەی خوازیت ومارەی نەکەیت .

## ٦٨. ﴿ بەسەرهاتی ئەو ماڵەی کە پێیان دەوترا ( ئوبەیرق ) ﴾

ترمذی وحاکم لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە دەگێرنەوە کەوتی: ماڵێك هەبوو لە ناو ئێمەدا پێیان دەووترا (ئوبەیرق) بیشرو بەشیر وموبەشەر وبوشەیر پیاوێکی دوو ڕوو بوو شیعری دەووت و هاوەڵانی پێغەمبەری پێ لەکەدار دەکرد هەندێ لە عەرەبەکانیش شیعرەکانی ئەویان دەماو دەم پێ دەکردو دەیان وت: فلانە کەس وای وت: ماڵ وخێزانەکەی بوشەیر لە سەردەمی نەفامی وپاشان ئیسلامیش دا هەر ڕەجاڵ وهەژار بوون تەنها خۆراکیان جۆ وخورمابوو قەتادە دەڵێت ڕیفاعەی کوڕی زەید کە مامی من بوو هەندێ خۆراکی کڕی وخستیە جەوەندەیەکی ئاوەوە کە قەڵغان و شمشێرو چەکیشی تێدا بوو لەژێر خانووەکە دا دزرا بوو جەوەندەکە لە بنەوە کون کرابوو هەرچی چەك وخۆراکی تێیدا بوو برا بو وکاتێك ڕۆژ بوویەوە مامم هات و وتی: برازای خۆم ئەم شەو دزیمان لێ کراوە وجەوەندەکەمان کون کراوە وخۆراك و چەکمان براوە ئێمە ئەو ماڵە گەڕاین وپرسیارمان کرد پێیان ووتین ئەم شەو ماڵی بەنی ئوبەیرق ئاگریان کرد بۆوە لەوانەیە هەندێ لە خۆراکە کەی ئێوە بیت لێیان نابێت چووین پرسیارمان لە بەنی ئوبەیرق کرد ووتیان بەخوا لەوانەیە لەبیدی کوڕی سەهل ماڵی ئێوەی دزی بێت کە ئەو لەبیدە پیاوێکی موسڵمان وچاکەکار بوو لە ناوماندا جا کاتێك کە لەبید ئەم قسەیەی بیست شمشێرەکەی هەڵگرت و وتی: من دزی دەکەم؟ بەخوا یان ئەم شمشێرە تێکەڵاوی لاشەتان دەبێت یان ئەم دزراوە ئاشکرا دەکەن ووتیان: وازمان لێ بێنە تۆ دزنیت جا پرسیارمان کرد دەربارەی ئەو ماڵە تا وای لێ هات گومانمان نەما کە ئەوان دزیویانە مامەم وتی: برازاکەم بەڵکو بڕۆیت بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەمەی بۆباس بکەیت

دەڵێ منیش چووم بۆلای پێغەمبەر وبۆم باس کرد کە بنەماڵەیەکی بێ خێری ناو خۆمان دەست درێژیان کردۆتە سەر مامەم وجەوەندەکەیان کوون کردووە وخۆراك وچەکیان لێ دزیوە با چەکەکە بگەڕێننەوە بەلاّم پیویستمان بە خۆراکەکە نیە پێغەمبەر(ﷺفەرمووی: دواتر لێ ی دەکۆڵمەوە جا کە بەنو ئوبەیرق ئەمەیان بیست هاتن بۆلای پیاوێکی خزمی خۆیان کە ناوی ئوسەیدی کوڕی عوروە بوو لەم بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کردو هەندێ لە پیاوانی بنەماڵەکەیان کۆکردەوە وچوونە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) ووتیان بەڕاستی قەتادەی کوڕی نوعمان ومامەکەی خانەوادەیەکی ناو ئێمە کەماڵێکی موسڵمان و چاکن بە دزی تاوانباریان کردوون بەبێ بەڵگەو دڵنیابوون قەتادە دەڵێت : منیش ڕۆیشتمەوە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ماڵێك تاوانبار دەکەن بە دزی کە باسی چاکەیان دەکرێت وهیچ بەڵگەش بەدەستەوە نیە بۆ تاوانەکە؟ منیش گەڕامەوە بۆلای مامەم وهەواڵەکەم بۆ گێرایەوە وتی: خوا یارمەتی دەرە زۆری پێ نەچوو قورئان دابەزی وفەرمووی: ( إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً {١٠٥} وَاسْتَغْفِرِ اللّهَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً {١٠٦} وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّاناً أَثِيماً {١٠٧} يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لاَ يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطاً {١٠٨} هَاأَنتُمْ هَـؤُلاء جَادَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَمَن يُجَادِلُ اللّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً {١٠٩} وَمَن يَعْمَلْ سُوءاً أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللّهَ يَجِدِ اللّهَ غَفُوراً رَّحِيماً {١١٠} وَمَن يَكْسِبْ إِثْماً فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ وَكَانَ اللّهُ عَلِيماً حَكِيماً {١١١} وَمَن يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْماً ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئاً فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً {١١٢} وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ

عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مُّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلاُّ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيْءٍ وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكَ عَظِيماً {١١٣} (النساء).

واتە: بێگومان ئێمە دانبەزاندۆتە سەر تۆ ئەم قورئانە بە ڕاستی بۆ ئەوەی بڕیاڕ بدەی لە نێوان خەڵکیدا بەو بڕیارەی کە خوا نیشانی داویت وە بۆ ناپاکان مەبە بەپارێزە روداواچی داوای لێ خۆشبوون لە خوا بکە بەراستی خوا لێخۆشبووی بەبەزەیی یە بەرگری مەکە لەوانەی ناپاکی دەکەن دەربارەی خۆیان بێگومان خوا خۆشی ناوێت ئەوانەی کە بەردەوام زۆر ناپاك و گوناهبارن تاوانەکانی خۆیان دەشارنەوە لە خەڵکی لە ترساندا ونایشارنەوە لە خوا شەرم ناکەن لە خوا لە کاتێکدا خوا لە گەڵیاندایە کاتێ بە نهێنی لە شەودا تەکبیردەکەن وقسەیەك دەکەن خوا پیێ ی ڕازی نیە وەخوا هەمیشە زاناو ئاگادارە بەهەر کردەوەیەك کە ئەوان دەیکەن ئیمانداران بێدارین وا ئێوە بەرگریتان لە ناپاکان کرد لە ژیانی دونیادا دەی ئایا کێ بەرگریان لێ دەکات لە سزای خوا لە رۆژی دوایدا یان کێ کاروباریان دەگرێتە دەست وەهەرکەس کردەوەیەکی خراپ بکات یان ستە م لە خۆی بکات پاشان داوای لێ خۆشبوون لە خوا بکات دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە وە هەر کەسێك گوناهێکی گەورەبکات بێگومان زیانی ئەو گوناهە لەسەر خۆیەتی وە خوا هەمیشە زانای کار درووستە وە هەرکەسێك گوناهێك بکات بەهەڵە یان گوناهێك بکات بەقەستی پاشان ئەو تاوانە بخاتە سەر بێ تاوانێك ئەوە بێگومان خستوویەتیە ئەستۆی خۆی سزای بۆهتانێك و تاوانیکی ئاشکرا وە ئەگەر بەخشش وبەزەیی خوا بەسەر تەوە نەبوایە ئەی موحەمەد(ﷺ) بێ گومان دەستەیەك لەو ناپاکانە بەنیاز بوون

کە گومڕات بکەن بەڵام ئەوانە بەس خۆیان گومڕا دەکەن وە ئەوانە هیچ زیانێ ناگەیەنن بە تۆ و خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەرت قورئان ودانایی وە ئەوەی کە نەتدەزانی فێری کردی وە هەمیشە بەخششی خوا بەسەر تۆوە زۆر گەورەیە خائینەکەش ماڵی بەنی ئوبەیریق بوو جا کاتێك قورئان لەم بارەوە دابەزی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەکەکانی گەڕاندەوە بۆ ڕیفاعەو بوشەیریش پەیوەندی کرد بە موشریکەکانەوە وچووە ماڵی سەلافەی کچی سەعد ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە دەربارەی سەلافە کە دەفەرمووێ: (وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيراً {١١٥} (النساء )

واتە: هەرکەسێك دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکات پاش ئەوەی کە ڕێبازی راستی بۆ ڕوون بوویەوە وشوێنی ڕێگایەکی تر بکەوێ بێجگە لە ڕێگەی بڕواداران ڕووی وەردەگێرین بۆ ئەو ڕێبازەی کە هەڵی بژاردووە ودەیخەینە دۆزەخ نای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە .

## ٦٩. ﴿ بەڕاستی خۆشەویستی ڕاستە قینە دەبێ ئاوابێ ﴾

ئیمامی تەبەڕانی دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە- خوای لێ رازی بێ- دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خۆم و کوڕەکەم وماڵ ومنداڵم زیاتر تۆم خۆش دەوێ هەندێ جار لە ماڵی خۆمدا بیرت دەکەم وئارام ناگرم تا دێم سەیرت دەکەم وکاتێکیش بیر لە مردنی خۆم وتۆ دەکەمەوە دەزانم کە تۆ چوویتە بەهەشت پلەو جێگەت بەرز دەکرێتەوە لە گەڵ پێغەمبەراندا منیش ئەگەر بچمە بەهەشت دەترسم نەتبینم پێغەمبەریش(ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە تا جوبرەئیل بەم ئایەتەوە دابەزی: ( وَمَن يُطِعِ

اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً {٦٩}) (النساء)

واتە: هەرکەسێك گویڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا بەهرەی ڕشتووە بە سەریاندا لە پێغەمبەران وڕاستگۆیان وشەهیدان وپیاو چاکان وە ئەوانە چ هاوڕێ وهاوەڵێکی چاکن.

## ٧٠. ﴿خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەستیان هەڵگرت لە داواکاریەکەیان﴾

ئیمامی موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی جابیرەوە دەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی: ئەبو بەکر ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) داوای مۆڵەتی کرد بچێتە ژورەوە بینی خەڵك لەبەر دەرگا کەیدا دانیشتوون مۆڵەت بە هیچ کەسێکیان نەدراوە بۆ چوونە ژورەوە وتی: مۆڵەت درا بە ئەبو بەکر وڕۆیشتە ژورەوە پاشان عومەر هات مۆڵەتی چوونە ژورەوەی خواست ئەویش مۆڵەتی پێ درا بینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانیشتووە وخێزانەکانیشی بە خەفەتباری وبەبێ دەنگی بە دەوریدا دانیشتبوون پاشان عومەر وتی: سوێند بە خوا قسەیەك دەکەم پێغەمبەر(ﷺ) پێ بکەنی وتی: خۆزگە ئەی پێغەمبەری خوا چاوت لێ بوایە خێزانم داوای نەفەقەی لێ دەکردم منیش هەڵسامەوە بۆی ودام بە گەردنیدا پێغەمبەر(ﷺ) پێ کەنی وتی: ئەم هاوسەرانەی منیش کە دەیان بینی بە دەوری مندان داوای نەفەقەم لێ دەکەن ئەبو بەکر هەستا بۆ عائیشە ماڵی بە گەردنیدا هەروەها عومەریش ماڵی بە گەردنی حەفصەداو هەردووکیان دەیان وت: پێیان داوای شتێك دەکەن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە نییەتی؟ ئەوانیش ووتیان سوێند بەخوا هەرگیز داوای شتێك ناکەین لە پێغەمبەر(ﷺ) کە نەی بێت

پاشان مانگێك یان بیست و نۆ ڕۆژ دوورکەوتەوە لێیان وجێی لێ جیا کردنەوە جا ئەم ئایەتەی بۆ هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً {٢٨} وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً {٢٩} الاحزاب .

واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە خێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دنیاو ڕازاوەی ئەوتان دەوێ هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم موتعە پارەو شتومەکێکە دەدرێتە ئافرەتی تەڵاق دراو وەتەڵاقتان بدەم بە تەڵاق دانێکی چاك وبێ زیان وەئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی وپاداشتی ڕۆژی دوایی تان دەوێ ئەوە بێگومان خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکەکاران لە ئێوە پاداشتێکی گەورە جابیر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە عائیشەوە دەستی پێ کرد وفەرمووی: ئەی عائیشە دەمەوێت کارێك بخەمە بەردەستت پێم خۆشە پەلەی تێدا نەکەیت هەتا پرس وڕا بە باوك ودایکت دەکەیت؟ عائیشەش وتی: ئەو کارە چیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەبەر (ﷺ) ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە پرس وڕا بە باوك ودایکم بکەم نەخێر واناکەم بەڵکو خواو پێغەمبەرەکەی وپاداشتی دوا ڕۆژ هەڵدەبژێرم وە داوات لێ دەکەم ئەم قسەی من کردم بە هییچ کام لە خیزانەکانت نەڵێیت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر ئافرەتێك لەوان پرسیارم لێ بکات پێ ی دەڵێم کە خوا منی بە ناڕەحەت کارو ناڕەحەت هێنە رنە ناردووە بەڵکو بە فێرکار وئاسانکار ناردوومی.

## ٧١. ﴿ جوولەکەکان وەڵامی پێغەمبەریان پێ نەدرایەوە ﴾

ئیمامی ئەحمەد گێڕایەوە لە عەوفی کوڕی مالیکەوە –خوای لێ رازی بێ- دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستاو ڕۆیشت منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم ڕۆیشتین تا چووینە ناو کەنیسەی جوولەکەکان لە مەدینە لەو ڕۆژەشدا جەژنی ئەوان بوولە بەر ئەوە ئەو ڕۆیشتنەی ئێمەیان پێ ناخۆش بوو بۆ ناویان ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێیانی فەرموو: ئەی خێڵی جوولەکە لە ناو خۆتاندا دوانزە پیاوم نیشان بدەن شایەتی بدەن کە هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە خوا وەشایەتی بدەن کە موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە خوای گەورە ئەو خەشم وغەزەبەی کە لە جوولەکەی گرتووە هەڵی دەگرێ لە سەر هەموو جوولەکەیەك کە لە ژێر چەتری ئاسماندا بێت جا جوولەکەکان بێ دەنگ بوون کەسیان وەڵامی پێغەمبەریان نەدایەوە پاشان سێ بارەی کردەوە لێیان هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە جا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی لە ئێوەم ویست نەتان کرد دەی سوێند بەخوا بێگومان هەر من کۆکەرەوەم کە هەموو خەڵك لە بەر پێم دا جەشر دەکرێت وە من کۆتا پێغەمبەرم منیشم پێغەمبەری هەڵبژاردە لای خوا باوەڕم پێ بێنن یان باوەڕم پێ نەهێنن پاشان گەڕایەوە ومنیش لەگەڵیدا بووم خەریك بوو دەرۆیشتینە دەرەوە لە کەنیسەکە پیاوێك کە لە دوامانەوە بوو بانگی کردو وتی: لە شوێنی خۆت ڕاوەستە ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەنجا هاتە پێشەوە وتی: ئەی خێڵی جوولەکە من بە پیاوێکی چۆن دەناسن ئەوانیش ووتیان سوێند بە خوا لە ناو ئێمەدا کەس نیە لە تۆ شارەزاتر وتێگەیشتوو تربێت بە کتێبی خوا بە هەمان شێوە باوکیشت پێش تۆ و باپیریشت پێش باوکت لە هەموو مان شارەزاتر بوون بە کتێبی خوا وتی: دەی من شایەتی

دەدەم کە بێگومان ئەم موحەممەدە ئەو پێغەمبەرەیە کە لە تەورات دا ناوی هاتووە ودەیخوێننەوە جوولەکەکان ووتیان: درۆ دەکەیت وڕاست نی یە وبەرپەرچیان دایەوە وقسەی ناشرین وخراپیان پێ وت پێغەمبەری خواش(ﷺ) فەرمووی: ئێوە درۆدەکەن هیچ قسەیەکیشتان لێ وەرناگیرێت چونکە کەمێك لەمەو پێش ئەوەتان وت دەربارەی چاکی ئەو وکەووتتان بەڵام کە باوەڕی هێناو موسڵمان بوو بە درۆزنتان لە قەڵەم دا ئەو قسە نابە جێیانەتان پێ وت کە پێتان وت بۆیە قسەی ئێوە دەربارەی ئەو وەرناگیرێ جا هەرسێکمان پێغەمبەری خوا(ﷺ) و من وعەبدوڵڵای کوڕی سەلام چووینە دەرەوە بەو هۆیەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ {١٠} الاحقاف

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ پێم بڵێن ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن خواوە بێ ئێوەش باوەڕتان پێ نەهێنابێ وەکەسێك لە نەوەی ئیسرائیل شایەتی دابێ لەسەر وێنەی ئەوەی وا لە قورئاندا جا ئیمانی هێنا بێ کەچی ئێوە خۆتان بە گەورە زانی بێگومان خوا ڕێنموونی گەلی ستەمکاران ناکات .

## ٧٢. ﴿بەسەر هاتی پیاوە چاو شینەکە کە چاوەکانی وەك چاوی شەیتان بوو﴾

ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتەوە لە عەبدەڵلای کوڕی عەبباسەوە- خوای لێ ڕازی بێ- وتی؛ پێغەمبەر(ﷺ) وچەند موسڵمانێکی هاوەڵی لە سێبەری ماڵێك لە ماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوون کەسێبەرەکە هەر ئەوەندە بوو تیادا جێیان بوو بوویەوە فەرمووی؛ تۆزێکی تر کەسێك دێتە ناوتان چاوەکانی کە پێیان دەبینێ دەڵێی چاوی شەیتانە جا کە هات کەستان قسەی لەگەڵدا نەکەن پاشان پیاوێکی چاوشین هات پێغەمبەریش(ﷺ) بانگی کردو قسەی لەگەڵدا کرد فەرمووی: لە بەر چی تۆو فلاّن کەس وفلاّن کەس چەند کەسێکی ناو هێنا جنێوم پێ دەدەن ئەو پیاوەش ڕۆشت وئەو کەسانەی بانگ کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) ناوی هێنان جا دەستیان کرد بە سوێند خواردن وپاکانە کردن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئیتر خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێ: (يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعاً فَيَحْلِفُونَ لَهُ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَى شَيْءٍ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْكَاذِبُونَ {١٨} ) المجادله.

واتە : لە ڕۆژێکدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە ئەوسا سوێندی بۆ دەخۆن هەرچۆنێ سوێندیان دەخوارد بۆ ئێوە لە دنیادا وە وادەزانن شتێکیان بە دەستەوەیە با بزان ئەبە ڕاستی هەر ئەوانن درۆزن .

## ٧٣. ﴿ رووخساری پێغەمبەر( ﷺ ) گەشایەوە وەك ئەوەی زێڕ پۆش بێت ﴾

موسلیم ونەسائی وجگە لە وانی ش لە جەریرەوە –خوای لێ ڕازی بێ – هێناویانە دەڵێت: لەنیوەی ڕۆژدا لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووین وخەڵکێکی بێ بەرگی پێ پەتی هاتن بۆلای شمشێریان لە دەست بوو زۆربەیان بەڵکو هەموویان لە موزەر بوون پێغەمبەر(ﷺ) ڕەنگی گۆڕا کاتێك ئەو سەختیەی ئەمانی بینی چوویە ژورەوە ودواتر هاتە دەرەوە وفەرمانی کرد بە بیلال تا بانگی داو نوێژی کرد و دواتر ووتاری خوێندەوە، دوایی فەرمووی: با هەر کەس بە دیناری بە درهەمی بە جلی بە مشتی ببەخشێ بە مشتێ خورمای تافەرمووی: بە لەتە خورمایەکیش ببەخشێت یەکێك لە پشتیوانان مشتێك زیاتری هێنا پاشان خەڵکی بە دوایدا هاتن تا ئەوەی دوو بەشە خواردن وجلم دی تا ئەوەی دەبینم ڕووخساری پێغەمبەر(ﷺ) دەگەشایەوە وەك ئەوەی زێڕ پۆش بێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەر کەس لە ئیسلامدا سوونەتێك دابنێت پاداشتی خۆی و ئەوەی هەیە کە کاری پێدەکات لە دوای خۆی بە بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوانیش کەم بکات هەرکەسیش لە ئیسلامدا شتێکی خراپ دابنێت تاوانی خۆی وئەوەشی لە سەرە کە لە دوای خۆی دەیکات بە بێ ئەوەی لە تاوانی ئەوانیش کەم بکات .

## ٧٤. ﴿ خێزانەکەی وتی فرۆشتنەکەت بە قازانجە ﴾

ئەحمەد وبەغەوی وحاکم لە ئەنەسەوە هێناویانە کابرایەك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فلان کەس دار خورمایەکی هەیە ومنیش دیوارەکەم لایەتی دەی پێی بڵێ تا بەشم بدات پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: (اعطه إياها بنخلة في الجنة) واتە: بەرامبەر بە دار خورمایەکی بەهەشت بیدەرێ بەلام کەسەکە نامادە نەبوو ئەبو دەحداح هات ووتی: ئەو دار خورمایەم پێ بفرۆشە بەرامبەر حەوشەکەم ئەویش ڕازی بوو ئەنجا ئەبو دەحداح هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دار خورماکەم لێ کڕی دەی بیدە پێی من داومە بە تۆ فەرمووی: (كم من عذق راح لابي الدحداح في الجنة) واتە: چەند دار خورمای پڕ بەر لە بەهەشتدا بۆ ئەبو دەحداح دانراون چەند جارێك فەرمووی پاشان ئەبو دەحداح چوو بۆلای ژنەکەی ووتی: ئەی ئوم دەحداح لەو حەوشە بڕۆ دەرێ فرۆشتوومە بە دار خورمایەکەی بەهەشت ئەویش وتی: فرۆشتنێکی بە قازانجە یان شتێکی لەو جۆرەی وت.[٥٩]

[٥٩] (صحيح لە الإصابة ج٤ ص ٥٩ دا وا هاتووە هەیسەمی ج٩ ص ٣٢٤ دەڵێت: ئەحمەد وتەبەرانی بە سەنەدی صحيح هێناویانە.

## ٧٥. ﴿ برسیەتی بە ڕووخساری پێغەمبەرەوە( ﷺ ) دیار بوو ﴾

بوخاری لە ئەبو مەسعودی ئەنساریەوە هێناویەتی دەڵێت یەکێك لە پشتیوانان هەبوو پێی دەوترا ئەبو شوعەیب غولامێکی قەڵەی هەبوو وتی: خواردنیکم بۆ ئامادە بکە تا پێغەمبەر(ﷺ)وپێنج کەس بانگ بکەم یەکێك شوێنیان کەوت پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی : تۆ ئێمە ئەم پێنجەت بانگکردوو ئەمەش کابرایەکە شوێنمان کەوتووە ئەگەر دەتەوێت مۆڵەتی بدە ئەگەریش دەتەوێت وەری مەگرە وتی مۆڵەتم داوە.

ئیمامی موسلیم ( ج٢ ص١٧٧ ) لە ئەبو مەسعوودەوە بەو جۆرە هێناویەتی پێغەمبەری(ﷺ) بینی وبرسیەتی لە ڕووخساریدا بە دیکرد بە غولامەکەی وت: قوڕ بەسەر خواردنێیکمان بۆ ئامادە بکە بۆ پێنج کەس .

## ٧٦. ﴿ پێغەمبەر( ﷺ ) راوێژی کرد بە جبریل سەلامی خوای لێ بێ ﴾

یەعقوبی کوڕی سوفیان لە عەبباسەوە- خوای لێ ڕازی بێ – هێناویەتی دەڵێت خوای گەورە یەکێك لە فریشتەکانی لە گەڵ جبریل (سلامی خوای لێ بێ) نارد بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) فریشتەکە بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: خوای گەورە سەرپشکت دەکات لە نیوان ئەوەی بەندەیەکی پێغەمبەر بێت یان پادشایەکی پێغەمبەر بێت پێغەمبەر(ﷺ) لایکردەوە بەلای جبریلدا وەك ئەوەی ڕاویژی پێ بکات ئەویش ئاماژەی بۆ کرد کە خاکی بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەڵکو بەندەیەکی پێغەمبەرم دوای ئەو قسە بە پاڵدانەوە نانێکی تەواوی نەخوارد تا ئەو کاتەی گەڕایەوە لای خوای گەورە.[٦٠]

---

[٦٠] بوخاری لە(التاریخ) ونەسائیش هێناویانە هەروەها لە(البدایە)و(النهایە)ج٦ ص٤٨دا هاتووە.

## ٧٧. ﴿ لە ماڵی پشتیوانان کەس هێندەی ماڵی ئەبوسەعید دەوڵەمەند نەبوو ﴾

ئیبن جەریر لە ئەبوسەعیدەوە هێناویەتی ڕۆژێك بەیانی کردەوە ولەتاو برسیەتی بەردێکی لەسەر سکی دانابوو ژنەکەی یان کەنیزە کەکەی پێی وت: بڕۆ بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وداوای لێبکە فلان کەس چوو بۆلای وداوای لێکرد وپێیدا منیش چووم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ووتاری دەخوێندەوە بەو فەرمایشتەی گەیشتم کە دەیفەرموو: ئەوەی دەوڵەمەندی بوێ وداوانەکات خوا دەوڵەمەندی دەکات کێ خۆی بگرێت خوا دەچێت بە هانایەوە وئاگای لێیە هەر کەس داو الە ئێمە بکات یان پێی دەدەین یان سۆزو بەدەمەوە چوونمان بۆی دەبێت ئەبو حەمزە گومانی هەبوو هەرکەس لە ئێمە داوانەکات لامان خۆشەویسترە لەوەی داوامان لا دەکات دەڵێت منیش گەڕامەوە وداوای هیچم لێ نەکرد دواتر خوا بەردەوام ڕۆزی بۆ دەناردین تا ئەوەی بڕوام وابوو کەس لە ماڵی پشتیوانان هێندەی ئێمە دەوڵەمەند نەبوو.[٦١]

## ٧٨. ﴿ پا بەندبوونی سەوبان بە ووتە پیرۆزەکەی پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

ئەحمەد ونەسائی وئیبن ماجە وئەبو داود بە سەنەدی صەحیح لە سەوبانەوە هێناویانە دەڵێت : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من يكفل لي أن لا يسأل الناس شيئا أتكفل له بالجنة) واتە: کێ زامنی ئەوەم بۆ دەکات داوای هیچ لە کەس نەکات زامنی بەهەشتی بۆ دەکەم من وتم: من ئیدی داوای هیچ لە کەس ناکەم ئیبن ماجە وا هێناویەتی دەڵێت: داوای هیچ لە خەڵك مەکە سەوبان جار هەبوو قامچیەکەی لە سەر وولاخەکەی دەکەوت بە کەسی نەدەوت بیدەرەوە دەستم دادەبەزی و هەڵیدەگرتەوە.[٦٢]

---

[٦١] لە كنز العمال ج٣ ص٣٢٢ دا واهاتووە .

[٦٢] لە الترغيب والترهيب ج٢ ص١٠١ دا واهاتووە.

## ٧٩.﴿پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی كرد ڕاخەرەكە بگێڕنەوە بۆ ئافرەتەكە﴾

بەیهەقی لە عائیشەوە-خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێكی پشتیوانان هات بۆلام سەیری ڕاخەرەكەی پێغەمبەری(ﷺ) كرد كە قەیفەیەك بوو ڕاخەرێكی بۆناردم وپێغەمبەر(ﷺ) هاتە ژورەوە بۆلام وفەرمووی: ئەی عایشە ئەمە چیە ؟ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا فلاّنە ئافرەت هات وڕاخەرەكەی تۆی بینی وچوو ئەمەی بۆناردم فەرمووی: بیگێڕەوە عائیشە سوێند بە خوا ئەگەر بمویستایە خوای گەورە شاخی زێڕو زیوی پێدەدام.[٦٣]

## ٨٠. ﴿ ئەبو جوحەیفە تا مرد تێری سكی نانی نەخوارد ﴾

تەبەرانی لە ئەبو جوحەیفەوە هێناویەتی دەڵێت : كولێرەیەكم بە گۆشتێكی چاكەوە خواردو هاتم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ونزگەرەم هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أكفف عنا جشاءك أبا جحيفة فإن أكثر الناس شبعا في الدنيا أطولهم جوعا يوم القيامة ).

واتە: ئەبو جوحەیفە نزگەرەكەتمان لێ بە دوور بگرە چونكە ئەو كەسانەی كە لە دنیادا زیاتر تێرن لە ڕۆژی دواییدا برسیەتیان دوور ودرێژترە دوای ئەوە ئەبو جوحەیفە تا مرد تێری سكی نانی نەخوارد نانی بەیانی بخواردایە نانی شەوی نەدەخوارد یان نانی شەوی بخواردایە نانی بەیانی نەدەخوارد.[٦٤]

---

[٦٣] (حديث حسن) ئەبو شیخ بە دوورو درێژ تر لەوە هێناوویەتی لە (الترغيب والترهيب) ج٥ ص١٦٢ دا واهاتووە).

[٦٤] هەیسەمی ج٥ ص٣١ دەڵێت: تەبەرانی لە دوو موعجەمی وسط وكبیر دا بە چەند سەنەدێك لە سەنەدەكانی (المعجم الكبير) دا موحەممەدی كوڕی خالیدی كووفی هەیە كە نایناسم كەسەكانی دیكەی جێ متمانەن، ئیبنُ عەبدولبیر لە (الاستيعاب) ج٤ ص٣٧ بەو جۆرە هێناویەتی بەزار بە دوو سەنەد بە كورتی بەو جۆرە هێناویەتی وكەسەكانی هەردوو سەنەدەكە جێ ی متمانەن .

هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٢ وا دەڵێت: ئەبو نەعیم لە (الحلية) ج٧ ص٢٥٦ لە ئەبو جوحەیفەوە بەو واتایە هێناویەتی ولەوێوە كە دەڵێت نانی نەخوارد تا كۆتای فەرموودەكەی نەهێناوە .

## ٨١.﴿ هاوەڵان بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر( ﷺ )زۆر دڵخۆش بوون ﴾

بوخاری وموسلیم لە ئەنەسەوە هێناویانە کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردووە ؟ وتی: هیچ بەڵام خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێت فەرمووی : تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت ئەنەس وتی: بە هیچ شتێك دڵخۆش نەبووین هێندەی بەو قسەی پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆش بووین کە فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت ئەنەس دەڵێت: من پێغەمبەری خوا(ﷺ) وئەبو بەکرو عومەرم خۆش دەوێت وهیوادارم بە خۆشە ویستیم بۆیان لە گەڵیان بم لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا کەسێکی لادێ نشین هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژی دوای کەی دێت؟ فەرمووی: هاوار بۆت چیت بۆ ئامادە کردووە؟ وتی: هیچم بۆ ئامادە نەکردوە جگە لەوەی خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێت فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوە دایت کە خۆشت دەوێت وتی: ئێمە واین؟ فەرمووی: بەڵێ ئێمەش ئەو ڕۆژە زۆر خۆشحاڵ بووین.

## ٨٢.﴿بەسەر هاتی زەمامی کوڕی سەعلەبە لە خزمەت پێغەمبەری خودا( ﷺ ) ﴾

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە-خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی دەڵێت: بەنو سەعیدی کوڕی بەکر زەمامی کوڕی سەعلەبەیان نارد بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش چوو بۆلای و ووشترەکەی لە بەردەم دەرگای مزگەوتدا بە جێهێشت دوایی بەستیەوە وچوویە مزگەوتەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو زەمام کەسێکی قژ درێژی خاوەن پرچ بوو کە دوو پرچی هەبوو هات تا لە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ)و لە بەردەم هاوەڵانیدا وستاو وتی: کامتان کوڕی عەبدول موتەلیبە؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: من ئەوم وتی: موحەمەد فەرمووی: بەڵێ ، وتی: ئەی کوڕی عەبدول موتەلیب من لە مەسەلەیکدا پرسیارت لێ دەکەم ولێت تووڕەم دەی

ووریای خۆت بە ئەویش فەرمووی: هیچ لە خۆمدا شك نابەم دەی پرسیار لە سەر ئەوە بکە کە وای دەبینیت ئەویش وتی: بۆ خاتری خوای تۆو خوای ئەوانەی پێشووت وئەوانەی دواتریشت ئایا خوا تۆی بە پێغەمبەری ناردووە بۆ ئێمە؟ فەرمووی: ئەرێ بەخوا وتی: دەی بۆ خاتری خوای خۆت وئەوانەی پێش تۆو دوای تۆ خوا فەرمانی پێ کردوویت تا فەرمانمان پێ بکەیت بە تەنها ئەو بپەرستین وهیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێین وواز لەو بتانە بهێنین کە باب وباپیرانمان پەرەستویانن؟ فەرمووی: ئەرێ بەخوا وتی: سوێندت دەدەم بە خوای خۆت وئەوانەی پێش خۆت ودوای خۆت خوا فەرمانی پێ کردوویت تا ئەو پێنج نوێژە بکەیت؟ فەرمووی: بەڵێ پاشان فەرزەکانی ئیسلامی ناو هێنا فەرزی زەکات ورۆژو حەج وشەریعەتەکانی ئیسلام ولە هەر کامیاندا سوێندی دەدا تا لە هەموویان بوویەوە وتی: دەی شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایەو ئەو فەرزانە بەجێ دەگەیەنم دوور دەکەومەوە لەوەی دوورە پەرێزیت لێ کردوون ئیتر زیادو کەمی تیادا ناکەم پاشان گەڕایەوە بەرەولای ووشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: (إن صدق ذو العقيصتين دخل الجنة) واتە: ئەگەر خاوەن دوو پرچ راست بکات دەچێتە بەهەشتەوە ئینجا ڕشمەی ولاخەکەی کردەوە وگرتی وچوویەوە بۆ ناو هۆزەکەی وهەموویان لە دەوری کۆبوونەوە یەکەم قسە کردی ئەوە بوو : ئای لە خراپی وپیسی لات وعوززا ئەوانیش ووتیان وس بە زەمام لە نەخۆشی پێشت بترسە کە تووشت نەبێت بترسە لە وەی تووشی شێتی نەبیت ئەویش وتی: قوڕتان بەسەر بەخوا ئەم دووانە سوود وزیان ناگەیەنن خوا پێغەمبەرێکی ناردووە وکتێبێکی بۆ دابەزاندووە کە لەو بارەتان ڕزگارتان بکات من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە من لەلای ئەوەوە فەرمان وڕێگریەکانم بۆ هێناون سوێند بە خوا ئێوارە نەهات تا هەموو ژن وپیاویان موسڵمان بوون ئیبن عەبباس-خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: نەمان بیستووە وەفدی هیچ هۆزێك چاکتر بێت لە زەمامی کوڕی سەعلەبە ئیمامی ئەحمەدیش لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق و ئیمامی ئەبو داودیش لەو ڕێگەوە هێناویەتی واقیدیش دەڵێت: ئێوارەی ئەو ڕۆژە نەهات تا هەموو ژن وپیاویان موسڵمان بوون ومزگەوتیان بنیاد ناو بانگیان دا

## ٨٣.﴿ پێغەمبەری خوا(ﷺ)دووعایەکی جیای کرد بۆ ئەبو رەیحانە ﴾

ئەحمەد ونەسائی وتەبەرانی لە ئەبو ڕیحانەوە -خوای لێ ڕازی بێ- هێناویانە دەڵێت: لە شەڕێکدا لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووە دەڵێت: شەوێکیان چووینە شوێنێك وزۆر سەرمامان بوو تا ئەوەی کەسی وا هەبوو چاڵی هەڵدەکەندو دەچوویە ناویەوە وقەڵغانەکەی دەدا بە سەر خۆیدا کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ئەمەی بینی فەرمووی کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات تا نزایەکی بۆ بکەم فەزلەکەی پێ بگات کەسێك لە پشتیوانان هەستا وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: تۆ کێیت ؟ وتی: فلاَن کەس فەرمووی: نزیك بەرەوە نزیك بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ)هەندێك لە جلەکەی گرت ونزای بە سەردا خوێند کە بیستم وتم منیش فەرمووی: تۆ کێیت؟ وتم: ئەبو ڕیحانە نزایەکی جیا لە نزاکەی ئەوی بۆ خوێندم پاشان فەرمووی: ئاگر حرامە لە سەر چاوێك کە لە پێناو خوادا پاسەوانی بکات.[٦٥]

## ٨٤.﴿ ئەگەر چووبانە ناو ئاگرەکەوە لێی دەرنەدەچوون ﴾

بوخاری وموسلیم لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە- خوای لێ ڕازی بێ-هێناویانە دەڵێت : پێغەمبەر(ﷺ)یەکێك لە پشتیوانانی لە سەر سریەیەك داناو ناردنی وفەرمانی پێکردن گوێگرو گوێڕایەڵی ئەو ئەمیرەیان بن ئەوانیش لە سەر شتێك تووڕەیان کردوو ئەویش وتی، دارو چیلکەم بۆ کۆ بکەنەوە کۆیانکردەوە وتی: ئاگرم بۆ بکەنەوە کردیانەوە وتی: مەگەر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێنەکردن گوێگرو گوێڕایەڵم بن؟ ووتیان: ئێمە لە دەست ئاگر ڕامانکردووە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) کە تووڕەییەکەی لەماوە ئاگرەکە کوژایەوە دوایی هاتنەوە لای پێغەمبەر(ﷺ)باسی ئەوەیان بۆ کرد ئەویش فەرمووی (لو دخلوها ما خرجوا منها انما الطاعة في المعروف) واتە: ئەگەر بچوونایە ناو ئاگرەکەوە لێ ی دەرنەدەچون بەراستی گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدایە .

---

[٦٥] (صحیح لە الاصابە ج٢ ص٥٦ دا واهاتووە ) (هەیسەمی ج٥ ص٢٨٧ ) دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد جێ متمانەن (بەیهەقی ج٩ ص١٤٩) بەو جۆرە هێناویەتی پەتە ناوی نەدەهاتنە دەرێ گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەو دروستیدایە .

## ٨٥.﴿ هەردووکیان گریان لەبەرکاریگەری ووتەکەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ﴾

ئیبن ئەبی شەیبە وئەبو سەعیدی نەقاش لە ئوم سەلەمەوە –خوای لێ ڕازی بێ- هێناویانە دەڵێت: دوو لە پشتیوانان ناکۆکیان هەبوو هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)لە سەر کێشەی میرات وبەڵگەیان لە سەری نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێوە کێشەتان هێناوەتە لای من ومنیش ڕای خۆم دەڵێم ولە سەری سروشم بۆ دانەبەزیوە هەر کامتان بەپێی بەڵگەکەی شتێکم بۆ بڕینەوە ولەمافی براکەی تیادا بوو با نەیبات بۆ خۆی چونکە ئەوە پەشە ئاگرێکە بۆی دەبڕمەوە ولە ڕۆژی دواییدا کە دێت وەك بازنەی دەوری گەردنی لە ملی ئاڵێنراوە هەردوو کابراکە گریان وهەرکامیان دەیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا مافەکەی من بۆ ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی ئەگەر واتان کرد بڕۆن وبە دووی هەقدا بگەڕین وهەریەکە وپشکێك ببەن وهەرکامتان گەردنی ئەوی ترتان ئازاد بکەن.[٦٦]

## ٨٦. ﴿ کامتان دەچن لەگەڵ ئەم خاوەن مافەدا ﴾

ئیبن ماجە لە ئەبی سەعیدەوە-خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی دەڵێت: دەشتەکیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)وداوای دانەوەی قەرزەکەی دەکرد لە سەری بوو زۆری بۆ هێنا تا ئەوەی وتی: وازت لێ ناهێنم تا ئەمدەیتەوە هاوەڵانی لێ هەستان و ووتیان: قوڕت بەسەر دەزانیت لە گەڵ کێ قسە دەکەیت؟ وتی: من داوای مافی خۆم دەکەم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کامتان دەچن لە گەڵ ئەم خاوەن مافەدا؟ پاشان ناردی بۆلای خەولەی کچی قەیس وپێی فەرموو: ئەگەر خورمات لایە بە قەرز بمان دەرێ تا خورمامان بۆ دێت وقەرزەکەت دەدەینەوە وتی: بەدایك وباوکمەوە بە قەربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا بە قەرز پێی داو قەرزەکەی دایەوە ئەویش وتی: خوا وەفادارت بکات وەفات هەبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوانە چاکترین خەڵکن پیرۆزی نیە لە ئومەتێکدا کە تیایدا لاواز مافی خۆی وەرنەگرێتەوە تا ماندوو نەکرێت .[٦٧]

---

[٦٦] صحیح لە کنز العمال ج٣ ص ١٨٢ دا هاتووە

[٦٧] صحیح بەزار لە فەرموودەکەی عائیشەوە- خوای لێ ڕازی بێ- بەگورتی هێناویەتی وتەبەرانیش لە فەرمودەکەی ئیبن مەسعودەوە بەسەنەدی باش هێناویەتی لە (الترغیب والترهیب)(ج٣ ص١ ٢٧٤ یشدا هاتووە.

## ٨٧. ﴿ ئوسەید کەلەکەی موبارەکی پێغەمبەری (ﷺ) ماچ کرد ﴾

حاکم لە ج٣ ص٢٨٨ لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئوسەیدی کوڕی حوزەیر- خوای لێ ڕازی بێ- پیاوێکی صاڵحی خەندەکاری گاڵتەچی بوو ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بوو قسەی بۆ خەڵك دەکردو دەیخستنە پێکەنین پێغەمبەر(ﷺ) دای بە ناو ووړگیدا وئەویش وتی: ئازارت دام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: تۆڵە بکەرەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ کراست لە بەرەو منیش کراسم لە بەر نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی هەڵکرد ئەویش باوەشی پێیدا کردو کەلەکەی ماچکرد وتی: بە دایك وباوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم وویست.[٦٨]

## ٨٨.﴿ کە پیاوەکە گوێ بیستی ووتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو بەندەکان ئازادکران ﴾

ئەحمەد وتەرمەزی لە عائیشەوە-خوای لێ ڕازی بێ- هێناویانە دەڵێت: کەسیك هات ولە بەردەم پێغەمبەردا(ﷺ)دانیشت ووتی: من دووکۆیلەم هەن درۆم لەگەڵ دەکەن ولەگەڵم ناپاکن ولە قسەم لادەدەن ومنیش جنێۆیان پێ دەدەم ولێیان دەدەم ئایا تاوانم بەرامبەریان هەیە ؟ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: ئەگەر ڕۆژی دوایی هات لەسەر ئەوەی ناپاك بوون بەرامبەرت ولە قسەت لایانداوە ودرۆیان لەگەڵ کردوویت لێپێچینەوە دەکرێن وسزای تۆش بۆیان بە پێی تاوانیانە ئەوە بەسە نەبۆ تۆ نە لە دژی تۆ ئەگەریش سزادانی تۆ لە تاوانیان زیاتر بووبێت ئەوا لە زیادە وچاکەی تۆ دەسێنن بۆ ئەوان وبەوە تۆڵەیان بۆ دەکرێتەوە کابرا سەری دانەواند و دەگریا،[٦٩] پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: مەگەر فەرمانی خوات نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمووی:
(ونضع الموازين القسط ليوم القيامة) کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاکترین شت وایە لێیان جیابمەوە تۆ بەشایەت دەگرم هەموویان ئازادن.[٧٠]

---

[٦٨] حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحە وبوخاری وموسلیم نەیانهێناوە زەهەبیش لەسەری کۆکە ودەڵێت: صەحیحە ئیبن عەساکیر لە ئەبو یەعلاوە بەو جۆرە هێناویەتی لە( کنز العمال) (ج٢ ص٣٠١) دا هاتووە تەبەرانی لە ئوسەیدی کوڕی حوزەیرەوە بەو جۆرە هێناویەتی لە (کنز العمال)( ج٤ ص٤٣) دا هاتووە

[٦٩] صحيح

[٧٠] لە (الترغيب والترهيب) ج٣ ص٤٩٩ دا هاتووە ولە ج٥ ص٤٦٤ دا دەڵێت: سەنەدەکەی ئەحمەد وترمذی موتەسیلن وگێڕەرەوەکانی سەردوو کیشیان جێ متمانەن

## ٨٩. ﴿ بەسەرهاتی ئەبو راشید لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

ئەبو راشید کوڕی عەبدوررحمان دەڵێت لە گەڵ سەد کەسی هۆزەکەمدا چووم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە پێغەمبەر(ﷺ) نزیك بووینەوە وەستاین وپێیان وتم: تۆ ئەی ئەبو موعاویە پێش بکەوە ئەگەر شتێکی باشت بینی وەرە بۆلامان تا ئێمەش بچین بۆلای ئەگەر شتێکی ناحەزت بینی وەرە وئێمەش ناچین منیش چووم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وبچووکترین هۆزەکەم بووم وتم: بەیانیت باش ئەی موحەممەد(ﷺ) (لیس هذا بسلام المسلمین بعضهم علی بعض) واتە ئەمە سەلامی موسڵمانان نیە بۆ یەکتر منیش پێم وت: ئەی چۆنە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەگەر هاتی بۆلای دەستەیەکی موسڵمانان بڵێ (السلام علیکم ورحمة الله) منیش وتم سەلامی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: (وعلیك السلام ورحمة الله وبرکاته) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ناوت چیە وتۆ کێیت ؟ وتم : من ئەبو موعاویەی کوڕی عەبد لات وعوززام پێی فەرمووم: بەڵکو تۆ ئەبو ڕاشید عەبدو ڕرەحمانیت ڕێزی گرتم ولەپاڵ خۆیدا دانیشاندم وجلەکەی بەری بۆدانام ونەعلەکەی پێدام وگۆچانەکەی دەستی پێدام ومنیش موسڵمان بووم لە ناو ئەوانەیدا دانیشتبوون بە پێغەمبەری فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بینیمان ڕیزی ئەو کابرایەت گرت پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: ئەوە گەورەو بەڕێزی هۆزەکەیەتی ئەگەر گەورەو بەڕێزی هۆز هات بۆلاتان ڕێزی بگرن.[٧١]

[٧١] (ئبن مەندە) لەم ڕووەوە بە کورتی هێناویەتی، ئبن سکن هێناویەتی ولە الاصابە ج٢ ص٤٠٩ دا هاتووە لە منتخب (کنز العمال) ج٥ ص٢١٦ شدا هاتووە.

## ٩٠.﴿پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوعەیلی کوڕی سوراقەی سپارد بە ئیمانەکەی﴾

ئەبو نەعیم ج١ ص٣٥٣ لە ئەبو زەڕەوە – خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(کیف تری جعیلا) واتە: جوعەیل چۆن دەبینیت؟ وتم: هەژارێکی وەك خەڵك فەرمووی: ئەی فلان کەس چۆن دەبینیت؟ وتم: گەورەیەکی خەڵکە فەرمووی: (جعیل خیر من مثل هذا ملء الارض) واتە: دەی جوعەیل باشترە لە نموونەی پڕی دنیا لەو جۆرە کەسە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەی فلان کەوایە تۆو ا ڕێزی دەگریت و وای لەگەڵ دەکەیت؟ فەرمووی: (انە راس قومە فانا اتالفهم) واتە: ئەو سەر دەستەی هۆزەکەیەتی ومن رایان دەکێشم ئیبن ئیسحاقیش لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمیەوە هێناویەتی دەڵێت بە پێغەمبەر(ﷺ) وترا : سەد سەدت دا بە عوینەی کوڕی حصن وئەقرەعی کوڕی حابس وبە جوعەیلت نەدا؟ فەرمووی: (والذي نفسي بيده لجعيل بن سراقة خير من طلاع الارض مثل عينة والاقرع لكني اتالفها واكل جعيلا الى ايمانە) واتە: سوێن دبە وەی گیانمی بە دەستە بە دڵنیاییەوە جوعەیلی کوڕی سوراقە زۆر باشترە لە پڕی دنیای وەك عویەینەو ئەقرەع بەلآم من ئەم دوانە ڕادەکێشم وجوعەیل دەسپێرم بە ئیمانەکەی.[٧٢]

---

[٧٢] (صحیح ئەم فەرموودە حەسەنی مورسەلە لە الاصابە دا هاتووە ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٥٣ لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمەوە بەو جۆرە هێناویەتی).

## ٩١. ﴿ فریشتەیەك وەڵامی بۆ دەدایەوە ولە گەڵیدا بوو ﴾

ئەحمەد وتەبەرانی لە ئەبو هورەیرەوە – خوای لێ ڕازی بێ- هێناویانە کەسێك جنێوێکی دابە ئەبو بەکر- خوای لێ ڕازی بێ- وپێغەمبەری خوایش(ﷺ) دانیشتبو وپێغەمبەر(ﷺ) سەری لێی سووڕما وزەردەخەنەی کرد کە زۆرتر وتی: ئەبو بەکر هەندێ قسەی وەڵام دایەوە پێغەمبەر(ﷺ) تووڕە بوو وهەستاو ئەبو بەکریش چوو بە دوایداو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو جنێوی پێدام وتۆیش دانیشتبوویت کە وەڵامم دایەوە تووڕەبوویت وهەستایت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (انه کان معك ملك یرد عنك فلما رددت علیه بعض قوله وقع الشیطان فلم اکن لاقعد مع الشیطان) واتە: لە گەڵتا فریشتەیەك هەبوو وەڵامی بۆ دەدایتەوە کە تۆ وەڵامی هەندێکت دایەوە شەیتان هات منیش لەگەڵ شەیتان دانانیشم پاشان فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر سێ شت هەموویان هەقن: هەر بەندەیەك ستەمێکی لێ بکرێت وبیداتە دەست خوا ئەوا خوای گەورە بەوە سەرکەوتنی خۆی پێ دەدات وعیزەتمەندی دەکات هەر کەسێك دەرگای بەخششێك بکاتەوە ومەبەستی پێی پەیوەندی بێت خوای گەورە بۆی زیاد دەکات هەر دەرگایەکی داوا کاریش بکاتەوە ومەبەستی پێی زیاد کردن بێت خوای گەورە زیاتر بۆی کەم دەکاتەوە.[٧٣]

---

[٧٣] (صحیح هەیسەمی) ج٨ ص١٩٠ هێناویەتی ودەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن ئەبو داودیش هێناویەتی بەڵام ئەوەی تێدا نیە پاشان فەرمووی ئەی ئەبو بەکر.

## ٩٢.﴿ بەسەر هاتی سەعدی کوڕی عوبادە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ﴾

بوخاری لە(الادب المفرد) دا (ص١٥٧) لە ئەبو موساوە هێناویەتی دەڵێت: سێ جار داوای مۆڵەتم لە عومەر کرد مۆڵەتی نەدام منیش چووم عومەر ناردی بەشوێنمداو وتی: عەبدوڵلا نەتدەتوانی لە بەر دەرگا بوەستی بزانە خەڵکی بەو جۆرە لە سەریان سەختە لە بەر دەرگات بوەستن وتم: من سێ جار داوای مۆڵەتم کردو تۆ مۆڵەتت نەدام ومنیش گەڕامەوە عومەر وتی: ئەمەت لە کێ بیستووە؟ وتم: لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست وتی: تۆ شتێك تلە پێغەمبەر(ﷺ) بیستووە کە ئێمە نەمانبیستووە؟ یان بەڵگەیەکم بۆ دینیت یان دەتکەم بەپەند منیش چووم تا گەیشتمە کۆمەڵێکی پشتیوانان کە لە مزگەوت دانیشتبوون پرسیارم لێکردن ووتیان: مەگەر کەس گومانی لەوەدا هەیە؟ وتم: عومەر وای وتووە؟ ووتیان: دەبێت بچووکترینمان لەگەڵت بێت ئەبو سەعیدی خودری یان ئەبو مەسعود لە گەڵم هات بۆلای عومەر و وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) چووین بۆلای سەعدی کوڕی عوبادە تا گەیشتە ئەوێ سەلامی کردو ئەویش مۆڵەتی نەدا لە دوای سێیەم جار کە مۆڵەتی نەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :(قضينا ما علينا) واتە: ئەوەی لە سەر مان بوو بە جێمان گەیاند پاشان گەڕایەوە وسەعد خۆی گەیاندە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی تۆی بە هەق ناردووە چی سەلامت کرد بیستم و وەلامم دایتەوە بەلام بە نزمی حەزمکرد زۆر سەلام لە خۆم ومالم بکەیت ئەبو موسا وتی: بە خوا بە جوانی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) پاراستووە وتی: بەڵێ بەلام حەزم کرد هەوڵی سەلماندنی بدەم.

## ٩٣.﴿ پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی خوزەیمەی بە شایەتی دوو پیاو دانا ﴾

ئیبن سەعد لە(ج٤ ص٣٧٨) لە عەمارەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی ثابت لە مامیەوە هێناویەتی بە گێڕانەوەی راست وصەحیح کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو پێغەمبەر؟(ﷺ) ئەسپێکی لە کابرایەکی دەشتەکی کڕی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە شوێنی تا پارەکەی پێ بدات بۆیە خێرا چوو دەشتەکیەکەش هێواشی نواند هەندێ کەس دەگەیشتن بە دەشتەکیەکەو لەسەر ئەسپەکە قسەیان لەگەڵ دەکرد ونەیان دەزانی پێغەمبەر(ﷺ) کڕیویەتی تاهەندێکیان لەو نرخەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دا نابوو زیاتریان بۆ دانا کاتێ ئەوە بوو دەشتەکیەکە پێغەمبەری(ﷺ) بانگکردو وتی: ئەگەر ئەو ئەسپە دەکڕێت ئەوە بیکڕە ئەگەر نا دەیفرۆشم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ألست قد ابتعته منك ؟)

واتە: ئایا من نەمکڕی لێت؟ دەشتەکیەکە وتی: نە بەخوا پێم نەفرۆشتیت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی با من لێم کڕیت بەڵی لێم کڕیت خەڵکی دەیاندا بەلای پێغەمبەر(ﷺ) و دەشتەکیەکەدا ونەوانیش قسەیان لەسەر دەکرد دەشتەکیەکە دەیوت: ئادەی شایەتێك بێنە کە پێم فرۆشتوویت هەر موسڵمانی دەهات بە دەشتەکیەکەی دەوت: قوڕت بەسەر پێغەمبەر(ﷺ) تەنها هەق دەڵێت: تا خوزەیمەی کوڕی ثابت هات گوێی لێبوو چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ودەشتەکیەکە دەی وت: شایەتێکم بۆ بێنە کە پێم فرۆشتوویت خوزەیمە وتی: من شایەتی دەدەم کە تۆ پێت فرۆشت پێغەمبەر(ﷺ) ڕویکردە خوزەیمە وفەرمووی: (بم تشهد؟) واتە: بەچی شایەتی دەدەیت؟ وتی: بەوەی بەڕاستت دەزانم تۆ پێغەمبەریت پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی خوزەیمەی بە شایەتی دوو پیاو دانا ئەبو داود (ص٥٠٨) لە عەمارەی کوڕی خوزەیمەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی خوزەیمە بەچی شایەتی دەدەیت لە گەڵمان نەبوویت؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سەبارەت بە هەواڵ دانت لە ئاسمان بە ڕاست دەزانم ئێستا بەو قسەت ئەڵێم ڕاستە پێغەمبەر(ﷺ) شایەتی خوزەیمەی بە شایەتی دوو پیاو دانا لە گێڕانەومیەکی تردا وتی: دەزانم تەنها هەق دەڵێت لەسەر گەورەتر لەوە لەسەر ئاینمان باوەڕمان پێ هێناویت ئەویش شایەتیەکەی قبوڵ کرد .

## ٩٤. ﴿ بەراستی ترسان لە خوای گەورە دەبێ ئاوابێ ﴾

ئیمامی ئەحمەد لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی لە باپیریەوە هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) لەکەناریدا لە شەودا خورمایەکی بینی خواردی ئەو شەوە نەخەوت یەکێك لە ئافرەتەکانی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمشەو بێدار بوویت فەرمووی: (إني وجدت في جنبي تمرة فأكلتها وكان عندنا تمر من تمر الصدقة فخشيت أن تكون منه) واتە: من خورمایەکم لە لا پاڵمدا بینی وخواردم خورمای صەدەقەشمان لابوو ترسام لەوە بێت.[٧٤]

## ٩٥. ﴿ پێغەمبەر( ﷺ ) فەرمانی کرد چاکەی لەگەڵ بنوێنن هێندەی نەبرد دەوڵەمەند بوو﴾

بەیهەقی لە ئەنەسەوە -خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وداوای شتی کرد ئەویش فەرمانی کرد خورمایەکی بدەنێ ئەویش فڕێی دا کەسێکی تر هات وفەرمانی کرد خورمایەکی بدەنێ وتی: سوبحانە لللا خورمایەك کە پێغەمبەری خوا بت داتێ پێغەمبەر(ﷺ) بە کەنیزەکەکەی فەرموو: (إذهبي إلى أم سلمة فمريها فلتعطه الأربعين درهما التي عندها) واتە: برۆ بۆلای ئوم سەلەمە وبیبە بۆلای با ئەو چل درهەمەی بداتێ کە لایەتی هەروەها لە حەسەنەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وداوای شتی لێ کرد پێغەمبەر(ﷺ) خورمایەکی پێ دا ئەویش وتی: سوبحانە لللا یەکێ لە پێغەمبەران خورمایەك دەبەخشێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (أوما علمت أن فيها مثاقيل ذر كثير؟ ) واتە: مەگەر نازانیت لە ناویدا چەندین مێثقاڵو ووردیلە هەیە کەسێکی تر هات وداوای لێکرد وخورمایەکی پێ بەخشی وتی: خورمایەکی پێغەمبەری خوا تا ماوم ئەم خورمایە لە خۆم دوور ناخەمەوە وبەردەوام هیوای بەرەکەتیم هەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کرد چاکەی لەگەڵ بنوێنن وهێندەی نەبرد کابرا دەوڵەمەند بوو پێویستی نەما.[٧٥]

---

[٧٤] (صحيح لەحمد بە تەنها هێناویەتی وئوسامەی کوڕی زەید لە کەسانی سەنەدی موسلیمە لە(البداية والنهاية)(ج٦ ص٥٩دا وا هاتووە).

[٧٥] (لە كنز العمال ج٤ ص٤٢ دا وا هاتووە).

## ٩٦. ﴿ پێغەمبەر(ﷺ)پشتگیری قسەكانی سەلمانی كرد كە ئاراستەی ئەبو دەردای كردن ﴾

بوخاری لە (ج١ ص٢٦٤) لە ئەبو حوزەیفەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان سەلمان وئەبو دەردا سەلمان سەردانی ئەبو دەردای كرد ئوم دەردای بینی خۆی زۆر شرۆڵ وهیلاك كردبوو وتی: چیتە؟ وتی: ئەبو دەردای برات لە دنیادا هیچ پێویستیەكی نیە ئەبو دەردا هات وخواردنێكی بۆ ئامادە كرد وتی: بخۆ من بە ڕۆژووم وتی: تا نەخۆیت ناخۆم لێی خوار دكە شەو هات ئەبو دەردا هەستا سەلمان وتی: بخەوە ئەویش خەوت پاشان هەستاو ئەویش دەیوت بخەوە بۆ كۆتایی شەو سەلمان هەستا وتی: ئیستا هەستە پێكەوە نوێژیان كرد سەلمان پێ ی وت، خوا مافی هەیە بەسەر تەوە دەروونت مافی هەیە بەسەر تەوە ماڵ ومنداڵت مافیان هەیە بەسەرتەوە دەی هەركامەو مافی خۆیان پێ بدە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وئەوەی بۆ باس كرد پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (صدق سلمان) واتە : سەلمان ڕاست دەكات.[٧٦]

---

[٧٦] (ئەبو نەعیم لە (الحلیە ج١ ص١٨٨) لە ئەبو جوحەیفەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی لەگەڵ زیادەكەیدا ، ئەبو یەعلا هێناویەتی وەك لە كنز العمال ج١ ص١٣٧ دا هاتووە ، ترمیزی وبەزار وئیبن خوزەیمە ودارقوتنی وتەبەرانی وئیبن حبان هێناویانە وەك لە فتح الباری ج٤ ص١٥١ دا هاتووە ، ئیبن سەعد ج٤ ص١٨٥ بەچەند دەقێكی جیا جیا هێناویەتی .

## ٩٧.﴿ بەسەر هاتی ئەو پیاوەی کە لەلای پێغەمبەر( ﷺ ) نارەزایی دەربڕی بەرامبەر دراوسێکەی ﴾

ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە –خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی کەسێك دای بەلای کوڕێکدا لە سەردەمی پێغەمبەردا وکابرا وەلأمیان دایەوە کە تێپەری یەکێکیان وتی: من زۆر ڕقم لەو کەسەیە ووتیان بەسە بەخوا پێی دەڵێین فلأن برۆ پێی بڵێ چی وت کابرا چوو بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وپێی وت: چی بووە کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بنێرە بە دوایدا بزانە بۆچی ڕقیەتی لێم؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو( لم تبغضه؟) واتە: بۆچی ڕقتە لێی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم وئاگام لێیەتی نەمبینیوە نوێژێك بکات جگە لەو نوێژەی چاك وخراپ دەیکەن کابرا پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایە دەست نوێژی خراپم بۆگرتووە یان لە کاتی خۆی دوام خستووە؟ وتی: نا پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم وئاگام لێیەتی هەرگیز نەمبینیوە نانی هەژارێك بدات جگە لەو زەکاتەی چاك وخراپ دەیدەن؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایە هەر کەس داوای کردبێت لێم ڕێگر بووم بیدەمێ؟ پرسیاری لێی کرد وتی: نا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دراوسێی ئەوم ئاگام لێیەتی نەمبینیوە هەرگیز جگە لە مانگی ڕەمەزان کە چاك وخراپ دەیگرێت ڕۆژووی تر بگرێت کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی بپرسە ئایا بینیوویەتی هەرگیز ڕۆژێ ڕۆژو بشکێنم بە بێ ئەوەی نەخۆش بم یان لەسەفەردابم؟ وتی: نا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: من نازانم لە وانەیە لە تۆ باشتر بێت.[٧٧]

---

[٧٧] (صحیح لە کنز العمال ج٢ ص١٧٠ دا وا هاتووە ).

## ٩٨. ﴿ خوا ڕاست دەکات و سکی براکەت درۆ دەکات ﴾

بوخاری وموسلیم لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هێناویانە کەسێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: براکەم سکی هیچ لە خۆ ناگرێت فەرمووی: (إسقه عسلا) واتە: هەنگوینی بدەرێ ئەویش چوو هەنگوینی پێدا پاشان هات وتی ئەی پێغەمبەری خوا نەنگوینم پێدا زیاتر بوو فەرمووی: بڕۆ هەنگوینی بدەرێ چوو هەنگوینی پێدا پاشان هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سك چوونی زیاتر بوو فەرمووی: (صدق الله وكذب بطن أخيك إذهب فاسقه عسلا) واتە: خوا ڕاست دەکات وسکی براکەت درۆ دەکات بڕۆ هەنگوینی بدەرێ چوو هەنگوینی پێدا چاك بوویەوە.[٧٨]

## ٩٩. ﴿ ڕەبیعەی کوڕی کەعب دواڕۆژ هەڵدەبژێرێ بەسەر دنیادا ﴾

ئەحمەد لە ڕەبیعەی کوڕی کەعبەوە هێناویەتی دەڵێت: من بە ڕۆژ خزمەتی پێغەمبەرم (ﷺ) دەکرد تا نوێژی عیشای دەکرد لە بەر دەرگای دادەنیشتم کە دەچوویە ماڵەوەی دەموت بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ)پێویستی وکارێکی هەبێت بەردەوام گوێم لێبوو دەیفەرموو(سبحان الله وبحمده) تا هیلاك دەبووم یان چاوەکانم بەسەرمدا زاڵ دەبوون وڕادەکشام ڕۆژێك کە مافی بۆی وخزمەتکردنی منی بەدی کرد فەرمووی: (يا ربيعة بني كعب سلني أعطك) واتە: ئەی ڕەبیعەی کوڕی کەعب داوام لێبکە تا پێت ببەخشم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بیری لێدەکەمەوە دواتر پێت دەڵێم بیرم کردەوە دنیا دەبڕێ ودەڕوات وچی تێدایە بەشی منی تیادایە داوای ڕۆژی دوایی لای پێغەمبەر دەکەم چونکە لای خوا پلەو پایەی بەرزە چووم بۆلای وفەرمووی ئەی ڕەبیعە چیبیت کرد؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا داوات لای پەروەردکار وشەفاعەتم بۆ بکەیت تا لە دۆزەخ بمپارێزیت فەرمووی: ئەی ڕەبیعە کێ فەرمانی پێکردیت بەوە؟ وتم: سوێند بەوەی تۆی بە هەق ناردووە کەس پێی نەوتووم بەڵام کاتێ فەرمووت داوام

---

[٧٨] (لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٥٧٥ دا وا هاتووە ).

لێبکە تا پێت ببەخشم تۆلای خوا ئەو پایەت هەیە سەیری باری خۆمم کرد زانیم دنیا تەواو دەبێ ودەڕواو بەشی منیشی تیادا هەیە وتم : داوای رۆژی دواییم دەکەم پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بێدەنگ بوو پاشان پێی فەرمووم(إني فاعل فأعني على نفسك بكثرة السجود) واتە: من ئەوە دەکەم دەی بەسوجدەی زۆر بردن بۆخۆت یارمەتیم بدە،[79] موسلیم وئەبو دەردا بە کورتی هێناویانە ودەقەکەی موسلیم دەڵێت: من لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) شەو دەمامەوە ئاوی دەست نوێژو کاروباریم ڕادەپەڕاند پێی فەرمووم: (سلني) واتە: داوام لێ بکە وتم: داوات لێ دەکەم لە بەهەشتدا هاودەمت بم فەرمووی: (أو غير ذلك) واتە: جگە لەوە ناکرێ؟ وتم: ئەوەم دەوێت فەرمووی: دەی بە سووجدە بردنی زۆر یارمەتیم بدە بۆخۆت .[80]

## ١٠٠. ﴿ پێغەمبەری خوا( ﷺ )ئامۆژگاری وەفدی بەنی عامر دەکات ﴾

ئەبو داود وترمەزی لە مترەفەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم وتی: لەگەڵ وەفدی بنی عامر چووم بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ووتمان: تۆ گەورەمانیت فەرمووی: ( السيد لله) ووتمان: خاوەن فەزڵترینمان و پشوو درێژ ترینمان فەرمووی: (قولوا بقولكم أو بعض قولكم ولا يستجرنكم الشيطان) واتە: قسەتان بڵێن یان هەندێکی قسەتان بڵێن وشەیتان بەسەرتان دا زاڵ نەبێ زۆر لە خۆ بکەن ئیبن رەزین بەو جۆرە لە نەسائییەوە هێناویەتی وئەوەشی بۆ زیاد کردووە فەرمووی: من نامەوێت بەرزم بکەنەوە بۆ سەرو پلەیەك کە خوای گەورە لەوێ دایناوم من موحەمەدی کوڕی عەبدەڵلاّ بەندە ونێردراوی خوام.[81]

---

[79] (لە البداية والنهاية ج٣ ص٣٩٥ دا وا هاتووە ، تەبەرانی لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاق بەهەمان شێوە هێناویەتی).

[80] (لە الترغيب والترهيب ج١ ص ٢١٣ دا وا هاتووە ).

[81] (صحيح لە جمع الفوائد ج٢ ص١٥٩ دا وا هاتووە ).

## ١٠١. ﴿ لە بەر ئەو بەڵێنەی کە دابوویان بەشداری جەنگەکەیان نەکرد ﴾

پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدا بە حوزەیفەو باوکی بەشداری لەم جەنەدا بکەن لەبەر ئەو بەڵێنەی کە قورەیش لەو دوانەی وەرگتبوو موصعەبی کوڕی سەعد – خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: موشریکەکان حوزەیفەو باوکیان پێش بەدر دەست گیر کردبوو وویستبوویان بیانکوژن بەلاَم ئازادیان کرد بوون بەمەرجێك بەشداری لەجەنگی بەدردا نەکەن.[٨٢] وە لە ڕیوایەتێکی کەدا حوزەیفە دەیگێڕێتەوە دەڵێ: ئەوەی ڕێگەی پێ نەدام کە بەشداری جەنی بەدر بکەم ئەوە بوو من وحوسەیلی باوکم دەرچوو بووین لە ڕێگەدا بێ یاوەرانی قورەیش ئێمەیان گرت و ووتیان: ئێوە بۆلای موحەمەد دەچن؟ ئێمەش ووتمان: بۆلای ئەو ناچین تەنها بۆشاری مەدینە دەچین ئەوانیش بەڵێن وپەیمانیان لێ وەررتین کە بچین بۆمەدینە لەو جەنگەدا لەگەڵ موسڵمانان بەشداری نەکەین ئێمەش هاتینە لای پێغەمبەر(ﷺ) وهەواڵەکەمان بۆ گێڕایەوە وفەرمووی: (أنصر فأنفي لهم بعهدهم ونستعين الله عليهم) واتە: بڕۆنەوە بەڵێنە کەیان بەجێ دەهێنین وداوای پشتیوانی لە خوا دەکەین دژ بەوان.[٨٣]

---

[٨٢] (أخرجة أحمد و الحاكم والطبراني وصححه الشيخ الالباني في الصحيحة (٢١٩١).

[٨٣] (أخرجه : مسلم (٤٦١٥) ).

## ١٠٢. ﴿ هەتا موسڵمان نەبوو ڕێگەی پێ نەدرا بەشداریان لەگەڵدا بکات ﴾

عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو بەرەو بەدر کاتێك گەیشتە (حرة الوبرة) واتە: ناوچەی تو کەسوتاوی نزیك مەدینە پیاوێك کە ئازایەتی وبەجەرگی وقارەمانیەتیان لێ باس دەکرد بە دوای موسڵمانان کەوت وخۆی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بینیان دڵخوش بوون پیاوەکە هات وبەپێغەمبەری(ﷺ) وت: هاتووم تا لەگەڵ تاندابم وشتم دەست کەوێت ؟ پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی فەرموو(تؤمن بالله ورسوله؟) واتە: باوەڕت هەیە بەخوا وپێغەمبەرەکەی؟ وتی: نەخێر پێ ی وت: (فأرجع فلن أستعين بمشرك) واتە: بگەڕێرەوە وەکۆمەکی موشریکم ناوێت ئەنجا کابرا ڕویشت وکاتێك گەیشتە لای (الشجرة) پیاوەکە دیسان گەیشتەوە بەوان وەك یەکەم جار وداوای بەشداری کردنی لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد وەك یەکەم جار پێغەمبەر(ﷺ) وەلامی دایەوە ورۆیشت وگەڕایەوە تا گەیشتە ناوچەی(البيداء) دیسان سێ بارە گەیشتەوە لای پێغەمبەر وەك یەکەم جار داوای بەشداری کردنی کرد پێغەمبەریش(ﷺ) وەك یەکەم جار پێ ی فەرموو: باوەڕت هەیە بە خوا وپێغەمبەرەکەی ؟ ئەنجا پیاوەکە لە وەلامدا وتی: بەڵی وپێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی پێداو فەرمووی: وەرە لەگەڵمان.[٨٤]

---

[٨٤] (أخرجه أحمد ٦-٦٧ ، ومسلم(٤٦٧٧)، وأبو داود(٢٧٣٢) ، والترمذي(١٥٥٨)، والدارمي(٢-٢٣٣)، وإبن شيبة(١٢-١٦٥) ، وإبن ماجة(٢٨٣٢)،وإبن حبان(٤٧٢٦)، وقال محققه صحيح على شرط مسلم أنظر (صحيح أبي داود(٢٣٧٢)، وصحيح ابن ماجة(٢٢٨٤)، وصحيح الترمذي(١٢٦٢)

## ١٠٣.﴿ ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە ڕۆیشتن بەرێـگادا لەگەڵ هاوەڵانیدا ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود- خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: ئێمە لە ڕێ وڕۆیشتنی بەدردا هەموو سێ کەسێکمان بەنۆرە سواری پشتی یەك وشتر دەبووین ئەبو لوبابە وعەلی کوڕی ئەبو تالیب – خوایان لێ ڕازی بێ- هەردووکیان هاوڕێ ی پێغەمبەر(ﷺ) بوون کاتێك کە سەرەیان دەهات بە پێغەمبەریان دەوت فەرموو سوار بە ئێمە لە جیاتی تۆ دەڕۆین واتە: نۆرەکەی ئێمەش بۆتۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: (ما أنتما بأقوى على المشي مني ولا أنا بأغنى عن الاجر منكما) [٨٥]

واتە: هەردووکتان لە من بە تواناترنین لە ڕۆیشتندا وە منیش لە ئێوە زیاتر نیم وپێویستم بە پاداشتە ئەمە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) لە ڕێ ڕۆشتن لەگەڵ هاوەڵانیدا بەڵکو جابر-خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕێ وڕۆشتندا خۆی دوا دەخست بێ توانای ببینیایە دادەبەزی ولە جێگەی خۆی سواری دەکرد یاخود لە دوای خۆیەوە لەسەر پشتی وەڵاخەکە سواری دەکردو دووعای بۆ دەکردن وبۆیان دەپاڕایەوە . [٨٦]

---

[٨٥] (أخرجه أحمد (٣٩٠١) والحاكم(٢-٩١) وصححه ووافقه الذهبي والبيهقي الكبرى(٥-٢٥٨) وفي الدلائل(٣-٣٩) والبزار(١٧٥٩) وأبو يعلى(٥٣٥٩) والبغوي(٢٦٨٦)وابن حبان(٤٧٣٣) وقال محققه إسناده حسن وقال الحافظ في الفتح (١٠-٣٩٦) رواه الطبري بإسناد جيد وحسنه الشيخ الألباني في الصحيحة(٢٢٥٧) وفقه السيرة ص (٢٣٤).

[٨٦] (أخرجه أبو داود(٢٦٣٩) وصححه الشيخ الألباني في صحيح أبي داود(٢٢٩٨) والصحيحة (٢١٢٠).

## ١٠٤.﴿ هەر کە میقدادی کوڕی عەمر قسەکانی کردن پێغەمبەر(ﷺ ) بە باشی وەڵامی دایەوە ودووعای بۆ کرد ﴾

پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی ڕۆیشتن بەرەو بەدر پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێ بیستی ڕاوێژو ڕاو بۆچوونی موسڵمانان بوو ئەبو بەکری ڕاستگۆ هەستاو ووتەیەکی زۆر چاکی وت: پاشان عومەری کوڕی خەتتاب هەستاو ووتەیەکی زۆر چاکی ووت: پاشان میقدادی کوڕی عەمر هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بڕۆ بۆ جێ بە جێ کردنی ئەو فەرمانەی کە خوا داوای لێ کردوویت ئێمەت لەگەڵداین سوێند بە خوا ئێمە ئەو ووتەیەت پێ ناڵێین کە بەنی ئیسرائیل بە موسایان وت: بڕۆ خۆت وخواکەت بجەنگن ئێمە ئا لێرەدا دانیشتووین بەڵام ئێمە دەڵێین: بڕۆ خۆت وخواکەت بجەنگن ئێمە لەگەڵتاندا جەنگاوەرین سوێند بەوەی تۆی ناردووە بەو ڕاستیە گەر بەڕۆیشتن بمان بەیت بۆ(برك الغماد ) کە جێگەیەکە لە یەمەن بەجەنگ دێین لەگەڵتدا دژ بە هەموو کەس تا دەگەیتە ئەو جێگەیە پێغەمبەریش(ﷺ) بە باشی وەڵامی دایەوە و دووعای بۆکرد .[87]

## ١٠٥.﴿ پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بەووتەکەی سەعدی کوڕی موعاز دڵخۆش بوو﴾

پێش دەست پێ کردنی جەنگی بەدر سەعدی کوڕی موعاز-خوای لێ ڕازی بێ- وتی: سوێند بەخوا وادەزانم کە ئێمەت بە مەبەست بێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەڵێ سەعدیش وتی: پێ دەچێت ئەی پێغەمبەری خوا لەوە بترسی کە یارمەتیدەران نایانەوێت کۆمەکیت بکەن و بە پێویستی نەزانن لە سەر خۆیان پارێزگاریت لێ بکەن تەنها دژ بەو دوژمنەی کە دەیبیننەوە لەناو خانوو منداڵ ونافرەتیاندا وەمن لە جیاتی یارمەتیدران وەڵامت دە دەمەوە وبە نوێنەرایەتی ئەوانەوە قسەدەکەم و دەڵێم: سوێند بەوەی کە ڕێزی گرتوویت وکتێبی بەسەردا دابەزاندوویت تا ئیستە بە ڕێگەی(برك الغماد)ی یەمەندا نەڕۆیشتووم وشارەزایم لە

---

[87] ( أخرجه البخاري( ٤٦٠٩).

بارەیەوە نیە بەڵام بە ڕۆیشتن بمان بەیت تا ئەو جێگەیە لەگەڵتدا دێین وەك ئەوانەش نابین کە بە موسا- سەلامی خوای لێ بێ- یان وت:﴿ قَالُواْ يَا مُوسَى إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَداً مَّا دَامُواْ فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ {٢٤}﴾(المائدە ) بڕۆ تۆو خوایەکەت بجەنگن ئێمە ئالێرەدا دانیشتووین بەڵام ئێمە دەڵێین: بڕۆ خۆت وخوایەکەت بجەنگن ئێمەش جەنگاوەرین لەگەڵتاندا وە تۆ بۆ کارێك هاتیتە دەر بەڵام خوای گەورە بۆی گۆڕیت بە کارێکی تر بڕۆ بۆ جێی بە جێ کردنی ئەو کارەی کە خوا پێی سپاردوویت بڕۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسە ببەستە کە خۆت دەتەوێت وە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەسە بپچڕە کە خۆت دەتەوێت وە بڕۆ بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆت دەتەوێت و دوژمنایەتی لەگەڵ ئەو کەسە بکە کە خۆت دەتەوێت وە ئاشتی لەگەڵ ئەو کەسە بکە کە خۆت دەتەوێت وە ببە لە سامانەکانمان ئەوەی دەتەوێت،[٨٨] وە ئەو سامانەمان بدەرێ کە خۆت دەتەوێت وە ئەوەی لە سامانە کانمانت بردووە لامان خۆشەویست ترە لەوەی کە بۆت بەجێ هێشتووین،[٨٩] ئێمە تۆمان بە ڕاست زانیووە وباوەڕمان پێ هێناوێت وشایەتیمان داوە ئەوەی کە تۆ پێ هاتوویت ڕاست ورەوایە لەسەر ئەمەش ئێمە گفت وبەڵێنمان داویتێ کە گوێت بۆ بگرین وگوێ ڕایەڵت بین بڕۆ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو کارەی کە خۆت دەتەوێت ئێمەت لەگەڵدایین ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەوەی کە تۆی ناردووە بەو ڕاستیە گەر پێشمان بکەویت بۆ ناو ئەو دەریایە هەر هەموومان شوێنت دەکەوین ویەك پیاومان لێ دواناکەوێت وەهیچ پێمان ناخۆش نیە سبەینی بمان گەیەنیتە دوژمنەکەمان وڕووبە ڕوویان بوەستین ئێمە بە ئارامین لە جەنگدا وڕاستین لە جەنگ وڕووبە ڕوو بوونەوەدا وە بەڵکو خوا نیشانت بدات لە ئێمەدا ئەوەی کە دەبێتە مایەی دڵخۆشیت پێشمان بکەوە و بمان بە لەسەر بەرەکەتی خوا پێغەمبەریش(ﷺ) بە ووتەکەی سەعد دڵخۆش وچالاك بوو ئەنجا پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی هاندا بۆدەرچوون بەرەو بەدر.[٩٠]

---

[٨٨] ( من رواية موسى بن عقبة كما في (تاريخ الاسلام) للذهبي (١-١٠٧).

[٨٩] ( من رواية ابن مردوية كما في (البداية) (٣-٢٦٤) ).

[٩٠] (أخرجه إبن حبان(٤٧٢٢) وقال محققه إسناده صحيح على شرطهما)

## ١٠٦. ﴿ عومەیری کوڕی ئەلحمام تامەزرۆ بوو بۆ دەست کەوتنی بەهەشت ﴾

ئەنەسی کوڕی مالیك – خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: لە جەنگی بەدردا موشریکەکان نزیك بوونەوە وپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (قوموا الى الجنة عرضها السموات والارض) واتە: هەستن بۆ ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی زەوی وئاسمانەکانە عومەیری کوڕی ئەلحمامی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەهەشتێکە پانتاییەکەی زەوی وئاسمانەکانە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ ئەویش وتی: بەخ بەخ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: چی وات لێ دەکات تا بڵێیت بەخ بەخ ئەویش وتی: نا سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم وت: بە هیوای ئەوەی کە من یەکێك بم لە خاوەنەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (فإنك من أهلها) واتە: تۆ یەکێکی لە خاوەنەکانی ئەو بەهەشتە عومەیریش کەمێك خورمای پێ بوو دەری کردو کەوتە خواردنی وتی: بەڕاستی ژیانێکی دوورو درێژە من بوەستم تا ئەم خورمایانە دەخۆم ئەنجا ئەوەی پێ مابوو فڕێ داو کەوتە شەڕەوە لەگەڵ موشریکەکان تا شەهید کرا.[٩١]

---

[٩١] (اخرجه أحمد(٣-١٣٦) برقم (١٢٣٩٨) وقال محققه إسناده صحيح على (٣- شرط مسلم(١٩٠١) والحاكم ٤٢٦) وصححه الذهبي والبيهقي الكبرى(٩-٤٣)

# ١٠٧.﴿ بەسەرهاتی مەعازی کوڕی عەمری کوڕی ئەلجەمووح ومعوەزی کوڕی عەفرا لە جەنگی بەدردا ﴾

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف- خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: لە گەرمەی جەنگەکەدا ولە ڕیزی موسڵماناندا لە شەڕگەکە دەجەنگام تەماشای لای ڕاست وچەپی خۆمم کرد دەبینم لە نێوان دوو کوڕی کەم تەمەنی ئەنصاریدام یەکێکیان هاتە لامەوە و دەستێکی لێ دام و بە چپە پێ ی وتم: مامە ئەبو جەهل دەناسیت منیش وتم: بەڵێ برازاکەم چ کارێکت پێی هەیە وتی: بۆیان گێڕاومەتەوە کە ئەو جوێن وقسەی ناشیرینی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووتوە سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە ئەگەر بەس بیبینم نایەڵم ڕووم لە ڕووی بترازێت تا کاممان بە پەلە بێت ئەوی تریان بکوژێت عەبدوڕڕەحمان دەڵێت: زۆر سەرم سوڕما لە ووتەکەی کوڕەکەی تریشیان هاتە لامەوە وهەمان ووتەی پێ وتم: منیش تەماشام کرد ئەبو جەهل بە ناو خەڵکەکەدا دێت ودەڕوا ئەوجا بە هەردووکیانم ووت: تەماشاکەن ئەوە ئەو کەسەیە کە بە دوایدا دەگەڕین وپرسیاری لە بارەوە دەکەن یەکسەر هەردووکیان پەلاماریان داو بە شمشێرەکانیان کوشتیان.[٩٢]

وەئەو دوو کوڕەش ناویان معاز ومعوز بوو لە ڕیوایەتێکی کەدا هاتووە کە بە ووردی باسی لە چۆنیەتی کوشتنی ئەبو جەهل دەکات معازی کوڕی ئەلجەمموح دەڵێت: لە شەڕی بەدردا گوێم لێبوو دەیان وت: ئەبو جەهل هاوەڵەکانی لە هەموو لایەکەوە وەك درەختێکی زۆر پەلدار پارێزگاری لێ دەکەن وە دەیان وت: کەس ناتوانێت بگاتە ئەبو جەهل کاتێك من ئەمەم گوێ لێ بوو ووتم دەبێت خۆمی پێ بگەیەنم خوڕاگرانە بەرەو ڕووی ڕۆیشتم تا لێی نزیك بوومەوە وپەلاماریم داو شمشێرەکەم لە ڕانیداو پەڕاندم وعەکریمەی کوڕیشی لەوێدا شمشێرێکی لەسەر قوڵ مدا دەستی قرتاندم وتەنها پێستەکەی پێوەمایەوە ودەستم پێوەی هەڵ واسرابوو ئەمەشم بووە هۆی دوور کەوتنەوەم لە ئەبو جەهل منیش قاچم خستە سەر دەستەکەم وشانم ڕاکیشا

---

[٩٢] (أخرجه أحمد(١٦٧٣)، والبخاری(٣٩٨٨)، ومسلم(١٧٥٢)، والحاكم(٣-٤٢٥)، وابن حبان(٤٨٤٠)، والبيهقي الدلائل (٣-٨٣).

تاڵێم کردەوە وفڕی مدا ئیبن هیشام دەڵێت: پاشان معوزی برای معاز بەلای ئەبو جەهلدا ڕۆیشت ولێ ی دا تا لە جووڵەی خست وپاشان بەجێ ی هێیلا وهێشتا گیانی تیا مابوو،[٩٣] موسای کوڕی عوقبە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) هات ولای کوژراوەکان وەستاو بەدوای ئەبو جەهلدا گەڕاو کەمێك نارەحەتی بە ڕوخساریەوە دیار بوو وفەرمووی: خوایە لە دەستم دەرنەچێت فیرعەونی ئەم ئوممەتە هاوەڵانی بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەوە بۆ دۆزینەوەی تا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دۆزیەوە تۆزێك لە ناوچەیەکی ئەولای شەڕگەکەوە بوو وبینی گلاوە وزرێ پۆشەکەی لە سەردایە وشمشێرەکەی لەسەر ڕانەکانیەتی وبرینی پێوە دیار نیەو توانای جووڵە کردنی تێدا نەماوە وسەری بەلادا شۆڕ بووەتەوە وتەماشای زەویەکە دەکات کاتێك عەبدەڵلای کوڕی مەسعود بینی بە چوار دەورەیدا دەسوڕایەوە بۆ ئەوەی بیکوژێت ودەترسا لەوەی هەڵسێتەوە بۆی وپەلاماری بدات وزیاتر لێی نزیك بوەوە و وای زانی کە بریندارەو توانای جوڵەی تێدا نەماوە ویستی بە شمشێرەکەی لێ ی بدات ترسا لەوەی کە سوودی نەبێت بۆیە لە دوای ئەبو جەهلەوە هات وشمشێرەکەی ئەوی دەرهێنا ولە ملی داو کوشتی وپاشان عەبدەڵلای کوڕی مەسعود گەڕایەوە وئەم هەواڵەی گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ) وئەویش فەرمووی: ئەوە لێدانی فریشتەکانە خوایە بەڵێنەکەت بۆ جێ بە جێ کردم .[٩٤]

---

[٩٣] (أخرجه ابن هشام في السيرة برقم(٥١٩)وأبو نعيم الدلائل برقم(٤١١)، والطبري في التاريخ(٢-٤٥٤) ، والبيهقي في الدلائل(٣-٨٤)، والاصبهاني في سير السلف الصالحين(٢-٦٥٦)، وقال محققه إسناده حسن

[٩٤] (أخرجه موسى بن عقبه كما في (الدلائل) للبيهقي (٣-١١٦) و(تاريخ الأسلام) للذهبي ص(١١١) وأنظر(المغازي) لعروة بن الزبير ص (١٤٢-١٤٣)

## ١٠٨. ﴿ هەواڵ دانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت دەقاو دەق هاتە دی ﴾

ئیبن عەبباس –خوای لێ ڕازی بێ- ووتویەتی: عوقبەی کوڕی ئەبی مەعەیت لە هەر سەفەرێك کە دەگەڕایەوە خواردنێکی درووست دەکرد ودراوسێکان وهەندێك کەسانی ناو شاری مەککە بۆ بانگ دەکردو زۆر جار دەچوو لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)دادەنیشت وفەرموودەکانی ئەوی بە لاوە باش بوو بەلام لە هەمان کاتدا خۆی زۆر پیاویکی خراپ بوو جارێکیان لە گەشتێکی گەڕایەوە خواردنێکی درووست کردو پێغەمبەری(ﷺ) بۆ ئەو خواردنە بانگ کردو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ما أنا بالذي أكل طعامك حتى تشهد أن لا إله ألا الله وإني رسول الله) واتە: من ئەو کەسەنیم خواردنەکەت بخۆم تا شایەتی نەدەیت کە خوا تاك وتەنهایە ومنیش پێغەمیەری خوام عوقبە داواکاریەکەی دووبارە کردەوە وپێغەمبەریش(ﷺ)هەمان وەڵامی دایەوە پاشان عوقبە شایەتمانی هێناو پێغەمبەریش(ﷺ) خواردنەکەی خوارد ئەم باسە گەیشتەوە بە ئوبەی کوڕی خەلەف ئەویش هات بۆلای عوقبەی هاوڕێ ی وپێ ی وت: بێ دین بوویت عوقبە؟ عوقبەش وتی: نا من بێ دین نەبووم بەلام پیاوێکم بانگ کرد بۆ ماڵەکەم وڕازی نەبوو نانەکەم بخوات تا شایەتەتی بۆ نەدەم منیش شەرمم کرد کە لە ماڵەکەم بڕواتە دەرەوە ونانەکەم نەخوات بۆیە شایەتیم بۆدا ئوبەی پێ وت: من بەمە لێت ڕازی نابم هەرگیز هەتا نەچیتە لای تفی لێ نەکەیت ئەوە بوو ئەو ستەمکارە وملهوڕە ئەو کارە ناپەسەندەی ئەنجامدا وە ڕۆژێکی تریش لە سەر داوای ئەبو جەهل شیلاوگ وناوسکی حووشتری هەلگرت وکە پێغەمبەر(ﷺ) چووە سووجدە کردیە سەر مل وناو شانی پێغەمبەر(ﷺ) کە تەنها ئەو توانیویەتی وڕێگەی بەخۆی داوە لە ناو هەموو قوڕەیشدا ئەم کارە ناپەسەندە ئەنجام بدات.[٩٥] پێغەمبەریش(ﷺ) پێ ی فەرموو: (لا ألقاك خارجا من مكة إلا علوت رأسك بالسيف) واتە: ئەگەر پێت بگە ملە دەرەوەی مەککە دا بە

---

[٩٥](أخرجه أحمد (١/ ٤١٧) والبخاري(٣١٨٥-٣٩٦٠) ومسلم(٤٦٢٥) والنسائي(١/ ١٦١) وابن حبان(٦٥٧٠).

شمشێر لە سەرت دەدەم ئەوە بوو ئەو تاوانبارە لە شەڕی بەدردا بەدیل گیرا ولە ناو هەموویاندا تەنها ئەو لە ملی دراو کوژرا.[٩٦] و ئەو تاوانبارە هەر ئەو کەسە بوو کە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بووردەیەکی بە شانەوە بوو نوێژی دەکرد لای کەعبە ئەم تاوانبارە هات لە پشتەوە بووردەکەی پێغەمبەری(ﷺ) گرت وگرێی دا لەملی بە توندی جەڕاندی هەتا وەخت بوو بیخنکێنێت تا ئەبو بەکر لە دوورەوە هات وعوقبەی دوور خستەوە وپێغەمبەریش(ﷺ) هێشتا هەر لە نوێژەکەیدا بوو .[٩٧]

---

[٩٦] (أخرجه أبو نعيم(الدلائل)(٤٠١) وقال السيوطي في(الخصائص الكبرى)(١/ ٥١٥) أخرجه أبو نعيم بسند صحيح.

[٩٧] (أخرجه البخاري(٣٦٧٨-٣٨٥٦) وأبو نعيم(الدلائل)(١٥٩) وابن أبي شيبة(١٤/ ٢٩٧) وأبو يعلى(١/ ٣٤٣) وابن حبان(٦٥٦٩).

## ١٠٩.﴿ سەودەی کچی زەمعە ووتەیەکی لە دەم دەرچوو پێغەمبەر( ﷺ ) پێی ناخۆش بوو﴾

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەدر گەڕایەوە وهاتەوە ناو شاری مەدینە بە دیلەکان ودەستکەوتەکانەوە دوای ئەوەی کە خوای گەورە سەرکردەکانی موشریکەکانی لە ناو بردووە موسوڵمانەکانی مەدینە تا ناوچەی(الروحا ء) ڕۆیشتن لەوێدا پێغەمبەر(ﷺ) وهاوەڵانی گەیشتن وپیرۆز بایی ودەستخۆشیان لێ دەکردن وپرسیاری کوژراوەکانی مووشریکەکانیان لێ دەکردن،[98] ئەوە بوو دیلەکانیان هێناو بردیانەوە ناو خانووەکانی شاری مەدینە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسعەدی کەڕی زوراره دەڵێت: سەودەی کچی زەمعەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) چوو بووە سەردانی بنەماڵی(عفراء) ئەوەش پێش ئەوە بوو کە(حجاب) فەرز بکرێت سەودە دەڵێت: سوێند بەخوا من لەوەێ بووم وهاتن بۆلامان ووتیان: ئەوە دیلەکانە وا هێنایانن منیش گەڕامەوە ماڵی خۆم وتەماشام کرد پێغەمبەر(ﷺ) لەوێ یە لە سوچێکی ژوورەکەش سوهەیلی کوڕی عەمری لێیەو هەردوو دەستی بەپشتی ملیەوە بە پەتێك گرێ دراوە دەڵێت: سوێند بە خوا کە ئەوم بینی خۆم پێ نەگیرا وتم: باوکی یەزید ئاواتان لە خۆتان کرد وخۆتان دا بەدەستەوە دا ئەی بۆ بەڕێزەوە نەمردن سوێند بەخوا بەووریا نەهاتمەوە هەتا گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو لە سووچی ژوورەکەوە فەرمووی : سەودە ئایە بەرامبەر خواو پێغەمبەرەکەی هانیان دەدەیت؟ منیش وتم: سوێند بەو خوایەی کە تۆی ناردووە بە ڕاستی خۆمم پێ نەگیرا کە ئەوم ئاوەها بینی تا ئەو ووتەیەم لە دەم دەرچوو.[99]

---

[98] اخرجه ابن هشام السيرة ٢ / ٢٣٦ والبيهقي الدلائل ١٤٧/٣ والحاكم ٤١٨/٢ وقال صحيح مرسل ووافقه الذهبي .

[99] اخرجه ابن ابي شيبة ٣٦٦٧٨ ، وابن هشام السيرة ٢٣٨/٣ والحاكم ٢٢/٣ وصححه على شرط المسلم ووافقه الذهبي والطبراني الكبير ٢٨/٢٤ وقال ابراهيم العلي في (الصحيح السيرة ٢٨٦ سنده صحيح

## ١١٠. ﴿ جوبەیری کوڕی مطعم هەر کە گوێ بیستی چەند ئایەتێك بوو ئیسلام چووە قوڵایی دڵیەوە ﴾

کاتێك کە موشریکەکانی مەککە دەهاتن بۆ ئازادکردنی دیلەکانیان ڕێزیان لێ دەگیراو وە پێغەمبەریش(ﷺ) لە مزگەوتدا دایدەنان وشەوێك لە مزگەوت دەمانەوە تا لە نزیکەوە ڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) وە هاوەڵەکانی وە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بناسن جوبەیری کوڕی مطعم کوڕی عەدی دەڵێت: کاتێك کە گەیشتمە ناو شاری مەدینە بە مەبەستی ئازاد کردنی هەندێك لە دیلەکانی بەدر ئەو ڕۆژگارە من هێشتا موسڵمان نەبووم من گەیشتمە ئەوێ زۆر ماندوو بووم خەوتم لە مزگەوتدا بە دەنگی قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) کە پێش نوێژی بۆ دەکردن لە نوێژی مەغریبدا وە سوورەتی(الطور)ی بۆ دەخوێندن من بە ئاگا هاتم وترسام کاتێك لە خوێندنەکەیدا بەردەوام گەیشتە ئەم ئایەتە(أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ {٣٨}) (الطور) دەڵێ: کە گوێم لەم ئایەتە بوو نزیك بوو دڵم بفڕێت وپاشەو پاش لە مزگەوت هاتمە دەرەوە وئەمە یەکەم جار بوو ئیسلام چووە قوڵایی دڵمەوە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: هێشتا لە دەرەوەی مزگەوت بووم گوێ ملە دەنگی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووکە ئەم ئایەتەی دەخوێند (إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ {٧}) (الطور) کە ئەم ئایەتەم بەرگوێ کەوت نزیك بوو دڵم دووکەرت بێت.[١٠٠]

---

[١٠٠] (اخرجه احمد(٤/ ٨٣) عبد الرزاق(١٦٣١) والطبراني الكبير(١٤٩٨-١٤٩٩) والطيالسي(٩٤٣) وابو يعلى(١/ ٣٤٩) والطحاوي مشكل(١/ ١٣٤) والبيهقي الكبرى(٣/ ٤٤٤) وقال الشيخ الالبانى في (الثمر المستطاب)(٣/ ٧٧١-٧٧٤) اسناده صحيح .

## ١١١.﴿ هەرکە پێغەمبەر( ﷺ ) هەواڵەکەی دا بە عەبباس بە تەواوی دڵنیا بوو ﴾

ئیبن ئیسحاق- رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێت: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب کە لە ناو دیلەکاندا بوو پارەی ئازاد کردنەکەی لە هەموو دیلەکانی تر زیاتر بوو چونکە ئەو پیاوێکی دەوڵەمەند بوو صەد ئوقیە ئاڵتەنی بۆ ئازاد کردنی خۆی وعەبباس پارەی ئازاد کردنی خۆی دا لەگەڵ هەردوو برازاکەی عەقیل ونەوفەل ولەگەڵ عوتبەی کوڕی جەحدمی هاوپەیمانیدا هەندێك لە پیاوانی پارمەتی دەران داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە عەباس ئازاد بکات بەبێ بەرامبەر وەك ئەنەسی کوڕی مالیك – خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: پیاوانێکی یارمەتی دەران بە پێغەمبەریان(ﷺ) وت: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەمان بدە با پارەی فدیەکەی عەباسی خوشکەزامان بۆی بگێڕینەوە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: نا سوێند بە خوایەك درهەمی بۆ ناگێڕنەوە.[١٠١]

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب مامی پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە پێغەمبەری خوا کرد کە ئەو بیست ئوقیە ئاڵتونەی کە لەگەڵیدا گیراوە لەسەر پارەی فیدیەکەی دای بنێت عەبدوڵلای کوڕی عەباس –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بە عەباسی فەرموو: ئەی عەباس فیدیەی خۆت وهەردوو برازاکەت عەقیلی کوڕی ئەبو تالیب ونەوفەلی کوڕی ئەلحاریس وهاوپەیمانت عوتبەی کوڕی جوحدەم برای ئەبی الحاریسی کوڕی فەهد چونکە تۆ پیاوێکی پارەداری ؟ عەباسیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێشتر موسوڵمان بووم بەڵام ئەوان بە زۆر ڕاپێچیان کردم لەگەڵ خۆیان ئیتر بۆ دەبێت فیدیەمان لێ وەربگیرێت ؟

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (الله أعلم باسلامك أن يكون ما تقول حقا فألله يجزيك به وأما ظاهر أمرك فقد كان علينا فأفد نفسك وابن أخويك) واتە: خوا باشتر دەزانێ بە ئیسلام بوونت ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت ئەوە خوا پاداشتی ئەوەت دەداتەوە بەڵام ڕوکەشی هەڵسوکەوتەکەت دژ بە ئێمە بوو لە بەر ئەوە فیدیەی خۆت وهەردوو برازاکەت بدە و عەباس کە دیل کرا بوو بیست ئوقیە ئاڵتونی پێ بوو لێ ی وەرگیرا بوو وەك دەسکەوت دابەش کرا بوو

---

[١٠١] (أخرجه البخاري (٣٥٣٧- ٤٠١٨).

لەوێدا عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئاڵتونە شم بۆ بخەرە ڕیزی فیدیەکەمەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا أفعل ذلك شيء أعطانا الله منك).

واتە: نا کاری وا ناکەم ئەوە شتێکی تۆیە کە خوا داویەتی بە ئێمە عەباسیش وتی: پارەی ئەو فیدیەیەم لانیە ئەی پێغەمبەری خوا ئایە ئەمەت بۆ خزمایەتی پێ کردم؟ سوێند بەوەی کە عەباس سوێندی پێ دەخوات وات لێ کردم کە هەژارترین کەسی قوڕەیش بم هەتا لە ژیاندا ماوم پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو: ئەی کوا ئەو پارەیەی کە پێش دەرچوونت تۆ ودایکی ئەلفەزل شاردتانەوە لە مەککەو کاتێك کە هەردووکتان بوون وکەستان لەگەڵدانە بوو لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە عەباسی فەرموو تۆچۆن هەژار ترین کەسی قوڕەیش دەبیت ئەی پارچە ئاڵتونەکانت ئوم ولفەزڵ وئەنجا بەرەو لای من هاتیت واتە: بەرەو جەنگی بەدروبە ئوممولفەزلت وت: ئەگەر کوژرام ئەوا تۆم بەجێ هێشتووە بەدەوڵەمەندی هەتا لە ژیاندا بیت وە ئەگەر گەڕامەوە خەمی هیچ شتێکت نەبێت وە ئەگەر لەم سەفەرەشدا کوژرام ئەوا ئەوەندە بۆ فەزل وئەوەندەش بۆ قوسم وئەوەندەش بۆ عەبدوڵلا؟ عەباسیش وتی: سوێند بەوەی کە تۆی بەم ڕاستیە ناردووە کەس بەوەی نەزانیوە تەنها من وئەو نەبێت وەمن دەزانم کە تۆ پێغەمبەری خوایت وە سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا من شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت ئەنجا عەباس فیدیەی خۆی وبرازاکەی وهاوپەیمانەکەیدا وخوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرمووێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم مِّنَ الأَسْرَى إِن يَعْلَمِ اللّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْراً يُؤْتِكُمْ خَيْراً مِّمَّا أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {٧٠} (الانفال )

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بەو دیلانەی کە لە ژێر دەستاندایە ڕاگەیەنە گەر ئیمان وباوەڕ لە دڵتاندا هەبێت ئەوا خوای گەورە باشترتان دەداتی لەوەی کە لێتان سەنراوە ولێتان خۆش دەبێت وخوای گەورەش بە بەزەی ولێخۆشبووە،[١٠٢] خوای گەورە بەڵێنەی خۆی هێنایە دی بۆ ئەو دیلانەی کە موسڵمان بوون وە قەرەبووی ئەو پارانەی بۆ کردنەوە کە لێیان وەرگیرابوو .

[١٠٢] (اخرجه احمد (٣٣١٠) وقال محققه الارناؤوط: حسن والطبري (التأريخ)(٣/ ٤٦٣) وأبي نعيم(الدلائل)(٤٠٩) والبيهقي(الدلائل) (٣/ ١١٩ ، ١٤٣) والحاكم(٣/ ٣٣٤) وصححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي وحسن الارناؤوط إسناد الحاكم في (المسند)(٥/ ٣٣٦)

## ١١٢. ﴿ ئاواتە خواز بوو بە قاچە شەلەکەیەوە بە ناو بەهەشتدا بگەڕێ ﴾

ئیبن ئیسحاق –رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێت: عەمری کوڕی ئەلجەموح پیاوێکی شەلی قاچ خوار بوو وەخاوەنی چوار شێرە کوڕ بوو کە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) لە هەموو جەنگەکاندا بەشدار دەبوون کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پێش وویستیان ڕێگە لە باوکیان بگرن وەپێیان وت: تۆ پاساوی بەشدار نەبوونت هەیە وخوای گەورە داوای بەشدار بوونت لێ ناکات ئەویش هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) پێ ی وت: کوڕەکانم دەیانەوێت ڕێگەم لێ بگرن نەیەم بۆ ئەم جەنگە لەگەڵتدا سوێند بە خوا من بە هیوام بەم قاچە شەلەمەوە بە ناو بەهەشتدا بڕۆم پێغەمبەریش(ﷺ) پێ ی فەرموو: بەلاَم تۆ غەزات لە سەر نیەوە خاوەن عوزریت وە بە کوڕەکانیشی فەرموو: پێویستە ئێوەش ڕێگری نەکەن بەڵکو خوا شەهیدی پێ ببەخشێت ئەوە بوو بەشدار بوو وە لە جەنگی ئوحویشدا شەهید بوو وە لە ڕیوایەتێکی تر لە جابیرەوە – خوای لێ ڕازی بێ- هاتووە کە دەڵێت: عەمری کوڕی ئەلجەموح قاچی شەل بوو هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر من ئەمڕۆ بجەنگێم لە پێناوی خوادا هەتا دەکوژرێم دەچمە بەهەشت ومنەم قاچەم ساغ دەبێتەوە پێ ی بڕۆ ملە ناو بەهەشتدا ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ عەمریش وتی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە نا گەڕێمەوە بۆلای خێزانەکەم تا نەچمە ناو بەهەشتەوە عومەری کوڕی خەتتاب –خوای لێ ڕازی بێ- وتی: سوێندەکەت مەکە بەمەرج بەسەر خواوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (مهلا يا عمر فأن منهم من لو أقسم على الله لأبره منهم عمرو بن الجموح) واتە: لە سەر خۆ ئەی عومەر تیایاندا هەیە ئەگەر سوێند دانێت لەسەر خوا خوای گەورە سوێندەکەی ناشکێنێت بۆی دەهێنێتە دی لەوانەش عەمری کوڕی ئەلجەموحە.[١٠٣]

---

[١٠٣] (أخرجه أحمد(٢٢٥٥٣) وقال محققه اسناده حسن ، وابن حبان(٧٠٢٤) وقال محققه اسناده جيد وحسنه الحافظ في (الفتح)(٣/ ٣١٦) وقال الشيخ الالباني في تحقيق(فقه السيرة) ص(٣٨٣) اسناده صحيح

## ١١٣. ﴿ حەرام سكاڵای كرد لە مەعاز لای پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ﴾

جابر- خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: مەعاز نوێژی عیشای لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەكرد ولە دواییدا دەگەڕایەوە وپێش نوێژی بۆ هاوەڵەكانی دەكرد واتە: لە مزگەوتەكەی گەڕەكی بەنی(خیطم) شەوێكیان دواكەوت ونوێژی لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) كرد وپاشان گەڕایەوە بۆلای خزمەكانی وپێش نوێژی بۆكردن وسوورەتی(البقرة)ی بۆ خوێندن وحەڕام هات بۆ مزگەوت تا نوێژەكەی بكات وپاشان بچێت دار خورماكانی ئاو بدات كاتێك بینی مەعاز- خوای لێ ڕازی بێ- نوێژەكەی درێژ كردەوە هاتە دواوە وبە تەنها خۆی نوێژەكەی كرد وبە پەلە تەواوی كرد وپاشان چووە دەرەوە وهەوساری ووشترەكەی گرتوو وچوو بۆ ئاودانی دار خورماكانی مەعاز نوێژەكەی تەواو كرد وباسی حەڕامیان بۆكرد ومەعاز وتی: ئەوە دووڕووە كە نوێژەكەی بەپەلە دەكات لە پێناوی ئاودانی دار خورماكانی دەبێت ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) بگێڕمەوە مەعاز هات وبۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە ودواتریش حەڕام هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەعاز دێت بۆلای تۆ نوێژ دەكات وزۆر خۆی لای تۆ دوادەخات ودەمێنێتەوە پاشان دەگەڕێتەوە بۆلای ئێمە لە كاتی خەوتندا وئێمە بە ڕۆ ژلە كارەكانماندا ماندووین ودێت و بانگمان دەكات بۆ نوێژو ئێمەش لە ماڵەكانمان دەردەچین بۆلای ئەویش نوێژەكەمان بەسەرەوە درێژ دەكاتەوە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەوی ڕابردوو نوێژەكەت دوا خست ومەعاز نوێژی لەگەڵ كردیت پاشان گەڕایەوە وپێش نوێژی بۆ كردین وە من ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو كاتەدا دەمویست زوو بچم تا دار خورماكانم ئاو بدەم وهاتمە مزگەوتەوە تا لەگەڵ ئەوان دا نوێژ بكەم ومەعاز دەستی كرد بە خوێندنی سوورەتی(البقرة) ونوێژەكەی درێژ كردەوە ومنیش هاتمە دواوە ونوێژەكەم كرد بەپەلە چووم بەلای ئاودانی دار خورماكانمەوە وە ئێمەش خاوەنی ووشترە ئاوكێشە كانین وبە دەستەكانمان كاردەكەین لەگەڵ ئەوەش دا مەعازبەمن دەڵێت: دووڕوو بەڵام مەعاز بۆی دەردەكەوێت بەیانی كە دوژمن هاتە پێش وهەموو دەبینن كە پێیان گەیشتین چۆن دەبێت ئەگەر خوا بیەوێت جابر –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: لەو كاتەشدا هەواڵی نزیك بوونەوەی دوژمنانیان پێ گەیشتبوو موسڵمانان هەموو خۆیان ئامادە دەكرد بۆ ئوحود وحەڕامیش لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوو دواتر پێغەمبەر(ﷺ) بە مەعازی فەرموو: چی كرد ئەوەی ناكۆكی وگلەیی لە هەردووكمان هەبوو؟ وتی: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) سویند بەخوا ئەو ڕاستی كرد ومن درۆم كرد وشەهید بوو .[١٠٤]

---

[١٠٤] (اخرجه البخاري(٦١٠٦)ومسلم(١٧٨-٤٦٥) واحمد(٣٣٤٧-١٤٣٠٧) وقال محققه اسناده صحيح على شرطهما) .

## ١١٤.﴿ سماکی کوڕی خەرشە شمشێرەکەی پێغەمبەری(ﷺ ) بە هەقی خۆی وەرگرت ﴾

زوبەیری کوڕی عەوام –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا شمشێرێکی نمایش کرد وپیشانی موسوڵمانانی دا وفەرمووی: کێ ئەم شمشێرە وەردەگرێت وهەقی خۆی دەداتێ؟ عومەر هەستاو وتی: من وەری دەگرم ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕاو پاشان فەرمایشتەکەی یەکەم جاری دووبارە کردەوە ومنیش وتم: من وەری دەگرم ئەی پێغەمبەری خوا ؟ بەلاّم ڕووی لە منیش وەرگێڕا پاشان فەرمایشتەکەی سێ بارە کردەوە وئەبو دوجانە واتە: سماکی کوڕی خەرشە هەستاو وتی: من بە هەقی خۆی وەری دەگرم بەلاّم هەقی خۆی چیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەقی ئەوەیە موسوڵمانانی پێ نەکوژی ولە ڕووی کافریشدا ڕانەکەیت وەلە دوژمن بدەیت تا دەچەمیتەوە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) شمشێرەکەی دایە دەست ئەبو دوجانە ئەویش پیاوێکی ئازا بوو وفیزی دەنواند لە کاتی جەنگدا وئەگەر ویستی شەرکردنی بوایە خۆی نیشانە دەکرد وپارچە قوماشێکی سووری لە ناو چەوانەوە دەبەست وخەڵکی ئەومیان بەر چاو بکەوتایە دەیانزانی کە بە ڕاستی شەر دەکات ئیبن ئیسحاق دەڵێت: ئەبو دوجانە شمشێرەکەی وەرگرت لە دەستی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) ئنجا پارچە پەڕۆیەکەی هێنایە دەرەوە وبە ناوچاوانیەوە بەست پاشان بە فیزەوە دەڕۆیشت لەبەردەم ڕیزی پێشەوەی موسوڵمانان دا وەلە پێش چاوی هاوبەش پەرستان پێغەمبەر(ﷺ) ئەبو دوجانەی بینی کە بە فیزەوە دەڕوات فەرمووی: ئەو جۆرە ڕۆیشتنێکە خوای گەورە خاوەنەکەی دەبوغزێنی مەگەر لە جێگە یەکی وادا نەبێت.[١٠٥]

---

[١٠٥] (السيرة لابن هشام (٣/ ١٦) رقم(٥٩٤).

## ١١٥.﴿ بەسەر هاتی پابتی کوڕی وەقش ویەمانی کوڕی جابر لە جەنگی ئوحوددا ﴾

مەحمودی کوڕی لوبەید –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو لەگەڵ موسوڵمانان بۆ جەنگی ئوحود ثابتی کوڕی وەقش ویەمانی کوڕی جابر لەگەڵ ژن ومنداڵەکانیان لە قەلاَکاندا دانرا بوون وە هەردووکیان زۆر بەتەمەن بوون یەکێکیان بەوی تریانی وت: باشە ئێمە چاوەڕێ ی چی دەکەین سوێند بەخوا هەر یەکە لە ئێمە تەمەنێکی زۆر کەمی ماوە لەمڕۆو سبەینێداین ئەوە بۆ شمشێرەکانمان هەڵنەگرین وپاشان خۆمان بگەیەنینە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵکو خوای گەورە شەهیدیمان بە قسمەت بکات ئەوە بوو هەردووکیان شمشێرەکانیان هەڵگرت پاشان چوون تا خۆیان گەیاندە ڕیزی موسوڵمانان بێ ئەوەی سوپای موسوڵمانان پێیان بزانن.[١٠٦]

## ١١٦.﴿ ئوصەیرمی کوڕی پابت لە ڕۆژی ئوحوددا ئیسلام چووە دڵیەوە ﴾

لە ڕۆژی ئوحوددا( الاصیرم)ی کوڕی ثابتی کوڕی وەقش کە ئەو باوەڕە بەگوڕو تینەی لە باوکە پیرەکەیدا بینی ئیسلام بوو وە خۆی گەیاندە ڕیزی سوپای بڕواداران ئەبو هورەیرە –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت: ئوصەیرم کە ناوی عەمری کوڕی ثابتی کوڕی وەقش بوو پێشتر ڕەخنەی لە موسڵمان بوونی خزمەکانی دەگرت وهەندێك پارەی ڕیبای لە جەهالیەت دا هەبوو ئەوە ببووە ڕێگری لە موسوڵمان بوون دەیویست پارەکانی وەرگریتەوە پاشان موسوڵمان ببێت بەلاَم کە ئەو ڕۆژە هاتە پێش پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ غەزای ئوحود لەو ڕۆژەدا ئیسلام چووە دڵیەوە وموسڵمان بوو وە چوو پرسیاری کرد ئامۆزاکانم لە کوێن ؟ وتیان: لە ئوحودن وتی: ئەی سەعدی کوڕی موعاز لە کوێیە ؟ ووتیان: لە ئوحودە ئەویش قەڵغانی سنگی لەبەر کرد

---

[١٠٦] (أخرجه ابن هشام برقم(٦٣٥) والحاكم(٣/ ٣٠٣) وقال صحيح على شرط مسلم وقال محقق (المستدرك) (٤٩٦١) إسناده صحيح.

وشمشێرەکەی ورمەکەی هەڵگرت وسواری پشتی ئەسپەکەی بوو پاشان چوو بۆ ئوحود وبە خێرایی خۆی گەیاندە ناو ڕیزەکانی موسڵمانانەوە وکاتێك موسوڵمانان بینیان پێیان وت: عەمر دووربکەوە لێمان ؟ ئەویش وتی: من موسڵمان بوومە.[107]

## ١١٧.﴿ موخەیریق وەسیەتی کرد کە ماڵ وسامانەکەی بدرێتە پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ﴾

موخەیریق جوولەکەیەکی ڕاست بوو لەو بەڵێنەی کە لەگەڵ موسوڵمانان دابووی کە پارێزگاری لە شاری مەدینە بکات ئیبن ئیسحاق دەڵێت: موخەیریق یەکێك بوو لە جوولەکەکانی بەنی ثعلە بە کاتێك جەنگی ئوحود هاتە پێش بە جوولەکەکانی خزمی وت: ئەی کۆمەڵی جوولەکە سوێند بە خوای گەورە دەزانن کە پێویستە لە سەرتان ئەمڕۆ موحەممەد سەربخەن؟ ئەوانیش وتیان: ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە ئەویش وتی: هەرگیز شەممە وپشووتان نەبێت پاشان شمشێر وکەل وپەلەکەی هەڵگرت وتی: ئەگەر کوژرام ماڵ وسامانەکەم هی موحەممەدە چی لێ دەکات ئارەزووی خۆیەتی ئەو بەرە بەیانە خۆی گەیاندە سوپای موسەڵمانان وپێغەمبەر(ﷺ) وپشتیوانی لێ کرد تا شەهید کرا.[108]

---

[107] (أخرجه أحمد(٢٣٦٣٤) وقال محققه الأرناؤوط:إسناده حسن، والطبراني(الكبير)(١٧/ ٣٧)، وأبو داود(٢٥٣٧) والحاكم(٢/ ١١٣) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي والبيهقي(الكبرى)(٩/ ١٦٧) والدينوري(المجالسة)(٢٤٢٤)وقال محققه: سنده حسن الشيخ الألباني في( صحيح أبي داود)(٢٢١٢)والشيخ المقبل في (صحيح المسند)(١٤٠٧)

[108] (أخرجه ابن هشام(السيرة)(٣/ ٤٤) والطبري(التأريخ)(٣/ ٥٣١) وابن سعد(الطبقات)(١/ ٣٨٩) وأبو نعيم(الدلائل) (٦/ ٨٧)

## ١١٨.﴿ مەربەعی کوڕی قەییزی مونافیق رق وکینەی خۆی ئاشکرا کرد بەرامبەر پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ﴾

لە کاتی دەرچوونی سوپای موسڵمانان بەرەو ئوحود پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: کێ دەتوانێت لە ڕێگەیەکەوە بمانبات بەلای ئەواندا نەڕوات؟ ئەبو خەیسەمە ئامادەی دەربڕی وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ئیتر توانی لە حەرەی بنی حاریسە ولە نێو ماڵەکانیانەوە تێپەڕێت لە نێو باخێکی مەربەعی کوڕی قەیزییەوە بردنی کە پیاوێکی مونافیقی کوێر بوو جا کاتێك هەستی کرد بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وموسڵمانان هەڵسا ودەستی کردە خۆڵ بەسەر پرژاندیان داو دەیووت: ئەگەر پێغەمبەری خوای من ڕازی نابم بە ناو باخەکەمدا تێپەڕیت دەشگێڕنەوە مشتێ خۆڵی هەڵگرتووە ووتوویەتی: سوێند بە خوا ئەگەر بمزانیبا فڕێی بدەم تەنها لە تۆ نەبێت لە کەسی تر نادات وامدە کرد ئیتر موسڵمانان هاتن بیکوژن بەلام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: مەیکوژن ئەمە کوێرە و دڵیشی کوێرە بەلام سەعدی کوڕی زەید بەنی عەبدولئە شهەلی پێش ئەوەی ئەم قسەیەی پێغەمبەری (ﷺ) پێ بگات بە کەوانەکەی لە سەری ئەو کابرایەی داو شکاندی.[١٠٩]

---

[١٠٩] (السيرة النبوية لابن هشام (٣/ ٧٣)

## ١١٩.﴿ بە سەرهاتی رافیعی کوڕی خودەیج وسومرەی کوڕی جوندەب لە جەنگی ئوحوددا ﴾

پێغەمبەر(ﷺ) لە سەر بازگەی خۆی لە(الشیخین) هەڵسا بەگێڕانەوەی هەندێك لە هاوەڵان چونکە تەمەنیان منداڵ بوو چواردە ساڵ وکەمتر بوون وەکو عەبدوڵلای کوڕی عومەر وزەیدی کوڕی سابیت وئوسامەی کوڕی زەید وزەیدی کوڕی ئەرقەم وبەرائی کوڕی عازیب وئەبو سەعیدی خودری ژمارەی ئەوانە گەیشتە چواردە منداڵ جێیگیریش بووە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر لە وانە بووە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای دا بە رافیعی کوڕی خودەیج کاتێك پێیان وت ڕافیع تیر هاوێژە کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە سومرەی کوڕی جوندەب چووە لای موڕڕەی کوڕی سینانی کوڕی سەعلەبە کە مێردی دایکی ومامی ئەبو سەعیدی خودری بوو هەر خۆیشی سومرەی بەخێو کردبوو لەلای خۆی پێی وت: ئەی باوکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای بە ڕافیع داوە ومنی گێڕاوەتەوە من لە زۆرانبازیدا ڕافیع دەبەزێنم ئیتر ئەم پیاوە چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی کردە لای ڕافیع وسومرەو پێی فەرموون: زۆرانبازی بکەن ئیتر سومرە ڕافیعی بەزاند وپێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای ئەویشی دا لەگەڵیان دەربچێت وکردنی بەسەربازی سوپاکەی کە هەر یەکە وتایبەتمەندی خۆی هەبوو .[١١٠]

---

[١١٠] (محمد رسول الله (٣/ ٥٧١).

## ١٢٠.﴿ بەسەر هاتی وەهبی کوڕی قابووسی موزەنی وحاریسی کوڕی قابووسی برازای لە جەنگی ئوحوددا ﴾

وەهبی کوڕی قابووسی موزەنی وحاریسی کوڕی قابووسی برازای لە کێوی موزەینەوە بە مەڕەکانیانەوە هاتن بۆ مەدینە بینییان شار چۆڵە پرسیاریان کرد خەڵکی لە کوێن؟ وتیان لە ئوحودن پێغەمبەر(ﷺ) دەر چووە شەر لەگەڵ بتپەرستان بکات ئیتر دەرچوون تاکو هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە ئوحود سەیریان کرد شەڕ گەرمە وپێغەمبەر وهاوەڵانی سەرکەوتوونە ئیتر ئەوانیش لەگەڵ موسوڵمانان بەشدار بوون لە دەستکەوتەکاندا ئینجا ئەسپ سوارەکان لە دواوە هاتن خالیدی کوڕی وەلید وعیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل ئیتر هەردووکیان شەڕێکی سەختیان کرد بەشێك لە سوپای بتپەرستان جیا بوویەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەرەقەتی ئەو کۆمەڵە دێت؟ وەهبی کوڕی قابووس وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ئینجا دەستی کرد بە تیر باران کردنیان تاکو گەڕاندنیەوە کۆمەڵێکی تریان لێ جیابوو بووەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ دەرەقەتی ئەو کۆمەڵە سەربازە دێت؟ موزەنی وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا ئینجا هەڵسا بە شمشێر گەڕاندنیەوە وگەڕایەوە کۆمەڵە چەکدارێکی تر هاتن وپێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کێ هەڵدەستێت بۆ ئەوانە ؟ دیسان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: هەڵسە ومژدەی بەهەشتت لێ بێت موزەنی بە خۆشحاڵیەوە هەڵسا ووتی: سوێند بە خوا نە پەشیمان دەبمەوە ونەوازدەهێنم ئنجا بە شمشێرەکەیەوە دەستی کرد بە لێدانیان وپێغەمبەر(ﷺ) تەماشای دەکرد تاکو لەو سەریانەوە دەرچوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: خوایە سۆزو بەزەیی خۆت بڕێژە سەری بەردەوام بە شمشێر وڕمەکانیان کوشتیان ودواتر بینرا بیست لێدانی کوشندەی پێوەیەو ئەتکیش کراوە ئنجا برازاکەی شەری کرد تا شەهید کرا عومەری کوڕی خەتتاب دەیوت خۆشترین مردن بەلامەوە مردنی موزەنییە.[١١١] سەعد دەڵێت: شایەتی دەدەم پێغەمبەرم(ﷺ) بینی لەسەری ڕاوەستابوو کاتێك کە شەهیدکرا بوو دەیفەرموو: خوای گەورە لێت ڕازی بێت من لەتۆ ڕازیم ئنجا بینیم

---

[١١١] (المغازي للواقدي ١/ ٢٧٥).

پێغەمبەر(ﷺ) بەو هەموو برینەشیەوە لەسەری ڕاوەستابوو تاكو خڕایە گۆڕەكەی بە پۆشاكێكی سەوز كفن كرابوو پێغەمبەر (ﷺ)دەستی درێژ كرد بەو پۆشاكە ڕووخساری داپۆشی ودرێژی كردەوە سەرگیانی تاكو گەیشتە نیوەی قاچی وفەرمانی پێ كردین گوژاڵكمان هێناو هەردوو قاچیمان داپۆشی لە گۆڕەكەیدا ئەنجا ڕۆیشت ، دەڵێ: منیش ئاواتە خواز بووم بەو شێوەیە بمردمایە .

## ١٢١.﴿ بەسەر هاتی حەنزەڵەی كوری ئەبو عامیر – ئەو كەسەی كە شەهید كرا فریشتەكان شۆردیان ﴾

حەنزەڵە كوری ئەبو عامیری فاسق بوو حەنزەڵە پێچەوانەی باوكی بوو گەنجێكی خوا ناس و سەر ڕاست بوو باوكی حەنزەڵە پیاوێكی نا پاك بوو مەددینەی بەجێ هێشت و پاڵی بە كافرانی قورەیشەوە داو دژی موسڵمانەكان چەكی هەڵگرت بەڵام حەنزەڵەی كوری ئەو پەڕی مەردایەتی و وەفادای نواند حەنزەڵە لە هەڵوێستی نا مرۆڤانەی باوكی شەرمەزار بوو بۆیە داوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرد تا مۆڵەت بدات باوكی بكوژێت بەڵام پێغەمبەری بە سۆز و ڕەحم ڕێگە نەدا و قەدەغەی كرد لە شەوی جەنگی ئوحوددا حەنزەڵە یەكەم شەوی زاوایەتی بوو هەر ئەو شەوە جەمیلەی كچی ئوبەی كوری سەلولی گواستبۆوە كە خوشكی عەبدوڵڵای كوری ئوبەی سەرۆكی نیفاق بوو حەنزەڵە پیاوانی بەشداری جەنگی ئوحودی كرد حەنزەڵە ئەو پیاوەیە كە ناونراوە بە (غسیل الملائكة ) چونكە كە شەهید كرا لەشی گران بوو بەفەرمانی خوا مەلائیكە شۆردیان كە بەیانی زوو جاڕ درا بۆ جیهاد بوكی بە جێ هێشتوو دەستی دایە كەرەستەی جەنگ و بێ ئەوەی ماوەی هەبێ خۆی بشوات بەپەلە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە جەنگ دەستی پێكرد حەنزەڵەش خۆی كرد بەناو ریزەكاندا و ناوجەرگەی مەیدانی جەنگ و گەیشتەی لای ئەبو سوفیانی فەرماندەی گشتی سوپای مەككە و هەڵمەتێكی دایە و چوار پەلی ئەسپەكەی قرتاندوو ئەبوو سوفیان لەسەری كەوتە خوارەوە كە ئەبوو سوفیان كەوتە زەوی حەنزەڵە هەڵمەتی داو پەریە سەرسەری و وویستی سەری ببڕێ

بەڵام بەفەرمانی خوا رۆژی ئەبوو سوفیان تەواو نەبووبوو نەبوا نەمرێ هەتا ئیمان بهێنێ و پلەی هاوەڵێتی دەست بکەوێ ئەوە بوو یەکێ لە پیاوەکانی دەوروبەری ئەبوو سوفیان کە ناوی شەددادی کوڕی ئەسوەد بوو بە نازناوی (ابن شعوب) ناسرا بوو بەپەلە هەڵمەتی دا تا ئەبو سوفیان رزگار بکات بە شمشێر حەنزەڵەی داگرتەوە و شەهیدی کرد دوای شەهید بوونی حەنزەڵەی پاڵەوان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( ان صاحبکم لتغسله ملائکة فسألوا أهل ما شأنه ؟ ) واتە : فەرمووی : مەلائیکە حەنزەڵە ئەشۆن لە هاوسەرەکەی پرسیار بکەن بزانن هۆی ئەمە چی یە ؟ کە پرسیار لە هاوسەرەکەی کرا ووتی : کاتێ کەدەنگی جار چی جیهادی بیست بەلەشی گرانەوە کەوتە رێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( لذالك غسلته الملائكة) فەرمووی : لەبەر ئەوە مەلائیکەت شۆردویانە .[112]

## ١٢٢.﴿ بەسەر هاتی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی حەرام —خوای لێ ڕازی بێ— لە غەزای ئوحوددا ﴾

عەبدوڵلا سوور بوو لە سەر بەشداری کردن لە غەزای ئوحوددا بە جابیری کوڕی وت: ئەی جابیر هیچت لەسەر نیە ئەگەر لە مەدینە بمێنیتەوە تاکو دەردەکەوێت مەسەلەی ئێمە بەچی دەگات سوێند بەخوا لە بەر ئەوە نەبێت کچ لە دوای خۆم بەجێ دەهێڵم حەزم دەکرد لە پێش دەستمدا بکوژرێیت.[113] هەروەها بە کوڕەکەی وت: وادەزانم لە سەرەتای ئەوانەی لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) شەهید دەکرێن من دەبم ئینجا من لە پاشی خۆم کەسم نیە لە تۆ خۆشەویست تربێت پێغەمبەر(ﷺ) نەبێت قەرزەکانم بدەرەوە وچاکە لەگەڵ خوشکەکانت بکە .[114]

---

[112] ژیانی ئازیزمان (ﷺ) بەرگی یەکەم لاپەرە (٧٥٠ – ٧٥١).

[113] (البخاری ) (٤٠٩٧).

[114] (البخاری) (١٣٥١).

عەبدوڵلاّ لەگەڵ موسوڵمانان دەرچوو پلەی شەهیدی بە دەست هێنا جابیر دەگێڕێتەوە دەڵی: كاتێك باوكم شەهید كرا لە ئوحود ڕوویم خستە دەرو دەگریام هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) داوایان لێ دەكردم نەگریم وپێغەمبەر(ﷺ) هیچی نەدەوتئینجا پوورەكەشم هەر لە سەر باوكم دەگریا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ( تبكين اولا تبكين مازالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفعتموه ).[115]

واتە: بگریت یان نەگریت فریشتەكان بە باڵیان سێبەریان بۆ دەكرد تاكو بەرزتان كردەوە پێغەمبەریش(ﷺ) جارێك بە جابیری فەرموو: ئەی جابیر بۆچی داماوی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوكم شەهید بوو هەندێ منداڵ وقەرزی بەسەر مەوە جێ هێشتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئایە مژدەت پێ نەدەم خوای گەورە باوكتی چۆن پێشوازی كرد وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: خوای گەورە لەگەڵ كەسدا قسەی نەكردوە لەپشت پەردەوە نەبێت بەلاّم لەگەڵ باوكت ڕاستەو خۆ قسەی كردو فەرمووی: بەندەكەم ئاوات بخوازە پێت دەبەخشم ئەویش وتی: خوایە زیندووم بكەرەوە بۆ ئەوەی جارێكی تر بكوژرێمەوە خوای گەورە فەرمووی: پێشتر بڕیومەتەوە لە ناگەڕێنەوە بۆ دونیا وتی: خوایە ئەمانەی دوای ئێمە ئاگادار بكەرەوە،[116] ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ {١٦٩} فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ {١٧٠} ) سوورەتی (ال عمران) ئایەتی(١٦٩-١٧٠).

---

[115] (البخاري)(١٢٤٤).

[116] (صحيح ابن ماجة الالباني رقم الحديث (١٥٨- ١٨٩).

## ١٢٣.﴿ ئەنەسی کوڕی نەضر بە ڕاستی بەڵێنەکەی خۆی بەجوانی بەجێ گەیاند ﴾

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت : - ئەنەسی کوڕی نضری مامم دواکەوتبوو لە جەنگی بەدر وتی:-

ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە یەکەم جەنگت لەگەڵ بتپەرستان دواکەوتم بەلاّم ئەگەر خوای گەورە ئەم جارە ئامادەی جەنگی هاوبەشپەرستەکانم بکات دەبینیت چی دەکەم وترسا هیچی تر بڵێت کاتێك کە جەنگی ئوحود بەرپا بوو موسوڵمانان ڕایان کرد وتی: - خوایە من داوای لێ بووردنت لێ دەکەم لەو کارەی کە موسڵمانان کردیان وە لە پێناوی تۆدا بەریم لەوەی کە موشریکەکان پێی هاتوون ونەنجامیان داوە پاشان بە شمشێرەکەیەوە چووە پێش وسەعدی کوڕی موعاز بەرەو ڕووی هات وپێی وت: - باوکی عومەر بۆ کۆی دەچیت ؟ ئەویش وتی: - دەچم بۆ بەهەشت ئای بۆنی بەهەشت کە خۆشە لە ناو هەمووتان دا من بۆنی دەکەم سەعد پێی وت ، - ئەی برام چی دەکەیت منت لەگەڵدام سەعد لە دوایدا بە پێغەمبەری وت: - ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی ئەو ئەنجامی دا من نەمتوانی ئەنجامی بدەم ئەنەسی کوڕی نە ضر ڕۆیشت جەنگا لەگەڵ موشریکەکان تا شەهید کرا ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت دواتر لاشەکەی ئەنەسی کوڕی نەضرمان دۆزیەوە وسەیرمان کرد لە هەشتا و سێ لاوە پێکرا بوو بە شمشێرو ڕم وتیر دواتریش موشریکەکان لاشەکەیان شێواند بوو کەس نەی دەناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت کە پووری من بوو ناوی ڕوبەیعەی کچی نەضر بوو وتی: براکەم نە دەناسیوە تەنها بەسەر پەنجەکەیدا نەبێت.[117]

---

[117] أخرجه :البخاري (٢٨٠٥ ) ومسلم (١٩٠٣ ) والترمذي(٣٢٠٠ – ٣٢٠١ ) والنسائي(الكبرى)(١١٤٠٣ ) وابن هشام (السيرة)(٣ / ٣٧ ) ١٢١

## ١٢٤.﴿ بەسەرهاتی ئەبەلغەیداق قزمان لە جەنگی ئوحوددا ﴾

یەکێك لەوانەی لەگەڵ موسڵمانان شەڕیان کرد لە ئوحود پیاوێك بوو قزمانی پێ دەوترا بە ئازایی دەناسرا بەڵام کە باسیان دەکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: (إنه من أهل النار) واتە ئەو لە خەڵکی دۆزەخە لە ڕۆژی ئوحوددا دوا کەوت بۆیە ژنانی بەنی زەفەر تانەو تەشەریان لێیدا ئینجا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) کە خەریکی ڕێکخستنی ڕیزەکان بوو تاکو خۆی گەیاندە ڕیزی یەکەم ئەو یەکەم کەس بوو کە تیر بهاوێت دوای ئەوە شەڕێکی زۆر نەبەردانەی کرد بە تیر وشمشێر ئینجا پێکراو کەوتە زەوی قەتادەی کوڕی نوعمان بانگی کرد : ئەی ئەبەلغەیداق پیرۆزت بێت شەهیدی موسڵمانانیش پێیان وت :- بە ڕاستی شەڕێکی چاکت کرد مژدەت لێ بێت ئەی قزمان وتی:- مژدەی چی ؟ سوێند بەخوا لەبەر خزمەکانم شەڕم دەکرد لە بەر ئەوەش نەبوایە شەرم نەدەکرد ئەوەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باس کرد وفەرمووی :- (إنه من أهل النار إن الله تعالى يؤيد هذا الدين بالرجل الفاجر) واتە:- ئەو دەچێتە دۆزەخەوە خوای گەورە پشتیوانی ئەم ئایینە دەکات بە پیاوی خراپەکار.[١١٨]

## ١٢٥. ﴿ کە هەڵیان گرتەوە وەك گا دەیبۆڕاند ﴾

عوروەی کوڕی زوبەیر – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- ئوبەی کوڕی خەلەف لە مەککە سوێندی خوارد بوو کە دەبێت پێغەمبەری خوا بکوژێت وئەم هەواڵەش گەیشتبۆوە پێغەمبەر(ﷺ) وفەرموو بووی بەڵکو من ئەو دەکوژم (أن شاء الله ) لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا ئوبەی کوڕی خەلەف هەموو لاشەی بە ئاسن داپۆشی بوو وە سەرو کڵاوی ئاسنینی پۆشی بوو تەنها چاوی دیار بوو هێرشی هێناو وتی:- ڕزگار نەبم ئەگەر موحەممەد ڕزگاری بێت هێرشی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) موصعەبی کوڕی عومەیر لە پێشی پێغەمبەر(ﷺ) وەستا بوو بۆ پارێزگاری کردنی ومەصعەب شەهید کرا وپێغەمبەر(ﷺ) چاوی بە ئەڵقەیەکی

---

[١١٨] (السيرة لابن هشام (٣ / ٩٩ )غزوة احد دراسة دعوية ( ١١٣ )

كراوەی نێوان كلاّو درعەكەی لە سەر قورِ قوراگەی ئوبەی كەوت رِمێكی بۆ هەڵدا ولەو جێگەیەی داو لەسەر ئەسپەكەی خستیە خوارەوە وبەلاّم خوێن لە جێ برینەكەی نەهاتە دەر وهاوەلاّنی هەڵیان گرتەوە وەك گا دەیبۆڕاند وپێیان وتبۆ وا بێ غیرەتی ئەوە تەنها رووشاویەكە ؟ ئەویش بەلێنەكەی پێغەمبەری(ﷺ) بۆ گێرانەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو بووی :- من ئوبەی دەكوژم پاشان وتی:- سوێند بە خوا ئەو ئازارەی ئیستا بە منەوەیە ئەگەر بە خەڵكی هەموو (ذي الحجاز)وە بێت هەموویان دەمرن ئەوە بوو ئوبەی پاشان مرد.[119]

## ١٢٦ . ﴿ بەسەرهاتی رِافعی كورِی خەدیج و نووكە ئاسنەكەی ناو سنگی ﴾

لە ریوایەتێكدا خێزانەكەی رِافعی كورِی خەدیج دەڵێت :- رِافع لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بوولە جەنگی ئوحوددا وتیرێكی تێ گیراو بەسەر سنگی گۆی مەمكی كەوت وهات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تیرەم لێ دەركە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :- (یا رافع إن شئت نزعت السهم والقطبة جمیعا ، وإن شئت نزعت السهم وتركت القطبة وشهدت لك یوم القیامة أنك شهید ) واتە:- ئەی رِا فیع كەر ویستت لێبوو ئەوا تیرەكە ونووكەكەی هەردووكیان دەردەكەم وە ئەگەر ویستت لێ بوو تیرەكە دەردەكەم ونووكە ئاسنەكەی دەر ناكەم وشایەتێت بوو دەدەم لە قیامە تدا كەتۆ شەهیدی رِافیعیش وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنها تیرەكە دەرێنە ونووكەكەی واز لێ بێنە وشایەتیم بۆ بدە لە قیامەت دا كە من شەهیدم ئەنجا پێغەمبەر(ﷺ) تەنها تیرەكەی دەركردوو نووكەكەی دەر نەكرد رِافیع لە دوای ئەوە ئەو نووكە تیرەی هەر لە جەستەدا بوو ژیا تا زەمانی خیلافەتی معاویە ولە پرِدا خوێنی بەر بوو لە جێگە نووكەكەدا ولە دوای نوێژی عەسر مرد.[120]

---

[119] أخرجه البیهقي (الدلائل) (٣/ ٣٥٨) وأبو نعیم (الدلائل) ( ٤١٥ )

[120] أخرجه: أحمد (٢٧/٢٨) وقال محققه الأرناؤوط: اسناده حسن، وأخرجه أیضاً، الطبراني (الكبیر) ٢٣٩/٤ برقم (٤٢٤٢) وقال البوصیري في (مختصر الأتحاف) ٤٧٧/٦ برقم (٥٠٦٠) رواه ابو داود والطیالسي بإسناد حسن.

## ١٢٧ ﴿ هەر هەموویان ڕازی بوونی پێغەمبەریان (ﷺ) پێ خۆش بوو ﴾

موسای کوڕی عوقبە و عوروەی کوڕی ئەلزوبەیر – خوایان لێ ڕازی بێ – دەڵێن:- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ناومەدینەو تێپەڕی بە کۆڵانەکانیدا گوێ ی لە گریانێکی زۆر بوو وفەرمووی ئەمە چیە ؟ ووتیان:- ئافرەتانی ئەنصارن بۆ شەهیدەکانیان دەگرین پێغەمبەریش(ﷺ) لە گریانی ئەوان حەمزەی مامی بە بیرهاتەوە وداوای لێخوشبوونی بۆ کردوو فەرمووی:- بەڵام حەمزە کەس نیە ئەمڕۆ بۆی بگری لە مەدینەدا پیاوانێکی یارمەتیدەران وەك سەعدی کوڕی موعاز وسەعدی کوڕی عوبادە وموعازی کوڕی جەبەل وعەبدەڵڵی کوڕی ڕەواحە گوێیان لەم ووتەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو گەڕانەوە بۆ خانووەکانیان وهەموو ئەو ئافرەتانەیان کۆکردەوە کە بۆ شەهیدەکانیان دەگریان وپێیان ووتن:- سوێند بە خوا نابێت بگرین بۆ شەهیدەکانتان تا بۆ حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) نەگرین چونکە باسی ئەوەی کردووە کە حەمزە هیچ کەسێکی نیە بۆی بگریت لە مەدینەدا وە هەمووان ڕازی بوونی پێغەمبەریان پێ خۆش بوو ئنجا عەبدوڵڵی کوڕی ڕەواحە هەموویانی هێنا بۆلای ماڵی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لە گریانە بوو فەرمووی:- ئەمە چیە ؟ ئەوانیش بۆیان گێڕایەوە کە یارمەتیدەران هەموو ئافرەتەکانیان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بۆ حەمزە بگرین پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ خۆش بوونی بۆ کردن وبەچاکە باسی کردن ڕازی بوو لەوانەی کە فەرمانیان داوە بەڕازی بوونی پێغەمبەر(ﷺ) وفەرمووی :- (ما هذا أردت وما أحب البكاء) واتە:- من ئەمەم نەویستووە وگریانم پێ خۆش نیە پاشان داوای لێ کردن کە دەست لە گریان هەڵگرن.[١٢١]

[١٢١] ( دلائل النبوة) للبيهقي ( ٣ / ٢١٦ - ٣٠٠)

## ١٢٨. ﴿ عەبدوڵلە ی کوڕی ئوبەی دوو ڕوو ڕازی نەبوو پێغەمبەر( ﷺ ) داوای لێ خۆشبوونی بۆ بکات ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرکردەی دووڕووەکان لە یەکەم جومعەی دوای جەنگی ئوحود ویستی نیاز پاکی ولایەنگیری خۆی وەك جاران دووپات بکاتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانان دوای ئەوەی کە سێیەکی سوپاکەی لە گۆڕەپانی جەنگدا گێڕایەوە ئیبن ئیسحاق – رەحمەتی خوای لێ بێت- دەڵێت :- عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی یەکێك بوو لە پیاو ماقوڵانی تیرەو هۆزەکەی خۆی لە هەموو کۆبوونەوەی جومعەیەك دا لە ناو هەمووواندا هەڵدەستاو لایەنگیری وسەرخستنی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دووپات دەکردەوە تا ئەوە بوو ئەو کارە نەبەجێیەی ئەنجامدا لە ئوحوددا وسێیەکی سوپاکەی گەڕاندەوە لە دوای ئەوە وەك جاران دیسان ویستی لە ڕۆژی جومعەدا هەستێت لە ناو خەڵکەکەدا و لایەنگیری خۆی دووپات بکاتەوە هەر کە ویستی هەستێت موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە جل وبەرگەکەیان گرت وپێیان وت:- دانیشە ئەی دوژمنی خوا تۆ ئەو پیاوە نیت دوای ئەوەی ئەو کارەت ئەنجامدا ؟ عەبدوڵڵاش بەسەر خەڵکاندا هەنگاوی دەنا بۆ چوونە دەرەوە لە مزگەوت ودەی وت:- هەستاوم لایەنگیری دەکەم دەڵێ ی قسەی ناشیرینم کردووە پیاوێکی یارمەتی دەران لە دەرگای مزگەوت دا گەیشتە ئەو مونافیقە وپێی وت:- کوڕە بگەڕێرەوە تا پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێخۆش بوونت بۆ بکات ؟ وتی:- وەڵلا نامەوێت داوای لێ خۆشبوونم بۆ بکات.[١٢٢]

خوای گەورەش وەصفی ئەم مونافیقانەی کردووە کە دەفەرمووێ :-

(وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُؤُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ {٥}) المنافقون .

---

[١٢٢] أخرجه إبن هشام (السيرة) (٣/ ٦٦) برقم(٦٦١) باسناد مرسل من الزهري وأورده البيهقي (الدلائل) (٣/٣١٨) وابن كثير (البداية) (٤/ ٩٥ )

واتە :- کاتێك پێیان بووترێ وەرن بۆلای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بکات سەرپێچی دەکەن سەریان بادەدەن وە دەیان بینیت ڕوو وەردەگێڕن لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان بە گەورە دەزانن .

هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵوێستیان جۆراو جۆر بوو لە بارەی ئەو مونافیقانەی کە گەڕابوونەوە لە جەنگی ئوحود زەیدی کوڕی ثابت –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) بەرەو ئوحود ڕۆیشت کەسانێك لەوانەی کە لەگەڵی دا بوون گەڕانەوە هاوەڵانی پێغەمبەریش(ﷺ) لە بارەی ئەوان دوو کۆمەڵ بوون کۆمەڵێکیان ووتیان:- دەیان کوژین وەکۆمەڵەکەی کەیان ووتیان:- نایان کوژین خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُواْ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ اللّهُ وَمَن يُضْلِلِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً {٨٨}) النساء

واتە:- ئەوە چیتانە دەربارەی دوو ڕووەکان بوونەتە دوو دەستە لە کاتێکدا خوا ئەوانەی گەڕاندۆتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی کردەوە کانیانەوە ئایا دەتانەوێت ڕێنمونی کەسێك بکەن کە خوا گومڕای کردووە وە هەرکەسێ خوا گومڕای بکات ئەوە هەرگیز ناتوانی ڕێگای ڕاست بدۆزیتەوە ، دوا جار پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- (إنها طيبة وإنها تنفي الخبث كما تنفي النار خبث الفضة) واتە:- ئەوە شاری مەدینەیە کە پیسی فڕێ دەدات وەك چۆن ئاگر ژەنگ وپیسی زیوو فڕێ دەدات.[١٢٣]

---

[١٢٣] اخرجه أحمد (٢١٦٣٦ و ٢١٥٩٩) وابن أبي شيبة (١٤/ ٤٠٦) والبخاري (٤٠٥٠) ومسلم(٢٧٧٦) والبيهقي (الدلائل) (٢٢٢/٣) واللفظ لأحمد

## ١٢٩ . ﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دڵنەوایی بیشری کوڕی عەقرەبە دەکات ﴾

پێغەمبەر(ﷺ)خێزانی شەهیدەکانی ئوحودی بەسەردە کردەوە بیشری کوڕی عەقرەبە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- گەیشتم بە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا و پێم وت:- باوکم چی لێ هات ؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی:- (أستشهد رحمة الله عليه) واتە:- شەهید بوو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ئیتر منیش گریام پێغەمبەر(ﷺ) منی گرت ودەستی هێنا بەسەرمدا ولەگەڵ خۆی سواری کردم وپێی فەرمووم:- (اسكت ما يبكيك أما ترضى أن أكون أنا أبوك وعائشة أمك ؟ ) واتە:- بێ دەنگ بە چی دەتگریەنێت ئەی ڕازی نابیت کە من باوکت بم وعائیشەش دایکت بێت.[١٢٤]

## ١٣٠ .﴿نزا کردنی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ حەمنەی کچی جەحش گیرابوو﴾

کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لە بەخاك سپاردنی هاوەڵانی بوویەوە سواری ئەسپەکەی بوو لەگەڵ موسڵمانان‌دا گەڕانەوە بۆ مەدینە ئیتر تووشی حەمنەی کچی جەحش بوو پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:- ئەی حەمنە داوای پاداشتی خوا بکە وتی:- کێ کوژراوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی :- خاڵوت حەمزەی کوڕی عەبدو لموتەلیب وتی:- (إنا لله وإنا إليه راجعون) خوای گەورە لێی خۆش بێت وشەهیدیش پیرۆز بێت ئنجا پێی فەرموو:- چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکە وتی:- کێ کوژراوە ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی:- موصعەبی کوڕی عومەیری مێردت وتی:- ئای لەو خەفەتە ئنجا هاواری کرد وقیژاندی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :- مێر دلە لای ژن پلە وپایەکی گەورەی هەیە ئەوەی فەرموو کاتێك بینی حەمنە خۆڕاگر بوو بەرامبەر کوژرانی خاڵوی وبراکەی بەڵام بۆ کوژرانی مێردەکەی هاواری کرد دوایی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد بۆ وات کرد ؟ وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا بیرم لە هەتیوی منداڵەکانی کردەوە وناڕەحەت بووم ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) دووعای بۆ خۆی ومنداڵەکانی کرد

---

[١٢٤] أخرجه البخاري (التأريخ الكبير) (١/ ٢/ ٧٨) وابن عساكر (التأريخ)(٣/ ٣٧٧) والبزار(٢/ ٣٨٥) (١٩١٠) وحسنه الشيخ الالباني في الصحيحة (٣٢٤٩).

کە خوای گەورە چاکەیان لەگەڵ دا بکات وئەو کەلێیەیان بۆ پڕ بکاتەوە،[١٢٥] دواتر شووی کرد بە تەڵحەی کوڕی عوبەیدەڵلا ودوو کوڕی لێ بوو بە ناوی موحەمەد وعیمران،[١٢٦] جا موحەمەدی کوڕی تەڵحە بەسۆزترین کەس بوو بۆ مندالەکانی.[١٢٧]

## ١٣١ .﴿ ئافرەتەکەی هۆزی دینارو خۆشەویستی بێ سنووری بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص – خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- پێغەمبەر(ﷺ) بەلای ئافرەتێکدا لە بەنی دینار تێپەڕی پیاوەکەی وباوکی وبراکەی کوژرا بوون لە ئوحود کاتێك هەواڵی کوژرانی ئەو کەسانەی پێ درا وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی بەسەر هات ؟ وتیان:- ساغ وسەلامەتە ئەی دایکی فلان ئەو لە سایەی خوای گەورە بەو شێوەیە کە تۆ پێت خۆشە وتی:- پێم نیشان بدە تا تەماشای بکەم ئاماژەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کرد تاکو بینی ووتی:- هەموو کارەساتێك لە پاش تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ئاسانە.[١٢٨]

---

[١٢٥] (البداية والنهاية) (٤/ ٧٤) غزوة أحد دراسة دعوية (٣٣٦)

[١٢٦] (الإصابة) (٨/ ٨٨) رقم (١١٠٦٠)

[١٢٧] (غزوة أحد لأبي فارس ص (١٠٩).

[١٢٨] (البداية والنهاية) (٤/ ٤٨).

## ١٣٢ ﴿ عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) جێ بە جێ کرد ﴾

موسای کوڕی عوقبە – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی ئونەیسی سولامی نارد بۆ لە ناو بردنی سوفیانی کوڕی عەبدوڵلای نەبیعی هەزەلی کە لە دۆڵی عورنەی بەردەم دەشتی عەرەفەی پشت مەککەوە بوو لەوێدا خەڵکانێکی لێ کۆبوونەوە بەمەبەستی خۆسازاندن بۆ هێرش کردنە سەر موسلمانان عەبدوڵلا ڕۆیشت ولە ڕێگەدا لەگەڵ خەڵکانی ئەو ناوچەیەدا بە ڕێکەوت خۆی بە یەکێك لە هۆزی خوزاعە دەناساند وبە هەرکەسێك بگەیشتایە پێ ی ڕادەگەیاند کە ئەو دەیەوێت خۆی بگەیەنێتە سوفیانی هوزەلی عەبدوڵلا بە ڕێکەوت خۆی گەیاندە سوفیانی هوزەلی کە لەو کاتەدا لە دۆڵی عورنە بە ڕێکەوتبوو هەموو ئەحابیشەکانی هاوپەیمانانی چوار دەوری کەعبەی بە دوواوە بوو عەبدوڵلا دەڵێت:- کاتێك کە سوفیانم بینی زۆر زۆری لێ ترسام وتم:- خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە پاشان خۆمم بۆ مەڵاس داو لە کەمیندا بووم بۆی خەڵکان ئارام بوون وحەوانەوە پاشان فرسەتم لێ هێناو لە ناوم برد.[١٢٩]

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی ئونەیسەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە ودەڵێت:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردم پێ ی فەرمووم :- هەواڵم پێ ی گەیشتووە کە خالیدی کوڕی سوفیانی نەبیعی هوزەلی خەڵکان کۆدەکاتەوە بۆ جەنگ لەگەڵ مندا لە ناوچەی عورنە لە ڕیوایەتێکی کەدا لە نەخلە تۆش بگەرە ئەو کەسەو بیکوژە دەڵێ:- منیش وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شێوەیم پێ بڵێ تا بیناسمەوە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- نیشانەی ناسینەوەی نێوان تۆو ئەو ئەوەیە کە دەیبینیت شەیتانت بیر دەکەوێتەوە وهەست دەکەیت لەرزۆکە عەبدوڵلا دەڵێت:- منیش شمشێرەکەم لەگەڵ خۆم برد تا گەیشتمە لای لە ناوچەی عورنە ئەو لەگەڵ یەکێك لە ژنە کانیدا جێگەیەکیان چاك دەکرد ئەویش لە کاتی نوێژی عەسردا بو وکاتێك بینیم بەو شێوازە لەرزۆکیەی ناسیمەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس

---

[١٢٩] (دلائل النبوة) للبيهقي (٤/ ٤٠ ).

کرد بووم لەوێدا ترسا مکە هەوڵدانم بۆ لە ناو بردنی ببێتە هۆی لەبیر چوونەوەی نوێژەکەم ولە دڵی خۆمدا وتم:- دەترسم هەوڵ وپەلامارەکەم بۆ لە ناوبردنی ببێتە هۆی دواخستنی نوێژەکەم بۆیە هەر بە ڕۆیشتنەوە ڕووبە ئەو نوێژم کرد وئاماژەم بە بەرزکردنەوە ونزم کردنەوەی سەرم دەکرد لە رکوع وسجود دا تا گیشتمە لای وئەو پێ ی وتم:- پیاوەکە کێ ی ؟ منیش وتم :- پیاوێکی عەرەبم باسی تۆ وئامادەکردنی سوپاکەتم دژ بەو پیاوە پێگەیشتووە و هاتووم تاکۆمەکیت بکەم لەو کارەتدا وتی:- بەڵێ من سەرقاڵی ئەو کارەم منیش تۆزێك لەگەڵیدا ڕۆیشتم تا فرسەتم لێ هێناو بە شمشێرەکەم لێمدا تا کوشتم وهەڵهاتم ئنجا ژنەکانی گەیشتنە سەری وئەوناوەم بە جێ هێشت وگەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وکاتێك منی بینی فەرمووی:- (أفلح الوجه) واتە:- ڕووخسارت ئازاد ورزگار بێت وسەرکەوتنت پێوە دارە دەڵێ:- منیش وتم:- من ئەوم کوشت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ڕاستت کرد پاشان هەستاو منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ناو ماڵەکەی خۆی وگۆچانێکی کوڵی دایە دەستم وفەرمووی:- (امسك هذه عندك يا عبدالله في رواية تخصر بهذه حتى تلقاني). واتە:- ئەمە بە دەستەوە بگرە تاکو بەمن دەگەیت منیش لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) چوومە دەرەوە وئەو گۆچانەم بە دەستەوە بوو هاوەڵانم پێیان وتم:- ئەم گۆچانە چیە بە دەستەوە ؟وتم:- ئەم گۆچانە پێغەمبەر (ﷺ) پێ ی بەخشیم وداوای لێ کردم کە لای خۆم بیهێڵمەوە ووتیان:- بۆچی ناگەڕێیتەوە پرسیاری ئەو گۆچانە لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەیت ؟ منیش گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتم :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گۆچانەت بۆ پێ بەخشیم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:-

(أية بيني وبينك يوم القيامة إن أقل الناس المتخصرون يومئذ ) واتە:- ئەو گۆچانەم پێ بەخشیت تا نیشانەیەك بێت لە نێوان من وتۆدا لە ڕۆژی قیامەت لەو ڕۆژەدا کە زۆر کەم لە خەڵکان نیشانەی وایان بە دەستەوە دەبێت عەبدوڵلا دەڵێت:- عەبدوڵلای باوکم لەو ڕۆژەوە لەگەڵ شمشێرەکەیدا بوو وهەردەم لەگەڵی بوو تا مرد ودواجار کرایە ناو کفنەکەی وبەیەکەوە نێژران.[١٣٠]

---

[١٣٠] أخرجه: أحمد (١٦٠٤٨ ١٦٠٤٧) وأبو داود(١٣٤٩) وأبو يعلى(٩٠٥) وابن حبان(٧١٦٠) والبيهقي(الدلائل) (٤/ ٤٣) وفي (الكبرى) (٣/ ٣٥٦) واسناد رجاله ثقات كما قال محققه (مسند أبي يعلى) (٣/ ٣٠٢) وقال ابن كثير في التفسير(١/ ٣٩٥) إسنادة جيد وحسن إسناد أبي داود (الحافظ) في الفتح (٤٣٧) .

## ١٣٣. ﴿بەسەرهاتی کارەساتەکەی بیری مەعونە﴾

عامیری کوڕی توفەیل یەکێك بوو لە سەرکردەکانی بەنی عامیرکە پیاوێکی لە سنوور دەرچووی ستەمکار بوو پێشی وابوو پێغەمبەر (ﷺ) زاڵ دەبێت بەسەر دوورگەی عەرەبیدا بۆیە ئەو بتپەرستە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ولە نێوان سێ شتدا سەرپشکی کرد هەڵبژێرێت یان دەسەلآت دا بەشبکرێت لە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) وخۆی دا یان ببێتە جێگیری پێغەمبرە (ﷺ) یان هێرش بکاتە سەر مەدینە بە هەزاران ئەسپ سوارەوە،[131] بێگومان پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ڕێگە چارە نەفامانەی هەمووی ڕەت کردەوە ئینجا عامیر کە (ملاعب الأسنة)ی پێ دەوترا وسەرگەورەی بەنی عامیر بوو خۆی هات بۆ مەدینە ودیاری پێش کەش کرد بە پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد موسڵمان بێت وئەویش ڕازی نەبوو پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو:- (فإني لا أقبل هدية من مشرك) واتە:- من دیاری لە بتپەرست وەرناگرم ئەویش وتی:- خەڵکانێك بنێرە بۆ نەجد من داڵدەیان دەدەم پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی کەسانێك وەك لە فەرموودەی ئەنەسدا –خوای لێ ڕازی بێ- هاتووە کە ووتوویەتی :- کەسانێك هاتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) ووتیان:- چەند پیاوێکمان لەگەڵ بنێرە بەڵکو قورئان وسوونەتمان فێربکەن پێغەمبەریش(ﷺ) هەڵسا بە ناردنی حەفتا پیاو لە یارمەتیدەران (القراء) یان پێ دەوترا حەرامی خاڵوی ئەنەسیشیان لەگەڵدا بوو ئەوانە قورئان خوێن بوون شەوان پێکەوە دەیانخوێند وفێردەبوون بە ڕۆژیش ئاویان دەهێنا بۆ مزگەوتەکەو داریان دەبڕی ودەیانفرۆشت وخواردەمەنیان پێ دەکڕی بۆ خەڵکی صوففە وهەژارەکان ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) ناردنی وئەوانیش بۆیان دانیشتن وشەهیدیان کردن پێش ئەوەی بگە نبە جێگای خۆیان ئەوانیش ووتیان:- خوایە پێغەمبەرەکەت ئاگادار بکەرەوە لێمان کە ئێمە چاومان پێکەوت وڕازیت کردین ولێمان ڕازی بوو دەڵێت:- پیاوێك هاتە لای حەرامی خاڵۆی ئەنەس ولە پشتەوە بەڕمەکەی لێ ی داو لە سینگیەوە دەرچوو حەرام وتی:- (فزت ورب الكعبه) واتە:- سوێن دبە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو : (إن إخوانكم قد قتلوا) واتە:- براکانتان کوژران و ووتیان:- خوایە پێغەمبەرەکەت لە حاڵمان ئاگادار بکە.[132]

---

[131] البخاري رقم ( ٤٠٩١ ) .

[132] (مسلم في الإمارة ) باب (ثبوت الجنة للشهيد) (٦٧٧)

## ١٣٤ ﴿ وەفاداری پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بەرامبەر بەڵێن وپەیمانەكانی لە ئەو پەڕی پلەدا بوو ﴾

(عمرو بن أمية الضمري) لە رۆژی كارەساتی بیری مەعونەدا بەدیل گیرا كاتێك عامیری كوڕی توفەیل زانی لە هۆزی موزەرە بەرپەدا وقژی تەوێڵی بڕی وئازادی كرد بەرامبەر ئازاد كردنی گەردنێك كە لەسەر دایكی بو وكاتێك عەمر بەرەو مەدینە دەرچوو لە رێگە لە سێبەرێكدا لایدا ودوو پیاوی لە بەنی عامیر بینی كە گرێبەستیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) عەمری كوڕی ئومەییە بەوەی نەدەزانی كە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانی بێ ترس كردووە لەسەر گیانی خۆیان عەمر پرسیاری لێ كردن :- ئێوە لە چی هۆزێكن ؟ ووتیان:- لە بەنی عامیرین ئیتر چاوەڕوانی كرد تاكو خەویان لێ كەوت وەك تۆڵە هەردووكیانی كوشت كاتێك گەڕایەوە مەدینەو ئەوەی باس كرد پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :- (لقد قتلت قتلين لا دينهما).[١٣٣] واتە:- دوو كەست كوشتووە پێویستە خوێنباییەكەیان بدەم ئەمەش هەڵوێستێكی زۆر بەرزە چونكە ئەو دوو پیاوە گرێبەستێكیان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە هیچ ئەژماری نەكرد بۆ ئەو ستەمەی هۆزەكەی بەنی عامیر لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) كردوویانە ئەوەش ئەوپەڕی وە فاداریە بەرامبەر بەڵێن وپەیمان خۆ دەكرا پێغەمبەر(ﷺ) ئەو كارەی عەمری كوڕی ئومەییەی بە بەشێك لە تۆڵە كردنەوە بژمارداپە لە دژی ئەو ستەمكارانە بەڵام گوناهی كەسانێكی بێتاوان چی بە تاكو بە تاوانی ستەمكارانی قەومەكەیان بكوژرێت ؟ ئاراستە ئیسلامیەكان پێغەمبەر(ﷺ) وموسلمانانیان هان دەدا رەوشتیان بەرز بێتە وە بە شێوەیەك كە هاو وێنەی نەبێت لە جیهاندا.[١٣٤]

---

[١٣٣] ( السيرة النبوية ) لابن هشام (٣/ ٣٠٦) .

[١٣٤] (التاريخ الإسلامي ) للحميدي (٦/ ٥٠)

## ١٣٥.﴿ عامیری کوڕی فوهەیرە لە دوای شەهیدبوونی بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ودوایی دووبارە دانرایەوە ﴾

لە پاش شەهید کرانی ئەوانەی لە بیری مەعونەدا شەهید کران وعەمری کوڕی ئومەییە بە دیلی کەوتە دەستیان عامیری کوڕی توفەیل وتی:- ئەوە کێ یە ؟ ئاماژەی بۆ یەکێك لە کوژراوەکان کرد عەمری کوڕی ئومەییە وتی:- ئەوە عامیرە کوڕی فوهەیرەیە وتی:- من ئەوم بینی لە پاش کوژرانی بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان تەنانەت سەیری ئاسمانم دەکرد لە نێوان ئەو وزەوی دا دوای ئەوە دووبارە دانرایەوە.[١٣٥]

## ١٣٦.﴿ ڕۆژی لەچکەکە ڕۆژێکی سەرسوڕهێنەری خوای پەروەردگار بوو ﴾

عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- کچێکی ڕەش پێستی خێڵێکی عەرەب کە ناوی وەلیدە بوو ئازادیان کرد بوو لە گەڵیاندا دەژیا کچۆڵەیەك لە ماڵ دەرچوو لەچکێکی بەسەرەوە بوو فڕێیدا یان لێی کەوت لەو کاتەدا داڵێك بەوێدا تێپەڕی و وایزانی پارچە گۆشتە پەلاماری داو فڕاندی کاتێ کەس وکاری گەڕان بۆی واگومانیان برد کە وەلیدە شاردوویەتیەوە هەموو گیانی کچەکە گەڕان نەیاندۆزیەوە وەلیدە دەڵێت:- بەخوا لەگەڵیاندا وەستابووم داڵەکە هات وفڕێی دایە بەردەمیان دەڵێت:- منیش وتم:- ئەوە ئەوەیە کە منتان تاوانبار دەکرد لە سەری منیش دوورم لەو کارەوە دایکە عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- پاش ئەوە وەلیدە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بوو لە مزگەوتەکەدا ژوورێکی بچووکی هەبوو یان چادرێك عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- هەموو جارێك دێتەلام وقسەم لەگەڵ دەکات بەڵام پێش ئەوەی دابنیشێت دەڵێت:- ڕۆژی لەچکەکە ڕۆژێکی سەر سوڕهێنەری پەروەردگارم بوو بەڵام لە ناوچەی کوفر ڕزگاری کردم عائیشە- خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- پێم وت:- ئەوە چیە دانانیشی هەتا ئەوە نەڵێیت؟ ئەویش بەسەر هاتەکەی بۆ گێرامەوە.[١٣٦]

---

[١٣٥] (البخاري في المغازي ) رقم (٤٠٩٣)

[١٣٦] (پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (١٢٦)

## ١٣٧. ﴿ بەسەرهاتی ژنە یارمەتیدەرەکە کە پاکانەی کرد بۆ عوثمانی کوڕی مە ظعون –خوای لێ ڕازی بێت ﴾

(أم علاء الحضرمي) –خوای لێ ڕازی بێ- کە ژنێك بووە لە یاریدەدەران (الأنصار) بەیعەتی داوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت:- کۆچەرییەکان بە قورعە بەشکران لە نێوا نماندا عوثمانی کوڕی مە ظعون-خوای لێ ڕازی بێ- بەر ئێمە کەوت ئێمەش لە ماڵەکانی خۆماندا وەك یەکێك لە خومان میوانداریمان کرد کەچی دوایی نەخۆش کەوت هەر بەو نەخۆشیە کۆچی دوایی کرد کاتێ کۆچی دوایی کرد وشۆردرا وبە جلەکانی خۆی کفن کرا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هات منیش وتم:- ئەی ڕەحمەتی خوات لێبێت ئەی (أبا السائب) من شایەتیت بۆ ئەدەم کە بەراستی خوا ڕێزی لێ نای پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- جا تۆ چوزانیت کە خوا ڕێزی لێناوە؟ منیش وتم:- باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئیتر خوا ڕێز لە کێ دەنێت؟ فەرمووی:- ئەم پیاوە دڵنیایی ویەقینی بۆ هات واتە تازە وەفاتی کردوو چوو بەرێی خۆیەوە بە خوا من هەر ئومێدی خێرم هەیە بۆی بەخوا من خۆشم کە پێغەمبەری خوام نازانم خوا چیم بەسەر دێنێ وچیم پێ ئەکات دەڵێت:- منیش وتم:- سوێن دبە خوا ئیتر لەمەولا پاش ئەو پاکانە بۆ هیچ کەس ناکەم واتە شایەتی پاکی وبەرائەت بۆ کەس نادەم.[١٣٧]

---

[١٣٧] (پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٢٧٣)

## ١٣٨.﴿بەسەرهاتی ئەو ئافرەتەی كە خێرەكانی دەبەخشیە هاوسەرەكەی﴾

زەینەب خێزانی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- لە مزگەوتدا بووم پێغەمبەرم (ﷺ) بینی بە ئافرەتانی فەرموو:- ببەخشن ئەگەر لە خشڵەكانیشتان بووە زەینەبیش خێرەكانی دەدا بە عەبدوڵڵای مێردی وچەند هەتیوێك كەلای خۆی بوون بە عەبدوڵڵای وت:- لە پێغەمبەر(ﷺ) بپرسە ئایە درووستە من خێرەكانم ببەخشم بە تۆ وبەو هەتیوانە ؟ عەبدوڵڵا وتی:- خۆت بپرسە زەینەب –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) بینیم ئافرەتێكی ئەنصاری لەبەر دەرگا وەستاوە وهەمان ئیشی منی هەیە بیلا لبە لاماندا تێپەڕی پێمان وت:- بپرسە لە پێغەمبەر(ﷺ) ئایە درووستە ئێمە دەبەخشین بە مێردەكانمان وئەو هەتیوانەی بە خێویان دەكەین ؟ بەڵام ناومان مەهێنە بیلال چووە ژوورەوە وپرسیاری كرد پێغەمبەر(ﷺفەرمووی:- كێن ؟ وتی:- زەینەب فەرمووی:- بەڵی دوو پاداشتی هەیە پاداشتی خزمایەتی وپاداشتی بەخشینەكەش.[١٣٨]

---

[١٣٨] (پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٣٣٣)

## ١٣٩.﴿ دوای ساتێك پیاوەکە لە بەستنەوە دەربازی بوو ﴾

ئەبو سەعید – خوای لێ ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەردا بوون ڕوویان کردە خێڵێك لە خێڵە عەرەبەکان داوای میوانداریان لێ کردن کەچی میوانداریان لێ نەکردن جا سەرۆکی ئەو خێڵە شتێك پێوەیدا زۆر هەوڵیاندا ئەملاو لایان کرد هیچ سوودی نەبوو هەندێکیان ووتیان:- بۆ نەچین بۆلای ئەو چەند کەسەی کە هاتن بەڵکو هەندێکیان چارەسەرێکیان لابێت ئەوسا هاتن بۆ لایان و ووتیان:- سەرۆکەکەمان شت پێوەی داوە هەوڵی زۆریشمان داوە سوودی نەبووە ئایە ئێوە چارە سەرێك شك نابەن ؟ هەندێ لە هاوەڵان ووتیان:- با بەخوا من دووعای بۆ دەخوێنم بەڵام خوا ئاگادارە کە ئێمە داوای میوانداریمان لێ کردن کەچی میوانداریتان لێ نەکردین لەبەر ئەوە من دووعاکە ناخوێنم هەتا شتێکما نبۆ بڕیار نەدەن ئەوسا لە سەر چەند سەمەڕێك ڕێکەوتن ئینجا قورئانی دەخوێند وتەڕایی دەمی دەدا لە شوێنی پێوەدانەکە ( الحمد لله رب العالمين)ی بەردەوام دەخوێند دوای ساتێك کابرا دەتوت لە بەستنەوە دەربازی بووە ئیتر هەستاو دەڕۆیشت هیچ ئێش و ئازارێکی نەما ئەوانیش ئەوەی کە ڕێکە وتبوون لەسەری هێنایان هەندێکیان ووتیان با بەشیان بکەین بەڵام ئەوەی کە قورئانەکەی دەخوێند وتی:- وا مەکەن هەتا دەگەینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وەهەموو شتێکی بۆ دەگێڕینەوە با بزانین فەرمانی بەچیە ئیتر هەموویان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بەسەر هاتەکەیان بۆ گێڕایەوە ئەویش پرسی:- باشە تۆ چۆن زانیت ئەوە دووعایەکی کاریگەرە ؟ پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بە پێکەنینەوە فەرمووی:- لە ڕاستیدا پێکاو تانەدا بەشی بکەون وبەشێکیش بۆ من دابنێن.[١٣٩]

---

[١٣٩] (پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٤٤٧)

## ١٤٠ .﴿ بەسەرهاتی عومەری کوڕی خەتتاب وهیشامی کوڕی حەکیم لە بارەی خوێندنی قورئان ﴾

عومەری کوڕی خەتتاب –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت گوێم لێ بوو هیشامی کوڕی حەکیم لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) سوورەتی( الفرقان) ی دەخوێند گوێم بۆ خوێندنەوەکەی گرت لەسەر شێوازێکی زۆر جیا دەیخوێندەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو شێوەیە بۆ منی نەخوێند بۆوە خەریك بوو لە نوێژەکەدا پەلاماری بدەم خۆم گرت تا سەلامی دایەوە یەخەی کراسەکەیم گرت وپێیم وت ئەم سوورەتی کەلێم بیستیت کێ پێی خوێندوویت ؟ وتی:- پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی خوێندووم پێم وت:- درۆ دەکەیت پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە شێوازێکی تر بە منی خوێندوە لەگەڵ خۆم بردم بۆلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتم:- من گوێم لە مەبوو سوورەتی ( الفرقان) ی دەخوێند بە شێوازێك تۆ وەها بۆ منت نەخوێندووە پێغەمبەر(ﷺ) وازی لێ بێنە ئەی هیشام بخوێنە خوێندی بەو شێوەیەی لێم بیستبوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- بەو شێوەیە هاتۆتە خوارەوە پاشان بە منی فەرموو:- (إقرأ یا عمر) منیش خوێندم بەو شێوەی بۆی خوێندبووم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- بەو شێوەیە هاتووەتە خوارەوە ئەم قورئانە بە حەوت شێواز هاتۆتە خوارەوە کامیان ئاسان بوو بەومیان بیخوێنن.[١٤٠]

---

[١٤٠] پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٨٠٢) .

## ١٤١ .﴿ ئافرەتەکەی لێ مارە کرا بەو ئەندازە قورئانەی کە لەبەری بوو ﴾

سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا هاتووم خۆمت پێشکەش بکەم پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیری کردو باش وورد بۆوە پاشان سەری داخست کە ژنەکە بینی پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی لە بارەیەوە نەفەرموو دانیشت یەکێك لە هاوەڵەکانی هەستاو وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر تۆ داخوازی نیت بۆ منی مارە بکە فەرمووی:- بڕۆماڵەوە بزانە هیچت دەست دەکەوێت ؟ ڕۆیشت وهاتەوە وتی:- نەبەخوا هیچم دەست نەکەوت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :- هەوڵ بدە با ئەڵقەیەکی ئاسنیش بێت کابرا چوو هاتەوە وتی:- نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەلقەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت بەلام ئەوە پۆشاکەکەمە هەر باشە نیوەی بۆ ئەو سەهل وتی:- ئەو پیاوە پۆشاکی تری نیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- چی دەکەی لەو تەنها پۆشاکەت ؟

تۆلە بەری بکەیت هیچ بۆ ئەو نابێت ئەویش لە بەری بکات هیچی بۆت ۆ نابێت کابرا دانیشتنەکەی درێژەی کێشا ئنجا هەستا پێغەمبەری خوا بینی کابرا ڕۆیشت فەرمانی دا بانگکرایەوە کە هاتەوە پێی فەرموو :- چەندە قورئانت لەبەرە وتی:- فلأنە سوورەت وفلأنە سوورەت ژمارەی کردن فەرمووی:- لەبەر دەیانخوێنیت ؟ وتی:- بەڵێ فەرمووی:- بڕۆ ئەوە لێم مارە کردیت بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە.[١٤١]

[١٤١] للبخاري (فضائل القرآن) (٤٧٤٢ ) .

## ١٤٢.﴿ مەعقەلی کوڕی یەسار کە گوێبیستی ئایەتەکە بوو خوشکەکەی مارە کردەوە لە پیاوەکە ﴾

مەعقەلی کوڕی یەسار- خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- خوشکێکی خۆم مارە کرد لە پیاوێك تەلاقی دا کە ماوەی عیدەی بەسەر چوو هات خوازبێنی کردەوە پێم وت:- کردمە هاوسەرت وڕێزم گرتیت تۆ تەلاقت دا پاشان هاتوویت خوازبێنی دەکەیتەوە نابەخوا هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆلات پیاوێکی خراپ نەبوو ژنەکەیش دەیویست بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (فلا تعضلوهن) واتە:- ڕێگایان لێ مەگرن بچنەوە لای مێردەکانیان منیش وتم:- هەر ئیستا دەیکەم ئەی پێغەمبەری خوا ئیتر لێ مارە کردەوە.[١٤٢]

## ١٤٣.﴿ پێغەمبەر (ﷺ) دادوەری کرد لە نێوان دوو ژنەکەی تیرەی هوزەیل ﴾

ئەبو هورەیرە –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت:- پێغەمبەر(ﷺ) قەزاوەت ودادوەری کرد لە نێوان دوو ژنی تیرەی هوزەیل کە شەڕیان کردبوو یەکێکیان بەردی هاویشتبوو بۆ ژنی دووەم دابووی لە سکی لە کاتێکدا کە باردار بوو منداڵەکەی کوشتبوو بۆ ئەو کێشەیە چووبوونە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش بەو جۆرە دادوەری کرد بوو لە نێوانیاندا خوێنی ئەو منداڵە کوژراوەی سکی ژنەکە کۆیلەیەکە بەندەیەکی پیاویان کە نیزەکێك لەو کاتەدا خاوەنی ئەو ژنەی تۆڵەی کەو تبووە سەر وتی:- چۆن خوێن بدەم ئەی پێغەمبەری خوا بەرامبەر منداڵێك لە سکدا نە خواردنەوەی خواردووە ونە خواردن نە زمانی بووە نە دونیای ڕۆشنی بینیوە شتی وا هەدەرە وخوێنی بەفیڕۆ چووە پێغەمبەر(ﷺ) دیار بوو بەم قسانە نارەحەت بوو بۆیە فەرمووی:- بە ڕاستی ئەم پیاوە لە دەستە برای کاهین ونەوانەیە کەلافی غەیب وزانین لێدەدەن،[١٤٣] کاهین بە کەسێك دەوترێ کە لافی غەیب لێدەدات یاپەیوەندی بە جنۆکەوە هەیە وهەواڵی دەدەنێ یا لە گۆترەوە نوقلانەی شت لێ دەدات ئەوانەش کە زیاتر (سجع) بەکار دێنن ولە خۆیانەوە هۆنراوە دەهۆننەوە پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕووداوەدا لە قسە هۆنینەوەی ئەو پیاوە نارەحەت بوو.

---

[١٤٢] پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٨١٦ ).

[١٤٣] پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە (٨٦٣ )

## ١٤٤ .﴿ پێغەمبەری خوا( ﷺ ) داواکاری هەردووك خزمەکەی ڕەت کردەوە ﴾

عەبدولموتەلیب کوڕی رەبیعەی کوڕی حارث دەڵێ:- رەبیعەی کوڕی حارث وعەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب کۆبوونەوە ووتیان:- بەخوا گەر ئێمەش ئەو دوو کوڕە بنێرین من وفەزلی کوڕی عەبباس بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)) قسەی لەگەڵ بکەن بەڵکو بیانکات بە کارمەندی زەکات وخەڵکی چی دەکات ئەوانیش بیکەن وخەڵك چی دەست دەکەوێت ئەوانیش دەستیان بکەوێت لەو کاتەدا ئەوان لەو گفتو گۆیەدا بوون عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب –خوای لێ ڕازی بێ – هاتە لایان وەستا ئەوانیش ئەو ڕازو نیازەیان بۆ باسکرد وتی:- کاری وا مەکەن بەخوا شتی وا ناکات رەبیعەی کوڕی حارث لە ڕویدا وەستاو وتی:- تۆ بۆیە وا دەکەیت حەسوودی بە ئێمە دەبەیت سوێن دبە خوا تۆ بویت بە زاوای پێغەمبەر(ﷺ) ئێمە حەسوودیمان بە تۆ نەبرد عەلی وتی:- بیانێرن ئەوان ڕۆیشتن وعەلیش – خوای لێ ڕازی بێ – ڕاکشا عەبدولموتەلیب دەڵێ:- کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی کرد پێشی کەوتین ولای حوجرەکەی وەستاین هەتا هات گوێی گرتین وفەرمووی:- چی لە دڵتاندایە دەری بڕن ئەو چووە ژوورەوە وئێمەش بە دوایدا لەو ژۆرەدا لای زەینەبی کچی جەحش بوو ئێمەش هەریەکەمان بەتەما بوو ئەوی تریان قسە بکات دوا جار یەکێکمان هاتە گۆو وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تۆ چاکترین کەس وخزم دۆست ترین کەسی ئێمەش گەورە بووین وکاتی ژن هێنانمان هاتووە هاتووین بمانکەیت بە کارمەندی هەندێ لەو خێرو زەکاتە خەڵك چیت بۆ دەکات ئێمەش دەیکەین وخەڵك چی دەست دەکەوێت ئێمەش دەستمان بکەوێت پێغەمبەر(ﷺ) ماوەیەکی زۆر بێ دەنگ بوو هەتا ویستمان قسەی لەگەڵدا بکەینەوە زەینەبیش لە پشتی پەردەکەوە ئاماژەی بۆ دەکردین قسەی لەگەڵ مەکەن لە دواییدا فەرمووی:- زەکات ناگونجێ بۆ بنەماڵەی موحەممەد چونکە چڵکی سامانی خەڵکیە محمیە ونوفلی کوڕی حارثی کوڕی موتەلیبم بۆ بانگ بکەن کە لەو ڕۆژەدا محمیە کارمەندی پێنج یەککی دەستکەوتەکانی جەنگ بووە دەڵێ:- هەردووکیان هاتن بۆ خزمەتی بە محمیەی فەرموو:- کچەکەت مارە بکە لەم کوڕە واتە:- لە فەزلی کوڕی عەبباس بە نەوفەلی کوڕی حاریثیشی فەرموو:- کچەکەت مارە بکە لەم کوڕە واتە:- لە من لێ ی مارە کردم ئینجا بە محمیەی فەرموو:- لە پێنج یەك ئەوەندە و ئەوەندە مارەیی بدە لە بری هەردووکیان زهری راوی دەڵێ:- ئەندازەکەی بۆ باس نەکردم.[144]

[144] پوختەی صەحیحی موسلیم بەرگی یەکەم لاپەڕە (٢٦٧ )

## ١٤٥ .﴿ بەسەر هاتی موسڵمان بوونی ثە مامە ی کوڕی ئاثـال ﴾

ئەبو هورەیرە – خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێ:- پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند سوارەیەکی نارد ڕووبە نەجد پیاوێکیان لە تیرەی بەنی حەنیفە بە دیل هێنا پێی دەوترا ثە ما مە ی کوڕی ئاثال گەورەی خەڵکی یەمامە بوو بەستیانەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوو بۆلای پێی فەرموو:- ئەی ثە مامە چیت لایە ؟ وتی:- ئەی موحەمەد خێرم لایە ئەگەر بمکوژی بەحەق دەمکوژی وە ئەگەر لێم خۆش ببی ئەوا لە کەسێکی سوپاسگوزار خۆش دەبی ئەگەر ماڵ وسامانیشت دەوێ ئەوا داوا بکە چەندت دەوێ پێت دەدرێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە جێی هێشت تا ڕۆژی دوایی دووبارە فەرمووی:- ئەی ثە مامە چیت لا هەیە ؟ وتی:- هەر ئەوەیە کە عەرزم کردوویت ئەگەر لێم خۆش ببی ئەوا لە کەسێکی سوپاسگوزار خۆش دەبی وە ئەگەر بمکوژی بەحەق دەمکوژی ئەگەر ماڵ وسامانیشت دەوێ ئەوا داوا بکە چەندت دەوی پێت دەدرێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ڕۆژەش بەجێی هێشت تا ڕۆژی سێ یەم دووبارە فەرمووی:- ئەی ثە مامە چیت لا هەیە ؟ وتی :- هەر ئەوەم هەیە کە عەرزم کردوویت ئەگەر لێم خۆش ببی لە کەسێکی سوپاسگوزار خۆش دەبی وە ئەگەر بمکوژی بەحەق دەمکوژی وە ئەگەر ماڵ وسامانیست دەوێ ئەوا داوا بکە چەندت دەوی پێت دەدرێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی :- ثە مامە بەردن بەپر تاو چوو بۆ ناو باخە خورمایەکی نزیك بە مزگەوتەکەوە خۆی شۆرد پاشان هاتە ناو مزگەوتەکەوە وتی:- (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمد عبده ورسوله) وتی :- ئەی موحەمەد سوێن دبە خوا لەم سەر زەویەدا ڕۆخسارێ نەبوو لەلام بە ڕادەی ڕووخساری تۆ ڕقم لێ بێ وا ئێستا ڕۆخساری تۆ خۆشەویسترینی هەموو ڕۆخسارەکانە لەلام سوێند بە خوا هیچ ئاینێك نەبووە لەلام کە بە ڕادەی ئاینەکەی تۆ ڕقم لێ بێت وا ئێستا ئاینەکەی تۆ لە هەموو ئاینێکی تر خۆشەویسترە لەلام سوێند بەخوا هیچ شارێ نەبووە لەلام کە بە ڕادەی شارەکەی تۆ ڕقم لێی بێ وا ئێستا شارەکەی تۆ بوومتە خۆشەویسترین شار لەلام سوارەکانی تۆ منییان گرت لە کاتێکدا کەمن دەمویست بچم بۆ عەمرە فەرمانت بە چیە ؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) موژدەی پێ دا

وفەرمانیشی پێ کرد کە عەمرە بکات کاتێ کە گەیشتەوە مەککە یەکێك پێی وت :- ئایە لە دینەکەت هەڵگەڕایتەوە ؟ وتی :- نەخێر بەڵام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) موسڵمان بووم سوێند بەخوا جارێکی تر لە یەمامەوە دەنکە گەنمێکتان بۆ نایەت تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی پێنەدات.[١٤٥]

## ١٤٦.﴿ئافرەتەکان کە گوێیان لە عومەر بوو عەباکانیان پێچا لە خۆیانەوە﴾

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ:- عومەر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتێکدا کە کۆمەڵێ ئافرەتی لابوو قسەیان لەگەڵ دەکردو ئامۆژگاری زیاتریان دەکرد دەنگیان هەڵبڕیبوو کاتێ عومەر ڕێگای خواست هەستان وخێرا عەباکانیان پێچا بە خۆیانەوە پێغەمبەر(ﷺ) بەدەم پێکەنینەوە ڕێگای عومەری دا عومەر وتی :- خوا دانەکانت بخاتە خەنین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:- سەرم لەم ئافرەتانە سوڕما کەلای من دانیشتبوون لە کاتێکدا دەنگی تۆیان بیست خێرا عەباکانیان پێچا بە خۆیانەوە عومەر وتی  هەقیان وایە لە تۆ زیاتر بترسن لە پاشدا عومە ربە ئافرەتەکانی وت :- ئەی ئافرەتانێك کە دوژمنی خۆتانن لەمن دەترسن ولە پێغەمبەر(ﷺ) ناترسن ؟ ووتیان:- بەڵێ تۆ ڕەق تری و ووشك تری لە پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی :- سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هیچ کات شەیتان بەتۆ نەگەیشتووە لەسەر ڕێگایەکدا مەگەر ئەو ڕێگایەکی تری گرتووە واتە ڕێگای خۆی گۆڕیووە.[١٤٦]

---

[١٤٥] البخاري ( المغازي) (٤١١٤)

[١٤٦] البخاري ( بدء الخلق ) ( ٣١٣٠).

## ١٤٧ .﴿ کچە هەتیوەکە گریا کە گوێی لە ووتەکەی پێغەمبەر( ﷺ ) بوو ﴾

ئەنەسی کوڕی مالیك –خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ :- کچێکی هەتیوو لای ئومو سولەیم – خوای لێ ڕازی بێ- بوو پێغەمبەر(ﷺ) چاوی بەم کچە هەتیوە کەوت فەرمووی :- ئەوە تۆیت ؟ بەڕاستی گەورە بوویت پێ نەگەیت کچە هەتیوەکە بە گریانەوە گەڕایەوە بۆلای ئوم سولەیم ، ئوم سولەیم وتی:- کچم چیتە ؟ کچەکە وتی:- پێغەمبەر(ﷺ) دووعای لێ کردم کە گەورە نەبم ئیتر قەت گەورەنابم یان وتی:- تەمەنم گەورە نابێت ئوم سولەیم بەپەلە چووە دەرەوە لەچکەکەی دا بە سەریدا هەتا گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) پاشان پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو :- ئوم سولەیم چیتە ؟ ئەویش وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا ئایە دووعات لەو کچە هەتیوە کردوە ؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- دووعای چی ؟ ئوم سولەیم وتی:- وادەزانێ کەتۆ دووعات لێ کردووە گەورەنەبێت یان تەمەنی گەورە نەبێت پێغەمبەر(ﷺ) زەردە خەنە گرتی پاشان فەرمووی:- ئوم سولەیم ئەی تۆ مەرجەکەی من لەسەر خوا نازانیت ؟ من بە ڕاستی مەرجم کردووە لەگەڵ خوای خۆمداو ووتوومە :- بەڕاستی من مرۆڤم ڕازی دەبم وەك خەڵکی ڕازی دەبن وتووڕە دەبم وەك ئەوان تووڕە دەبن هەر کەسێك من دووعام لێ کرد لە ئوممەتی من بە دووعایەك کە شایەنی نەبێت ئەوە بۆی بکە بە پاککردنەوەی گوناهی ولێی خۆش بەو بیکە بە هۆی نزیك خستنەوەی ئەو لە خۆتەوە لە دوا ڕۆژدا.[١٤٧]

---

[١٤٧] پوختەی صەحیحی موسلیم بەرگی (٢) لاپەرە (٩٠٦) .

## ١٤٨.﴿ بەسەر هاتی ئەبو بەکری صدیق و حەنظلە لە لە خزمەتی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ﴾

ابو عثمان الهندي –خوای لێ ڕازی بێ- ئەویش لە (حنظلة الأسيدي) یەوە –خوای لێ ڕازی بێ- ئەو پیاوە لە نووسەرانی سرووشت بوو دەڵێ :- أبو بەکری صدیقم پێ گەیشت وتی:- حە نظە لە چۆنی ؟ وتم:- حە نظە لە بووە بە دوو ڕوو وتی:- پاکی هەر بۆ خوایە ئەوە چی دەڵێیت ؟ دەڵێ وتم:- کاتێك لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) دەبین دۆزەخ وبەهەشتمان دەخاتەوە یاد وەك ئەوەی بەچاوی خۆمان بینیبێتمان کاتێك لای پێغەمبەر(ﷺ) دەر چووین ژن ومنداڵ وئیش وکار سەر قاڵمان دەکەن وهەموو شتیکمان لە بیر دەچێتەوە ئەبو بەکریش وتی:- سوێند بەخوا ئێمەش هەر بەو شێوەین هەمان حاڵەتمان هەیە حەنزەڵە دەڵێ :- من وئەبو بەکر چووین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتم : حەنزەڵە لە دوو ڕوویی کردووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- ئەوە چی یە ؟ ئەو دوو ڕوویە ؟ وتم :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك لای تۆ بین بەهەشت ودۆزەخمان دەخەیتەوە یاد وەك ئەوەی بە چاوی خۆمان بینیبێتمان کاتێکیش لای تۆ دەرچووین ئەوا ژن وماڵ ومنداڵ سەرقاڵمان دەکات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بە دەستە ئەگەر بەردەوام بن لە سەر ئەو حاڵەتەی کەلای منن یان لە یادکردنەوە دان ئەوا فریشتەکان لەگەڵتاندا دەبوون وتەوقەیان لەگەڵ دەکردن لە جێگەکا نتاندا ولە ڕێگاو بانەکاندا بەڵام حەنزەڵە کات کاتە سێ جار دووبارەی کردوە.[١٤٨]

[١٤٨] (پوختەی صەحیحی موسلیم بەرگی دووەم لاپەرە (٩٣٤)

## ١٤٩. ﴿ جوەیریەی کچی حارث ئافرەتێکی بە خێرو بەرەکەت بوو بۆ هۆزەکەی ﴾

ئیبن ئیسحاق – رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێت:- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە غەزای بەنی مصطلق ژمارەیەکی زۆر پیاو ئافرەتی بەدیل گرت وهەموویانی دابەش کرد بەسەر موسڵمانەکاندا لە ناویاندا جوەیریەی کچی حارثی کوڕی ضراری سەرکردەی بەنی مصطلقی تێدابوو موحەمەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر لە عوروەوە ئەویش لە عائیشەوە- خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێت :- کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) گیراوەکانی دابەش کرد جومیریەی کچی حارث بەر ثابتی کوری قەیس کەوت یان بەر کوڕە مامەکەی ثابت کەوت کە ناوی صەفوانی کوڕی مالیك بوو حوەیریە کتابەکەی کە بۆ کۆیلایەتی دەنوسرا لەسەر خۆی نۆ نۆقیەی نووسی کە بیداتە خاوەنەکەی کاتێك بیەوێت خۆی ئازاد بکات جومیریەش ئافرەتێکی جوان وبەرچاوی خوێن شیرین بوو هەر کەسێك چاوی پێ بکەوتبایە دەچووە دڵیەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وداوای لێ کرد هاوکاری بکات لە ئازاد کردنەکەیدا عائیشە دەڵێت وەڵڵاهی یەکەم جار کە بینی ملە دەرگای ژوورەکەم وەستا خۆشم نەویست زانیم ئەگەر پێغەمبەر چاوی پێ بکەوێ دەکەوێتە بەر دڵی دیارە سەیرکردن بۆ مەبەستی هاوسەرگیری بووە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر لەوە گەورەتر بووە وسەیری ئافرەتی نامەحرەمی نەکردووە چووە ژوورەوە وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من جومیریەی کچی حارثم گەورەی هۆزەکەی لەو بەلایەی من تووشی هاتووم خۆت ئاگاداری کە من بووم بە کەنیزەك و ئەوەیش لە بەڕێزت شاراوە نیە لە دابەش کردنەکەدا بەر ثابتی کوڕی قەیس یان کوڕە مامەکەی کەوتم لەسەر نۆ نۆقیە کتابەکەم نوسیوە بۆ ئازاد کردنم منیش هاتوومەتە خزمەتت تاکو پارمەتیم بدەیت ئازادم بکەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو :- (فهل لك في خير من ذلك) ؟ واتە:- پارەی ئازاد کردنەکەت لەسەر من وخوازبێنیت دەکەم بۆ هاوسەرگیری ؟ وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕازیم فەرمووی:- بەڵی منیش بەڵێنی خۆم جێ بەجێ دەکەم عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- هەواڵەکە گەیشتە خەڵکی کە پێغەمبەری

خوا(ﷺ) جوەیریەی کچی حارثی هێناوە خەڵکی ووتیان:- ئەوان هەموو بوون بە خزمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیتر ئەوانیش گیراوەکانیان ئازاد کرد وناردیاننەوە بەهۆی هاوسەرگیری یەکەی سەد کەس لە خزم وکەسی خۆی ئازاد کرد لە بەمی مصطلق نەمزانیووە هییچ ئافرەتێك لە جوەیریە بە خێرو بەرەکەت تر بوو بێت بۆ هۆزەکەی.[١٤٩]

## ١٥٠. ﴿ بەسەرهاتی ئەبی یەسر ئەو کەسەی کە ژنێکی ماچ کرد ﴾

بوخاری وموسلیم لە ابن مسعودەوە دەگێرنەوە دەڵێت :- پیاوێك ئافرەتێکی ماچ کرد هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە خوای گەورەش ئایەتی (وأقم الصلاة طرفي النهار وزلفا من الليل أن الحسنات يذهبن السيئات) دابەزانو پیاوەکەش وتی:- ئەو ئایەتە بۆ منە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:- بۆ سەرجەم خەڵکی یە ترمذی وفەرمووده گێڕەوەکانی تر دەگێڕنەوە لە ئەبی یەسرەوە دەڵێت:- ژنێك هات بۆلام خورمام لێ بکرێت منیش وتم:- لە ماڵەوە خورمای جوانترمان هەیە ئافرەتەکە لەگەڵما هات بۆ ماڵەوە وپەلامارم داو ماچێکم کرد ئنجا هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە فەرمووی:- تۆ چاکەی تێکوشەرێکی ڕێگەی خوات بەوە دایەوە ئاوا بەرامبەر ژنەکەی بکەیت ؟ ئینجا ماوەیەك کەوتە دەریای بیرکردنەوە هەتا پەروەردگار نیگای بۆ ناردو ئایەتەکە دابەزی.

---

[١٤٩] اخرجه احمد (٣٦٣٦٥) وقال محققه :- سنده حسن والطبراني (الكبير) (٣٤/ ٤٩) ابو داود(٣٩٣١) ابن حبان(٤٠٥٤ – ٤٠٥٥) وقال محققه إسناده قوي الحاكم(٤/ ٣٦) البيهقي(الكبرى) (٩/ ٧٤) و(الدلائل) (٤/ ٤٩) أبو يعلى(٤٩٦٣٩ وقال محققه إسناده صحيح ابن هشام (السيرة) (٣/ ٣٥٠) رقم (٨٠٣) وقال محققه إسناده حسن وحسن اسناده الشيخ الالباني في (صحيح ابي داود) (٣٣٣٧) وفي (الارواء) (١٣١) وقال الارناؤط في تخريج (زاد المعاد) (٣/ ١١٣) إسناده صحيح وقال الشيخ مقبل في الصحيح المسند (١٦٤٥)

## ١٥١. ﴿ جوولەکەیەك داوای گرەنتی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە دەڵێت:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) میوانێکی راگرت ئەوجا منی ناردە لای پیاوێکی جوولەکە تا ناردی لا بهێنم بە سەلەم ئەو کاتەش سەرەتای مانگی رەجەب بوو جوولەکەکە وتی:- نەخێر نایدەمێ تا گرەنتیم نەداتێ دەڵێت :- هاتمەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و وەڵامی جوولەکەکەم پێ ڕاگەیاند ئەویش فەرمووی:- سوێند بێ بەخوا من ئەمینو متمانە پێکراوم لە ئاسمان و زەویدا ئینجا هاوەڵەکە دەڵێت:- هێشتا لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) نەڕۆیشتبووم ئایەتی (ولا تمدن عينيك إلى ما متعنا بة أزواجا منهم) دابەزی .

## ١٥٢. ﴿ بەڕاستی پیاوەکە قسەکەی ڕاست وتەواو بوو ﴾

(ابن المنذر) و (ابن أبي حاتم) لە (ابن رزين)وە دەگێڕنەوە دەڵێت :- دوو پیاو شەریك بوون یەکێکیان بەرەو شام رۆیشت وئەوی تریشیان مایەوە کاتێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) رەوانەکرا نامەیەکی بۆ شەریکەکەی نووسی ودەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری کرد گوایە چی کردوە ؟ ئەویش وەڵامی نووسی کەوا لە قورەیش دا تەنها لاواز و هەژارەکان شوێنی کەو توون کابراش بازرگانەکەی بەجێ هێشت وگەڕایەوە بۆلای شەریکەکەی وپێی وت جێگەی پێغەمبەرم نیشان بدە جا ئەم پیاوە چەند کتێبێکی خوێند بوویەوە هاتە لای پێغەمبەرو وتی:- بۆچی بانگ دەکەیت ؟ ئەویش فەرمووی:- بۆ فلان شت وفیسارە شت وتی:- دەی شاهیدی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت ئەویش فەرمووی:- تۆ چۆن دەزانیت من پێغەمبەری خوا وتی:- هیچ کات پێغەمبەرێك ڕەوانە نەکراوە تەنها لاوازو هەژارەکان شوێنی کەو توون ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (وما أرسلناك في قرية من نذير إلا قال مترفوها إنا بما أرسلتم به كافرون) واتە:- دواتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بە شوێن کابراداو پێی فەرموو :- بەڕاستی خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە دەربارەی ڕاستیەتی ئەو قسەیە کە وتت .

## ١٥٣. ﴿ پیاوەکە مل کەچ بوو بۆ هەق ﴾

پیاوێك قەرزی لای پیاوێکی تر بوو هات بۆ داوا کردنەوەی قەرزەکەی کابرا قەرزدار داوای لە خاوەن قەرز کرد نەرم ونیان بێت وهەندێك لە قەرزەکەی خۆش بێت چونکە ناتوانێت قەرزەکەی هەمووی بداتەوە کابرا ڕازی نەبوو ئیتر دەنگیان بەسەر یەکتردا بەرز کردەوە خاوەن قەرز سوێندی خوارد سوێند بە خوا وا ناکەم پێغەمبەر(ﷺ) ئەم سوێندەی گوێ لێ بوو فەرمووی:- ئەوە کێیە زیادە ڕەوی دەکات لە سوێند داس وێند بەخوا دەخوات کە کاری چاکە نەکات کابرا وتی:- من بووم ئەی پێغەمبەری خوا کابرا هەستی بەهەڵەی خۆی کرد ئومێدەوار بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) لێی تووڕە نەبێت ڕووی کردەوە کابرا وتی:- کامیانت پێ خۆشە هەڵبژێرە یان چەندە دەتوانی قەرزەکە بدەیتەوە مەیدەرەوە یان بەویستی خۆت ئەندازەیەك لە قەرزەکە ببڕە بۆیە ئەم کارەی کرد تا ملکەچی هەق بێت و دڵی براکەی ڕازی بکات وگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر(ﷺ) بکات.[١٥٠]

## ١٥٤. ﴿ پارێزگاری کرد لە ئاشکرا کردنی نهێنی پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) ئەنەسی کوڕی مالیکی نارد بۆ کارێك بەوهۆیەوە ئەنەس کەمێك درەنگ گەڕایەوە بۆماڵەوە بۆیە دایکی پرسیاری لێ کرد لە هۆی درەنگ گەڕانەوەی ؟ ئەویش وتی:- خەریکی کارێکی پێغەمبەر ﷺبووم وتی:- چ کارێك ؟ ئەنەسیش وتی:- نهێنیە لەو کاتەدا ئوم سولەیم دایکی زۆر دڵخۆش بوو ئەوسا وتی :- ئەی ئەنەس نەکەی کەس لە نهێنی پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بکەیت.[١٥١]

---

[١٥٠] ( متفق علیه ).

[١٥١] ( رواه أبو داود ).

## ١٥٥. ﴿ عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە پابەند بوو بە کارە جوانەکانی پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە –خوای لێ ڕازی بێ – منداڵێکی بچووك بوولە ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەژیا ئەو هەر کات دەیویست نان بخوات دەستی دەگێڕا بەناو قاپەکەدا لە لایەکەوە نەیدەخوارد ئەمەش لە ئاکاری خواردن نیە پێغەمبەریش (ﷺ) هیچ هەڵێکی فەرامۆش نەدەکرد کاتێ لەگەڵ هاوەڵان کۆ دەبۆوە فێری شتانێکی دەکردن کە بەرژەوەندی دنیاو دوا ڕۆژی هەبێت ڕۆژێك عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە –خوای لێ ڕازی بێ – لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) نانی دەخوارد کاتێ بینی منداڵەکە وا نان دەخوات پێی فەرموو:- کوڕم نزیك ببەرەوە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فێری ئاکاری خواردنی کرد پێی فەرموو:- (بسم الله) بکەو بەناوی خوا دەست بە خواردن بکە بە دەستی ڕاست بخۆ ئنجا لەلای خۆتەوە بخۆ دەست مەگێڕە ئیتر هەمیشە عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە پابەند بوو بەو ئاکارە جوانانەی پێغەمبەر(ﷺ) فێری کرد.[152]

---

[152] ( رواه البخاري )

## ١٥٦. ﴿ دەستی شەیتان لەگەڵ دەستی هەردووکیان دا بوو ﴾

هاوەڵان – ڕەزای خوایان لێ بێ- کاتێ لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دادەنیشتن بۆ نان خواردن هەرگیز پێش ئەو دەستیان بە خواردن نەدەکرد جارێك لە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و لە دەوری خواردنێك دانیشتبوون کچێکی بچووك هات دەستی بۆ خواردنەکە درێژ کرد پێغەمبەر (ﷺ) دەستی گرت ونەیهێشت پاشان دەشتەکیەك هات ودەستی بۆ خواردنەکە درێژ کرد پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی بۆ ببات ئەم جارەش پێغەمبەر دەستی کابرای گرت پاشان فەرمووی:- هەر خواردنێك ناوی خوای لەسەر نەهێنرێت شەیتان بۆ خۆی حەڵاڵ دەکات منیش دەستیم گرت ونەمهێشت ئینجا ئەو کابرایەی هێنا تا خواردنەکەی پێ حەڵاڵ بکات دەستیم گرت سوێند بەخوا بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە دەستی شەیتان لەگەڵ دەستی هەردووکیان دا لە دەستی مندا بوو پاشان پێغەمبەر(ﷺ) (بسم الله) ی کرد ودەستی بە خواردن کرد.[١٥٣]

## ١٥٧. ﴿ پیاوە ئەنصاریەکە پابەند بوو بە نوێژی بە کۆمەڵ ﴾

پیاوێکی ئەنصاری ماڵیان زۆر لە مزگەوتەوە دوور بوو ولەگەڵ ئەوەشدا زۆر هەوڵی دەدا نوێژەکانی بە جەماعەت لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) بکات بۆیە هیچ کات لە جەماعەت دوا نەدەکەوت وەهاوەڵان زۆر بۆی بە پەرۆش بوون ئوبەی کوڕی کەعب –خوای لێ ڕازی بێ- پێشنیاری بۆ کرد کە دەمەوێت گوێ درێژیکت بۆ بکڕم تا هات وچووی پێ بکەیت ؟ چونکە بە ناو ئەو لە گەرمەدا هات وچۆ دەکەیت زۆر ماندوو دەبیت پیاوەکە وتی:- نا براکەم من زۆر دڵخۆش نیم لە نزیك مزگەوتەوە بم ئومێدم وایە خوای گەورە بەهاتنم بۆ مزگەوت وگەڕانەوەم بۆ ماڵ ئەجرو پاداشتی تەواوم دەست بکەوێت کاتێك ئەم هەواڵەیان دا بە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- داوا کارم خوای گەورە پاداشتی ئەوهات وچۆیەی بۆ کۆ بکاتەوە و پاداشتی بداتەوە.[١٥٤]

---

[١٥٣] (رواه مسلم ).

[١٥٤] (رواه مسلم ).

## ١٥٨. ﴿ بەسەر هاتی پیاوە خاوەن تەورەکە ﴾

رۆژێکیان پیاوێك داوای لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد تا خێرێکی پێ بکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچی نەدایە وفەرمووی :- چیت هەیە لە ماڵەوە ؟ کابرا وتی:- پارچە بەڕەیەك وپەرداخێك پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- بچۆ بیهێنە ئەوجا پێغەمبەر(ﷺ) بۆی فرۆشت بە دوو دەرهەم دایە دەستی سواڵکەرەکە فەرمووی:- بە دەرهەمێکیان خواردن بکڕە بۆ منداڵەکانت بە دەرهەمەکەی تر تەورێك بکڕە کابرا ڕۆیشت ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو بوو جێ بەجێ کرد وگەڕایەوە تەورێکی بە دەستەوە بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دەستی پیرۆزی تەورەکەی بۆ ساز کردو فەرمووی:- بڕۆ دار بهێنە لەو شاخە تا پازدە رۆژ نەت بینم کابرا رۆیشت دەستی کرد بە دارهێنان وفرۆشتنی لەو ماوەیەدا دە دەرهەمی دەست کەوتبوو دوای پازدە رۆژەکە هاتەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- بڕۆ بە هەندێکی خواردن بکڕە بەوەی تریش پۆشاك وراخەر بکڕە وە پاشان بۆی ڕوون کردەوە کە کار کردن باشترو پیرۆزە تا ئەوەی سواڵ بکەیت ودەست لە خەڵك پان بکەیتەوە فەرمووی:- ئەمە باشترو چاکترە لەوەی کە سواڵ بکەی چونکە سواڵ کردن وا دەکا خاڵێکی رەش لە دەم وچاوودا دەرکەوێ لە ڕۆژی دوای دا.[١٥٥]

## ١٥٩. ﴿ بەنو سەلەمە شوێنەکەی خۆی نەگۆڕی لەوێدا مایەوە ﴾

بەنو سەلەمەماڵیان زۆر دوور بوو لە مزگەوتەوە بەردەوام باسی دەکردوە بە کێشەیەکی گەورە تەماشای دەکرد وناڕەحەت دەبوو بە هاتن وگەڕانەوە رۆژێکیان بەنو سەلەمە وویستی خانووەکەی بفرۆشێت وەخۆی نزیك بکاتەوە لە مزگەوت وببێتە دراوسێی مزگەوت پێغەمبەر(ﷺ) بەم باسەی زانی وناردی بە شوێنیدا فەرمووی:- بیستوومە ئەتەوێ بارکەیت وخۆت نزیکی مزگەوت بخەیتەوە ؟ بەنو سەلەمە وتی:- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا نیازێکی ئاوام هەیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- ئەی بەنی سەلەمە ئاسەواری ڕۆیشتن وچوونت لای

---

[١٥٥] ( رواه ابن ماجة ).

خوا تۆمار دەکرێت ودەبێتە شاهید بۆت بمێنەرەوە لە شوێنی خۆت با بەردەوام خێری هاتن ورۆیشتنت بۆ بنوسرێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوو سێ جار ئەم ووتەیەی فەرمووو پاشان فەرمووی:- تۆ بەهەموو هەنگاوێك کە دەینێیت بەرەو مزگەوت خوا پلەیەك بەرزت دەکاتەوە بەنو سەلەمە ڕازی بوو وە خۆی هێشتەوە لەم دوورییە بەو هیوایەی بەردەوام ئەو پاداشتەی بۆ بنووسرێ دەیفەرموو :- مادام ئاوایە قەت ئەم شوێنە ناگۆڕم.[١٥٦]

## ١٦٠. ﴿ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ووشانەی فێری هەردووکیان کرد کە جبریل فێری کردبوو ﴾

عەلی کوڕی ئەبو تالیب –خوای لێ ڕازی بێ – خاتوو فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواست لە ماڵەوە ئیش وکاریان زۆر بوو وە زۆر ماندوو دەبوون بەهۆی هاڕینی گەنم بە دەستار ئیمامی عەلی داوای لە فاتیمە کرد کە بچێت بۆلای باوکی کە پێغەمبەرە (ﷺ) وە داوای لێ بکات کە خزمەتکارێکی بداتێ تا یارمەتی بدات بۆ کاروبارەکانی ماڵەوە خاتوو فاتیمە – خوای لێ ڕازی بێ- ڕۆیشت بۆ خزمەت باوکی بەلاّم شەرمی کرد ئەو داوایە لە باوکی بکات و بەدەستی خاڵی گەڕایەوە ئەم جارە لەگەڵ عەلی هاوسەری چوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە باسی ماندوویی وناڕەحەتی خۆیان کرد بەدەست ئیش وکاری زۆر و کاری گرانەوە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە خزمەتکارێکیان بداتێ پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی تێکردن وفەرمووی:- هەواڵتان بدەمێ بە شتێ کە لەوە باشترە کە ئێوە داوای دەکەن ؟ ووتیان:- بەڵێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- چەند ووشەیەکتان پێ دەڵێم کە جوبرەئیل منی فێر کردووە فەرمووی:- لە دوای هەموو نوێژێك دە جار ( سبحان الله) بکەن وە دە جار ( الحمد لله ) بکەن وە دە جار ( الله أكبر) بکەن وە ئەگەر چوونە سەر جێگای نووستن سی وسێ جار (سبحان الله ) بکەن وسی وسێ جار (الحمد لله) بکەن وسی وچوار جار ( الله أكبر) بکەن.[١٥٧]

---

[١٥٦] ( رواه مسلم ).

[١٥٧] ( رواه الإمام أحمد ).

## ١٦١. ﴿ قوبەیصەی کوڕی المخارق وشەیدایی بۆ وەرگرتنی زانست ﴾

قوبەیصەی کوڕی المخارق –خوای لێ ڕازی بێ – پیاوێکی پیر بوو بەڵام بە ساڵا چوونەکەی ی نەکرد واز لەوەرگرتنی زانست بێنێت چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:- ۆچی هاتووی ؟ قوبەیصە وتی:- تەمەنم زۆر بووە ئێسکەکانم لاواز بووە هاتووم شتێکم فێر کەی سوودم پێبگەیەنێ لای خوای گەورە پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆش بوو کە بە پیری هاتووە ـست وەربگرێ پێی فەرموو:- بەلای هیچ دارێك وبەردێکدا ودیوارێك دا نەڕۆیشتووی همموویان داوا ی لێ خۆشبوونیان بۆ کردووی دوایی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی کرد بە فێرکردنی ئەوەی سوودی پێ دەگەیەنێ فەرمووی:- ئەی قوبەیصە کاتێك نوێژی بەیانیت کرد سێ جار بڵێ پاك وبێگەردی بۆ خوای گەورە وە ستایشی ئەو دەکەم کە پاراستوومی لە نابینایی وگولی وئیفلیجی ئەی قوبەیصە بڵێ خوایە داوای ئەوە دەکەم کە لەلای تۆیەوە بڕێژە یەسەرما فەزلی خۆت وە بەر سۆزی خۆتم بخە وە بم خەرە بەر بەرەکەتی خۆت.[158]

## ١٦٢. ﴿ پیرە ژنەکە کە شادوومان بوو بە موژدەکەی پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

ڕۆژێك ئافرەتێکی بەساڵا چوو هاتە لای پێغەمبەری(ﷺ) پێی وت :- ئەی پێغەمبەری خوا داوای دووعام بۆ بکە بچمە بەهەشت ؟ پێغەمبەر(ﷺ) بە گاڵتەوە پێی فەرموو:- بێگومان بەهەشت کەسی پیری ناچێتە ناو ئافرەتەکە زۆر خەمبارو بێتاقەت بوو وە زۆر ترسا ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- تۆ دەگەڕێتەوە سەر شێوازی گەنجی ولاوی لە بەهەشتدا.[159]

---

[158] ( رواه الإمام أحمد ).

[159] ( أخرجه البيهقي ).

## ١٦٣. ﴿ پیاوە دەشتەکیەکە پابەندی فەرمانەکەی پێغەمبەر( ﷺ ) بوو ﴾

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك ڕێزگرتنێ لە هاوەڵانی وویستی بانگیان بکات بۆ میوانداریەك بۆ ئەم مەبەستە فەرمانی بەسەلمانی خزمەتکاری کرد کە خواردن ئامادە بکات و پێغەمبەریش (ﷺ) ڕۆیشت بۆ ئەوەی هاوەڵان بانگ بکات بۆ سفرە و خوانەکە پێغەمبەر(ﷺ) وهاوەڵان نانیان خوارد وتێر بوون وکەمێك خواردن مایەوە لەو کاتەدا کابرایەکی دەشتەکی بانگی کرد بۆ نان خواردن کابرا هات وخواردنەکەی هەموو بە دەستەوە گرت وناوی خوای نەهێنا ودەستی بە خواردن کرد پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری کرد فەرمووی:- خواردنەکە دابنێ وپاشان ناوە خوا(بسم الله ) بکەو لەو جێگەوە دەست بە خواردن بکە کە لێت نزیکە واتە:- لە بەردەمی خۆتەوە کابراش گوێی بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) گرت وتێری خوارد وهێشتا خواردن هەر مایەوە.

## ١٦٤.﴿ تەلحەی کوڕی بەڕرا وخۆشەویستی بێ سنووری بۆ پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

تەلحەی کوڕی بەڕرا پێغەمبەری خوای (ﷺ) زۆر خۆش دەویست وزۆر لێی دەترسا کە خراپەیەکی بەسەر بهێنن ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی زستان تەلحە نەخۆش کەوتبوو پێغەمبەر(ﷺ) چوو بۆ سەردانی کاتێك کە هاتە دەرەوە بە نزیکەکانی فەرموو:- وا نابینم تەلحە زیندوو بمێنێت ودەمرێت بۆیە ئەگەر مرد ئاگادارم بکەنەوە تا ئامادەی بم ونوێژی لەسەر بکەم ئێوەش خێرای لێبکەن کاتێ کە شەو داهات تەلحە هەستی بە ئەجەلەکەی کرد بۆیە دەورو بەرەکەی کۆکردەوە وپێی وتن:- ئەگەر مردم بمخەنە ناو گۆڕەوە وبمگەیەننە پەروەردگارم نەکەن پێغەمبەر(ﷺئازار بدەن وهەواڵی کۆچی منی پێبدەن چونکە لەبەر جولەکەکان زۆری لێدەترسم شتێکی بەسەر بهێنن تەلحە لە نیوەی شەودا خەمی ئەوەیەتی جولەکەکان بەڵایەك بەسەر پێغەمبەر دا (ﷺ) بهێنن بەڵێ ئەوە بوو تەلحە مرد وکەس وکارەکەی بە نهێنیەوە

[١٦٠] (رواه الطبراني ).

ئەسپەردەی خاکیان کرد لە بەرەبەیانیدا کە هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە ڕێ بەرەو لای گۆڕەکەی لەگەڵ خەڵکیدا ڕاوەستاو دەستەکانی بەرز کردەوە وفەرمووی:- پەروەردگارا تەلحە بگەیەنە بەخۆت بە شێوەیەك بۆی پێبکەنیت وئەویش بۆ تۆ پێبکەنێت.[١٦١]

## ١٦٥. ﴿ کۆڕێك کە شانازی پێ دەکرێت بە سەر فریشتەکاندا ﴾

عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە –خوای لێ ڕازی بێ– یەکێك بوو لە هاوەڵە بەرێزەکان کە زۆر عاشقی زیکر بوو سور بوو لەسەر بەستنی کۆڕی زیکر ئەو هەر جارێك لە ماڵ دەر دەچوو هەواڵی کۆڕی زیکری دەپرسی خەڵکی بۆ بانگ دەکرد کە ئەگەر بگەشتایە بە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیوت:- وەرە با چەند ساتێك ئیمان بە خوا نوێ بکەینەوە بۆیە ڕۆژێکیان لە ماڵ دەرچوو گەیشت بە پیاوێك لە هاوەڵان پێی وت:- وەرە با ساتێك ئیمان بهێنین کابرا تووڕە بوو لەو قسەیەو چوو بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبینی لای عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ئارەزووی لە ئیمانت نیە وباس لە ئیمانی ساتێك دەکات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:- خوای گەورە ڕەحم بکات بە عەبدەولای کوڕی ڕەواحە ئەو کۆڕێکی خۆش دەوێت کە تیایدا شانازی پێ بکرێت بەسەر فریشتەکاندا.[١٦٢]

---

[١٦١] (رواه الطبراني).

[١٦٢] (رواه الإمام أحمد).

## ١٦٦.﴿بەسەر هاتی لەقیتی کوڕی صەبرە لە خزمەتی پێغەمبەردا ( ﷺ )﴾

لە لە( لقيط ) ی کوڕی ( صبرة)وە دەگێرنەوە کە ووتوویەتی   من نوێنەری هۆزی مونتەفیق بووم یان یەکێ بووم لە نوێنەرانی هۆزی مونتەفیق بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی :-کاتێ کە گەیشتینە ئەوەێ تەشریفی لە ماڵ نەبوو نەمان دی بەلاّم عائیشەی دایکی باوەڕدارنمان – ڕەزای خوای لێ بێ – بینی لە قیط وتی:- عائیشە – ڕەزای خوای لێ بێ- فەرمانی کرد خواردنی خەزیرەمان بۆ درووست بکەن کە بریتیە لە پارچە گۆشتی بچووك بچووك لەناو خوێ ئاودا دەیکوڵێنن کاتێك کە کولاّ ئاردی پێوە دەکەن وتی:- بۆمان درووستکرا ولە سەر تەبەق سینیەك دا بۆیان هێنایین قوتەیبە ڕاوی فەرموودەکە نەیوت تەبەق تەبەق شتێکە خورمای تێدایە پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات وفەرمووی:- ئایە شتێکتان دەست کەوتووە بیخۆن یان عائیشە فەرمانی کردووە کە شتێکتان بۆ درووست بکەن ؟ ووتمان بەڵێ :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی:- لە کاتێکدا کە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشتبووین وتووێژمان دەکرد شوانەکە مەڕەکانی هێنایەوە ودەیکردنە بەچەوە بەرخۆلەیەکی پێ بوو قارە قاڕی بوو پێغەمبەر(ﷺ) بە شوانەکەی فەرموو:- ئەی فلاّن کەس چی بووە وتی:- بەرخێکی بووە فەرمووی:- لەجیاتیدا مەڕێکمان بۆ سەربڕن پاشان فەرمووی:- وا مەزانن لە بەر ئێوە سەری دەبڕین سەد سەر مەڕمان هەیە نامانەوێت زیاد بکەن هەر کاتێك بەرخێك لە دایك بوولە شوێنیدا مەڕێك سەردەبڕین وتی:- وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ژنێکی دەم درێژ زمان پیسم هەیە فەرمووی :- دەی مادام وە هایە تەلاّقی بدە وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵی ژیانمە ومنداڵم لێی هەیە فەرمووی:- دەی ئامۆژگاری بکە ئەگەر خێری تێدا بێت وەری دەگرێت و بەگوێت دەکات بەلاّم لە ژنەکەت مەدە وەك چۆن دەدەی لەخزمەتکارەکەت وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستنوێژم فێر بکە ؟ فەرمووی:- بەباشی دەست نوێژ بگرە وپەنجە بخە نێوان پەنجەکانتەوە وزۆر چاك ئاو بدە بەلوتداو چاك هەڵیمژە مەگەر بەرۆژوو بێت واتە:- ئەگەر بە ڕۆژوو بوویت زۆر هەڵی مەمژە نەوەك بڕژێتە قوڕگتەوە ورۆژووەکەت بەتاڵ بێتەوە.[١٦٣]

---

[١٦٣] صحيح سنن ابو داود رقم (١٤٢) و صححه الشيخ الالباني

## ١٦٧. ﴿ حارثی کوڕی خوزاعی پابەند بوو بەو بەڵێنەی کە دابووی بە پێغەمبەر( ﷺ ) ﴾

ئەحمەد وئەوانی دیکەش لە حارثی کوڕی خوزاعی یەوە دەگێڕنەوە دەڵێت چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەویش بانگی کردم بۆلای ئیسلام منیش دانم پیادا هێناو موسڵمان بووم پاشان بانگی کردم بۆ زەکاتدان ودانیشم بەوەدا ناو وتم :- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەڕێمەوە بۆ ناو هۆزەکەم وبانگیان دەکەم بۆ موسڵمان بوون وزەکاتدان ئەوەی وەڵامم بداتەوە زەکاتی لێ وەردەگرم وکۆی دەکەمەوە تۆش نوێنەرێك بنێرە لە هەمانکاتدا هەتا ئەوەی من کۆی دەکەمەوە بۆتی بنێرم دوای ئەوەی حارث ڕۆیشتەوە وزەکاتەکەی کۆکردەوە لە وانەی وەڵامی بانگەوازەکەیان دا بوویەوە پاشان وادەی دیاری کراوی هاتنی نوێنەرەکانی پێغەمبەری خوا هات بەڵام نوێنەرەکان دواکەوتن حارث گومانی بۆ پەیدا بوو وای زانی خوا وپێغەمبەرەکەی لێی زویر بووین بۆیە پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی بانگ کردو پێی وتن پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێکی دیاریکردووە کە تیایدا نوێنەرەکانی بنێرێت هەتا ئەو زەکاتەی کۆمان کردۆتەوە بیبەن کەچی تا ئیستا نوێنەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) دیار نیە نەهاتنی نوێنەریش بەزویر بوونی پێغەمبەر(ﷺ) لێك دەدەمەوە با بچین وخۆمان بگەیەنینە خزمەتی لە هەمان کاتدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەلیدی کوڕی عوقبەی نارد تا ئەو زەکاتەی کۆکراوەتەوە وەری بگرێت وبهێنێت کاتێك وەلید دەرچوو هەندێك لە ڕێگای بڕی دواتر دوو دڵ بوو بە شوێن پێی دا هاتەوە دواوە تا گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو جا وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) حارث زەکاتەکەی نەدامێ و وویستی بمکوژێت پێغەمبەری خواش (ﷺ) کۆمەڵێکی ترو چەند نوێنەرێکی نارد بۆلای حارث لەو لایشەوە حارث لەگەڵ هاوەڵەکانیدا هاتن و لە دەرەوەی شاری مەدینە بەیەك گەیشتن وتێکەڵ بەیەك بوون وحارث وتی:- ئێوە بۆ کوێ ڕەوانە کراون ؟ ئەوانیش ووتیان بۆلای تۆ ؟ وتی:- بۆچی ؟ ووتیان:- پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەلیدی کوڕی عوقبەی بۆلای تۆ ناردووە و تۆ زەکاتت نەداوەتێ وهەوڵی کوشتنت داوە حارث وتی نەخێر سوێند بەو زاتەی کە موحەممەدی بە حەق

ڕەوانە کردووە بەهیچ شێوەیەك چاوم پێ نەکەوتووە وهەرگیز نەهاتۆتەلام کاتێك حارث چووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو:- ئەی حارث زەکاتت نەداوە و ویستووتە نوێنەرەکەشم بکوژی ؟ ئەویش وتی:- نەخێر سوێند بێت بەو زاتەی کە بەهەق تۆی ڕەوانە کردووە بەهیچ شێوەیەك شتی وەها ڕووی نەداووە نەچاوم پێی کەوتووە ونەهەوڵی کوشتنیم داوە منیش بۆیە هاتووم هەتا زەکاتەکە بدەم چونکە نوێنەری تۆڵ ە وادی خۆی دوا کەوت ولە کاتی خۆیدا نەهات منیش لەوە دەترسام ئەو دواکەوتنە دەرخستنی تووڕەبوونی خواو پێغەمبەرەکەی بوو بێت پاشان لە سوورەتی (الحجرات) دا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ {٦} وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُوْلَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ {٧} )الحجرات : واتە:- ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراو هەواڵێکی بۆهێنان خێرا بڕوای پێ مەکەن بەڵکو سەرنج بدەن لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە تەوەکو ئازار وناخۆشی وگیر وگرفت بۆ خەڵکی درووست بکە نبە نەزانی جا دوای پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کە پێی هەستاون ئێوە دڵنیا بن وبزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناو تانوایە پرس و ڕای پێ بکەن زۆر شت هەیە ئەگەر ئەو بەڕای ئێوەی بکردایە تووشی گیروگرفت وناخۆشی دەبوون بەڵام خوا ئیمان وباوەڕی لە لا خۆشەویست کردوون ولە دڵ ودەروونتاندا ڕازانوویەتیوە لەو لایشەوە کوفرو بێباوەڕی وگوناهوو یاخیبوون لە فەرمانی خوای لە لا تاڵ وناشیرین کردوون ئا ئەوانە هەر خۆیان ڕێگای ژیرو سەر فرازیان گرتوتە بەر .

## ١٦٨.﴿ هەردوو لا پاشگەز بوونەوە وخۆیان سپارد بە فەرمانی پەروەردگار ﴾

(إبن جرير) و(إبن أبي حاتم) له (سدى) ه وه دەگێڕنەوە دەڵێت پیاوێك لە پشتیوانەکان ناوی عیمران بوو خێزانێکی هەبوو پێیان دەوت (أم زيد) ئەم ئافرەتە نیازی هەبوو سەردانی خزمەکانی بکات بەڵام مێردەکەی ڕێی لێگرتبوو لە جێگەیەکی بەرزدا داینابوو ئافرەتەکەش وەڵامی نارد بوو بۆ خزمەکانی وهاتبوون بەدەمیەوە ودایان گرتبوو تا بیبەنەوە لەو کاتەشدا مێردەکەی لەماڵ چوو بووە دەرەوە خزمانی خۆی بانگ کردبوو پاشان ئامۆزاکانی پیاوەکە لەو نێوانەدا هەوڵی ئەومیان دابوو نەیەڵن خزمانی ئافرەتەکە خێزانی ئامۆزاکەیان ببەنەوە دەرەنجامی ئەم بارو دۆخەش بە دەنگە دەنگ ودەستەویەخە بوونی یەکدی ونەعل کێشا نبە یەکتردا دوایی هاتبوو ئەوجا ئەم ئایەتە سەبارەت بەو ڕووداوە هاتە خوارەوە ( وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا) دواتر پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بە دوایاندا ودادوەریکرد لە نێوانیان هەردوولاش پاشگەزبوونەوە وخۆیان سپارد بە فەرمانی پەروەردگار .

## ١٦٩.﴿ پێغەمبەری خوا کە گوێ بیستی قسەی جوولەکەکان بوو تووڕە بوو لێیان ﴾

( حاکم ) لە ( ابن عباس)ـەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : - جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وپرسیاریان لێکرد دەربارەی درووست کردنی ئاسمانەکان وزەوی فەرمووی :- خوای گەورە لە ڕۆژی یەك شەممە و دووشەممە دا زەوی درووست کردووە لە ڕۆژی سێ شەممە شدا شاخەکان وئەو سوودەشی بەوانەوەیە درووستی کردووە لە ڕۆژی چوار شەممە شدا درەخت وئاو وتەختایی ئاوەدان و وێرانی درووست کردووە لە ڕۆژی پێنج شەممەدا ئاسمانی درووست کردو لە ڕۆژی هەینیش دا ئەستێرە وخۆرو مانگ فریشتەی درووست کردووە تا سێ کاتژمێر لەو ڕۆژەدا ماوتەوە جا لە یەکەمی ئەو سێ کاتژمێرەدا ئەجەلی دیاریکرد تا ئەوەی کاتی مردنی بێت بمرێ تا لە کاتژمێری دووەمدا بەڵاو ئەهامەتی درووست کرد بۆ ئەو شتانەی مرۆڤ سوودیان لێ وەردەگرێت لە کات ژمێری سێیەمدا ئادەمی درووست کرد وجێگیری کرد لە بەهەشت داو فەرمانی کرد بە ئیبلیس کڕنووش بەرێت بۆ ئادەم لە کۆتایی کاتژمێرەکەشدا لە بەهەشتی وە دەرنا جوولەکەکان ووتیان باشە دوای ئەمە چی ڕوویدا ئەی موحەممەد پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی :- دەسەڵاتی خۆی ڕاگرت بەسەر عەرشدا ( استوى على العرش ) ووتیان :- ئەگەر قسەکەت تەواو کردبا ڕاستت دەکرد ئینجا ووتیان :- خوا پشووی کردووە لەو نێوەندە دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر تووڕەبوو پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ( ولقد خلقنا السماوات والارض وما بينهما في ستة أيام ) .

## ١٧٠.﴿ خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کرد سەبارەت بە قسەو باسی جوولەکەکان ﴾

شەعبی لە عومەرەوە –خوای لێ ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە عومەر دەهاتە لای جوولەکەکان و گوێی لە تەورات دەگرت لە تەورات سەری سووڕدەما چۆن ووتەکانی قورئان پڕاوپڕ بە ڕاست و درووستی هاتووە تا ڕۆژێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە لایاندا تێپەڕی و عومەر وتی :- تووخوا دەزانن موحەمەد (ﷺ) نێردراوی پەروەردگارە ؟ یەکێك لە زاناکانیان لە وەڵامدا وتی :- بەڵێ :- دەزانین پێغەمبەری خوایە عومەریش وتی ئەی بۆچی شوێنی ناکەون ؟ ووتیان :- پرسیارمان لێکرد :- کێ سروشت نیگات بۆ دەهێنێ وتی :- جوبرەئیلی دوژمنمان ئەو جوبرەئیلەی شەڕو ئاژاوە ووێرانکاری دەبارێنی عومەریش لێی پرسی :- ئەی لای ئێوە کام فریشتە بەرپرسی نیگایە ؟ ووتیان :- میکائیل باران وسۆزو بەزەیی دەهێنێتە خوارەوە ئنجا عومەر پرسی لێ ی :- ئەی باشە ئەم دوو فریشتەیە لای خوا پلەو پایەیان چۆنە ؟ ووتیان :- یەکێکیان لای ڕاست وئەوی دیکەش لای چەپی عومەریش –خوای لێ ڕازی بێ- وتی:- لایەق نیە هیچ کام لە جوبرەئیل و میکائیل دژایەتی یەکتری بکەن خۆ ئەگەر جوبرەئیل دوژمنی میکائیل بێت ئەوا ناگونجێت میکائیل دۆستایەتی ببەستێت لەگەڵ یەکێکدا کە دژایەتی بکات منیش بەش بە حاڵی خۆم شاهێدی دەدەم ئەو دوو فریشتەیە وپەروەردگار ئاشتی خوازن بۆ ئەوانەی ئاشتی وپارێزراوی هەڵدە بژێرن و جەنگیش بەرپا دەکەن لەگەڵ ئەوانەدا دژایەتیان دەکەن ئنجا عومەر هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وویستی ئەو گفتو گۆیەی پێ ڕابگەیەنێت ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ ی وت :- ئایا ئەو ئایەتانەت پێ ڕابگەیەنم کە هاتوونەتە خوارەوە ؟ عومەریش وتی :- بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( من كان عدوا لجبريل) تا گەیشتە (الكافرين) ئەوجا عومەر وتی:- سوێند بێت بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا لە لای جوولەکەکانەوە هاتم تا ئەوەت پێ ڕابگەیەنم چی لە نێوان من وئەواندا گوزەرا بەڵام پەروەردگار پێش من کەوت .

## ١٧١. ﴿ وابضە ی کوڕی معبد پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەربارەی چاکە ﴾

وابضە ی کوڕی معبد –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وپێی وتم هاتوویت پرسیار بکەیت سەبارەت بە چاکە ؟ وتم :- بەڵێ فەرمووی:- دڵی خۆت سەر پشك بکەو چاکە ئەوەیە نەفست دڵنیا بێت پێی و خراپەش ئەوەیە لە نەفسدا دەبێت بەگرێ وسینە دەگرێت گەرچی خەڵکی فتوات بۆ بدەن.[١٦٤]

## ١٧٢.﴿ هەماهەنگ بوونی بۆچوونی عومەر لە سێ شوێندا لەگەڵ بڕیاری خوای پەروەردگار ﴾

بوخاری وفەرمووده گێرەوەکانی تریش لە عومەرەوە دەگێرنەوە دەڵێت :- لە سێ شوێندا هەماهەنگ بووم لەگەڵ خوای خۆم یەکەمیان وتم ئەی پێغەمبەری خوا بریا مەقامی ئیبراهیمت بکردایە بە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی بۆ نوێژ ئەوە بوو ئایەتی ( واتخذوا من مقام إبراهيم مصلى ) دابەزی : دووەمیان :- وتم ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکانت مرۆڤی پاك وپیس چاك وخراپ ڕوویان تێ دەکات ئەگەر فەرمانی بالاّ پۆشیت بدایە بەسەریاندا ئەوا باش بوو ئەوە بوو ئایەتی حیجا بهاتە خوارەوە سێیەمیان :- خێزانەکانی پێغەمبەری خوا لە نێو خۆیاندا غیرەیان کرد لە یەك ومنیش پێم وتن :- بەڵکو ئێوە تەلاق بدات خوای گەورە ژنی باشتری بەنسیب بکات ئەوە بوو ئایەتی (عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجاً خَيْراً مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ مُّؤْمِنَاتٍ قَانِتَاتٍ تَائِبَاتٍ عَابِدَاتٍ سَائِحَاتٍ ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَاراً {٥}) نارده خوارەوە - - - .

---

[١٦٤] ( أخرجه أحمد والدارمي ).

## ١٧٣. ﴿بەسەر هاتی عوقبەی کوڕی عامیر لە کۆڕی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)﴾

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی :- لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووین شوانی خۆمان بووین خزمەتکاری کەس نەبووین سەرپەرشتی ووشترەکانی خۆمان دەکرد هەر ئەو ڕۆژە ویەکێکمان ووشترەکانمان دەبرد بۆ لەوەڕگا جارێك نۆرەی من بوو ووشترەکانم برد بۆ لەوەڕگا ئێوارە کە هێنانمەوە بۆ شوێنی حەوانەوەیان دوای ئەوەی کە ئیش وکارەکانم ڕاپەڕاند چووم بۆ کۆڕی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتاری دەدا بۆ خەڵك گوێم لێ بوو دەیفەرموو :- هەر کەسێك لە ئێوە بە جوانی وبە تەواوی دەستنوێژێك بگریت پاشان هەستی بەگەرد نکەجی وبە خشوعەوە ڕووبکاتە خواو دوو رکات نوێژ بکات ئیللا ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت وتم :- بەخ بەخ ئەمە چ بەخشندەییەکی گەورەیە پیاوێ کە پێشتر لە کۆڕەکەدا بوو وتی:- ئەی عوقبە لەوەش جاکتر سەرنجمدا سەیر دەکەم عومەری کوڕی خەتتابە وتم:- ئەو شتە چیە ئەی ئەبا حەفص ؟ وتی:- پێش ئەوەی کە تۆ بێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بگرێت پاشان بڵێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا عبده ورسوله)

واتە :- من شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی راستە قینە نیە بێجگە لە خوا کە تەنیایەو هاوەڵی نیەو ، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەی خوایە وپێغەمبەریەتی ئەوا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە هەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی.[١٦٥]

---

[١٦٥] ( صحيح سنن ابو داود رقم ١٦٩ ) و صححة الشيخ الالباني.

## ١٧٤. ﴿ پێغەمبەر( ﷺ ) کە گوێ بیستی عائیشە بوو پێکەنی ﴾

خاتوو عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ- یاریەکی هەبوو کە دوو بوکەلە بوو یاری پێدەکردن کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) خواستی ئەو دوو بووکەڵەی لەگەڵ خۆیدا برد پێغەمبەر (ﷺ) لای عائیشە بینینی پرسیاری لێکرد عائیشە ئەوانە چین ؟ عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ- وتی:- کچەکانم بوکەڵەکانم هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) لە نێوان ئەو دوو بوکەدا ئەسپێکی بینی کە دوو باڵی هەبوو فەرمووی :- ئەی ئەو شتە چیە لە نێوان دوو بووکەڵەکەدا ؟

عائیشە وتی:- ئەوە ئەسپە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەی ئەوە چیە لەسەر پشتی وتی:- ئەوە دوو باڵە کەیەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەسپ وباڵی هەیە ؟ عائیشە –خوای لێ ڕازی بێ- وتی:- ئەی نەتبیستووە کە سولەیمان – سەلامی خوای لێ بێ- ئەسپێکی هەبوو کە باڵی هەبووە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی.[١٦٦]

## ١٧٥. ﴿ پێغەمبەر ( ﷺ ) لە هەڵسوکەوتی کابرا دەشتەکیەکە تووڕە بوو ﴾

کابرایەکی دەشتەکی ووشترێکی کڕیبوو ڕۆژێکیان لێ ی ون دەبێ ئەو ڕۆژە زۆر دەگەڕێ هەتا تاریکایی شەو دادێ بەڵام نایدۆزێتەوە لە نوێژی بەیانیدا کابرای دەشتەکی ڕۆیشت بەرەو مزگەوت چووە ناو مزگەوت لە دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد کابرای دەشتەکی کەوتە پرسیار کردن لە خەڵکی ئاخۆ ووشترەکەی ئەویان نەدیوە پاشان بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد هەر کەسێك ووشترێکی سووری لەو شێوەی دۆزیەوە کە لێم وون بووە با ئاگادارم بکاتەوە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) کە کابرای دی بەو شێوەیە هاوار دەکات تووڕە بوو فەرمووی:- دەك ئەی دۆزیەوە مزگەوتمان دروست کردووە بۆ خوا پەرستی نەك بۆ بانگەواز کردن بۆ شتی ونبوو لە ناو مزگەوتدا فەرمووی :- ئەوەی گوێی لێ بوو پیاوێك بانگەواز بۆ شتی ونبوو دەکات با بڵێت خوا بۆت نەگێڕێتەوە چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەوە دروست نەکراون.[١٦٧]

---

[١٦٦] ( رواه أبو داود ).

[١٦٧] ( رواه مسلم ).

## ١٧٦.﴿ هەواڵدانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی حگمی کوڕی هندی بکری دەقاو دەق هاتە دی ﴾

لە عەکریمەوە دەگێڕنەوە دەڵێت :- حطمی کوڕی هندی بکری هات بۆ مەدینە لەگەڵ جڵەوی ووشتری خۆی داك ی بارێك لە خواردەمەنی یان هەڵگرتبوو وفرۆشتی پاشان چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وموسڵمان بو وکاتێك پشتی هەڵکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:-

بە ڕوویەکی پیاو خراپەوە هاتە لام و بەسەرو سیمایەکی غەدر باریشەوە پشتی هەڵکرد کاتێك حطم گەیشتە یەمامە پاشگەز بوویەوە کە ئیسلام وئنجا باری خواردنی نا لە ووشترەکانی و روویکردە مەککە لە مانگی (ذي القعدة ) دا کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم هەواڵەیان بیست چەند هاوەڵێك خۆیان ئامادە کرد ڕێگە بە کاروانەکەی بگرن خوای گەورەش ئایەتی (يأيها الذين أمنوا لا تحلوا شعائر الله ) ناردە خوارەوە ئنجا هاوەڵان دانیشتن ودەست بەرداری ئەوە بوون .

## ١٧٧.﴿ مەعازی کوڕی جەبەل وسەعدی کوڕی عوبادە ئامۆژگاری جوولەکەکانیان کرد ﴾

لە ئیبن عەبباسەوە دەگێڕنەوە دەڵێت :- پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوولەکەکانی بانگ کرد بۆ موسڵمان بوون و تامەزرۆی کردن ئەوانیش بەرپەرچیان دایەوە ڕازی نەبوون مەعازی کوڕی جەبەل وسەعدی کوڕی عوبادەش بە جوولەکەکانیان وت :- ئەی گرۆهی جوولەکە لە خوا بترسن سوێند بێ بە خوا ئێوە باش دەزانن کە پێغەمبەری خوایە پێش ئەوەی ڕەوانە بکرێت ئێوە بۆ ئێمە تان باس دەکردو سیفەتەکانیتان بۆ والآو دەست نیشان دەکردین رافعی کوڕی حریمەلەو وەهبی کوڕی یەهوزاش ووتیان شتی وامان پێ نەوتوون ولە دوای موسا شەوە هیچ کتێبێکی دیکە نازلنە بووە ودوای موسا نەترسێنەرو نەمژدە دەرێکی دی نەنێر دراوە پەروەردگاریش ئایەتی ( يا أهل الكتاب قد جاءكم رسولنا بينات )ی دابەزاند .

## ١٧٨. ﴿ کەنیزەکە کە ئازاد کرا چونکە ئیماندار بوو ﴾

لە معاویەی کوری حەکەمی (السلمی)ە وە هاتووە کە وتوویوتی لەگەڵ پێغەمبەری خودادا (ﷺ) نوێژم دەکرد پیاوێك لە نوێژخوێنان پژمی منیش وتم:- (یرحمك الله ) واتە:- خوا رەحمت پێ بکات کەچی خەڵکەکە چاویان تێبڕیم وخێسەیان لێ کردم وتم :- ئەوە چیتانە وەها سەیرم دەکەن ؟ هەموو دەستیان کێشابە ڕانیاندا زانی مکە دەیانەوێت بێدەنگم بکەن بێدەنگ بووم وتی:- کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژەکەی بوویەوە دایك وباوکم بە قوربانت بێت هەرگیز نە لەوەو پێش وە نە لەوەو دوا مامۆستای وەهام نەدیوە لە پەروەردەدا لەو باشتر بێت سوێند بەخوا نە سەرزەنشتی کردم نە لێی دام نە قسەی پێ وتم :- فەرمووی:- ئەم نوێژە بۆ ئەوە ناشێت کە قسەی خەڵکی تێکەڵ ببێت بەڵکو بریتیە لە تەسبیح وتەکبیر وقورئان خوێندن وتم :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من نزیکم لە سەردەمی نەفامیەوە خوای گەورە ئیسلامی هێنا لە ناو ئێمەدا کەسانێك دەچوونە لای فاڵچیەکان فەرمووی :- تۆ مەچۆ بۆ لایان دەڵێ:- وتم: کەسێکمان هەبوو رەشبین دەبوون بە فڕینی باڵندە فەرمووی:- ئەوە شتێك لە دڵیاندا درووست دەبوو بەڵام ڕێی نەدەگرت لەو کارەی کە دەیانویست بیکەن دەڵێ وتم:- کەسانێکی تریشمان هەبوو هێڵیان لە زەویدا دەکێشا فەرمووی:- پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی خوا هێڵی دەکێشا هەرکەس لەگەڵ هێڵەکەیدا یەك بگرێت ئەوە چاکە دەڵێ: وتم:- کەنیزەکێکم هەبوو شوانی مەڕەکانم بوو لە شوێنێکی نزیك مەدینەوە دەیلەوەڕاندن جارێکیان چووم کە دیم گورگێك مەڕێکی لە ڕانەکە فڕاند منیش پیاوێکم لە ئادەمیزادەکان خەم دەخۆم وەك چۆن خەڵکی تر خەم دەخۆن بۆیە زلەیەکم پێداکێشا ئینجا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵەکەم بۆ گێرایەوە ئەویش ئەو کارەی زۆر لەسەر گەورە کردم بۆیە وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایە ئازادی نەکەم ؟ فەرمووی:- بیهێنە بۆلام بۆم هێنا پێی فەرموو:- خوا لە کوێیە ؟ وتی:- لە ئاسماندایە فەرمووی:- ئازادی بکە چونکە ئیماندارە.[١٦٨]

---

[١٦٨] صحيح سنن ابو داود رقم ٩٣٠ و صححه الشيخ الالباني.

## ١٧٩. ﴿ پیاوەکە هەردووك دەستی خۆی پڕکرد لە خێرو چاکە ﴾

لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتووە کە ووتوویەتی پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی:- ئێستا بەم دەست وبردە ناتوانم هیچ لە قورئان لەبەر بکەم کەواتە شتێکم فێر بکە لە جیاتی قورئان بیخوێنم فەرمووی:- بڵێ :- (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر ولا حول ولا قوة إلا بالله ) پیاوەکە وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە زیکرو یادی خوایە بۆ ئەوە ئەی چی بۆمن ؟ فەرمووی:- بڵێ (اللهم ارحمني وارزقني وعافني واهدني) واتە:- خوایە لێم خۆش ببەو بەزەییت هەبێ بۆم ورۆزیم بدەو لەش ساغم بکەو ڕێنمایم بکە بۆ ڕێی ڕاست جا پیاوەکە کە هەستا بڕوا ووشە بە ووشە بە پەنجەکانی هەردوو دەستی دەیژماردن هەرووشەیەکی دەوت وپەنجەیەکی دەنوقاند ودەیوت ئەمە یەك ئەمە دوو تا دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- بەڵێ ئەم پیاوە هەردوو دەستی خۆی پڕکرد لە خێرو چاکە.[١٦٩]

## ١٨٠. ﴿ بەسەرهاتی (العذراء) تەشتە گورەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) تەشتێك لە گەنی گەورەی هەبوو پێیان دەوت (العذراء) زۆر گەورەبوو چوار کەس کەمتر نەیان دەتوانی هەڵیبگرن ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵانی بانگ کرد بۆ خواردن لە دوای نوێژی چێشتەنگاو پێغەمبەر (ﷺ) ئەو تەشتەی هێنا کە پڕ بوو لە تریت پاشان بە هاوەڵانی فەرموو کرد بۆ خواردنی نانەکە هەموویان هاتن لە دەوری دانیشتن تا جێگەیان تەسك بۆوە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەژنۆی دانیشت کابرایەکی دەشتەکی وتی :- ئەم دانیشتنە چیە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- خوای گەورە منی کردووە بە بەندەیەکی ڕێزدار وبەڕێز نەیکردووم بە کەسێکی سەر کەش وتوند پاشان بە هاوەڵانی فەرموو:- لە لاتەنیشتەکانی بخۆن قەراغەکانی ناوەڕاستەکەی واز لێ بهێنن خوای گەورە بەرەکەت و فەرەدەڕێژێتە ناوی.[١٧٠]

---

[١٦٩] سنن ابو داود رقم ٨٣٢ و حسنه الشيخ الالباني.

[١٧٠] ( رواه أبو داود ).

## ١٨١. ﴿ بەسەر هاتی كەغەری كوڕی یەساری موزەنی وئەبو بەكری صدیق ﴾

هاوەڵێك هەبوو ناوی كەغەرری كوڕی یەساری موزنی بوو ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوێكی ئەنصاری فەرمووو كە بڕێك خورما كە لای بوو بیبات بۆ ئەغەر بەڵام كابرای ئەنصاری پێدانی خورماكەی دوا دەخست ونەیدایە ئەویش شكاتی لای پێغەمبەر (ﷺ) كرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەبو بەكر بڕوات خورماكەی بۆ لێ وەرگرێت ئەبو بەكری صدیق —خوای لێ ڕازی بێ- لەگەڵ ئەغەر ڕێكەوتن كە لە دوایی نوێژی بەیانی یەكتر ببینن وپێكەوە دەرچن لە ڕێگەدا ئەبو بەكر — خوای لێ ڕازی بێ- هەر كەسێكی ببینیایە لە دوورەوە سڵاوی لێ دەكرد پاشان ئەبو بەكر — خوای لێ ڕازی بی- بە ئەغەری وت:- نابینی خەڵك چەند چاكەیان لەسەر تۆ هەیە ؟ كەس لە سڵاودا پێشت ناكەوێت لە دوای ئەوە ئەغەر پەلەی دەكرد ودەست پێشخەری دەكرد لە سڵاودا دیوت :- نیتر هەر پیاوێكمان لە دوورەوە ببینیایە سڵاومان لێ دەكرد پێش ئەوەی ئەو سڵاو بكات.[١٧١]

## ١٨٢. ﴿ پە نجە تەقاندن كاری شەیتانە ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوو كە هاوەڵانی پەروەردە بكات لەسەر شتی پاك وجوان وباش وە ئامۆژگاری دەكردن كە خۆیان دور بگرن لە هەڵسوكەوتی شەیتانی لەووتەو كاریاندا وە بەردەوام ئامۆژگاری موسڵمانانی دەكرد كە زۆر ڕێزی مزگەوت بگرن فێری دەكردن كە چۆن لە مزگەوتدا دانیشن ڕۆژێكیان بینی وا پیاوێك لە ناوەڕاستی مزگەوتدا دانیشتووە وقاچەكانی توند لكاندووە بە سكیەوە وە پەنجەكانی كردووە بە ناو یەكتریدا خەریكی پەنجە تەقاندنە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە ئەم پیاوەی بینی بەم شێوەیە ئاماژەی كرد بۆی كە دەست لەو كارە هەڵگری بەڵام كابرا حاڵی نەبوو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وبەردەوام بوو لە پەنجە تەقاندن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەگەر هاتنە ناو مزگەوتەوە پەنجە مەتەقێنن چونكە پەنجە تەقاندن كاری شەیتانە ئێوە لە مزگەوتا بەردەوام وان لە نوێژدا هەتا ئەو كاتەی لە مزگەوت دەردەچن.[١٧٢]

---

[١٧١] (أخرجه الطبراني ).

[١٧٢] (رواه الإمام أحمد ).

## ١٨٣. ﴿ ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جوبەیری کوڕی مطعە م بوو بە مایەی خێرو بەرەکەت ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) جوبەیری کوری مطعە می بینی پێی فەرموو ئایا پێت خۆشە ئەی جوبەیر ئەگەر دەرچووی بۆ سەفەر کە لە باشترین هاوەڵەکانت بیت لە ڕووی شێوازەوە وە لە هەموویان زیاتر توێشووت پێبیت ؟ جوبەیر وتی:- بەڵێ باوك ودایکم بە قوربانت بێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەم پێنجە سوورەتە بخوێنە (الکافرون , النصر , الإخلاص , الفلق , الناس ) هەموو سوورەتێك بە ( بسم الله الرحمن الرحیم ) دەست پێ بکە چەند ڕۆژ ومانگ تێپەڕی جوبەیر چەند جارێك بەسەفەر ڕۆیشت دوای ئەو هەموو گەشت وگەڕانە وتی:- من کەم ماڵ بووم کە دەڕویشتم بۆ سەفەر وە شێوازم لە هەموویان ناشرین تر بوو لە هەموویان توێشووم کەمتر بوو بەلاّم لەو کاتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم سوورەتانەی فێر کردووم وەدەیان خوێنم من لە هەموویان شێوازم جوانترە وە لە هەموویان توێشم زیاترە تا لە سەفەر دەگەڕێینەوە.[١٧٣]

## ١٨٤. ﴿کە شیرەکەی بە دیاری بۆن ناردن دڵنیا بوون کە لێیان تووڕەنەبووە﴾

لە ئەنەسی کورشی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە جوولەکە هەرکاتێ ئافرەتێکیان بکەوتایەتە بێ نوێژیەوە لەماڵ دەریان دەکرد نە خواردن وخواردنەوەیان لەگەڵ دەخوارد نە لە ماڵیشەوە لەگەڵی دادەنیشتن بەڵکو پارێزیان لێ دەکردوو جێیان بۆ جیا دەکردەوە بۆیە یارانی پێغەمبەریش (ﷺ) لەو بارەیەوە لێیان پرسی ؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ ڕەوانەکرد (ویسألونك عن المحیض قل هو أذی فأعتزلوا النساء في المحیض) واتە :- وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حەیز بڵێ حەیز ئازارە کەواتە دوور بکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لە کاتی حەیزدا , ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- لە ماڵەکاندا لە گەڵیان کۆببنەوە وهەموو

---

[١٧٣] (رواه أبو يعلى ).

شتێکیان لەگەڵ ئەنجام بدەن جگە لە کاری جوتبوون جولەکە ووتیان :- ئەم پیاوە دەیەوێت لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ جا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر وعەببادی کوڕی بەشیر چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوە و ووتیان :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوولەکە ئاوا و ئاوا دەڵێن ئەی بۆچی ڕێگامان پێ نادەی هەتا لە کاتی بێ نوێژیدا بچینە لایان ودرووست ببین لەگەڵیاندا ؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی گرژ کردوو ڕەنگی گۆڕا هەتا وامان دەزانی کەلێیان تووڕە بووە بۆیە هەردووکیان هەستان چوونە دەرەوە ورۆیشتن لە پاشدا هەندێ شیریا نبە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیان وخواردیانەوە وتێگەیشتن کە دڵی لێیان نەیەشاوە.[174]

## ١٨٥. ﴿ دەشتەکیەکە نەگەیشتە سبەی ئێوارە مرد ﴾

هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بیبیستایە کەسێك نەخۆشە سەردانی دەکرد سەردانی پیاوان وژنانی دەکرد سەردانی منداڵ وپیری دەکرد سەردانی موسڵمان ونا موسڵمانی دەکرد هەبوو لەوانە سوودی دەبینی لەو بەسەرکردنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هەشبوو وەك جوولەکە سوودی نەدەبینی ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی دوو پیاوی دەشتەکی کرد پێغەمبەر (ﷺ) کە سەردانی نەخۆشی دەکرد دەیفەرموو:- هیچ نیە خوا بیەوێت مایەی پاك بوونەوەیە کابرای دەشتەکی وتی پاککە رەوەیە ؟ نا بەڵکو تایەکی لە ناو بەرە لەسەر شێخی پیرو دەیکاتە میوانی گۆڕ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ناخۆش بوو ووتەکەی کابرا پڕ بوو لە بێ هیوایی وە سوودی نەبینی لە ئامۆژگاری و دووعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە فەرمووی:- تۆ ئەگەر دووعات ڕەت کردەوە ئیتر ئەوە قسە قسەی خۆتە بڕیاری خوا دێتە دی کابرا نەگەیشتە سبەی ئێوارە مرد.[175]

---

[174] صحيح سنن ابو داود رقم ٢٥٨ و صححه الشيخ الالباني.

[175] ( رواه البخاري ).

## ١٨٦.﴿پێغەمبەر (ﷺ) بەهەمان نیەتی خۆیان وەڵامی جوولەکەکانی دایەوە﴾

ڕۆژێك کۆمەڵێکی جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتەدا خاتوو عائیشە-خوای لێ ڕازی بێ- خێزانی پێغەمبەر روداوێکی باوەڕداران لە خزمەتی پێغەمبەردا جوولەکەکان ووتیان ( السام علیکم) لە جیاتی ( السلام علیکم) واتە مردن وتیچوون بۆ ئێوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ( وعلیکم) لەسەر خۆتان بێت ئیتر هیچی زیادەی نەفەرموو بەڵام عائیشە-خوای لێ ڕازی بێ- تورە بوو وتی:- ( بل علیکم أنتم السام واللعنة) واتە:- بەڵکو لەسەر ئێوە بێت تیاچوون ومەرگ ونوفرین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەی عائیشە بێگومان خوای گەورە نەرم ونیانی خۆش دەوێت لە هەموو کارو بارێکدا وە داوای لێکرد ئارام بێتەوە عائیشە وتی:- گوێت لێ نەبوو چیان وت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- منیش وتم ( وعلیکم) واتە:- بە هەمان نیەتی خۆیان وەڵامم دانەوە.[١٧٦]

## ١٨٧. ﴿ فەرمانی بە کوڕەکەی کرد لە دوای پێغەمبەر ( ﷺ ) بڕوات ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) لە سەفەرێکدا لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانیدا بوو عومەری کوڕی خەتتاب وعەبدوڵڵای کوڕی لەگەڵدا بوو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر حوشترێکی بەهێزی چالاکی تیژ ڕەوی پێ بوو کە هی باوکی بوو لە میانەی ڕێگەدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پەلەی بە حوشترەکەی کرد پێشی ئەو حوشترە کەوت کە پێغەمبەری لەسەر بوو کە عومەر ئەمەی بینی عەبدوڵڵای بانگ کرد ڕەخنەی لێگر تکە پێشی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتووە قەدەغەی کرد لەسەر ئەمە وەفەرمانی کرد بە سەریا کە لە دوای پێغەمبەرەوە بڕوات کە پێغەمبەر (ﷺ) ئیشەکەی عومەری بینی چی کرد داوای لە عومەر کرد کە حوشترەکەی لێبکرێ عومەر- خوای لێ ڕازی بێ- وتی:- بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لێی کڕی پاشان فەرمووی:- بە عەبدوڵڵا :- ئەو حوشترە بۆ تۆ ئەی عەبدوڵڵا چی پێ دەکەی بیکە.[١٧٧]

---

[١٧٦] ( رواه مسلم ).

[١٧٧] ( رواه البخاري ).

## ١٨٨.﴿ دەمقاڵێەك ڕووی دا لە نێوان ئەبو بەکر وعومەردا ﴾

بوخاری وئەوانی دیکەش لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێت:- کاروانییەك لە لایەن (بنوأمية)وە هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو بەکر وتی:- فەرمان بە قعقاعی کوڕی مەعبەد بکە عومەریش وتی:- بەڵکو فەرمان بە ئەقرەعی کوڕی حابس بکە ئەبو بەکر وتی:- بەعومەر تەنیا مەبەستت پێچەوانەی من بوو عومەر وتی:- بەڵکو مەبەستم پێچەوانەی تۆ نەبوو دەمەقاڵەیەکیان بەر پا کرد تا دەنگیان بەرز بوویەوە ئنجا دەربارەی ئەم ڕووداوە ئایەتی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ {١} يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ {٢} إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ {٣} إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ {٤} وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّى تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْراً لَّهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ {٥} ) الحجرات.

واتە :- ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پێشی خواو پێغەمبەری خوا مەکەون لە بڕیار وپێشنیاردا لە خوا بترسن وپارێزکار بن چونکە لە ڕاستی خوا بیسەرە بە گوفتارتان زانایە بە نیاز ونهێنیەکانتان , ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) بەرز مەکەنەوە لە کاتی گفتو گۆدا قسە بێ پەردە مەکەن لە خزمەتیدا وەکو بۆ یەکتری دەکەن نەوەکو کردەوەکانتان پووچ بێتەوە وهەستیشی پێ نەکەن بەڕاستی ئەوانەی کە دەنگیان هێواش دەکەنەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە دڵەکانیانی زاخاو داوە بۆ تەقواو خوا ناسین ئەوانە لێخۆش بوون ویاداشتی گەورەو گرانبەها بۆیان ئامادەیە بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت لێ دەکەن ئەوانە زۆربەیان نەفامن وژیری وەرناگرن چونکە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی درووستیان لەو بوارەدا ڕەچاو نەکردووە خۆ ئەگەر ئەوانە خۆگر بوونایە تا چوویتە دەرەوە بۆلایان ئەوە چاکترو ڕەوانەتر بوو بۆیان خوالێخۆشبوو میهرەبانە - - - -

## ١٨٩. ﴿ بەسەر هاتی ووتە بێژەکەی تیرەی بەنی سەعد وگفتوگۆ کردنی لەگەڵ پێغەمبەردا ( ﷺ ) ﴾

ئیبن سەعد لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قوریضیە وە دەگێڕێتەوە دەڵێت :- لە ساڵی نۆی کوچیدا دە کەس لە تیرەی بەنی ئەسەد هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێک لەوان تەلحەی کوڕی خویلد بوو لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوتدا بوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا ئەوان سەلامیان کردوو ووتە بێژەکەیان وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە شایەتیمان داوە خوای گەورە تاك وتەنیاو بێ هاوەڵە وگەواهیمانداوە تۆش بەندەو پێغەمبەری خوایت خۆمان هاتووین بۆلات بێ ئەوەی بنێری بە دوا ماندا ئێمەش هاوچەشنی پەیژمیەك واین بۆ دوای خۆمان خەڵکی چاومان لێ دەکەن ئنجا ئایەتی ( يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ {١٧}) الحجرات.

واتە :- ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسڵمان بوون پێیان بڵێ منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسڵمان بوونەکەتان بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتیداون بۆ ئیمان وباوەڕ ئەگەر ئێوە راستگۆن

## ١٩٠. ﴿سەرە بزنێك حەوت ماڵ گەڕاو ئەوجا گەیشتەوە دەست کەسی یەکەم﴾

واحدی لە ئیبن عەبباسەوە دەگێڕیتەوە دەڵێت :- سەری بزنێك درا بە یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش وتی:- بەڕاستی فلانە کەسی برام ومنداڵەکانی زیاتر پێویستی پێیەتی هەتا ئێمە بۆیە سەرە بزنەکەی نارد بۆ ئەوان بەم شێوازە هەر لە ماڵەو ئەو سەرە بزنەیان بە دیاری دەنارد بۆ ئەوی تر هەتا حەوت ماڵ گەڕاو ئەوجا گەیشتەوە دەست کەسی یەکەم ئیتر ئەم ئایەتە نازل بووە خوارەوە: (وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ {٩} ) الحشر.

واتە: - حەز بە بەخشینی دەسکەوتەکان بەوان دەکەن فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەر چەندە هەژارو نەداریشن جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت وزاڵ بێت بەسەریدا ئا ئەوانە هەر سەر فرازن .

## ١٩١. ﴿ بیلال چاوەڕوانی نەکرد وپەلەی کرد ﴾

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە کە وتوویەتی :- شەوێکیان میوانداری پێغەمبەرم کرد (ﷺ) فەرمانی کرد لایەکیان پارچەیەکی گەورە گۆشتی مەڕی بۆ بهێن بۆ ئەوەی بیبرژێنن چەقۆیەکی گەورەی هەڵگرت وگۆشتەکەی پێ دەبڕی موغیرە وتی :- بیلال هات هەواڵی دایە بەوەی کە کاتی نوێژە موغیرە وتی:- چەقۆیەکەی فڕێدا وفەرمووی :- بۆچی بیلال پەلەی کرد چاوەڕێی نەکرد خواردنەکەم بخۆم دەستی بدرێت بە خۆڵەوە هەستا نوێژی کرد.[١٧٨]

## ١٩٢. ﴿ هەر کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێ بیستی ووتەکەی عەمری کوڕی عاص بوو پێکەنی ﴾

لە عەمری کوڕی عاصەوە هاتووە کە ووتوویەتی :- لە غەزای (ذات السلاسل) لە شەوێکی زۆر ساردا لەشەم گران بوو جا ترسام لەوەی کە ئەگەر خۆم بشۆم تیا بچم بۆیە تەیەمومم کرد پاشان بەر نوێژی نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵەکانم کرد کاتێك کە لە غەزاکە گەڕاینەوە بەسەر هاتەکەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە جا ئەویش فەرمووی:- ئەی عەمر بەلەش گرانیەوە نوێژت بە هاوەڵەکانت کرد ؟ منیش پێم ڕاگەیاند کەچی ڕێگری لێکردم لەوەی کە خۆم نەشۆم و تەیەمومم کرد وتم:- ئەم فەرموودەیەیی خوای گەورەم یاد کەوتەوە کە دەفەرموێت:-( ولا تقتلوا أنفسكم إن الله كان بكم رحيما ) واتە :- خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوای گەورە زۆر بە بەزەییە بەرامبەر بە ئێوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی و هیچی نەفەرموو.[١٧٩]

---

[١٧٨] ( رواه أبو داود رقم (١٨٨ ) وصححه ألألباني.

[١٧٩] (رواه أبو داود رقم (٣٣٤) وصححه ألألباني.

## ١٩٣. ﴿ گەرمای توند هەناسەی دۆزەخە ﴾

لە ئەبو زەرەوە هاتووە :- کە وتوویەتی :- لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بووین بانگبێژ ویستی بانگی نیوە ڕۆبدات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :- ساردی کەرەوە دیسان ویستی بانگ بدات پێی فەرموو:- ساردی کەرەوە دوو جار تا سێ جار بەو شێوەیە هەتا سێبەری تەپۆلکەکانمان بینی پاشان فەرمووی:- بە ڕاستی گەرمای توند هەناسەی دۆزەخە هەر کاتێ گەرما زۆر توونـد بوو بە نوێژەکانتان ساردی بکەنەوە واتە:- نوێژەکانتان دوا بخەن هەتا گەرما نامێنی.[١٨٠]

## ١٩٤. ﴿ پیاوەکە لە پۆشاکەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) کفن کرا ﴾

ڕۆژێکیان یەکێك لە ئافرەتە صەحابیەکان بڕیاریدا پۆشاکێ جوان درووست بکات ماوەیەکی زۆر خەریکی بوو تا تەواویکرد زۆر جوان درووستی کرد کاتێ تەواو بوو هەڵی کرت وبە دیاری بردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وپێی بەخشی وەکو دیاری وە پێغەمبەریش (ﷺ) دیاریەکەی قبوڵ کرد وسوپاسی کرد پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پۆشاکەکەی لە بەر کرد یەکێك لە هاوەڵەکان بە لایەوە جوان وسەیر بوو داوای لە پێغەمبەرکرد کە ئەو پۆشاکەی پێ ببەخشێ پێغەمبەر (ﷺ) عادەتی وابووە داوای چی لێ کرابێ بەخشیوویەتی وڕەدی نەکردۆتەوە چونکە زۆر بەخشندە وسەخی بوو لە بەخشین وسەخاوەتدا وەکو شنە بای فێنك بووە بەخشیوویەتی ولەهەژاری نەترساوە پێغەمبەر (ﷺ) پۆشاکەکەی داناو بەخشی بە پیاوەکە ولە خۆی بورد هەندێ لە خەڵکی ووتیان:- بۆ لێت وەرگرت پێغەمبەر خۆی پێویستی پێیەتی کابرا بۆی ڕوونکردنەوە بۆ ئەوەم ناوێ لەبەری بکەم بەڵکو دەمەوێ بیکە ئەبە کفنم کاتێ مردم تا بەر بەرەکەتی پێغەمبەر بکەوم بەڵێ ئەم هاوەڵە لە کاتێ مرد لە پۆشاکەکەی پێغەمبەردا کفن کرا لەو کفنە پاکە جوانە.[١٨١]

---

[١٨٠] ( رواه أبو داود رقم الحديث (٤٠١ ) وصححه الألباني.

[١٨١] ( البخاري فتح / ٦٠٣٦ ( نظرة النعيم ) / ج ٣ / ٦٣٨ ).

## ١٩٥. ﴿ خاوەنی وویستەکان تەنها خوای گەورەیە ﴾

جارێك پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ودەربارەی هەندێ شت قسەی لەگەڵدا کرد پاشان پیاوەکە دەربارەی کارێك بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت: ئەگەر خواو تۆ بیانەوێت پێغەمبەر (ﷺ) بە قسەکەی تووڕە بوو پاشان بۆی ڕوون کردەوە کە خاوەنی وویستەکان تەنها خوایە وبەس کە هەر کاتێك وویستی لە سەر شتێ هەبوو هەر دەبێت وئەگەر وویستیشی لەسەر شتێ نەبوو ئەوە هەرگیز نابێت ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو:- ئایا تۆ دەتەوێت من بکەیتە هاوەڵی خواو وەك ئەو دامبنێت ؟ وا مەڵی بەڵکو هەموو کات بڵێ ئەگەر خوا خۆی وویستی لەسەر بێ.[١٨٢]

## ١٩٦. ﴿ ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ عەبدوڵڵای کوڕی فضالە ﴾

لە عەبدوڵڵای کوڕی (فضالە)وە لە باوکیەوە هاتووە کە وتوویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کارەکانی ئیسلام ونەحکامەکانی فێر دەکردم بێگومان یەکێ لەمانەی کە فێری دەکردم بریتی بوو لەوەی کە فەرمانی پێ کردم پارێزگاری لە پێنج فەرزەی نوێژ بکە واتە:- بەردەوام بە لەسەریان ولە یەکەم کاتی خۆیاندا بە کۆمەڵ بیانکە (فضالة)وتی:- وتم لەم کاتانەدا زۆر سەرقاڵم بە ئیش و کاری دنیاوە بۆیە شتێکم فێر بکە کە خێرو پاداشتەکەی ئەوەندە زۆر بێت بیکەم وبەسم بێت فەرمووی:- پارێزگاری لە دوو عەسرەکە بکە ئەمەش لە زمانی ئێمە نەبوو بۆیە وتم ئەم دوو عەسرە کامانەن ؟ فەرمووی:- نوێژ کردن لە پێش خۆر کەوتن ولەپێش خۆر ئاوا بوون دا واتە:- نوێژی بەیانی ونوێژی عەسر.[١٨٣]

---

[١٨٢] ( رواه البيهقي ).

[١٨٣] ( رواه أبو داود رقم الحديث ( ٤٢٧ ) وصححه الشيخ الألباني.

## ١٩٧.﴿ عەمری کوڕی عاص بێدەنگ بوو نەبادا پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕیزبەندی خۆشەویستەکانیدا بیخاتە کۆتایی ﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی خۆی زۆر خۆشدەویست هەر یەکێك لەوان وایاندەزانی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی لە هەمووان خۆشتر دەوێت ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) سوپایەکی بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی دوژمن ئامادە کردبوو عەمری کوڕی عاصی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی سوپاکە ئەو سوپایە ئەبو بەکر وعومەریشی تیا بوو –خوا لێیان ڕازی بێت – عەمر لە دڵی خۆیدا وایزانی ئەم هەڵبژاردنەی پێغەمبەر لەبەر پلە وپایەو خۆشەویستی عەمرە لە دڵی پێغەمبەردا (ﷺ) بەڵێ ڕۆشتن ولە غەزای ( ذات السلاسل)دا بەسەر بێ باوەڕاندا سەرکەوتن کاتێك گەڕانەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کردن عەمر هەستی کرد کە ئێستا ئەو خۆشەویسترین کەسە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا خۆشە ویسترین کەس لای تۆ کێیە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – عەمر وتی:- مەبەستم لە ناو پیاواندا ؟ فەرمووی:- باوکی عائیشە واتە:- ئەبو بەکری صدیق – خوای لێ ڕازی بێ – عەمر وتی:- پاش ئەو کێ ؟ فەرمووی:- پاشان عومەری کوڕی خەتتاب پاشان چەند پیاوی تر ژمارد عەمر بێدەنك بوو لە ترسی ئەوەی نەبادا پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕیز بەندی خۆشەومیستە کانیدا ئەو بخاتە کۆتایی.[184]

[184] ( رواه الترمذي وقال :– حديث حسن ).

## ١٩٨. ﴿ هاوەڵە ئەنساریەکە بە خێرایی لە ڕاکردندا ناسرا بوو ﴾

هاوەڵێکی ئەنساری هەبوو بە خێرایی لە ڕاکردندا ناسرا بوو لە کاتی گەڕانەوەی موسڵمانان لە یەکێك لە غەزاکاندا هاواری کردو وتی:- کەس هەیە ڕاکردن وپێشبڕکێم لەگەڵدا بکات تا مەدینە ؟ بەم شێوەیە بانگەوازەکەی دووبارە ودووبارە دەکردەوە کاتێك سەلەمەی کوڕی ئەکوەع بیستی پێی وت:- ئەوە ڕێز لە بەڕێز ناگریت لە شەریف وخانەدان ناترسی ؟ پیاوەکە وتی:- نەخێر ناترسم مەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێت سەلەمە داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد تا مۆڵەتی بدات پێشبڕکێی لەگەڵدا بکات پێغەمبەر (ﷺ) مۆلەتیدا وفەرمووی:- ئەگەر خۆت بتەوێ سەلەمە وازی لە کابرا هێنا تا ماوەیەك ڕابکات پێش ئەو پاش کەمێك سەلەمە شوێنی کەوت تا گەشتەوە بە کابرا دواتر بە تەواوی پێشی کەوت.[١٨٥]

## ١٩٩. ﴿ ئوم وەرەقەی کچی نەوفل بە شەهیدە ناوی دەبرا ﴾

لە ئوم وەرەقەی کچی نەوفەلەوە هاتووە کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بچێت بۆ جەنگی بەدر پێم وت:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتم بدەرێ با لەگەڵت بێم بۆ جەنگ چارەسەری وخزمەتی نەخۆش وبریندارەکان بکەم بەڵکو خوای گەورە پلەی بەرزی شەهیدیم پێ ببەخشێت ؟ فەرمووی: - لە ماڵی خۆت بمێنەرەوە خوای گەورە پلەی بەرزی شەهیدیت پێ دەبەخشێت وەکیع ڕاوی فەرموودەکە وتی:- ئیتر لە دوای ئەوە بە شەهیدە ناوی دەبرا وەکیع وتی:- ئوم وەرەقە قورئانی لەبەر بوو بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی پێدا لە ماڵەکەیدا بانگبێژێ دابنێ بانگی بۆ بدات وبەر نوێژی بکات بۆ ئافرەتان ڕاوی وتی:- غولامێك وکەنیزەکێکی هەبوو پێی وتن:- لە دوای مردنم ئێوەش ئازاد بن ئەوانیش شەو چوونە سەری وپۆشاکێکیان دا بە سەر لوت ودەم وچاویدا بەستیان هەتا مرد جا هەستان ورۆیشتن کاتێ کە ڕۆژ بوویەوە هەواڵەکە گەیشتە پێشەوا عومەر –خوای لێ ڕازی بێ – هەستا ووتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە ووتی:- کێ هەواڵی ئەو دووانە دەزانێت یان کێ بینیوونی بیانهێنێت بۆ لامان کاتی هێنانیان فەرمانی کرد هەڵیان بواسن ئەوەش یەکەم هەڵواسین بوو لە شاری مەدینەدا.[١٨٦]

---

[١٨٥] ( رواه مسلم ).

[١٨٦] ( سنن أبو داود رقم الحديث (٥٩١ ) وحسنه الشيخ الألباني.

## ٢٠٠.﴿ بەسەرهاتی پیاوە ئەنصارییەکە کە پابەند بوو بە خوێندنی سوورەتی ئیخلاص ﴾

پیاوێکی ئەنصاری لە مزگەوتی ( قباء ) پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد ،- سوورەتی ( قل هو الله أحد) هەتا کۆتایی سوورەتەکە دەخوێند تا تەواو دەبوو پاشان سوورەتێکی تری دەخوێند لە هەموو ڕکاتێکدا ئەمەی دووبارە دەکردەوە هاوەڵانی مزگەوتەکەی پێیان وت: - تۆ هەمیشە ئەم سوورەتە دەخوێنی پاشان وەك ئەوەی وابزانی نوێژەکەت تەواو نیە دەچیت سوورەتێکی تریش دەخوێنی یان تەنها سوورەتی ( الاخلاص ) بخوینە یان ئەوە مەخوێنە وسوورەتێکی تر بخوێنە ئەویش وتی:- من هەرگیز ئەو کارە واز لێ ناهێنم جا ئەگەر پێتان خۆشە پێش نوێژیتان بۆ دەکەم ئەوە ئامادەم ئەگەر پێتان نا خۆشە واز دەهێنم ئەوانیش لەبەر ئەوەی پیاوێکی بەڕێزی ناویان بوو پێیان خۆش نەبوو بیگۆڕن ووتیان :- ڕازین بەو شێوەیە پێش نوێژیمان بۆ بکە جا کاتێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەو ڕووداوەیان پێگەیاند فەرمووی:- ئەی فلان کەس چی وایلێکردی بە گوێی هاوەڵەکانت نەکەیت ؟ وە بۆچی ئەوەندە پابەندی بەو سوورەتەوە لە هەموو ڕکاتێکدا دوو بارەی دەکەیتەوە ؟ وتی:- ئەو سوورەتەم زۆر خۆش دەوێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- خۆشەویستیت بۆ ئەو سوورەتە دەتباتە بەهەشتەوە یان خواش تۆی خۆش دەوێت.[١٨٧]

---

[١٨٧] (رواه البخاري ومسلم ).

## ٢٠١. ﴿ بەسەر هاتی خەواتی کوڕی جوبەیری ئەنساری لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

ئیبن حەجەر لە کتێبی ( ألإصابة) دا ئەم بەسەر هاتەی هێناوە کە خەوات شاعیرێکی جاهیلی بوو لە مەدینە هۆنراوەی دەوت بەسەر ئافرەتاندا ونوکتەو دەنگو باسی لە ناو عەرەبدا بڵاو بوو خۆی دەگێڕێتەوە ودەڵێت تازە موسڵمان بووم لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) دەر چووین لە دۆڵێکی مەککە بە ناوی (ظهران) خێمەمان هەڵدا بوو شەوێك کە مانگە شەو بوو هاتمە دەرەوە چەند ئافرەتێکی ناو چەکەم بینی دانیشتبوون وقسەیان دەکرد منیش گەڕامەوە خێمەکەم خۆم گۆڕی وهاتمە لایان قسەیان لەگەڵ بکەم وهۆنراوەیان بۆ بخوێنمەوە لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ ئیشی خۆی ومنی بینی لەگەڵ ئافرەتەکاندا وفەرمووی:- باوکی عەبدوڵلا چی دەکەی بەم شەوە ؟ زۆر تەریق بوومەوە بۆ پینەی حاڵی خۆم وتم:- حوشترەکەم بەرەڵا بووە دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە بینیمیەوە فەرمووی:- مەسەلەی حوشترەکەت بو بەچی ؟ منیش لە شەرم وتەریقیدا نەدەچووم بۆ مزگەوت تا پێغەمبەر (ﷺ) نەبینم تا ڕۆژێك هەستم کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوتدا نیە چووم نوێژ بکەم هەستم کرد پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی خۆیان هاتە دەرەوە ودوو ڕکات نوێژی کردو دانیشت منیش نوێژەکەم درێژ کردەوە بەڵکو هەستێ وبڕوات ئەویش فەرمووی:- وا من دانیشتووم چەند نوێژەکەت درێژ دەکەیتەوە بیکە ناچار نوێژەکەم تەواو کرد وچوومە خزمەتی و وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا لەو کاتەدا لاواز بووم وگوناهێکی وام کرد ئەویش بە زەردە خەنەوە فەرمووی:- خوا ڕەحمت پێ بکات , خوا ڕەحمت پێ بکات .

## ٢٠٢. ﴿بەسەر هاتی عەمری کوڕی سەلەمە وپێش نوێژی کردنی بۆ هۆزەکەی﴾

لە عەمری کوڕی سەلەمەوە هاتووە کە ووتوویوتی:- ئێمە لە (حاضر) لە سەر ڕێگای خەڵك بووین (حاضر) بە شوێنی دەووترێت کە ئاوی لێ بێ وهۆزی لێ دادەبەزن وبەجێی ناهێڵن بۆیە کاتێ کە خەڵك دەچوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بەلاماندا تێدەپەڕین وە کاتێکیش کە دەگەڕانەوە بەهەمان شێوە جا کە دەهاتنەوە وە پێیان رادەگەیاندین و دەیانووت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاواو ئاوای فەرمووە منیش لەو کاتەدا غولامێك بووم توانای لەبەر کردنم بە هێز بوو زوو شتم لەبەر دەکرد بۆیە هەرچیان دەوت لە بەرم دەکرد لەبەر ئەوە قورئانێکی زۆرم لە بەر کرد جا باوکم لەگەڵ چەند کەسێکی هۆزەکەمان بە نوێنەری چوون بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەویش فێری نوێژی کردن وفەرمووی:- کێ قورئانی زۆرتر لەبەر بوو با ئەوە پێش نوێژیتان بۆ بکات منیش لە هەموویان زیاتر قورئانم لەبەر بوو بۆیە کردمیان بە پێش نوێژی خۆیان وبەر نوێژیم بۆ دەکردن کراسێکی زەردی کورتم لەبەر دا بو وکاتێ کە دەچوومە سەجدە وە بەدەنم دەردەکەوت بۆیە ئافرەتێك لەو تیرەیە وتی:- ئەوە بۆ پاشی شەرمگەری دوای قورئان خوێنەکەتان ناشارنەوە لە ئێمە ئەوانیش کراسێکی عومانیان بۆ کریم وپۆشیم ئەوەندە پێی کەیف خۆش بووم لە دوای ئیسلام بە هیچ شتێ ئەوەندە کەیف خۆش نەبووم من حەوت هەشت ساڵان بووم بەر نوێژیم بۆ دەکردن.[١٨٨]

---

[١٨٨] ( صحيح سنن أبو داود رقم (٥٨٥ ) وصححه الشيخ الألباني ).

## ٢٠٣. ﴿ کاتێك گەنجەکان پێغەمبەریان بینی بلاوەیان کرد ﴾

ڕۆژێك کۆمەڵێك گەنجی مەککە پۆشاکەکانی بەریان داکەند بوو وەك حەبل لولیان کرد بوو بە یەکتریاندا دەکێشا لەو کاتەدا ئەوان ئەو کارەیان دەکرد دوو هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بە لایاندا ڕۆشتن گەنجەکان گالتەیان پێکردن وباکیان نەبوو هیچ ڕێزیان بۆ ئەو کەسانە دانەدەنا کە بە لایاندا دەرۆشت پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە لایاندا ڕۆشت کاتێك پێغەمبەریان بینی بلاوەیان لێکرد پێغەمبەر (ﷺ) بە تورەیی گەڕایەوە بۆ ماڵ دەربارەی ئەو گەنجانە دەیفەرموو:- (سبحان الله) شەرم لە خوا ناکەن ولە بەردەم پێغەمبەری خواشدا خۆیان دا ناپۆشن ئوم ئەیمەن – خوای لێ ڕازی بێ – پێی فەرموو:- ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە وە زۆر جەختی لێ کردەوە تا داوایان بۆ بکات بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێخۆشبوونی بۆ نەکردن.[189]

## ٢٠٤. ﴿ کەچاوی بە حاڵی کوڕەکەی کەوت چاوە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فرمێسکیان باراند ﴾

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵان چوون بۆلای ئیبراهیمی کوڕی لەو کاتەدا لە کاتی گیانکێشاندا بوو پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بە گریان هەتا لە چاوە پیرۆزەکانی فرمێسك دەهاتە خوارێ هەندێ لە هاوەڵە بەڕێزەکان گومانیان وابرد کە گریان وغەمباری نیشانەی خۆڕانەگرتنە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتی:- تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ؟ پێغەمبەر فەرمووی:- ئەی کوڕی عەوف ئەمە بە ڕاستی سۆزە چاو فرمێسك دەڕێژێ دڵ غەمبار دەبێ ئەمە واتای ئەوە نیە ڕازی نەبین بە وویستی خوای گەورە بەڵام لە جیا بوونەوەت ئەی ئیبراهیم هەمووومان خەفەت بارین وە ڕۆژێکیان کچێکی پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) منداڵێکمان وەفاتی کردووە پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوەکەی ناردەوە بۆلای پێی فەرموو سەلامت لێ دەکات وە پێی بڵێ هەمووی هی خوایە ئەوەی دەیبەخشێ ئەوەی دەیباتەوە وە هەموو شتێك لای خوای گەورە ماوەی بۆ دیاری کراوە بۆیە خۆڕاگر بە وچاوەڕێی پاداشتی خوای گەورە بکە.[190]

---

[189] ( رواه أحمد والطبراني ).

[190] ( رواه البخاری ومسلم ).

## ٢٠٥. ﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەشتەكیەكەی فێری نوێژ كرد ﴾

ڕۆژێكیان پیاوێكی دەشتەكی خۆی كرد بە مزگەوتدا نوێژی بە خێرایی كرد هیچ ڕكوع وسجوودی تەواو نەبوو واتە:- حەقی خۆی پێ نەدەدان پێغەمبەر (ﷺ) تەماشای كرد پاشان فەرمووی:- بڕۆ نوێژەكەت بكە ئەوە نوێژ نەبوو تۆ كردت كابرا ڕۆیشت نوێژەكەی دووبارە كردەوە وئینجا چووە خزمەت پێغەمبەرەوە (ﷺ) دووبارە فەرمووی:- بڕۆ نوێژەكەت بكە ئەوە نوێژ نەبوو تۆ كردت كابرا رۆیشت سێ یەم جار نوێژەكەی كردەوە بەلأم پێغەمبەر (ﷺ) هەر فەرمووی:- بڕۆ نوێژەكەت بكەرەوە كابرا وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوای گەورە لەوە باشتر نازانم فێرم بكە ؟ ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) كابرای دانیشاندو فێری نوێژی كرد وفەرمووی:- ئەگەر چویتە ڕكوع ئەوەندە بمێنەوە تا جەستەت ئیسراحەت بكات و باقی نوێژەكە بە هەمان شێوە.[١٩١]

## ٢٠٦. ﴿ پێغەمبەر ( ﷺ ) كاری ئافرەتەكەی بە گەورە سەیر كرد ﴾

لە سەر دەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئافرەتێك هەڵدەستا بە پاك كردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) وە چاو دێری تەواوی دەكرد پێغەمبەری خوا سۆزی هەبوو بۆی وپرسیاری دەكرد لە حاڵ وگوزەرانی كارەكەی بە گەورە سەیر دەكرد وزۆر سوپاسی دەكرد لە سەر كارەكەی ڕۆژێكیان پێغەمبەر (ﷺ) چووە مزگەوتەوە ئافرەتەكەی نەبینی پرسیاری كرد ئەو ئافرەتە لە كوێیە ؟ ووتیان :- قوربان مردووە وە هەواڵیان دایە كە شۆراوە ونوێژیان لەسەر كردووە وئەسپەردەی خاكیان كردووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- بۆ پێش ناشتنی ئاگادارتان نەكردم ؟ پاشان فەرمووی: - ئەم گۆڕانە تاریكە بۆ خاوەنەكەی بەلأم خوای گەورە ڕووناكی دەكاتەوە بە هۆی ئەوەی كە نوێژیان لەسەر دەكەم.[١٩٢]

---

[١٩١] ( متفق عليه ).

[١٩٢] ( رواه مسلم ).

## ٢٠٧. ﴿ پێغەمبەری خوا بە شێوەیەکی زۆر تووند سەرزەنشتی ئەقرەعی کوڕی حابسی کرد﴾

ئەقرەعی کوڕی حابس –خوای لێ ڕازی بێ- سەردانی ماڵی پێغەمبەری کرد کاتێك دانیشتبوون پێغەمبەری بینی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی کە کچەزای بوو ماچ کرد ئەقرەع سەری سوڕما لەو کارەی پێغەمبەر (ﷺ) وتی:- من دە منداڵم هەیە تا ئیستا هیچیانم ماچ نەکردووە ؟ ئایە ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن ؟ من تا ئیستا ماچم نەکردوون کە دە منداڵم هەیە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بە لایەوە سەیر بوو کە ئەم پیاوە واتە:- ئەقرەع بۆ ئەوەندە ووشکە ودڵ داخراوە بەرامبەر بە منداڵەکانی ڕووی تێکردوو سەرزەنشتی کرد بە شێوەیەکی زۆر توند فەرمووی:- چی بکەم لە دڵێك کە خوای گەورە سۆزو بەزەیی ومیهرەبانی تیا هەڵگرتووە واتە:- هیچ ناکرێ وناوترێ لەگەڵ کەسێ کە دڵی بەزەیی تیا نەبێ وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەقرەعی ئاگادار کردەوە لەو دڵ ڕەقی و ووشکی وبێ بەزەییەی فەرمووی:- ئەوەی بە بەزەیی نەبێ خواش بە بەزەیی نابێ بەرامبەر بەو کەسە.[١٩٣]

---

[١٩٣] (رواه البخاري ومسلم ).

## ٢٠٨.﴿ هەر کە گوێ بیستی ووتەکەی پێغەمبەر بوو ئەبو بەکر لە خۆشیدا سوپاسی خوای کرد ﴾

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە کە ووتویەتی :- رۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆ ناو هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف بۆ ناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە کاتی نوێژ بوو بانگدەر کە بیلال بوو هات بۆلای پێشەوا ئەبو بەکر –خوای لێ ڕازی بێ- وتی:- ئەگەر بانگ بدەم بەر نوێژی دەکەی بۆ خەڵك ؟ وتی:- بەڵێ جا کە پێشەوا ئەبو بەکر نوێژی دابەست پاش کەمێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەوە هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکە یەکە دڕی بەڕیزە کاندا هەتا خۆی گەیاندە ڕیزی یەکەم لەوێ وەستا خەڵکەکە بە بەری دەستیان دایان لە پشتی دەستیان ئەبو بەکریش عادەتی نەبوو لابکاتەوە بەڵام کە بینی خەڵکەکە ئەوەندە بەبەری دەستیان دەدەن لە پشتی دەستیان ئەویش ئاوڕی دایەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆت بمێنەرەوە ونوێژەکەمان بۆ تەواو کە پێشەوا ئەبو بەکر لە خۆشیدا دەستی بەرز کردەوە وسوپاسی وستایشی خوای کرد لە سەر فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاشان ئەبو بەکر هاتە دواوە بۆ ناو ڕیزەکەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە پێشەوە کاتێ لە نوێژ بوویەوە فەرمووی:- ئەی ئەبو بەکر چی ڕێگری لێ کردی لە لە جێی خۆت بمێنیتەوە کاتێ کە فەرمانم پێ کردی ؟ ئەبو بەکر وتی:- بۆ کوڕی ئەبو قوحافە ناگونجێت لە پێش پێغەمبەری خواوە (ﷺ)نوێژ بکات جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خەڵکەکەی فەرموو:- ئەوە چی بوو ئەوەندە بە بەری دەستتان داتان لە پشتی دەستان ؟ هەر کەسێ لە ناو نوێژەکەیدا شتێکی لێ روویدا با (سبحان الله ) بکات کاتێ کە (سبحان الله)ی کرد پێش نوێژ ئاوڕی لێ دەداتەوە چونکە بە بەری دەست دان لە پشتی دەست لە ناو نوێژدا بۆ ئافرەتانە.[١٩٤]

---

[١٩٤] ( صحيح سنن أبو داود رقم الحديث ( ٩٤٠ ) وصححه الشيخ الألباني ).

## ٢٠٩.﴿ خوای پەروەردگار ڕزق وڕۆزی دیاری دەکات لە بینی فەجرو ڕۆژهەڵاتدا ﴾

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ هاوەڵان کرد لە دوای نوێژەکەی ڕووەو ماڵی خاتوو فاتیمەی کچی ڕۆشت بینی هێشتا ئەوان نووستوون وبە خەبەر نەهاتوون لە کاتێکدا تەواو دنیا ڕووناك بۆتەوە خەبەری کردنەوە وئاگاداری کردنەوە لە فەزڵ وبەرەکەتی سەعاتی دوای نوێژی بەیانی کە لەو کاتەدا خەیرو بەرەکەتێکی زۆر هەیە فەرمووی:- ئەی کچەکەم هەستە شاهید وبە ئاگابە لەسەر ڕزقی پەروەردگار نەکەی لە بێ ئاگایان بێت چونکە خوای پەروەردگار ڕزق وڕۆزی خەڵکی دیاری دەکات لە بەینی فەجرو ڕۆژهەڵاتدا.[١٩٥]

## ٢١٠.﴿ سەلمانی فارسی بە بینینی چەند نیشانەیەك لە پێغەمبەری خوا یەکسەر موسڵمان بوو ﴾

لە ئیبن عەبباسەوە دەڵێت :- سەلمانی فارسی قسەی بۆ کردم وتی:- من کەسێکەی فارسی بووم لە ئەهلی ئەصفەهان خەڵکی گوندێك بووم بە ناوی ( جي) کە شارۆچکەیەك بوو لە ئەصفەهانی کۆن کە باوکم کوێخاکەی بوو وە من خۆشەویسترین کەسی باوکم بووم ئەوەندە خۆشی دەوویستم زۆر جار هەروەك کەنیزەك لە ماڵەوە دەیبەستمەوە لە ئاینی ئاگر پەرستیدا تەقەلام دا تا بوومە هاونشینی ئەو ئاگرەی کە باوکم هەڵیدە گیرساند ونەیدە هێشت بۆ کاتژمێرێك بکوژێتەوە وە باوکم زەوی زارێکی گەورەی هەبوو ڕۆژێکیان بەهۆی درووست کردنی خانوویەکەوە سەرقاڵ بو وپێ ی وتم:- کوڕم ئەوە من ئەمڕۆ  بە هۆی سەرقاڵیەوە بە بینا کردنەوە لە زەوی یەکەم دابڕاوم تۆ بڕۆ چاوێکت لێی بیت وچەند فەرمانێکی تریشی دا بەسەرمدا منیش چوومە دەرەوە پاشان باوکم پێی وتم:- خۆتم لێ وون نەکەی چونکە تۆ زۆر لە زەوی یەکە بۆمن گرنگتریت ئەگەر خۆت وون کەیت ئەوا بە خۆتەوە سەرقاڵم دەکەیت

---

[١٩٥] ( رواه البيهقي ).

وهەموو شتێکم بیر دەچێت منیش چوومە دەرەوە بە نیازی ڕۆیشتن بۆ سەر زەوی یەکەی لە ڕێگا بەلای یەکێ لە کەنیسەکانی گاورەکاندا تێپەڕ بووم گوێ ملە دەنگیان بوو دووعایان دوکرد منیش نەمدەزانی کاری ئەمانە چ پەیوەند یەکی بە بەند کردنی منەوە هەیە لە لایەن باوکمەوە لە ماڵەوە ئەوە بوو کە تێپەڕیم بە لایاندا گوێم لە دەنگیان بوو چوومە ژوورەوە بۆ لایان تا بزانم خەریکی چین کە بینیمن سەرم سوڕما لە نوێژەکەیان وموعجیبی بووم وحەزم لە کارەکەیان کرد وتم:- سوێند بە خوا ئەمە باشترە لەو ئاینەی وا ئێمە لە سەری دەڕۆین سوێند بە خوا بەجێم نەهێشت تا خۆر ئاوا بوو وازم لە زەوی باوکم هێناو نەچوومە سەری بەوانەی ناو کڵێسەکەم وت:- بنچینەی ئەم ئاینە لە کوێیە ؟ ووتیان لە شامە دەڵێت :- ئەو جا گەڕامەوە بۆلای باوکم کە ناردبووی بە دوامدا وبە بۆنەی گەڕان بە دوای مندا هەموو کارەکانی خۆی واز لێ هێنا بوو بەمنەوە سەرقاڵ بو وکاتێ هاتم بۆلای پێی وتم:- دەی کوڕم لە کوێ بویت ؟ باشە من پێم نەوتی واو وا بکە ؟ وتم :- بابە گیان ڕاستیەکەی ئەوە بوو بەلای خەڵکانێکدا ڕەت بووم لە کڵێسا نوێژو دووعایان دەخوێند منیش موعجیبی کارو ئاینەکەیان بووم وسوێند بە خوا لە لایان مامەوە تا خۆر ئاوا بوون باوکم وتی:- کوڕم ئەو ئاینەی ئەوان خێری تیا نیە بەڵکو ئاینی خۆت وباو باپیرانت باشترە لەوە وتم:- نا بەخوا بەڵکو ئەوە لە ئاینەکەی ئێمە باشترە دەڵێت:- ئەو جا باوکم ترساو بە قەیدێك قاچی بەستمەوە ولە ماڵەوە بەندی کردم دەڵێت:- پەیامێکم نارد بۆ گاورەکان و وتم:- ئەگەر قافڵەیەکی بازرگانی لە شامەوە هات بۆلاتان لە بازرگانانی گاور هەواڵم پێ بدەن ئەوە بوو قافڵەیەك لە شامەوە هاتە لایان وئەوانیش هەواڵیان پێ دام وتم:- ئەگەر کارەکانیان تەوا و بوو وویستیان بگەڕێنەوە پێم بڵێن دەڵێت:- ئەوانیش وایان کرد منیش قەیدە ئاسنەکەم هەر چۆنێك بوو لە قاچم کردەوە ولەگەڵیان چووم تا گەیشتمە شام کە گەیشتمە شام وتم:- کێ باشترین کەسە لە ناو ئەم ئاینەدا ؟ ووتیان واعیزو ئەسقەفی ناو کڵێسا باشترین پیاوی ئەم ئاینەیە منیش هاتم بۆلای پێم وت:- من ڕەغبەت و وویستی ئەم ئاینەم کردو حەزم کرد لەگەڵ تۆدابم ولە ناو کڵێسادا خزمەت بکەم وشتیشت لێ فێربم ونوێژت لەگەڵ بکەم دەڵێت:- هاتە ژوورەوە ومنیش لەگەڵیدا هاتمە ژوورەوە ومامەوە بۆم دەرکەوت پیاو خراپێکە فەرمان بە خەڵکی دەکات کە ماڵ وسامان

ببەخشن وهانیان دەدات بە صەدەقە وهەرکە خەڵکەکە پارەیان کۆکردەوە بۆ بەخشێنی ئەم لای خۆی گلی دەدایەوە وهیچی لێ نەدەدا بە هەژاران تاوای لێ هات حەوت قلال (قلال) جۆرە جامێکی عەرەبی یە زێرو پارەیەکی زۆری کۆکردەوە منیش لە بەر ئەوە زۆر زۆر ڕقم لێ هەڵسا پاشان مرد گاورەکان کۆبوونەوە کە بە خاکی بسپێرن پێم وتن:- ئەم پیاوە کەسێکی خراپە فەرمانی بە ئێوە ئەکرد کە ببەخشن وهانی ئەدان کە بۆتان نەهێنا هەڵی ئەگرت بۆ خۆی وهیچی لێ نە ئەدا بە هەژاران وئەوجا شوێنی گەنجینەکەیم نیشاندان کە حەوت گۆزەی پڕی تیابوو ئەوانیش کە دیتیان ووتیان:- سوێند بە خوا نابێ هەرگیز بیسپێرین ئەوە بوو لە خاچیان داو بەرد بارانیان کرد ئەوجا پیاوێکیان لە جێی دانا پیاوی وا باشم نەدیبوو کەسێکی زاهید بوو لە دنیا ڕووی لە قیامەت بوو هەر زۆر بەرێز بوو شەو ڕۆژ خەریکی خوا پەرستی بوو شتانێکی فێر کردم کە تا ئەو کاتە باشترین وخۆشەویسترین شت بوو لە دڵما لەلای مامەوە تا وەفاتی کرد لەسەرە مەرگدا پێم وت:- ئەی فلاَن کەس وا دەبینی کە خوا حافیزی ئەکەیت ودەزانی کە سوێند بەخوا کەسم هێندەی تۆ خۆشنە ویستووە پێم بڵێ چی بکەم وبۆلای کێ بڕۆم دوای خۆت ؟ پێی وتم:- کوڕم سوێند بەخوا ئەوەندە دەزانم پیاوێك لە موصل هەیە بڕۆ بۆلای دەبینیت هەر وەك من بێت دوای مردنی ڕۆیشتم بۆ موصل وچوومە لای هاوەڵەکەی دەبینم هەر وەك ئەوە لە کۆشش وزوهدا پێم وت:- فلاَن کەس منی بە تۆ سپاردووە کە بێمە لات ولەگەڵت بم پێی وتم:- دەههەڵسە کوڕم ولەلام بمێنەرەوە منیش لەلای مامەوە تا ئەویش مەرگی هاتە پێشەوە پێم وت:- فلاَن منی بە تۆ سپارد تۆش وا خەریکی کۆچ دەکەیت بە کێم دەسپێری ؟ وچی فەرمانێکم پێ دەکەیت؟ وتی:- سوێند بە خوا هەر ئەوەندە ئەزانم پیاوێك لە فلاَن جێ هەیە بڕۆ بۆلای ئەوە بوو دوای سپاردنی چووم بۆلای ئەو پیاوە ولەلای مامەوە کە هەر وەك ئەوان بوو تا ئەویش کەوتە سەرە مەرگی و وەسیەتی بۆ کردم بچم بۆلای پیاوێك لە ئەهلی (عموریە) لە ڕۆم منیش هاتم بۆلای ئەویش هەر وەك ئەوان بوو لەو نێوانەدا من بووم بە خاوەنی چەند سەر مانگاو ماڵات بە کاسبی کردن ئەویش کەوتە سەرەمەرگ وقسەم لەگەڵ کرد دەربارەی ئەوەی دوای ئەو بۆ کوێ بڕۆم وڕوو لە کێ بکەم؟ وتی:- کوڕم سویند بە خوا ئەوەندەی من دەزانم کەس نەماوە لە سەر ئەو ڕێ یە بڕوات کە ئێمەی لەسەر ڕۆیشتین تا

فەرمانت پێ بکەم بچیتە لای بەڵام ڕۆژانێك نزیکن کە پێغەمبەرێك دێت لە حەرەمەوە دەر بەدەر دەکرێ بۆ زەوی یەکی شۆرەکاتی پڕ لە دار خورما وچەند نیشانەیەکی پێوەیە کە نەشاردرێتەوە لە نێوان هەردوو شانیشیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەیە دیاری وەردەگرێت وبەخشش صەدەقە ڕەت دەکاتەوە ووەری ناگرێت ئەگەر توانیت خۆت بگەیەنیتە ئەو وولاتانە ئەوە ئەو کارە بکە چونکە زەمانی هاتنی وا سێبەری بۆت کردووە واتە:- تۆ ئێستا لەو زەمانە دێت ئەوە بوو پاش ئەوەی ئەمیشیان سپاردەکرد مامەوە تا پیاوانێك لە بازرگانە عەرەبەکان لە (کلب ) بەلامدا تێپەڕین پێم وتن :- لەگەڵ خۆتان هەڵمگرن بۆ ووڵاتی عەرەبی بەرامبەر ئەو موڵك وچەند سەر مانگایە کە هەمە ووتیان:- باشە ماڵ ومانگاکانم پێدان ئەوانیش لەگەڵ خۆیان هەڵیانگرتم هەتا گەیاندمیانە (وادی القری) لە وێدا ستەمیان لێ کردم و وەك کۆیلەیەك فرۆشتمیان بە پیاوێکی جوولەکە کە لە (وادی القری) بوو سوێند بە خوا چاوم بەدار خورما کەوت وتەماعم ئەوە بوو کە ئێرە ئەو جێگایە بێت کە هاوەڵەکەم بۆی وەسف کرد بووم سوێند بەخوا بۆم یەکلا نەبوویەوە هەتا پیاوێك لە (بني قريظة) هات بۆ (وادي القری) وکابرای جوولەکە منی پێ فرۆشت ئەویش منی لەگەڵ خۆی برد تا هاتینە مەدینە سوێند بە گەورەیی خوا هەرکە دیتم و چاوم بە مەدینە کەوت زانیم کە ئەو جێگایەیە من بۆی دەگەڕێم ئیتر بە کۆیلەیەتی مامەوە لەو نێوانەدا خوای گەورە پەیامی خۆی نار دبە پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) لە مەککە وبە هۆی ئەو حاڵ وکۆیلەیەتی یەی منی تیا بوو کەس هیچی پێ نەوتبووم لەو بارەیەوە هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە (قباء) کاتێ من خەریك بووم لە باخێکی دار خۆرمادا کارم دەکرد بۆ خاوەنەکەم وەڵڵاهی من خەریکی کاری خۆم بووم تا کوڕە مامێکی هات وتی:- ئەی فلان کەس خوا (بني قيلة) واتە:- هەردوو هۆزی ئەوس وخەزرەج بە کوشت دات سوێند بەخوا ئەوان ئێستا لە (قباء) کۆبوونەتەوە لەگەڵ پیاوێك لە مەککە کە ئەڵێن گوایە پێغەمبەرە سەلمان وتی:- سوێند بەخوا هەر ئەوەندەی گوێم لەو قسانە بوو هەموو گیانم کەوتە لەرزین بە جۆرێك وتم:- ئێستا نەکەوم بەسەر خاوەنەکەمدا خێرا دابەزیم و وتم:- ئەم هەواڵە چی بوو؟ سەلمان دەڵێ گەورەکەیشم دەستی بەرز کردەوە زللەیەکی توندی لێ دام و وتی:- تۆ چیتە بەم قسانەوە بڕۆ خەریکی کاری خۆت بە سەلمان دەڵێ:- منیش

وتم:- هیچ تەنها هەواڵێکم بیست وحەزم کرد بزانم چی یە کاتێ شەو داهات بڕێك خۆراکم پێ بوو هەڵمگرت ورۆیشتم بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ (قباء) پێم وت:- پێیان وتووم کە تۆ پیاوێکی چاکسازیت وچەند هاوەڵێکی غەریبت لەگەڵدایە وەمنیش بڕێك بەخشش وصەدەقەم پێ بوو بە خۆمم وت کە ئێوە لە هەموو کەسێك لەم وولاتەدا زیاتر لەسەر هەقن وە شایستەن بەم صەدەقەیە فەرمووی:- لێی بخۆ دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارێزی کردو لێی نەخوارد وبە هاوەڵەکانی فەرموو بیخۆن منیش بە خۆمم وت:- ئەمە یەکێکە لەو سیفاتانەی کە هاوەڵەکەم پێی وتم پاشان گەڕامەوە پێغەمبەری خواش (ﷺ) هاتبوو بۆ مەدینە بڕێك کەل وپەلم کۆکردەوە لەلای خۆمەوە وهێنام بۆی و وتم:- دەبینم لە صەدەقە ناخۆیت بەلاَم ئەمە دیاری یە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەری گرت ولێی خوارد وهاوەلاَنیش لێیان خوارد وتم:- ئەمەش سیفاتێکی ترە کە بۆم باسکرا پاشان هاتمەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بە شوێن جەنازەیەکەوە بوو لە ناو هاوەلاَنیدا گەڕامە دواوە وچوومە پشتەوە سەیری بکەم بزانم ئەو مۆرەی کە بۆم وەسف کرا بوو بە پشتیەوە هەیە یان نا ئەوە بو وکاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی بینی وا چوومەتە دوایەوە زانی کە ئەمەوێ لەشتێك دڵنیا بم کە پێشتر بۆم وەسف کراوە بۆیە عەباکەی لادا لەسەر پشتی کە مۆرەکەم بینی وناسیمەوە خێرا باوەشم پیادا کرد وبە دەم گریانەوە ماچم دەکرد پێغەمبەری خواش (ﷺ) پێی وتم:- وەرە بەو لاوە منیش هاتمە ئەملاوە وچیرۆکەکەی خۆمم بۆ باس کرد هەر وەك ئێستا بۆ تۆی باس دەکەم ئەی (ئیبن عەباس) پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزی کرد هاوەلاَنیشی گوێیان لە چیرۆکەکەم بێت پاشان سەلمان بە کۆیلەیەتی مایەوە تا بەو هۆیەوە نەیتوانی لە بەدرو ئوحود ئامادە بێت لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- (کاتب یا سلمان) واتە:- خۆت بکەڕەوە ئەی سەلمان, سەلمان دەڵێ:- منیش لەگەڵ خاوەنەکەم رێك کەوتین کە سێ سەد بن دار خورمای بۆ بروێنم بە نەمام لەگەڵ چل ئوقیەدا ئەویش من ئازاد بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هاوەلاَنی فەرموو:- هاوکاری براکەتان بکەن ئەوانیش بە دار خورما هاوکاریان کردم هەبوو بە سێ نەمام وهەبوو بیست وهەبوو بە پازدە هەتا سێ سەد نەمام کۆکردەوە ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- (أذهب یا سلمان ففقر لها , فإذا

فرغت فأئتني أكون أنا أضعها بيدي) برۆ زەویەکەیان بۆ هەڵکەنە وچاکی بکە کە لێی بوویتەوە وەرە پێم بڵێ من بە دەستی خۆم نەمامەکانی تێ دەخەم منیش جێگای نەمامەکانم هەڵکەند بە هاوکاری هاوەڵانم وکە لێبوومەوە هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وپێم وت کە تەواو بووین ئەویش لەگەڵم هات ئێمەش شەتڵ ونەمامەکانمان بۆ نزیك دەکردەوە وئەویش دەیخستە ناو چاڵەکەوە سوێند بەو زاتەی نەفسی سەلمانی بە دەستە یەك دانە لەو شەتلانە نەمردو ووشك نەبوو بەو جۆرە دار خورماکەم لە کۆڵ بوویەوە ئەدام کرد مایەوە پارەکە ئەدا بکەم ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە قەبارەی هێلکەی مریشکێك زێڕی هێنا کەلە چەند غەزایەکدا دەستی موسڵمانان کەو تبوو فەرمووی:- (ما فعل لفارسي المكاتب ؟ ) واتە:- برا فارسیە مکاتبەکەمان چی کرد ؟ منیان بانگ کردە لای فەرمووی:- (خذها فأد بها ما عليك) واتە:- ئەمە بەرە وبیدە بە گەورەکەت وئەوەی لەسەرتە بیدە وتم:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە بەش دەکات ؟ فەرمووی:- (خذها فإن الله سيؤدي بها عنك) واتە:- بیبە بێگومان خوای گەورە بۆت جێ بە جێ دەکات منیش بردم وکێشی چل ئۆقیەم بۆ کێشانە کردن وهەقی خۆیانم دا پێیان وئازاد بووم ئەوجا بە ئازادی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دا لە جەنگی خەندەق بەشداریم کرد وپاش ئەویش لە هیچ غەزایەکی تر دوانەکەوتم.[١٩٦]

---

[١٩٦] (پیاوانی جێی متمانەن أحمد وغەیری ئەویش گێڕاویانەتەوە أرنائووت ( سیر ١ / ٥١١ ).

## ٢١١. ﴿ سەرکەوتنی ئیمامی عەلی بەسەر عەمری کوڕی عەبدوددا لە جەنگی خەندەقدا ﴾

ئیبن ئیسحاق – رەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێت:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) وموسڵمانەکان وەستابوون بەرامبەر بە ئەحزاب وە دوژمنەکانیشیان گەمارۆیان دابوون بەڵام هیچ ڕووبە ڕوو بوونەوەیەکی سەربازی بە شێوەی تێك پرژان ڕووی نەدا لە نێوانیاندا تەنها ئەوە نەبێت چەند سوارێکی قورەیش لە ناویاندا عەمری کوڕی عەبدود وعیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل وهوبەیرەی کوڕی ئەبو وەهبی مخزومی ضیراري کوڕی خەتتاب خۆیان ئامادە کردو بەرگی جەنگیان پۆشی پاشان دەرچوون بە ئەسپەکانیان وە ئینجا شوێنێکی بەر تەسکیان ڕەچاو کرد لە خەندەقەکەو لە ئەسپەکانیان خوڕی ولە وێوە پەڕینەوە وکەوتنە ناو قوڕاوێك چەقین لە نێوان خەندەق وکێوی (سەلەع) دا عەلی کوڕی ئەبو تالیب – خوای لێ ڕازی بێ – لەگەڵ دەستەیەك لە موسڵمانان بۆیان چوون هەتاکو گەیشتنە سەریان لەو دەروازەی لێوەی پەڕی بوونەوە بە ئەسپەکانیانەوە وهەوڵیاندەدا بە خێرایی بەرەو ڕوویان بڕۆن عەمری کوڕی عەبدود لە پاڵەوانە ناسراوەکانی قورەیش بوو بەژداری غەزای بەدری کرد بوو لەوێدا بریندار بوو بوو بەژداری غەزای ئوحودی نەکرد بو وکاتێك غەزای خەندەق هات بەژداری کردو پەڕۆیەکی بۆ ناسینەوەی لە نێوان چاوانی بەستبوو بۆ ئەوەی پایەی خۆی دەرخات وببینرێت کاتێك خۆی لەسەر ئەسپەکەی بوو وتی:- کێ بووم دێتە مەیدان بۆ شمشێر بازی ؟ عەلی کوڕی ئەبو تالیب بۆی چووە مەیدان وپێی فەرموو:- عەمر تۆ شەرت وپەیمانت لەگەڵ خوادا بەستووە کە هەر کەسێکی قورەیشی داوای دوو شتت لێ بکات یەکێکیانی بۆ جێ بە جێ بکەیت پێی وت:- بەڵێ ئیمامی عەلی وتی:- من بانگت دەکەم کە باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی وئاینی پیرۆزی ئیسلام بێنی وتی:- پێویستم بەوە نیە ئیمامی عەلی وتی:- کەواتا داوای دابەزینت لێ دەکەم بۆ شەڕە شمشێر بە عەلی وت:- بۆچی ئەی کوڕی برام وەڵڵاهی من پێم خۆش نیە تۆ بکوژم عەلی پێی وت : بەڵام وەڵاهی من پێم خۆشە بتکوژم عەمر ڕقی هەستا کە ئەو قسەی گوێ لێ بوو لە ئەسپەکەی خۆی هەڵدایە خوارەوە ولە دەم وچاوی ئەسپەکەی دا وکوشتی

پاشان بەرەو ڕووی عەلی ڕۆیشت کەوتە شەڕە شمشێر لە گەڵێداو یەکتریان دەهێناو دەبرد ئەوە بوو عەلی – خوای لێ ڕازی بێ – دواجار عەمری کوشت وئەسپ سوارەکانی تر لە ترسان بە شکست خواردوو بە پەلە لە خەندەقەکەوە ڕایان کردەوە عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل لە پەلەیان و لە ترسان ڕمەکەی لە بیر چوو لەو ڕۆژەدا لەبەر ئەوەی کە بەسەر عەمردا هات وڕای کرد.[197]

## ٢١٢.﴿بەسەرهاتی ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر لەغەزای ئەحزاب دا﴾

لە غەزای ئەحزابدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێکەوتنێکی لەگەڵ (بني قوريظة)دا گرێدا بوو یەکێك لە بەندەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە ئەوە بوو کە هەردوو لا بە هاوبەشی پارێزگاری لە مەدینە بکەن ئەگەر تووشی دوژمنکاری یەکی دەرەکی هات وکاتێ ئەحزاب کۆبوونەوە بەمەبەستی ڕیشەکێش کردنی ڕەچەڵەکی موسڵمانان ولە دەوروبەری مەدینە قەڕە وڵیان دانا هەواڵی پەیمانشکێنی جوولەکەکانی (بني قريظة) گەیشت ووتیان:- کە هیچ گرێبەست وپەیمانێك لە نێوان ئێمە وموحەممەددا نیە وخەریك بوو ئەم پلانە ستەمکارانەیە هەموو موسڵمانان لە ناو بەرێت ئەگەر بەزەیی ولوتفی خوای باڵا دەست نەبوایە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- ڕۆژی خەندەق پرسیمان :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕاستیدا دڵەکان گەیشتوونەتە گەروو لە تۆقیندا چیمان پێ دەڵێیت کە ئەنجامی بدەین یان بیڵێین ؟ ئەویش فەرمووی:- (اللهم أستر عوراتنا وأمن روعاتنا) واتە:- بڵێن :- ئەی پەروەردگار عەورەت ودامێنمان بپۆشە ولە ترس وتۆقین دڵنیا وئەمینمان کە دەڵێت:- ئەوە بوو پەروەردگار بە ڕەشەبا دای لە دەم وچاوی دوژمنان وبە ڕەشە با شکستی پێ هێنان خوای گەورە دەفەرمووی:- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنُوداً لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً {٩}﴾ الاحزاب.

---

[197] ( أخرجه :ابن هشام(السيرة) ٣ / ١٨٠ , والحاكم ٣ / ٣٢ , رقم(٤٣٨٥ )وقال محققه سنده الى ابن اسحاق صحيح وهو معضل , والبيهقي (الدلائل) ٣ / ٤٣٧

واتە:- ئەو جا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی ئەحزابەکان بوویەوە بەرەو(بني قريظة) موسڵمانەکانی برد تا ئابڵوقەیان بدەن پاش ئەوەی لە کاتی نەهات ونارەحەتیدا ئەو پەیمانەی دا بوویان شکاندیان ونەیانبردە سەر ئیبن ئیسحاق دەڵێت:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بە خۆی وئاڵا کەیەوە پێشخست بۆلای (بني قريظة) وهەرکە نزیك قەڵاکانیان بوویەوە گوێی لە قسەیەکی ناشیرین ونەشیاو بوو کە بە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دەوت ئەوە بوو گەڕایەوە تا لە ڕێگا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشت پێی فەرموو:- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر نزیك نەبیتەوە لەو پیس ودەغلانە باشترە فەرمووی:- (لم ؟ أظنك سمعت منهم لي أذى) واتە:- لەبەر چی ؟ وا دیارە شتێکی ئازار دەرت لێیان بیستووە دەربارەی من ؟ وتی:- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش (ﷺ) فەرمووی:- ( لو رأوني لم يقولوا من ذلك شيئا) ئەگەر منیان بدیایە شتی وا لە زاریان دەرنەدە چوو ئەو جاك ە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە قەلاکانیان نزیك بوویەوە فەرمووی:- (يا إخوان القردة هل أخزاكم الله وأنزل بكم نقمته ؟ ) واتە :- ئەی براو خوشکی مەیموونەکان دەڵێی خوا ڕیسوای کردوون وغەزەبی خۆی بە سەرتاندا دابەزاندووە ؟ ووتیان :- ئەی ئەبا قاسم هەرگیز نەزان نەبوویت،[١٩٨] ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆی دان بۆ ماوەی بیست وپێنج شەو هەتا ئەو گەمارۆدانە جوولەکەکانی شەکەت کردو ترس وتۆقینی هاوێشتە دڵەکانیان وپێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردن کە بین بە دەم فەرمان وبڕیاری یەوە وملکەچی بن ئەوجا (بني قريظة) کەسێکیان ناردە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەبا لوبابەی کوڕی منزری برای عەمری کوڕی عەوفیان بۆ بنێرێت ئەوان هاوپەیمانی ئەوس بوون تاوەکو ڕاوێژی پێ بکەن دەربارەی حاڵی خۆیان پێغەمبەری خواش (ﷺ) ناردی بۆیان هەرکە بینیان پیاو ئافرەتیان دەستەو دامینی بوون ودەستیان بە گریان کرد ئەویش بەزەیی پیایاندا هاتەوە ئەبو لوبابە دەیزانی بڕیاری

---

[١٩٨] حاکم لە(المستدرك) (٣ / ٣٤ , ٣٥ ) لە عائیشەوە -خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی بە لەفزێکی هاو شێوە دەڵێت:- لەسەر مەرجی هەردوو شەیخ صەحیحە وئەوان دەرهێنانیان بۆ نەکردووە زەهەبیش هاوڕایە وئیبن کەسیر لە(التأريخ) (٤ / ١١٨ ) دەڵێت.- ئەم فەرموودەیە چەند ڕێگەیەکی باشی هەیە لە عائیشەو غەیری ئەویشەوە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) چیە بۆیان وە مۆڵەتی ئەوەشی نەبوو کە ئەو نهێنیە بدرکێنێ پێیان وت:- ئەی ئەبا لوبابە بەڕای تۆ بەدەم فەرمانی موحەمەدەوە بچین ؟

وتی:- بەڵێ بە دەستی ئاماژەی بۆ گەرووی کرد مە مەبەستی کوشتن بوو ئەبو لوبابە دەڵێت:- سوێن دبە خوا هێشتا لە جێی خۆم نەجولاً بووم زانی مکە ناپاکیم لەگەڵ خوا وپێغەمبەری خوا (ﷺ) کردووە پاشان ئەبو لوبابە بۆی دەرچوو نەهاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ولە مزگەوت خۆی بەستەوە بە یەکێك لە پایەکانەوە و وتی:- لەم جێیەی خۆم ناجولێم تاخوا لیم خۆش دەبێ لەسەر ئەوەی کە کردم وپەیمان بە پەروەردگار دەدەم کە هەرگیز پێ نەخەمە لای (بني قريظة)وە وئەو جێگایە نەبینم کە تیایدا ناپاکیم لە خواو پێغەمبەر کرد ونهێنیەکەم درکاند ئیبن هیشام دەڵێت:- سفیانی کوڕی عویینە لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبی خالیدەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی قەتادەوە دەڵێت:- خوای گەورە دەربارەی ئەبو لەبابە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە (لِيَمِيزَ اللّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعاً فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ {٣٧} ) (الانفال ).

واتە:- ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خیانەت مەکەن لە ئەمانەت وسپاردەکانتان کە پێیان دەسپێر درێت لە کاتێکدا ئێوە دەزانن کە ئەوە خیانەتە ئیبن ئیسحاق دەڵێت:- کاتێ هەواڵی ئەبو لوبابە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت ئەوە بوو هەر دیار نەمابوو کە بێتەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- ( أما أنه لو كان جاءني لأستغفرت له فأما اذ قد فعل فأفعل فما أنا بالذي أطلقه من مكانه حتى يتوب الله عليه ).[١٩٩]

واتە:- ئەگەر بهاتبایە بۆلای من ئەوا داوای لێ خۆشبوونم بۆ دەکرد بەڵام مادەم ئەوەی کردووە کە کردوویەتی لە مزگەوت ماوەتەوە ئەوە منی شلە جێی خۆی بە ڕەڵای ناکەم تا خوا لێی خۆش دەبێ ئیبن ئیسحاق دەڵێت:- یەزیدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی قسیط بۆی باس کردم کە قبووڵ کردنی تەوبەکەی ئەبو لوبابە لە کاتی سەر لە بەیانیدا دابەزیووە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لە ماڵی ئوم سەلەمە دا بوو ئەم سەلەمە –خوای لێ ڕازی بێ – وتی:- گوێ ملە

[١٩٩] (إبن جەریری تەبەری لە تەفسیرەکەیدا (٢١ / ٩٧ ) والواحدی لە (أسباب النزول) (١٩٣ ).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بەیانی زوو پێکەنی پرسیم بەچی پێ دەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا ؟ یاخوا هەمیشە خۆش حاڵ بیت ؟ فەرمووی:- خوا لە ئەبو لەبابە خۆش بووە وتەوبەکەی وەرگرتووە وتم:- ئەچم مژدەی پێ بدەم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- بەڵێ برۆ ئەگەر بتەوێ دەڵێت:- ئوم سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – لە دەرگای ژوورەکەیەوە لەو کاتەدا هێشتا ئایەتەکانی بالآپۆشی نەهاتبووە خوارەوە وتی:- ئەی ئەبو لوبابە مژدە بێ خوا تۆبەکەی قبووڵ کردویت ئوم سەلەمە دەڵێت:- خەڵك هەموو بەرەو ڕووی ڕۆیشتن تا بیکەنەوە وتی:- نا بەخوا هەروا دەمێنم تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی دەست وبەندەکانم بکاتەوە بە دەستی موبارەکی ئەوجا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ نوێژە بەیانی چوو بۆ مزگەوت دەست وبەندەکەی کردەوە،[٢٠٠] ئیبن هیشام دەڵێت:- ئەبو لوبابە بە بەستراوەیی بۆماوەی شەش ڕۆژ خۆی هێشتەوە ولە کاتی نوێژەکاندا خێزانەکەی دەهات دەستی دەکردەوە تا نوێژەکەی بکات وپاشان خۆی دەبەستەوە بە پایەکەوە هەروەك هەندێ لە زاستخوازان بۆیان باس کردووم ئەو ئایەتەش کە لە تەوبەکەیدا دابەزی ئەمە بوو کە پەروەردگار دەفەرمووی: سورەتی (التوبە) ئایەتی (١٠٢ ).

واتە:- بێجگە لەوانە کەسانێکی تریش هەن کە دان بە گوناهو هەڵەکانیاندا دەنێن و کرداری چاك و کرداری خراپیشیان تێکەڵ کردووە ئەمانە نزیکە خوا تەوبەیان لێ وەربگرێت چونکە بە ڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە ئەبو لوبابە پاش دابەزینی ئەم ئایەتە بە وەرگرتنی تەوبەکەی بەوەفاداری بۆ ئاینەکەی مایەوە وبەخوا پەرستی یەوە خەریك بوو تا ئەو کاتەی وەفاتی بۆ هاتە پێش وگەیشت بە قافڵەی سەرفرازان – خوای لێ ڕازی بێ - .

---

[٢٠٠] (داله پالگەی (مرسلە) بەیهەقی لە (الدلائل) ( ٤ / ١٧ ) دەری هێناوە.

## ٢١٣.﴿ دووعاکانی پێغەمبەر (ﷺ)و موعجیزەی سەرکەوتن لە غەزای خەندەقدا ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر هاواری کردو دەپاڕایەوە لە خوای گەورە بە تایبەتی لە کاتی غەزاکاندا کاتێکیش موسڵمانان کەوتنە حاڵەتێکی نارەحەتەوە بەو شێوەی خوای گەورە باسی کردووە موسڵمانان چارەیان نەما ئەوە نەبێت ڕوویانکردە پێغەمبەر (ﷺ) و ووتیان ئایە هیچ شتێك هەیە بیڵێین ؟ چونکە دڵەکان گەیشتوونەتە بینە قاقا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- بەڵێ بڵێین (اللهم استر عوراتنا وأمن روعاتنا).[٢٠١]

واتە:- خوایە عەیب وکەم وکوڕییەکانمان دا بپۆشە وترسیشمان لەسەر لابدە هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی پێغەمبەر (ﷺ) پاڕاوەتەوە لە دژی ئەحزابەکان وفەرموویەتی:- خوایە ئەی ئەو کەسەی قورئانت دابەزاندووە وبەپەلە لێپرسینەوە دەکەیت شکست بهێنە بەو ئەحزابانە خوایە بیانبەزێنەوە وبیان لەرزێنە خوای گەورەش دووعای پێغەمبەرەکەی قبوڵ کردو تەفرو تونای کردن وڕەشەبایەکی ساردی ناردەسەریان وترسە وبیمی خستە دڵەکانیانەوە وە وەکو فەرموویەتی :- (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً وَجُنُوداً لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً {٩} )(الاحزاب)

واتە:- ئەی ئەوانەی ئیمان وباوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان , مەبەست جەنگی خەندەقە کە خوای گەورە فریای ئیمان داران کەوت کاتێك سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێزو سەربازانێکمان ناردە سەریان کە ئەتان دەبینین خوای گەورە بینابوو بە هەوڵ وکۆششتان چۆن پاسەوانیتان دەکرد چۆن ئەو چاڵە قوڵ ودرێژەتان هەڵکەند قورتوبی – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت:- ئەو ڕەشەبایە موعجیزەیەك بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) چونکە نێوان هەردوولا تەنها پانایی کەندڕەکە بوو

[٢٠١] ( مسند الامام أحمد عن ابي سعيد الخدري – ٣ / ٢ ).

ئیتر خوای گەورە فریشتەکانی ناردو مێخی چادرەکانی هەڵکەندو ئاگرەکانی کوژاندنەوە ومەنجەڵەکانی ڕشتن ئەسپەکانیشیان بەیەکدا دەچوون و(ألله أکبر)ی فریشتەکانیش زیادی کرد لە دەووروو بەری سەربازگەکەوە بە یەکتریان دەوت با خۆمان ڕزگار بکەین ئەوەندە تۆقیبوون ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سوور بوو لە جەخت کردن لەسەر ئەوەی ئەو ئەحزابانە لەلایەن جەنگاوەرە موسڵمانەکانەوە نەبەزێنران سەرەڕای فیداکاری زۆریان بەڵکو خوای گەورە خۆی بەزاندنی وەکو لە سورەتی ئەحزاب ئایەتی (٩)دا هاتووە ، لە ئەبو هورمیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:- هیچ خوایەك نیە (الله ) نەبێت سەربازەکانی خۆی سەربەرز کردو بەندەی خۆی سەرخست وتەنها خۆیشی ئەحزابەکانی شکاندو هیچ شتێکیش نیە لە پاش ئەو .

## ٢١٤.﴿ خوای گەورە ڕێنمایی تاقە پیاوێكی كردوو سووپای كافرەكانی پەرتەوازە كرد لە غەزای خەندەقدا ﴾

شەوێك پێش دوا شەوی ئەحزاب خوا هیدایەتی نوعەیمی كوڕی مەسعوودی دا دڵەكەی بە ئیمان ئاشنا بوو ولەو كاتە ناسكەدا نووری ئیمان گەشەی كرد ئەم گەش بوونەوە ئیمانیەی لای هیچ كەس باسی نەكرد پیاوێكی پیاوانە بوو خاوەن سەلیقە بوو بەبێ دەنگی لەسەربازگەی ئەحزاب خۆی دزیەوە ولە بەردەم خەندەقەوە لە تاریكایی شەودا بەرەو سەربازگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەوتە ڕێ كە ئەوە بوو پێغەمبەرو هاوەڵانی لەوێ پاسەوانی خەندەق بوون ئەوەش ئەوپەڕی ئازایەتی یە لەو تاریكە شەوەدا بپەڕێتەوە دیارە فریشتەكانی خوا چاو دێریان كردووە موسڵمانەكان دەیگەیەننە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ بەنهێنی ڕای دەگەیەنێ كە خوا هیدایەتی داوە ودڵی چۆتە سەر ئیمان هێنان ئامادەیە ببێتە سەربازێكی گوێ ڕایەڵی بە كەڵك بۆ ئەم هەڵویستە ناهەموارە ڕای گەیاند موسڵمان بووە ودەیەوێ پێغەمبەری فەرماندە فەرمانی بەسەردا بدات نوعەیم وتی:- ئەی پێغەمبەری خوا من موسڵمان بووم وخزمەكانیشم بەم موسڵمان بوونەمیان نەزانیوە چیت پێ خۆشە فەرمانم بەسەردا بدە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- تۆ تاقە پیاوێكی چیت پێ دەكرێ ئەگەر توانیت دوژمنمان لێ دوور بخەرەوە چونكە جەنگ خەڵەتاندن وفرو فێڵە لە ڕیوایەتێكی تردا داوا دەكات كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماوەی بدات ئەگەر پێویست بوو شتانێك بڵێ كەوا نەبن ئەویش ماوەی دا بەوە ماوەی دا كە بەهەر جۆرێك بۆی ڕێك دەكەوێ با سوپای ئەحزاب تێك بدات وپەرتەوازەیان بكات نوعەیم بەپەلە هەستا بەرەو ناوچەی ئەوەی قورەیزە كەوتە ڕێ كە بە بۆنەی هەڵ گەڕانەوەی ئەوانەوە بارو دۆخەكە ئاڵۆزتر بوو نوعەیم لەلای جوولەكەی ئەوەی قورەیزە كەسێكی ناسراو بوو وجولەكە هۆگری بوو بوون ولەسەردەمی نەفامی دا دۆستایەتی وتێكەڵی لەگەڵدا كرد بوون كاتێك كە نوعەیمی كوڕی مەسعوود گەیشتە قەلاكانی ئەوەی قورەیزە بەلام موسڵمان بوونی ئاشكرا نەكردبوو دەستی كرد بە هەڵ بەستنی ئەو فێڵەی كە بە تەمابوو سوپای ئەحزاب وجوولەكەی پێ تێك بدات ئەو فێڵەی كە بە ڕاستی بووە

هۆی تێك شکاندنی ئەحزاب وسەر فراز بوونی سوپا بچۆکەکەی ئیسلام نوعەیم پێی وتن ئەی ئەوەی قورەیزە دۆستایەتی من بۆ جولەکە بە تایبەتی بۆ ئێوە هەمووتان چاك دەیزانن بەبی ئینکاری هەموویان پشتگیری قسەکەیان کردوو وتیان:- ڕاست دەکەی بەلای ئێمەوە هیچ تاوانباریەکت نیە نوعەیم دەستی بە کارەکەی خۆی کرد کە بریتی بوو لە درووست کردنی گومان ودوو دڵی لە نێوان جوولەکەو سوپاکانی ئەحزابدا تا بتوانێ ڕێك کەوتنەکەیان تێك بدات سەرۆکەکانی ئەوەی قورەیزە کۆبوونەوە چونکە هەموویان دەیان ناسی متمانەیان پێ دەکرد ئەویش وەها خۆی لەقەڵەم ئەدا کە یەکێکە لەوان وبە چاکی خەمیان دەخوات بۆیە پێی وتن:- قوڕەیش وغە طـە فان وەك ئێوە نین ئێوە وولات وولاتی خۆتانە ماڵ وسامان وژن ومنداڵتانی تێدایە ناتوانن بەجێی بهێڵن وبچن بۆ شوێنێکی تر قوڕەیش وغە طە فان هاتوون لەگەڵ موحەممەد وهاوەڵانی دا بجەنگن ئێوە لە دژی موحەممەد پشتی ئەوانتان گرتووە وئەوان وولات وخاو خێزان وسامانیان لە شوێنێکی ترە ئەوان وەك ئێوە نین جا ئەوان ئەگەر هەلیان دەست کەوت ئەوا دەستی خۆیان دەوەشێنن وگەر وایش نەبوو دەگەڕێنەوە بۆ وولاتی خۆیان وئێوە وکابرا لەم وولاتەی خۆتاندا بەجێ ئەهێڵن هەروا لەسەر ترساندنیان بەردەوام بوو تاوتی:- دیارە ئێوەش بەتەنیا چاری ئەو ناکەن واتە بەرگەی موسڵمانەکان ناگرن کە زانی ترسیان لەلا درووست بووە وڕاستیشە بەرگەی سوپای ئیسلام ناگرن نوعەیم دوا گورزی کاریگەری وەشاند ڕێی بۆ دانان ووتی:- جا ئێوە لەگەڵ ئەحزاب بەبێ کۆڵ دان لەگەڵ موحەممەدا ئەجەنگن هەتا بی دەن بە زەوی دا قسەکەی نوعەیم بەڕاستی لەجێی خۆی دا بوو جوولەکە نەزان کاربوون خۆیان خستە ئەو گێژاوە وە خۆ هەتا نەیان توانی وەك پیاو بچنە سەر قەلای ژن ومنداڵەکان چ جای بچنە سەر سەنگەری پیاوەکان خۆیان خستە جەنگەوە بەبێ مانا ئەحزابیش سوپایەکی دڕندەی بێ سەروو بەرە وهەر سەعاتێك وویستیان ئەدەن لە ئاوزەنگی وبەرەو ماڵەوە ئەکێشێن تەنها جوولەکەی قوڕ بەسەر ماوەی هەلاتنیان نیە لەبەر ئەوە بە چاکی بڕوایا نبە قسەکانی نوعەیم هەبوو وهەستیان کرد کە پێویستیان بە یارمەتی وزامن بوون هەیە تا لە ناپاکی پارێزراو بن بەوە جوولەکە سوپاسێکی بێ پایانی نوعەیمیان کرد لەسەر ئەم ئامۆژگاریە دۆستانەیە وپێیان وت:- بەڕاستی ڕای چاکت دەست نیشان کرد نیتر

ـریاریان داك ە لێی لانەدەن نوعەیم کە هەستی کرد وا قۆناغی یەکەمی نەخشەکەی کە بۆ
ـماندنی هاوکاری بتپەرستی وجوولەکە دای ڕێژابوو سەری گرت ولە وەش بێ خەم بوو کە
ـەوەی قورەیزە بڕوایا نبە قسەکانی کردووە وگومانیان لە دۆستایەتی ئەو نیە بۆیان بەپەلە
خۆی گەیاندە بنکەی فەرماندەیەتی گشتی سوپای ئەحزاب تا بەشەکەی تری نەخشەکەی کە
بۆ تێك دانی ئەحزاب دای ڕێژا بوو ئەنجام بدات کە گەیشت لە پێشەوە داوای کرد لەگەڵ
فەرماندەی گشتی ئەحزاب ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب ودەستەی ئەرکانی جەنگی قوڕەیشی دا
کۆببێتەوە کە دانیشتن دیارە ئەیان دەزانی موسڵمان بووە هەواڵی دانی کەبۆ کارێکی گرنگ
هاتووە بۆلایان کە پەیوەندی بەسەلامەتی خۆیان وسوپاکانیانەوە هەیە ولەبەر ئەوەی کە بێ
وەی بن وئابڕووی سوپاکانیان نەچێ خۆی ناچار زانیوە وەك دۆستێك بێت ولە کارێکی گرنگ
کە پەیوەندی بە ئەوەی قورەیزەی هاو پەیمانیانەوە هەیە ئاگاداریان بکات بە ئەبو سوفیان وە
دەستەی ئەرکانی جەنگی قوڕەیشی وت:- خۆشتان ئاگادارن کە من دۆستی ئێوە ودوژمنی
موحەممەدم ئەوانیش ئینکاری ئەو قسانەیان نەکرد چونکە دەیانزانی وەك خۆیان بت پەرستە
ویەکێکە لە پیاوە ناودارەکانی ئەحزاب کە لە ئابلۆوقەی مەدینە ودەست وەشاندن لە
موسڵمانەکان دەورێکی گرنگی هەبووە کە نوعەیم زانی قوڕەیش متمانەی پێ ئەکەن وەك
ئامۆژگارێکی دڵسوز لێیان هاتە پێش وکەوتە باسی ئەو پیلانەی کە جوولەکە بە دەستیانەوەیە
لە دژی قوڕەیش وغە طـه فان کە ئەنێرن بۆلایان وداوای حەفتا پیاو لە قوڕەیش وغە طـه فان
دەکەن تا بە وێنەی بارمتە لە لایان بن ودڵیان متمانە بکاتك ە سوپای ئەحزاب دەوری مەدینە
چوڵ ناکەن هەتا بە تەواوی موسڵمانەکان لە ناو بەرن جا لەلایەن خۆیەوە شتێکی تری بۆ زیاد
کرد تا هەردوولا چ جوولەکە وچ ئەحزاب متمانەیان بەیەك نەمێنێ نوعەیم بە فەرماندەکانی
قوڕەیشی وت:- دەنگ وباسێکم بیستووە کە بە پێویستم زانی وەك ئامۆژگاریەك بۆتان پێ تانی
ڕابگەیەنم بەڵام بلاوی مەکەنەوە ووتیان :- باشە پێی وتن :- ئەزانن کە جوولەکە پەشیمانی
ئەوەن کە نێوان خۆی وموحەمەدیان تێك داوە واتە:- پەیمانەکەیان شکاندووە جا ناردوویانە
بۆلای کە ئێمە پەشیمانی ئەو کارە مانین پاشان پێیان ڕاگەیاندووە کە ئامادەن سەر لە نوێ
دەست بخەنە ناو دەستیەوە وئامادەشن لە گەڵیا بن دژی سوپای ئەحزاب جا بۆ ئەوەی بی

سەلمێنن کە راست دەکەن لەگەڵیا پێیان ووتووە:- ئایە بەوە ڕازی دەبیت کە ئێمە لە هەردوو هۆزەکە لە قورەیش ولە غە طەفان چەند پیاویکی ماقووڵیان وەربگرین وبیان دەینە دەست وبدەی لە ملیان پاشان ئێمە لەگەڵتا بین دژی ئەوانەیان کە ماون هەتا ریشە کەنیان بکەین ئەویش واتە:- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەزامەندی بۆ ئەوە نواندووە پاشان بە شێوەی ئامۆژگاری نوعەیم بە فەرماندەکانی قورەیشی وت:- ئەگەر جوولەکە ناردیان بۆ لاتان وداوای چەند پیاوێکیان بە بارمتە لێتان کرد تاقە پیاوێکیان نەدەنێ دوای ئەوەی نوعەیم دڵ ومێشکی سەرداره قورەیشیەکانی لە گومان ودوو دڵی دەر هەق بە جوولەکە پڕ کرد خێرا هەستاو خۆی گەیاندە لای غە طەفانی خزم وکەسی لە ناو سەربازگەی گەورەی غە طەفان دا داوای کۆبوونەوەیەکی نهێنی لەگەڵ سەردارو فەرماندەکانیانا عویەینەی کوڕی حیصن وطولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی و حاریثی کوڕی عەوفی موررپی کرد کە لەلای کۆبوونەوە پێی وتن:- ئەی کۆمەڵی غە طەفان ئێوە بنەڕەت وعەشیرەتم وخۆشەویست ترین کەسمن وبڕواناکەم بە تاوان بارم بزانن ووتیان:- ڕاست دەکەیت وبە لامانەوە هیچ تاوان باریەکت نیە ئەویش ئاگاداری کردن کە هەواڵێکی گرنگی بە لاوەیە وپەیوەندیشی بە سەلامەتی ئەمانەوە هەیە جا پێی وتن:- ئەم هەواڵەم بپارێزن وبلاوی مەکەنەوە ووتیان:- باشە چی بە قورەیش وت وچۆن ئاگاداری کردن کە ووریا بن وبە جوولەکە نەخەڵەتین بەوانیشی گەیاندو ئاگاداری کردن کە نەکەن بارمتە بدەنە دەست جوولەکەی ناپاك زۆر سوپاسی نوعەیمیان کرد لەسەر ئەو کارەی وجەختیشیان لەسەر ئەوە کردەوە کە خەمی نەبێ تاقە پیاوێکیان بە بارمتە نادەنە دەست ئەوەی قورەیزە بەم شێوەیە نوعەیم لە یەکەم ڕۆژی موسڵمان بوونیدا بە ژیری وسەلیقەی خۆی توانی داوێك بۆ ئەو سوپا مل هوڕە بنێتەوە کە ببێتە مایەی تێك چوونیان وسەرەنجام پاشە کشەیان لە دەوری مەدینە لە ڕاستیدا فەرماندیەتی قورەیش وغە طەفان بایەخی تەواویان بەو دەنگ وباسەی نوعەیمی کوڕی مەسعووددا چونکە لەوە بێ گومان بوون کە دۆستیانە وبۆ بەرژەوەندی ئەوان ئەم قسەیەی کردووە لە هەمان کاتدا یەکجار پێی بێ تاقەت بوون ئەو شەوە هەردوولا بە داخ وخەفەتێکی زۆرە وە سەریان نایەوە ورق وقینێکی زۆریشیان لە ئەوەی قورەیزە هەڵگرت دوای ئەوەی کە سەرکردایەتی قورەیش وغە طەفان بە

تەواوەتی قەناعەتیان بەو پیلانە کرد هەر ئەو ئێوارەیە کە ڕۆژی جومعە بوو بڕیاریان دا کە کۆمەڵە پیاوێکیان لە سەرۆك وفەرماندەکانیان بە نوێنەری بنێرنە لای نەوەی قورەیزە تا لەوێ جەخت لەسەر ڕاستی ئەو هەواڵەی نوعەیم بکەنەوە جا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ناڕاستەو خۆ لە ڕاستی هەواڵەکە ئاگادار بن بەو نوێنەرانەیان وت کە داو الە جوولەکە بکەن تا خۆیان ئامادە بکەن تا ڕۆژی شەممە واتە:- سبەینێ بە هەموویانەوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان ئەوە بوو هەر ئەو شەوە بە نهێنی ولە تاریکی دا نوێنەرەکان گەیشتنە مەنزلگای نەوەی قورەیزە کە کەوتبوونە ئەودیوی سوپای مەسڵمانەکانەوە کە گەیشتن هەستیان بە ساردو سڕی سەرۆکە جوولەکەکان کرد بەڵام هەر چۆن بوو نوێنەرەکان بە نەوەی قورەیزە یان گەیاند کە فەرماندایەتی هاوبەشی سوپای ئەحزاب ئەیەوێ هێرشێکی ناخلۆفی بکاتە سەر موسڵمانەکان وەك لە بناغەدا لەسەری ڕێك کەوتوون وداوا لەوانیش دەکرێ کە ئامادەبن ئەوە بوو ووتیان:- ئەی نەوەی قورەیزە ئێمە نین لە شوێنی خۆمان دا ئەوە تا چ ووشترو چ ئەسپمان هەموویان تیا چوون ئێوەش خۆتان ئامادە بکەن هەتا بچین بەگژ موحەمەددا وناکۆکی نێوانمان ببڕینەوە سەرۆکە جوولەکەکان نەیان وویست ڕاستەو خۆ بە ڕووی نوێنەرەکانی ئەحزابدا هەڵچن بەوەی کە دەری بڕن ئەوان ئامادەنین جەنگ بکەن هەتا بارمتەیان لەلا دانەنێن بەڵکو هەنگاو بە هەنگاو بۆی چوون کە ئەحزاب داوای بەشداری جەنگیان کرد جوولەکە ئەوەیان کردە بیانو وکە سبەینێ شەممەیە وئەوانیش بە پێی ئامۆژگاری دینەکەیان لە شەممەدا هیچ شتێك بایەخی هەبێ یا نەیبێ ئەنجام نادەن بۆیە ناتوانن لەو ڕۆژەدا جەنگ بکەن دوای ئەوە بەرە بەرە هاتنە سەر باسە سەرەکیەکە کە ئەوان ترسیان لە دڵدایە سوپای ئەحزاب تا سەر لە هەر جەنگ بەردەوام نەبن وبەبێ ئەوەی موسڵمانەکان ڕیشەکەن بکەن بگەڕێنەوە بۆ ووڵاتی خۆیان ونەوەی قورەیزە بە تەنیا لەبەردەم سوپای موسڵمانەکان دا بەجێ بهێڵن ئەوە بوو ڕاستەو خۆ بە نوێنەرەکانی ئەحزابیان وت:- لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە جەنگتان لەگەڵ ناکەین دژی موحەممەد هەتا چەند پیاوێکتان بە بارمتە لە لامان دانەنێن تا دڵمان متمانە بکات بۆ ئەوەی موحەممەد بدەین بە زەوی دا چونکە ئێمە دەترسین کە ئەگەر جەنگ ناڕەحەتی کردن وکوشتار نارەحەت بوو بۆتان پشتمان تێ بکەن وبگەڕێنەوە بۆ ووڵاتی خۆتان وئێمە وکابرا لەم

وولاتەماندا بەجێ بهێڵین وئەو کاتە ئێمەش چاری ئەو ناکەین کاتێك کە نوێنەرانی ئەحزاب ئەمەیان لە دەم سەرۆکە جوولەکەکان بیست بە بێ وەلام دانەوە گەڕانەوە بۆ بنکەی فەرماندەیەتی گشتی و وەلامی قورەیزە یان بۆ باس کردن بەمە هیچ گومانێك لە دڵی قوڕەیش وغە طه فان دا دەر هەق بە نوعەیمی کوڕی مەسعوود نەماو بڕوایان کرد کە ئەو جوولەکانە نیازی خراپیان کردووە وڕاستە ئەو بارمتانەیان بۆ ئەوە ئەوێن کە بیان دەنە دەست پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا ئەویش تۆڵەی خۆی بە کوشتنی ئەوانە بکاتەوە تا بەم کارە لە جوولەکەش خۆش ببێ دەر هەق بە پەیمان شکاندنیان فەرماندەکانی ئەحزاب هەموو بەیەك دەنگ بە یەکتریان وت:- بەخوا ئەوەی کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود بۆی باس کردن ڕاست بوو بەمە هەموویان هاتنە سەر ئەو ڕایە کە جوولەکە ناپاکیان کردووە وبێ گومان ئەگەر بارمتەیان بدەنێ تەسلیمیان دەکەن هەر هەموو خۆیان ئەخواردەوە بۆ ناپاکی جوولەکە بۆیە بەپەلە لە کۆمەڵێکی تر پیاویان ڕەوانەی لای جوولەکە کرد تا پێیان ڕابگەیەنن کە بارمتە لە لایان دانانێن وداوای ئەوەش ئەکەن کە بەپێی ڕێك کەوتنی هەردوولا پێکەوە هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان بۆ جاری دووهەم نوێنەری ئەحزاب خۆیان گەیاندە مەنزڵی قورەیزە وبە ناوی فەرماندایەتی پێیان ڕاگەیاندن کە تاقە پیاوێکیان بە شێوەی بارمتە بە دەستەوە نادەن چونکە ئەمە بێ متمانەیی یە بە فەرماندایەتی ئەحزاب جا ئەگەر جەنگیان دەوێ با دەرچن وبەشداری جەنگ بکەن کە گەورە جوولەکەکان ئەم وەلامەیان لە فەرماندەی ئەحزابەوە وەرگرت هیچ گومانێکیان بەلاوە نەما کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود ڕاستی کردووە دەربارەی قوڕەیش وغە طه فان ئەوە بوو بە یەکتریان ئەوت:- ئەوەی کە نوعەیمی کوڕی مەسعوود بۆی باس کردن ڕاست بوو ئەو خەڵکە نەیانەوێ ئێوە جەنگ بکە نجا ئەگەر هەلیان دەست کەوت ئەوا ئەی قۆزنەوە وئەگەر وایش نەبوو ئەوا پشت هەڵ ئەکەن وئەگەڕێنەوە بۆ وولاتی خۆیان ودەست بەرداری ئێوە ئەبن لە بەردەم کابرادا دوای ئەم بۆچوونە قورەیزەش نێردراویان نارد بۆلای سەرکردایەتی ئەحزاب وپێیان ڕاگەیاندن کە جوولەکە بە هیچ شێوەیەك بەشداری جەنگی دژی موسڵمانەکان ناکەن هەتا بارمتەیان لە لەلا دانەنرێت بۆ ئەوەی دڵیان پڕ لە متمانە بێ کە بەتەنیا بە جێیان ناهێڵن دیارە فەرماندایەتی ئەحزاب بۆ جارێکی تر داواکاری

جوولەکەیان دایە دواوە کە بارمتە دانانێن سەرۆکی جوولەکەی نەوەی نە ضیر حویەیی کوڕی نە ختە ب کە لە بنەڕەتدا ئاگرەکە ئەو هەڵی گیرساند ئەم عەرەبانەی بۆ ئەوە کۆکردەوە موسڵمانان ریشەکەن بکەن کە سەرنجی بارو دۆخەکەی دا ئەبینێ وا خەریکە ریسەکەی ئەبێتەوە بە خوری بۆیە هەوڵی دا نەهێڵێ بەینیان لەگەڵ نەوەی قورەیزەدا تێك بچێ ئەوە بوو چوو بۆلای نەوەی قورەیزەو هەوڵی لەگەڵ دان هەتا قەناعەتیان پێ بکا بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانەکان بەلاَم بێ سوود بوو چونکە جوولەکە لەسەر بیانووی خۆیان سوور بوون کە ئەبێ حەفتا پیاوی بارمتە بدرێتە دەستیان تا لە خۆیان بێ خەم بن بەم شێوەیە نەخشەکەی نوعەیمی کوڕی مەسعوود سەری گرت وناکۆکی کەوتە نێوان جوولەکەی قورەیزە ونەحزابەوە ونەمەش ئاسوودەیەك بوو بۆ موسڵمانەکان ئیمامی بەیهەقی لە کتێبی (الدلائل) دا ئەوەی گێڕاوەتەوە کە کاتی نێوانی جوولەکەو ئەحزاب تێك چوو وبارمتەیان نەدایە دەست جوولەکەی نەوەی قورەیزە پەیوەندیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد تا لەگەڵیان دا رێك بکەون بەو مەرجەی ئەویش رێگابدا جوولەکەکانی نەوەی نەضیریان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە کەچی ئەم داواکاری یە لەلایەن پێغەمبەری خواوە درایە دواوە.[٢٠٢]

[٢٠٢] (ژیانی ئازیزمان (ﷺ) بەرگی دووەم لاپەرە ( ١٣٤ – ١٤٢ ).

# ٢١٥.﴿ جوولەکەی بەنو قورە یظە پابەند نەبوون بە ئامۆژگاریەکەی ئیبن هەیـبان ﴾

لە کاتی گەمارۆدانی جوولەکەکانی بەنو قورەیظە سێ کەس مەسڵمان بوون لە جوولەکەکانی بەنی (هەدل) وهاتنە خوارەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وموسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند  وبەوەش خوێن ومالْ وموڵك وکەسو کاری خۆیان وخێزان ومنداڵەکانیان پاراست لە تیاچوون ئیبن ئیسحاق دەڵێت:- لەو کاتەدا ثە علبە ونوسەیدی کوڕی سەعیەو ونەسەدی کوڕی عوبەید لە کەسانێك بوون لەبەنی (هەدل) ولە بەنی قورەیظە نەبوون وە نەدەچوونەوە سەر بەنی نەضیریش ڕشتەی باوکیان لە سەرووی ئەوانەوە بوو ئەوان لە کوڕانی مامیان بوون هەر لەو شەوەدا موسڵمان بوون چیرۆکی موسڵمان بوونیان بە درێژی لە گێڕانەوەیەکی تردا لە عاصمی کوڕی عەمرەوە ئەویش لە پیاوێکی پیری بەنی قورەیظە وە دەگێڕێتەوە دەڵێت :- لەو کاتەدا ثە علبە وئوسەیدی کوڕی سەعید ونەسەدی کوڕی عوبەید لە کەسانێك بوون لە بەنی (هەدل) ولە بەنی قورەیظە نەبوون وە نەدەچوونەوە سەر بەنی نە ضیریش ڕشتەی باوکیان لە سەرووی ئەوانەوە بوو ئەوان لە کوڕانی مامیان بوون هەر لەو شەوەدا موسڵمان بوون چیرۆکی موسڵمان بوونیان بە درێژی لە گێڕانەوەیەکی تردا لە عاصمی کوڕی عەمرەوە ئەویش لە پیاوێکی پیری بەنی قورەیظەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت:- پیاوێك لە جوولەکەکانی خەڵکی شام کە پێیان دەوت  (ئیبن هەیبان) هاتە لامان پێش هاتنی ئیسلام بە چەند ساڵێ کە لە ناوماندا مایەوە وەڵلاهی هیچ کەسێکمان نەدەبینی پێنج فەرزەی نوێژ لە ئەو ڕێك و پێکتر ئەنجام بدات دوای ئەوەی جێگیر بوو لە لامان ئێمە دوو جاری بێ بارانی و ووشکە ساڵی بووین ووتمان پێی ئیبن هەیبان هەستە نوێژی باران بارینمان بۆ بکە ئەویش لەوەلأمدا وتی:- وەڵلاهی کاری وا ناکەم هەتا زەکات لە ماڵەکانتان دەرنەکەن وە لەبەر دەستی مندا داینەنێن ووتیان:- چەندە وتی:- بۆ هەموو کەسێك یەك پێوانە خورما ومشتێك جۆ پیرە مێردەکە دەڵێ :- ئێمە زەکاتەکەمان لێ دەرکرد ئەویش ئێمەی بردە دەرەوە بۆ گەرمەسێرێکی خۆمان لەو دەشتە نوێژە بارانەی بۆ کردین وەڵلاهی ئەو هێشتا لە کۆڕو دانیشتنەکەمان هەڵنەستا بوو کە بۆ نوێژ خوێندنمان وەستابوون لەو کاتەدا پەڵە هەوری پەرتەوازە کۆبوونەوەو بوو بە باران وبە هۆی ئەوەوە بارانمان بۆ باری وتێر ئاو بووین ئەوەی چەندین جار دووپات دەکردەوە نەجارێك ونە دوان ونە سیان هەتاکو گەیشتە سەرە

مەرگ کاتێك زانی دەمرێت وتی:- ئەی کۆمەڵەی جوولەکەکان بە بۆچوونی ئێوە چ شتێك منی لە خاکێکی پڕ دارو درەخت وشینایی وەدەرناوە بۆ خاکێکی پڕ لە برسیەتی ونەهامەتی ؟ دەڵێت:- ووتمان:- خوا زاناترە وتی:- من هاتووم بۆ ئەو وولاتە لە چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەرێکدا بووم کە سەردەمی هاتنی نزیك بۆتەوە ئەو وولاتەی ئێوەیە کە کۆچی بۆ دەکات من تکام وا بوو ڕەوانە بکرێت وشوێنی بکەوم بەلاَم کاتی هاتنی لە ئێوە نزیکە ئەی کۆمەڵی جوولەکەکان با هیچ کەسێك پێش ئێوە نەکەوێت لە شوێن کەوتن وچوون بەدەم بەنگەوازەکەیەوە ئەو دەنێردرێت کوشتار ودەستکەوتی جەنگی بۆ حەلاَڵ دەبێت تەنانەت ژن ومنداڵیش بۆ هەر کەسێك کە دژایەتی بکات وپێچەوانەی ئەو بجوڵێتەوە با ئەو شتانە نەبنەڕێگر لەبەردەمتان لەوەی کە بگە نبە خزمەتی کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەوانە کراو هات بۆ گەمارۆی بەنی قورەیظە ئەوانە گەنج بوون وە تازە پێدەگەیشتن لە گێڕانەوەیەکی تردا کاتێك ئەو شەوە هات کە بۆ بەیانیەکی بەنی قورەیظە فەتح کرا وخۆیان دا بە دەستەوە ئەو سێ کەسە ثەعلەبەی کوڕی سوعنە وئوسەیدی برای وئەسەدی کوڕی عوبەید بە جوولەکەکانیان وت:- ئەی کۆمەڵەی جوولەکە ئەی بەنی قورەیظە وەڵڵاهی ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە (ﷺ) کە ئیبن هەیبان ئێوەی لێ ئاگادار کرد بووەوە وڕایسپارد بوون کە شوێنی بکەون ئێوەش لە خوا بترسن شوێنی بکەون بەلاَم جوولەکەکان گوێیان پێنەدان وسەرپێچیان کردن و ووتیان:- ئەوە ئەو کەسە نیە ووتیان:- وەڵڵاهی ئەوە خۆیەتی بە نیشانەکانی دیارە کە ئەوە ئەوان دابەزین وموسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند وسەرو ماڵ وموڵك وخێزان ومنداڵی خۆیان پاراست دەڵێت:- ماڵ وسامانیان لە ناو قەلاَکەدا مابوو لەگەڵ جوولەکەکان کاتێك فەتح کرا هەموویان بۆ گەڕانەوە ودایانەوە پێیان.[٢٠٣]

---

[٢٠٣] اخرجه ابو نعيم (الدلائل) (٤٢) و ابن سعد (الطبقات) (١/١٦٠) و ابن هشام (١/٢١٣) والبيهقي (الكبرى) (١١٣/٩) وفي الدلائل (٤/٣١ ، ٣٢) و ابن عبدالبر الدر) ص ٢٠٤ / ٢٠٥ وقال حافظ في (الاصابة) (١/٣٣) اخرجه : ابن السكن باسناد قوي و قال الشيخ الالباني في صحيح (لسيرة) ص :٦١ اسناده صحيح

## ٢١٦.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوكمێكی توندی دەركرد لە بارەی هەڵگەڕاوەكانی عوكەل و عورەینە ﴾

لە مانگی شەووالی ساڵی شەشەمی كۆچی دا هەشت پیاوی عوكەل وعورەینە (عورەینە) شوێنێكە لە وولاّتی فەزارە لە نەجد هاتنە مەدینەو موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند بە ماوەیەكی كەم ئاو هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت ونەخۆش كەوتن بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فرمانی دا ببرێن بۆ ناوچەی (جدر) لەلای (قباء) وە كە نزیكی چیای عیرە وشەش میل لە مەدینەوە دوورە تا لەوێ شیری ئەو ووشترانەیان دەرخوارد بدرێ كە لەوێ بەخێو دەكران وناوچەیەكی سازگاریش بوو كە لەو شوێنە دا بە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كۆمەڵێك ووشتر لەو شوێنەدا بۆ شیردان ڕاگیرا بوون تا دەرخواردی میوان ونوێنەران بدرێ دەستی یارمەتیش بۆ هەژاران ولاوازان درێژ بكرێت ئەو میوانانە ماوەیەك لەوێ مانەوە لە لایەكەوە هەوای سازگارو لە لایەكیشەوە خواردنەوەی شیری ووشترەكان بوونە هۆی چاك بوونەوە وقەڵەو بوونیان ئەوانە لە بەرامبەر ئەم خزمەتەدا نامەردیان لێ وەشایەوە هەستان ئەو ووشترانەی كە بەشیرەكەیان قەڵەو بوو بوون دایاننە بەرو وویستیان بیان دزن وبیان بەنەوە بۆ وولاّتی خۆیان كە یەساری بەندەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمە ئاگادار بوو یەساری نەوبیی بەندەی ئازاد كراوی پێغەمبەری خوا بووە (ﷺ) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرنجی یەسار ئەگەرێت بە جوانی نوێژ بەجێ دەهێنێ ئازادی دەكات وئەی نێرێ بۆ سەروكاری ئەو ووشترانەی كە بۆ شیردان راگیر كرابوون جا یەسار لەگەڵ چەند كەسێكی كەمدا كەوتنە دوای ئەو هەڵگەڕاوانە لە ئاین هەتا ووشترەكانیان لێ سێننەوە كە گەیشتنە لایان دەستیان دایە كوشتار ویەساریان شەهید كرد ودەست و پێیان بڕی ودڕكیان چەقاند بە زمان وهەردوو چاوی دا كە ئەم دەنگ و باسە گەیشتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیست ئەسپ سواری لە هاوەڵانی هەڵبژارد وفەرماندایەتی دانە دەست گەرزی كوڕی جابیری فەهری وفەرمانی دا بكەونە دوای عەورەینیەكان وبیان گرن دوای ناردنیان دووعاشی لەو نامەردانە كردو فەرمووی:- (أللهم أعم عليهم الطريق واجعلها عليهم أضيق من مسك )

واته:- خوایه رێیان لێ وون بکەیت هەرواش بوو خوا رێی لێ وون کردن وسریه موسڵمانەکه بەپەله رۆیشتن وفریایان کەوتن ودەورەیان لێ دان ودەست وپەلیان بەستن وهێنایانەوه بۆ مەدینه ئەو تمه کبه حەرامانەیان بردنه خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا بریاریان بۆ دەربکات دوای لێ کۆڵینەوه دەرکەوت که تاوان بارن بۆیه پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوکمێکی توندی بۆ دەرکردن تا ببنه پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموو نمەك به حەرامێکی نامەرد فەرمانی دا دەست وپێیان ببڕدرێت وچاویان دەر بهێندرێت یان چاویان به بزمار بتەقێندرێت چونکه ئەوان به درك چاوی یەساری شوانیان تەقاند بوو پاشان فرێ درانه سەر ناوچه بەرداویەکه وداوای ئاویان ئەکرد هیچ کەس پێی نەئەدان هەتا مردن ئەم دەست وپێ برین وچاوکوێرکردنه به (تمثيل) ناژمێرددرێ چونکه ئەوانە:-

یەکەم :- دزی

دووەم :- کوشتن

سێیەم:- (تمثيل)کردن به یەسار

چوارەم:- دوای موسڵمان بوون کافر بوونەوه

پێنجەم:- دژایەتی کردنی خواو پێغەمبەریان ئەنجام داوه دەست وپێیان لەسەر دزی وجەردەیی براون وکوشتن وچاو دەرهێنانیشیان له تۆڵەی کوشتن وچاو دەرهێنان دا ئیبن سەعد دەڵێت:- بۆ ئەمه خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوه (إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ {٣٣} ) ( المائده).

واته:- بێگومان پاداشتی ئەوانەی که دەجەنگێن ودوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن وبه گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاو کردنەوەی فەسادو بەدڕەوشتی له زەویدا هەر ئەوەیه ئەوانەیان که خەڵکیان کوشتووه دەبێت بکوژرێن ئەوانەش که خەڵکیان کوشتووه وجەردەیشیان کردووه دەبێت له خاچ بدرێن ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن دەست وقاچێکیان به پێچەوانەوه ببڕدرێت ئەوانەیان که مەترسیان لێدەکرێت ئەوە دوور بخرێنەوه له وڵات ئەو سزایه خەجاڵەتی وسەر شۆڕیه بۆیان له دونیادا له قیامەتیشدا سزای سەخت وگەورەیان بۆ هەیه ----.[٢٠٤]

[٢٠٤] ( ژیانی نازیزمان (ﷺ) بەرگی دووەم لاپەرە (٢٢٥ – ٢٢٦ ).

## ٢١٧.﴿ نەخشەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك وهاوەڵەکانی دژی ئەبو را فیع سەری گرت ﴾

سەلامی کوڕی ئەبو لحوقەیق لە جوولەکەی نەوەی نە ضیر بوو دوای ئەو پیلانەی کە جوولەکە وویستیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژن لە مەدینە دەرکران وخۆیان گەیاندە خەیبەر ئەم جوولەکەیە یەکێك بووە لە پیلان گێران لە خەیبەریش بۆ خۆیان دانەنیشتن خەریکی ئاژاوە نانەوە بوون چەند سەر زلێکیان کەوتنە پیلان گێران بۆ لە ناو بردنی موسڵمانەکان ئەوە بوو قوڕەیش وغە طە فانیان هەڵ نان تا دەهەزار جەنگاوەری قوڕەیش وغە طە فان بهێننە سەر مەدینە بۆ جەنگی ئەحزاب وسەرەنجام خوای گەورە موسڵمانانی لە دەستیان دەرباز کرد سەلام خۆی گەیاندەوە خەیبەر وپەیوەندی لەگەڵ سەرۆکی هۆزە بت پەرستەکان بەست بەو نیازەی لە دژی موسڵمانەکان هەڵیان بنێ تا جەنگێکی تری وەك جەنگی ئەحزاب بەرپا بکەنەوە بۆ ئەمە پێویست بوو موسڵمانان لە کۆڵی خۆیانی بکەنەوە پێنج پیاو لە خەزرەجیەکان خۆیان ئامادەکردبۆ ئەوەی پادشای خەیبەر بکوژن پیاوەکانیش بریتی بوون لە :-

١ – عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك.

٢ – مەسعوودی کوڕی سینانی ئەسلەمی.

٣ – عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی جوهەینی.

٤ – حاریثی کوڕی ڕەبیعی ئەبو قەتادەی ئەنصاری.

٥ – خوزاعی کوڕی ئەسوەد.

ئەم پێنجینە دوای راوێژکردن لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەرەو خەیبەر کەوتنە ڕێ وعەبدوڵڵای کوڕی عەتیك ئەمیریان بوو تا کاریان لێ تێك نەچێ پێش دەرچوونیان لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئامۆژگاری کران کە نە منداڵ ونە ئافرەت نەکوژن ودەست درێژیان

نەكەنە سەر ئەوەش لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی شەشەمی كۆچی دا بوو دوای چەند ڕۆژێك هەر پێنجیان گەیشتنە خەیبەر (خەیبەر ) بازاڕێكی گەورە بوو بۆ كرین وفرۆشتنی كەل وپەلی پێویست بە تایبەت خۆراك وەك خورماو گەنم وجۆ وگەنمە شامی بۆیە عەرەبەكانی ئەو دەوروبەرە بە ئاسانی هات وچۆیان ئەكرد بەڵام پێنج پاڵەوانە خەزرەجیەكە ئەوەیان پێ نەئەكرا چونكە ئەوەی نە ضیر چەند مانگێك بوو لە مەدینە دەركرا بوون ویەك بە یەكی ئەوس وخەزرەجیان ئەناسی هەتا دەنگیان ئەناسین لە بەر ئەوەی هەر بە منداڵی پێكەوە ژیا بوون وئەگەر بیان دیبانایە ئەیان گرتن وئەیان كوشتن چونكە موسڵمانانی مەدینە لەگەڵ خەیبەرێدا ناكۆك بوون بەڵام شتێك كاری بۆ ئاسان كردن كە ئەویش ئەوە بوو عەبدوڵڵای كوڕی عەتیكی ئەمیریان شارەزایی لە زمانی جوولەكەدا هەبوو بۆیە هاوەڵەكانی حەشار دان وخۆی تێكەڵی هەندێ جوولەكە بوو وتوانی بە زمانی خۆیان بیان دوێنێ بۆ ئەوەی زانیاری پێویست دەربارەی ئەبو را فیع سەلامی كوڕی ئەبو لحوقەیق وەر بگرێ ئەمەش بۆ ئاسان كردنی كوشتنی دوای ئەوەی ئەخشەیان بۆ خۆیان دانا چۆنیەتی كوشتنی ئەبو را فیع لە ڕیوایەتەكەی بوخاریدا ئاوا باس كراوە:- كاتێك كە موسڵمانەكان ئەگەنە خەیبەر عەبدوڵڵای كوڕی عەتیكی ئەمیریان فەرمانیان بەسەردا ئەدا ئەوان لەجێی خۆیان دا بمێننەوە تا خۆی بچێ هەواڵ بزانی كە وتی:- لە شوێنی خۆتان دا دابنیشن تا سەیر بكەم عەبدوڵڵای كوڕی عەتیك دەڵێت:- هەوڵم دا بچمە ناو قەلاكەوە ئەوە بوو گوێ درێژێكیان وون بوو بوو وبە شۆڵەیەكەوە لە قەلاَ دەرچوو بوون وبە دوای دا ئەگەڕان منیش ترسام بم ناسن بۆیە سەرو قاچم داپۆشین هەروەك دەست بە ناو بگەیەنم پاشان دەرگاوانەكە بانگی كرد بەر لەوەی دەرگاكە داخەم كێ دێتە ژوورەوە با بێت لە ڕیوایەتیك دا بانگ لە عەبدوڵڵای كوڕی عەتیك ئەكات ئەی بەندەی خوا ئەگەر ئەتەوێ بێتە ژوورەوە وەرە ئەمەوێ دەرگاكە داخەم ئەڵێت:- چوومە ناو قەلاكەوە كە خەڵكەكە چوونە ژوورەوە دەرگاكە داخراو كلیلەكانیان بە كۆڵە كەیەكەوە هەڵ واسین منیش لە شوێنی بەستنەوەی گوێ درێژێك دا لە نزیك دەرگای قەلاكەدا خۆم حەشاردا ئەبو رافیعیش لە باڵا خانەیەكی دا میوانی هەبوون لە لای ئەو نانی ئێوارەیان خوارد وبە قسەكردنەوە بەشێكی شەو ڕۆیشت پاشان گەڕانەوە ماڵی خۆیان كە دەنگە دەنگ

ئەماو جم وجوڵم نەئەبیست هەستام بۆ کلیلەکان ودام گرتن ودەرگای قەڵاکەم کردەوەو ووتم:- ئەگەر پێیان زانیم لەسەر خۆ بۆی دەر ئەچم دەڵێت:- دوای ئەوە چووم دەرگای ژوورەکانیانە لە دەرەوە لەسەریان داخست وهەرچی دەرگایەکم ئەکردەوە لە ناوەوە لەسەر خۆمم دائەخستەوە وتم:- ئەگەر پێشم بزانن ئەوان ناگەنە لام من ئەو ئەکوژم گەیشتمە لای ئەبو ڕا فیع ئەبینم وا لە ژوورێکی تاریك دا لە ناو خاو خێزانی دا ونەم ئەزانی لەچ شوێنێکی ژوورەکەدایە وتم:- ئەبو ڕافیع وتی:- ئەوە کێیە ؟ دەڵێت:- بەرەو دەنگەکە خۆم هەڵداو بە شمشێر دام گرتەوە وسەریشم سوڕئەما لێدانی شمشێرەکەم هیچی پێ نەکرد هاواری لێ بەرز بوویەوە ومنیش لە ژوورەکە چوومە دەرەوە بەڵام دوور نەکەوتمەوە کاتێك کە خاوەنی ( السيرة الحلبية) ڕیوایەتەکەی بوخاری نەقڵ دەکات دەڵێت:- ژنەکەی ئەبو ڕافیع بە مێردەکەی ئەڵێت:- ئەوە دەنگی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکە مێردەکەی پێی ئەڵێت:- دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك لە کوێ یە ؟ لەبەر ئەوەی ئەوەی نە ضير وهۆزی خەزرەج دۆست وهاوپەیمان بوون تێکەڵیان هەبووە ویەکتریان ناسیوە پاشان وەك فریای بکەوم هاتمە لای ودەنگی خۆمم گۆری وبە عیبری پێم وت:- ئەوە چیتە؟ وتی:- دایکت تیا چێت پیاوێك هاتە ژوورەوە بە شمشێر لێی دام ئەڵێت:- جارێکی تر بۆی چوومەوە وبە شمشێر لێم دایەوە بەڵام هیچی پێ نەکرد هاواری لێ بەرز بوویەوە وکەس وکاری بەخەبەر هاتن بەشێوەی فریا گوزار هاتم بە دەمیەوە ودەنگی خۆمم گۆڕی ئەبینم کەوتووە بە پشت دەڵێت:- منیش شمشێرەکەم خستە سەر وورگی وخۆم دا بەسەری دا هەتا قرچەی ئێسقانەکانم بیست دوای ئەوەی کە شمشێرەکە لە پشتیەوە دەر ئەچێ ئیتر زانیم کوشتوومە ئەڵێت:- هاتم یەك بە یەك دەرگاکانم کردنەوە وبەسەر سامیەوە هاتمە دەرەوە هەتا گەیشتمە لای پەیژەکە و ئەم ویست بێمە خوارەوە بەسەریەوە کەوتمە خوارەوە پێم دەرچوو خێرا بەستم و بە شەلە شەل هاتمەوە لای هاوەڵەکانم وتم :- دەرچن مژدە بدەن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لێرە ناجوڵێم هەتا دەنگی ئافرەتی شیوەن کەر ببیستم کە کەڵەشێری بەر بەیان خوێندی شیوەن کەر لەسەر شووراکە وەستاو هەواڵی مردنی ئەبو ڕافیعی گەورە بازرگانی ئەهلی حیجازی دا بە خەڵکەکە دەڵێت:- ئیتر منیش فریای هاوەڵەکانم کەوتم وبەر لەوەی کە بچنە خزمەتی پێغەمبەری خوا

(ﷺ) مژدەم دایە وبۆم باس کرد فەرمووی:- ئادەی قاچت درێژ بکە کە درێژم کرد دەستی پیا هێنا هەر وەك هەرگیز ئازاری نەبووبێ .

بوخاری ئەڵێت:- زوهەوی ووتوویەتی هاتنەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەسەر مینبەر بوو وفەرمووی:- (أفلحت الوجوه) عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکیش وتی:- دەم وچاوی خۆت گەشاوە بێ ئەی پێغەمیەری خوا فەرمووی:- (أفتكتموه ؟) ئایە دەستتان لێ وەشاند ؟ ووتیان :- بەڵێ فەرمووی:- (ناولني السيف) کە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا فەرمووی:- (أجل هذا طعامه في زباب السيف) واتە:- بەڵێ ئەوە خواردنەکەیەتی بە دەمی شمشێرەکەیەوە دوای ئەوەی کە پێنج موسڵمانەکە ئەبو ڕا فیعیان کوشت وجوولەکە هەواڵەکەیان زانی کە موسڵمانان لە مەدینەوە هاتوون وکوشتوویانە بە تایبەت هاوسەرەکەی هاواری کرد ئەو پیاوە عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك بووە ودەنگی ناسیوەتەوە جوولەکە هەوڵیان دا ئەوانە بگرن یان بیان کوژن ئەوە بوو بەسەرکردایەتی حاریث ئەبو زەینەب پێش بەرەبەیان سێ هەزار جوولەکە بڵاوەیان لێ کردو بەدوای بکوژانی ئەبو ڕا فیع دا گەڕان بەڵام بێ هوو دەبوو نەیان دۆزینەوە چونکە بە چاکی خۆیان شارد بۆوە هەتا ئەڵێت دوو ڕۆژ خۆیان حەشار داوە ئەوسا بەرەو مەدینە کەوتوونەتەڕێ.[٢٠٥]

---

[٢٠٥] ( ژیانی ئازیزمان – ﷺ– بەرگی دووەم لاپەرە – ٢٢٩ – ٢٣٦ ).

## ٢١٨.﴿ لە حودەیبیەدا موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرکەوت ﴾

لە کاتی بار خستنی موسڵمانان دا لە حودەیبیە موسڵمانان هەر هەموویان موعجیزەیەکی ڕوون وئاشکرایان بە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بینی ئەوە بوو لەسەر بیرێك خستیان کە ئاوێکی زۆر کەمی تێدا بوو هاوەڵان کەوتنە پێش برکێ کە هەرکەسە ئەیویست خۆی ئاو بخواتەوە وولاغەکەشی ئاوبدات سەیریان کرد ئاوەکە یەکجار کەمە کە بەشی چەند کەسێکی کەمیش ناکات چ جای ئەوان کە هەزارو چوار صەد کەس بوون وزۆر بەشییان ولاغیان پێ بوو ئەبوا موسڵمانەکان ماوەیەك لە حودەیبیە بمابانەوە بۆیە سەرنجیان دا حاڵ وگوزەرانی خۆیان وولاغەکانیان یەکجار سەخت ئەبێت وبە بێ ئاو ناژین ولەو نزیکانەش دا ئاویان دەست ناکەوێ چونکە لە هەر شوێنێکیش ئاوهەبێ قورەیش دەستی بەسەردا گرتووە وناهێڵن کەڵکی لێ وەربگرن کە هاوەڵان هیچ چارەیەکیان بۆ پەیدا کردنی ئاو لەبەردەمدا نەمایەوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ودادی بێ ئاویان کرد ئەویش پەنای بردە بەر بارەگای خوای گەورە وپاشان فەرمانی بەسەر یەکێ لە هاوەڵانی دا تا بچێتە ناو بیرە کەم ئاوەکەوە وئەو تیرەی پیادا بچەقێنی کە بە دەستی موبارەکی خۆی پێی دا ئەو هاوەڵە ناوی ناجیەی کوڕی ئەعجەم بوو جا ناجیەی کوڕی ئەعجەم ئەی وت:- کە دادی کەم ئاوی برایە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کردم ولەتیر دانەکەی دا تیرێکی دەر هێناو دای پێم وداوای دۆلکەیەك لە ئاوی بیرەکەی کرد کە بۆم هێنا دەست نوێژی پێ گرت وئاوی لە دەمی ڕاداو کردیەوە ناو دۆلکەکە وخەڵکەکەش گەرما زۆری بوو هێنا بوون وتەنها یەك بیریش هەبوو وبت پەرستەکان زوو گەیشتبوونە بەلدەح ودە ستیان بەسەر ئاوەکانی دا گرتبوو فەرمووی:- (إنزل بالماء فصبه في البئر وأثر ماءها بالسهم ) فەرمووی:- دابەزە ناو بیرەکەوە وئەم ئاوە بکەرەوە ناو بیرەکەو تیرەکەش بە بیرەکەدا بچەقێنە ئەڵێت:- منیش چووم وەهام کرد دەی بەو خوایەی کە ئەوی بەهەق ڕەوانە کردووە نەهاتبوومە دەرەوە هەتا ئاو خەریك بوو دام پۆشێ بە وێنەی قابلەمە هەڵ چوو هەتا پڕ لە ئاو بوو ئاوگەیشتە لێوی بیرەکە ولەقەراغیا بەدەست

ناویان دەر نەهێنا هەتا دوایەکیان تێر ئاو بوون کاتێك کە ئەم موعجیزەیە ڕووی دا هەموو سوپای ئیسلام بەچاوی خۆیان بینیان وبە هیچ کەس ئینکاری نەئەکرا هەتا مونافیقەکان وەك کوڕی ئوبەی وجەددی کوڕی قەیس بە چاوی خۆیان ئەمەیان بینی وهەندێ لە خزم ونزیکانیان کەوتنە گلەیی ولۆمەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کە واز لە ڕێی چەوت وچەوێڵی نیفاق ناهێنێ یەکێ لەوانەی کە لۆمەی کوڕی ئوبەی کرد ئەوسی کوڕی خەولی خەزرەجی بوو کە لە هۆزەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بوو کە تاکەی قەناعەت بە ڕاست گۆیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناکات؟ بەلام عەبدوڵلا خۆی ئاسا بە بێ ئیمانانە وەلامی دایەوە وئەوس لێی تووڕە بوو ئەڵێت:- شتی وەهام دیوە ئەوسیش ئەڵێت:- خوا خۆت وڕاو بۆ چونت ناشیرین کات ئەم ملە جەڕەی عەبدوڵلا گەیشتەوە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا کە عەبدوڵلا هات بۆ دانیشتن لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) پێی فەرموو:- (أي أبا الحباب أين رأيت مثل ما رأيت اليوم ؟ ) فەرمووی:- عەبدوڵلا ئەوەی ئەمڕۆ دیت لە چ شوێنێکی تر دیوتە ؟ وتی:- هەرگیز وەك ئەمەم نەدیوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی وەبیر هێنایەوە کە بە ئەوسی کوڕی خەولی وتبوو عەبدوڵلاش چاری نەما وئینکاری ئەو ووتە ناشیرینەی نەکرد جا بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر خەشمی موسڵمانان وتی:- (أستغفر الله) عەبدوڵلای کوڕی ئەو مونافیقەش کە گەنجێکی چاك وخوا ناس بوو وتی:- داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکە ئەی پێغەمبەری خوا ئەویش داوای لێ خۆش بوونی بۆ کرد هەروەها جەددی کوڕی قەیسیش بەش بە حاڵی خۆی لەناو خزمەکانی دا سەردار بوو بەلام ئەمیش لە نیفاقدا هاوتای کوڕی ئوبەی کردو وەك ئەویش ڕقی لە پێغەمبەری خوا بوو بەلام بۆ ئاژاوە لەگەڵ سوپای ئیسلامدا هاتبوو واقیدی لە ئەبو قەتادە باسی کردووە کە ووتوویەتی :- کاتێك کە لە حودەیبیە خستمان وئاو کەم بوو گوێ ملە جەددی کوڕی قەیس بوو ئەی وت:- دەرچوونمان بۆ ناو ئەو خەڵکە هیچی بەسەر نەبوو هەر هەموومان لە تینوانا ئەمرین ئەبو قەتادە ئەڵێ:- وتم:- باوکی عەبدوڵلا ئەوە مەڵێ جا بۆچی بەرێ کەوتوویت؟ وتی:- لەگەڵ خزمەکانم دا هاتووم وتم:- ئەی بۆ عەمرە نەهاتوویت؟ وتی:- نەخێر بەخوا ئیحرامم نەبەستووە ئەبو قەتادە وتی:- نیەتی عەمرەشت نەهێناوە ؟ وتی:- کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوەکەی بانگ کرد وبە تیرەکەوە دابەزی بە ناو بیرەکەو

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دۆلکەکەدا دەست نوێژی گرت وئاوەکەی ناو دەمیشی تفی یەوە ناوی وپاشان ئاوەکەی گەڕاندەوە بۆ ناو بیرەکە وئاوی بیرەکە هەڵ چوو ئەبینم جەدد هەردووپێی لە قەراغی بیرەکەوە بۆ ناو ئاوەکە شۆڕ کردوونەتەوە دەڵێ:- منیش وتم:- باوکی عەبدوڵلا ئەوەی تۆ وتت کوا؟ وتی:- گاڵتەم لەگەڵ کردی ئەوەی کە وتم:- هیچی بۆ موحەممەد نەگێڕیتەوە ئەبو قەتادە دەڵێ:- منیش ئەوەم زووتر بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باس کرد بوو جەدد تووڕە بوو وتی:- لەگەڵ چەند منداڵێکی خزممان هەڵس وکەوت دەکەین کە گوێ بە پایەو تەمەنمان نادەن بە ڕاستی ئەمڕۆ ناوسکی زەوی چاك ترە لەسەر زەوی ئەبو قەتادە ئەڵێ:- ئەوە بوو قسەکەیم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باس کردبوو ئەویش فەرمووی:- (إبنه خير منه) واته:- کوڕەکەی لە خۆی چاکترە ئەڵێ:- چەند کەسێك لە خزمانم تووشم بوون ودەستیان دایە سەرزەنشت کردنم لەسەر ئەوەی کە قسەیەکم گەیاند بوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش پێم وتن:- بە ڕاستی خزم گەلێکی خراپن تیاچن لە جەددی کوڕی قەیس بەرگری ئەکەن ؟ ووتیان:- بەڵێ گەورەو سەردارمانە وتم:- بەخوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرداری ئەوی لەسەر ئەوەی سەلیمە لابردووە وبیشری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرووری کردۆتە سەردارمان وهەر پایەو پلەیەك لە دەرگای جەددا بووە ڕووخاندوومانە ولە دەرگای بیشری کوڕی بەرا دا بنیاتمان ناوەتەوە وهەتا ڕۆژی قیامەت هەر ئەو سەردارمانە جەددی موونافیق هەروا بە ترسنۆکی ژیانی بەسەر بردو لە کاتی بەیعەت دانی شدا لە ترساندا خۆی ئەشاردەوە.[٢٠٦]

---

[٢٠٦] ( ژیانی ئازیزمان – ﷺ– بەرگی دووەم لاپەرە ٢٥٥ – ٢٥٨ ).

## ٢١٩. ﴿ لە کاتی ووتوو وێژی پێغەمبەری خواو عورووەی کوڕی مەسعوود لە حودەیبیەدا ڕووداوێکی سەیر ڕووی دا ﴾

دوای ئەوەی کە بت پەرستانی مەککە عورووەی کوڕی مەسعوودی سەقەفیان ناردە لای پێغەمبەر (ﷺ) لە حودەیبیەدا عوڕوە مەککی جێهێشت وچووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە لە نزیك پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت پاشان کەوتە قسەکردن و وتی:- ئەی موحەمەد ئەوە چیە کۆمەڵە خەڵکێکی هەرچی وپەرچی وناکەس بەچەت هێناوەتە سەر خزم وکەس وهۆزەکەت دەتەوێت بن بڕیان بکەیت وبەوان لە ناویان بەریت ووریابە ئەوە قوڕەیشە بەهەرچی گەورەو بچووك وژن ومنداڵیانەوە هەموویان بۆت هاتوونە دەرێ وجل وبەرگی پڵنگیان پۆشیوە وپەیمانیان داوە بەخوا هەرگیز بە تۆبزی وزۆرە ملێ ڕێگە تپێ نەدەن بچیتە ناو مەککەوە پێغەمبەری خواش چ فەرمایشتێکی بە بودەیلی کوڕی وەرقاء فەرموو بوو بە ئەویشی ڕاگەیاند لە گێڕانەوەی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەویش فەرمووی:- ( إنا لم نات لقتال ولكنا أردنا أن نقضي عمرتنا وننحر هدينا فهل لك أن تأتي قومك فأنهم أهل قتب وأن الحرب قد أخافتهم وأنه لا خير لهم أن تأكل الحرب منهم إلا ما قد أكلت فيخلون بيني وبين البيت فنقضي عمرتنا وننحر هدينا ويجعلون بيني وبينهم مدة تزل أي تهدأ فيها نساؤهم ويأمن فيها سربهم ويخلون بيني وبين الناس فإني والله لأقاتلن على هذا الأمر الأحمر والأسود حتى يظهرني الله أو تنفرد سالفتي , فإن أصابني الناس فذاك الذي يريدون وإن أظهرني الله عليهم أختاروا, أما قاتلوا معدين وأما دخلوا في السلم وافرين ).[٢٠٧]

واتە:- ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕ وکوشتار بەڵام ئێمە دەمانەوێت عەمرەکەمان بەجێ بگەیەنین وقوربانیەکانمان سەربڕین با ئەوەت پێ بڵێم کە چوویەوە لای خزم وکەسانت ئەوان تا کەی ماڵیان لە سەر پشتی ئەسپ و ووشتر بێت وەك کۆچ وباری کۆچەریەکان وە جەنگ وهەرا دوو چاری ترس ودڵە ڕاوکێ ی کردوون وهیچ خێرو بێری تێدا نیە بۆیان لە کاتێکدا شەڕو کوشتار لەبنی هێناون ئینجا هەتاکو بە تەواوی نەی بڕاندوونەتەوە با لە پەیوەندی

---

[٢٠٧] ( أخرجه ابن أبي شيبة – المصنف – (٣٧٩٩٤ ).

نێوان من وخەڵکەکە بگەڕێن وخۆم یەکلایی بکەمەوە وەڵلاهی من شەر دەکەم لەسەر ئەو پەیامە خواییە لەگەڵ تێکرای ئەو خەڵکە بەبێ جیاوازی ڕەگەزو ڕەنگ وزمان هەتاکو خوا سەرم دەخات یان لەو پێناوەدا سەری خۆم دا دەنێم ئەگەر خەڵکی توانیان لە ناومان بەرن ئەوا ئاواتیان هاتۆتە دی وئەوانیش ئەوەیان دەوێت وەئەگەر خواش سەری خستم بەسەریاندا ئەوە ئەوان سەرپشکن یا خۆیان بۆ شەڕرو کوشتار ئامادە دەکەن یاخود بەوویستی خۆیان بچنە پەیمانی هەرکەسێکەوە عوروەی کوڕی مەسعوود لەو کاتەدا وتی:- ئایە کەسێك بەر لە تۆ لە ناو عەرەب وویستوویەتی بنەچەو خزم وکەسی خۆی لەبن بینێ بە ڕاستی ئەوە کارێکی نەشیاوە ونەگونجاوە وەڵلاهی من وا دەبینم ئەو خەڵکە هەرچی وپەرچی ودەم ڕووتە لە دەم وچاویاندا ئەوە دەخوێنمەوە کەسبەی هەر شتێك ڕووبدات ئەوان ڕادەکەن وپشتت بەردەدەن لەو کاتەدا ئەبو بەکری صدیق – خوای لێ ڕازی بێ – کە لە پشت پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دانیشتبوو فەرمووی:- ئەی دەستت بە لاقیتەی لات ئێمە ڕادەکەین وپێغەمبەر (ﷺ) جێ دەهێڵین وپشتی تێ دەکەین ئێمە دووچاری شکستی دەکەین وبە دەست دوژمنیەوەی دە دەین عوروە وتی:- ئەوە کێیە ئەی موحەمەد ؟ فەرمووی:- ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافەیە وتی:- وەڵلاهی لە بەر ئەوە نەبوایە کە چاکەیەکت بەسەرمەوەیە هێشتا قەرەبووم نەکردۆتەوە بۆت دەنا وەلامم دەدایتەوە بەلام با ئەوە لە بری ئەوە بێت واتە: - عوروە هەستا بوو بە لە ئەستۆ گرتنی خوێنی کوژراوێکی خزمی ئەبو بەکریش یارمەتی وهاوکاری باشی کرد بوو بۆ ئاشتەواییەکە عوروە پێغەمبەری خوای دەدواند هەر کاتێك قسەیەکی دەکرد دەستی دەبرد بۆر ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەش نەریتێکی باوی ناو خێڵە عەرەبەکان بوو لە کاتی گفتو گۆدا بە تایبەتی لە کاتی ڕازی کردنی بەرامبەرو نەرمی نواندن بە مەبەستی لێك نزیك بوونەوە لەو کاتەشدا موغیرەی کوڕی شوعبە وەك پاسەوان بە دیار سەری پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەستابوو خۆی دەمامەك دا بوو بە خودەی ئاسنین وشمشێرەکەشی بە دەستەوە بوو هەر کاتێك عوروە دەیویست دەستی ببات بۆر ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەسکی شمشێرەکەی دەی کێشا بە دەستیدا ودەیفەرموو:- دەستت بکێشەوە لە ڕیشی پێغەمبەر بەر

لەوەی نەگەڕێتەوە بۆلات لە گێڕانەوەیەکی تردا دڵنیابە یا ئەوەیە دەستت دەکێشیەوە یا دەستت ناگەڕێتەوە بۆلات.[٢٠٨]

عوروە سەری بەرز کردەوە وتی:- ئەی بێ بەلاَ بی چەند توندو تیژو زبریت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بزەیەکی کرد عوروە پێی وت:- ئەوە کێ یە موحەمەد ؟ (ﷺ) فەرمووی:- ئەوە برازاکەتە موغیرەی کوڕی شوعبەیە وتی:- ئەی چەند سپڵەی ئەی ئەی ستەمکاری پیاو کوژ تۆ هێشتا لە تاوانەکەی دوێنێت پاك نەبوویتەوە کە لە بازاری (عكاظ) ئەنجامت داوە هەوڵ وکۆششی من نەبووایە تاوانەکەت نەدەبڕایەوە وسوڵحت بۆ نەدەکرا ئیبن هیشام – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێت:- مەبەستی عوروە لەو قسەیە ئەوە بوو کە موغیرەی کوڕی شوعبە – خوای لێ ڕازی بێ – بەر لە موسڵمان بوونی سیانزە کەسی لە بەنی مالیکی هۆزی (ثقیف) کوشتبوو ئەوەش ئاشوبی بەر پا کردبوو هەر دوو بەرە بابی هۆزی (ثە قیفي) کرد بە گژیەکدا بەنی مالیکی خێڵی کوژراوەکان وە ئەحلاف خێڵی موغەیرە عوروە خوێنی هەر سیانزە کوژراوەکەی خستە ئەستۆی خۆیی وخوێنەکەی پێدان بەوەش کێشەکەی چارە سەر کرد وئاشتەوایی خستەوە نێوانیان .

ئیبن حەجەری عەسقەلانی – ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێت:- پوختەی ڕووداوەکەی موغەیرە بەم شێوەیە بوو موغەیرە لەگەڵ کۆمەڵێك بۆ گەشت دەرچوون بە مەبەستی سەردانی کردنی موقەوقسی میسر ئەویش میوانداریەکی باشی کردن وڕێزێکی شایستەی لێ گرتن وبەخششێکی باشی وەك دیاری پێدان ئەوانیش بەشی موغەیرەیان کەم داناو پشت گوێیان خست ئەویش ئەمەی لە دڵی خۆی گرت ولێیان بە ڕق دا چوو کاتێك لە ڕێگادا گەڕانەوە ئارەقیان خواردەوە کاتێك سەرخۆش بوون وخەویان لێکەوت موغەیرەش ئەم هەلەی قۆستەوە وهەڵی کوتایە سەریان وهەموویانی کوشت.[٢٠٩]

---

[٢٠٨] ( أخرجه ابن أبي شيبة – المصنف– (٩ / ٢٠٠ ) وصحح إسناده كل من الحافظ في – المطالب العالية– (٤٢٨٩ والبوصيري في – اتحاف الخيرة المهرة– (٦٢٨٠ ).

[٢٠٩] ( فتح الباري ) ( ٥ / ٣٤٠ ).

هەموو ماڵ وكەلوپەل وسامانەكەشی هێنان وله دوایدا هاته خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) وموسڵمان بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- پێی :- (أما الإسلام فأمتك وأما المال فلست منه في شيء فإنه مال غدر لا حاجة لنا فيه ).

واته:- موسڵمان بوونه كەتمان له دڵەوه پێی ڕازین بەڵام ماڵ وسامانەكەت پەیوەندی بە ئێمەوه نیه وهیچ شتێكی لێ وەر ناگرین ئەوه ماڵی بەستەم زەوت كراوه ئێمە هیچ پێویستی یەكمان پێ نیه بەو جۆره پێغەمبەری خوا ڕازی نەبوو وەری بگرێت.[٢١٠]

---

[٢١٠] (أخرجه- أحمد (١٨١٥٣ ) وقال محققه إسناده صحيح على شرطهما والطبراني (الكبير) (٢٠ / ٣٦٥ ) وقال محققه حديث صحيح النسائي (الكبرى) (٨٧٣٣ ) وقال الشيخ مقبل في صحيح المسند (١١٥٠ ) حديث صحيح)

## ٢٢٠.﴿ بەسەرهاتی ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل لە کاتی مۆرکردنی ڕێکەوتنامەی حودەیبـیـەدا ﴾

لە حودەیبیەدا هەرکە ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك بینی بەرەو ڕووی دێت فەرمووی:- ئەوە سوهەیلە خوای گەورە ئەم دۆخەتان بە ئاسانی بۆ چارەسەر دەکات دیارە قورەیشی یەکان ڕێکەوتن وئاشتەوایان دەوێت کاتێك ئەو پیاوەیان ناردوە هەرکە سوهەیلی کوڕی عەمر گەیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) گفتو گۆی دەست پێ کردو قسە کردن لە بارەی دانوستانەکەوە درێژی کێشا پێدا چوونەوەی تەواویان کردو دەستیان پێ دەکردەوە هەتاکو بە ڕێکەوتن وئاشتەوایی لە نێوانیاندا کوتایی پێ هات کاتێك بە تەواوی کارەکە بڕایەوە وهیچ شتێك لە گۆڕ نەما عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێ – بەهەڵە داوان خۆی گەیاندە ئەبو بەکر – خوای لێ ڕازی بێ – وتی:- ئەی ئەبو بەکر ئایە ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نییە ؟ وە ئێمەش موسڵمان نین ؟ ئەوانیش موشریك وبێ باوەڕنین ؟ وتی:- بەڵێ , وتی:- باشە لەسەر چی ئێمە بە زەلیلی لەسەر ئاینەکەمان ڕازی بین ؟ ئەبو بەکر وتی:- ئەی عومەر پابەند و دڵنیابە پێغەمبەر (ﷺ) بێ مەبەست ئەم کارەی نەکردووە من شایەتی دەدەم کە ئەو نێردراوی خوایە عومەریش وتی:- وەمنیش شایەتی دەدەم کە ئەو پێغەمبەری خوایە ئنجا سوهەیل وتی:- نوسراوێکم بۆ بنووسە و لە نێوان ئێمەو خۆتاندا با نوسراوێکی فەرمی هەبێت لە نێوا نماندا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە عەلی – خوای لێ ڕازی بێ – (أكتب الشرط بيننا أكتب:- بسم الله الرحمن الرحيم ).[211]

واتە :- بنووسە ئەو خاڵ ومەرجانەی لە سەریان ڕێکەوتین سەرەتا بنووسە (بسم الله الرحمن الرحيم) سوهەیل وتی:- وەڵڵاهی من (الرحمن الرحيم ) ناناسم ونازانم کێ یە بەڵکو

---

[211] ( أخرجه البخاري (١٣١٨٤ ) ومسلم (١٧٨٣ )

ئەوە بنووسە کە ناسراوە لەلامان (باسمك اللهم) کە پێشتر دەت نووسی مۆسڵمانەکان ووتیان:- وەڵلاهی ئێمە هیچ شتێك نانووسین تەنها (بسم الله الرحمن الرحيم) دونووسین.[٢١٢]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- (أكتب بإسمك أللهم ما صالح عليه محمد رسول الله سهيل بن عمرو ) واتە:- بنووسە (باسمك اللهم) ئەوە ئەو رێکەوتنەیە کە موحەمەد پێغەمبەری خوا (ﷺ) وسەهەیلی کوڕی عەمر لە سەری رێکەوتن سوهەیلی کوڕی عەمر وتی:- وەڵلاهی ئێمە دان نانێین بەوەدا سوێند بەخوا ئەگەر بمانزانیایە تۆ نێردراوی خوای رێگریمان لێ نەدەکردێت لەوەی سەردانی کەعبە بکەیت وشەڕمان لەگەڵ نەدەکردیت وباوەڕمان پێ دەکردیت وبەیعەتمان پێ دەدایت لەسەر ئەو پەیامە بەڵکو ناوی خۆت وباوکت بنووسە یەکە ئەو رێکەوتنەیە کە موحەمەدی کوڕی عەبدەڵلا وسوهەیلی کوڕی عەمر لەسەری پێك هاتوون پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- وەڵلاهی من نێردراو فرستادەی خوام ئەگەر ئێوەش بە درۆم بخەنەوە عەلی :- بیسڕەوە خوایە تۆ دەزانی کە من پێغەمبەری تۆم ئەوە ڕەش بکەوە ئەی عەلی وبنووسە:- ئەمە ئەو رێکەوتنەیە کە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلا مۆری کردووە.[٢١٣]

عەلی – خوای لێ رازی بێ – وتی:- وەڵلاهی نایسڕمەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نووسراوەکەی وەرگرت کە خۆی نەخوێندەوار بوو سڕیەوە وا بریار درا لەسەر ئەوەی دەست نەهێننە رێگەیان تا بتوانن تەواف بکەن سوهەیل وتی:-

وەڵلاهی نابێت خێڵە عەرەبەکان بڵێن بە زۆرە ملێ چوونە مەککەوە بەلام ئەگەر ساڵی ئاینده هاتن ئێمە شارەکەتان بۆ چۆڵ دەکەین خۆت وهاوەڵانت وەرنە ناو مەککەوە سێ رۆژ تیایدا بمێننەوە وتەنها چەکی رێبوارتان پێ بێت دەبێت بێنە ناو شارەوە تەنها شمشێرتان پێ بێت لە کێلاندا وە رێککەوتن کە بۆ ماوەی دەساڵ شەڕو کوشتار لە نێوانیاندا بوەستێت وخەڵکی بە تەواوی بکەونە ئاسایش ودڵنیاییەوە هەردوو لایان دەست لە خوێن ڕشتنی یەکتر

[٢١٢] ( أخرجه البخاري (٢٧٣١ ).

[٢١٣] ( أخرجه أحمد ( ١١٨٧ ) وقال محققه إسناده حسن ).

هەڵگرن ولە کاتی بە یەك گەیشتندا دەست لەیەك نەکەنەوە وە هەروەها لەسەر ئەوە پێك هاتن کە هەر کەسێك لە قورەیشیەکان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا موسڵمان بێت پێویستە ڕێگە پێدان وڕۆخەستی خاوەن وکەس وکاری لەسەر بێت گەر وا نەبێت پێویستە بینێرنەوە بۆ مەککە لە دوای ئەو ڕێکەوتنە موسڵمانەکان ووتیان:- (سبحان الله) چۆن بنێردرێتەوە بۆلای موشریکەکان لە کاتێکدا هاتووە وموسڵمان بووە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- (اکتب فکتب :- من یاتي منکم رددناه علیکم ومن أتی منا ترکناه علیکم) واتە:- بنووسە:- هەر کەسێك لە لای ئێوەوە هات دەینێرینەوە بۆ لاتان وە هەر کەسێك لە لای ئێمەوە هاتە ناوتا نبۆ مەککە ئەوە دەست بەرداری دەبین بۆتان ووتیان:- ئەی پێغەمبەری خوا بینووسین وئەوەیان پێ بدەین ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- ( نعم إنه من ذهب منا إلیهم فأبعده الله , من جاء نا منهم فرددناه سیجعل الله له فرجا ومخرجا ) واتە:- بەڵێ هەر کەسێك لە ناو ئێمەوە بڕواتەوە ناویان ئەوە خوا ڕزگاری کردووین لە دەستی لە کۆڵمان بوومتەوە وە هەر کەسێکیش لە لای ئەوانەوە بێتە لامان کە دەیگێڕینەوە بۆ لایان خوای گەورە بە زووترین کات دەرووی خێری لێ دەکاتەوە ورزگاری دەکات.[٢١٤]

وە یەکێکی تر لە بەندەکانی ڕێکەوتنەکە کاتێك کە نووسراوەکەیان نووسی ئەوە بوو کە دڵنیا بین وهیچ پەیمان شکێنی وفرسەت قۆستنەوە وهەڵومشاندنەوە لە نێوانماندا نەمێنێت وە خەڵکیش پشت ڕاست ودڵنیا بن لەوەی هەر کەسێك پێی خۆشە پەیمان لە گەڵ موحەمەددا ببەستێت وهاوپەیمانی بێ گرفت دەتوانێت ئەو کارە بکات لەوێدا هۆزی خوزاعە ڕاست بوونەوە ووتیان:- ئێمە گرێبەستی وهاوپەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) مۆر دەکەین ودەچینە پەیمانی ئەوەوە بەنی بەکریش هەستان ووتیان :- کەواتە ئێمەش گرێ بەستی هاوپەیمانیە تیمان لەگەڵ قورەیشەو دەچینە هاوپەیمانیەتی ئەوانەوە هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام بوو لە نووسینی بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی

عەمر هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بە ئاسن بەسترابۆوە وکۆت وزنجیر کرا بووە ڕایکرد بوو لە خوارووی مەککەوە هاتبوو هەتاکو خۆی کرد بە ناو ڕیزی موسڵمانەکاندا.[٢١٥]

وە خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك دەرچوون بەرەو مەککە هیچ گومان ودوو دڵیەکیان لە فەتح وڕزگار کردنی مەککە دا نەبوو لەبەر ئەو خەو بینینەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە خەودا بینیبووی کاتێك چاویان کەوت بەوەی کە دەهاتە پێش لە ڕێکەوتن وئاشتەوایی وە قورەیش بەندو باریان لەسەر دانان بۆ گەڕانەوەیان ونەچوونە ناو شاری مەککە وکاتێك ڕازی بوون وچوونە ژێر باری ئەو مەرجە قورسانەی دانووستان ئەمانەیان بینی لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) مقۆ مقۆیەك کەوتە ناو خەڵکەکەوە ئەمەیان بە کارێکی گەورە وقورس بۆ سەر خۆیان دا دەنا هەتاکو نزیك بوو دوو چاری لە ناو چوون وبێ فەرمانی خواو پێغەمبەریان (ﷺ) بکات هەر کە سوهەیل چاوی کەوت بە ئەبو جەندەلی کوڕی هەستا بۆیی وکەوتە پێدا کێشانی بە زللەو بە عەباکەی ڕای دەکێشاو ئنجا وتی:- ئەی موحەممەد ئەمە یەکەم کەسە کە دەکەوێتە گەردنت لە ڕێکەوتنەکە کە بیگێڕیتەوە بۆمن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- (إنا لم نقض الكتاب بعد ) واتە:- ئێمە هێشتا نوسراوەکەمان تەواو نەکردووە ومۆر نەکراوە وتی:- وەڵلاهی ئەگەر وابێت بە هیچ جۆرێك لەسەر هیچ شتێك ڕیکەوتنت لەگەڵ ناکەین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ئەوە بە من ببەخشە وتی:- نایبەخشم بەتۆ فەرمووی:- بەڵکو ئەو کارە بکەیت وتی:- من ناتوانم ئەو کارە بکەم موکریز وتی:- ئەوە بەخشیمان بەتۆ سوهەیل وتی:- موحەممەد کۆتایمان بە هەموو شتێك هێناو هەمووی بڕایەوە لە نێوان من وتۆدا بەر لە هاتنی ئەمە فەرمووی:- ڕاست دەکەیت ئەبو جەندل ڕووی کردە موسڵمانەکان ووتی:- ئەی گرۆهی موسڵمانان ڕادەستی موشریکەکانم دەکەنەوە لە کاتێکدا بە موسڵمانی هاتوومە ناوتان ئایە نازانن کە دووچاری چی دەبمەوە ؟ دووچاری سزاو ئازارێکی سەخت دەبمەوە لە پێناوی خوادا عومەر – خوای لێ ڕازی بێ – وتی:- وەڵلاهی لەو ڕۆژەوە کە موسڵمان بووم دووچاری هیچ گومان و دوو دڵیەك نەبووم تەنها

---

[٢١٥] ( أخرجه البخاري ( ٢٧٣٢ ) ( ٣١٨٢ ) ومسلم ( ٢٧٨٤ ).

ئەو ڕۆژە نەبێت چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتم:- تۆ پێغەمبەری خوا نیت ؟ فەرمووی:- بەڵێ:- دەڵێت:- وتم:- کەواتە با بە زەلیلی ڕازی بین لەسەر ئاینەکەمان وبا نەگەڕێینەوە هەتاکو خوا نێوانی ئێمە وئەوان یەکلایی دەکاتەوە فەرمووی:- (إني رسول الله ولست اعصيه وهو ناصري ولن اخالف أمره ولن يضيعني) واتە:- من پێغەمبەری خوام من سەرپێچی ناکەم لە کاتێکدا ئەو پشتیوان وفریادڕەسمە وە پێچەوانەی فەرمانەکانی ناجوڵێمەوە ئەویش هەرگیز پشتم تێ ناکات ودەست بەردارم نابێت وتم:- ئەی تۆ نەت فەرموو پێمان کە ئێمە دەچینە کەعبەوە وتەوافی بەدەوردا دەکەین ؟ فەرمووی:- بەڵێ من پێم وتی کە تۆ ئەم ساڵ دەچیت؟ وتم:- نەخێر فەرمووی:- تۆ دەچیتە مەککەو تەوافی ماڵی خوایش دەکەیت دەڵێت:- دوای ئەو چوومە خزمەت ئەبو بەکر پێم وت:- ئەبو بەکر ئایە هەر بەڕاستی ئەو پێغەمبەری خوا نیە ؟ فەرمووی:- بەڵێ وتم:- وە ئێمە لەسەر هەق نین ودوژمنەکانمان لەسەر ناهەق وپوچ نین ؟ وتی:- بەڵێ وتم:- ئایە کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدا نین وکوژراوەکانی ئەوانیش لە ئاگردا نین ؟ وتی:- بەڵێ وتم:- ئەی بۆچی ڕازی بین بە زەلیلی لەسەر ئاینەکەمان وبەوجۆرە بگەڕێینەوە کە هێشتا خوای گەورە نێوانی ئێمەو ئەوانی یەکلایی نەکردۆتەوە ئەبو بەکر وتی:- واز بێنە عومەر لە بۆچوون وبیرو ڕای ئەو پیاوە کە ئەو پێغەمبەری خوایە هەرگیز سەرپێچی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتی خۆی ناکات وخواش پشتیوان وسەر خەریەتی هەرگیز خوا دەست بەرداری نابێت پابەندی ڕێ و شوێنی بە هەتاکو دەمرێ وەڵڵاهی ئەو لەسەر هەق وڕاستی یە وتم:- ئەی نەیفەرموو پێمان کە دەچینە کەعبەو تەوافی دەکەین ؟ وتی:- بەڵێ بەس فەرمووی کە ئەم ساڵ دەچین؟ وتم:- نەخێر وتی:- کەواتە دەچیت وتەوا فیش دەکەی عومەر دەڵێت:- بەردەوام خێرو صەدەقە وڕۆژوو ونوێژی زیاترم ئەنجام دەدا وبەندەم ئازاد دەکرد لە ترسی ئەوەی ئەو ڕۆژووە کردم وەلە بەر ئەو قسانەی کردم هەتاکو ئەو خێرو چاکانە قەرەبووی بکاتەوە وە سوهەیل بە توندو تیژی بەرامبەر ئەبو جەندەل وەستایەوە عەباکەی گرت وبە دوای خۆیدا ڕای دەکێشا بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆلای قوڕەیش ئەبو جەندەلیش بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد :- ئەی گرۆهی موسڵمانان ئایە دەمگێڕنەوە بۆ ناو موشریکەکان کە لەسەر ئاینەکەم پاشگەزم بکەنەوە بۆ شەریك وهاوبەشی دانان دەڵێت:-

خەڵکەکە زیاتر ڕقیان هەڵدە سا لەوەی کە بەسەریان دە هات بەهۆی سوڵحەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:- ( يا أبا جندل اصبر واحتسب فإن الله عز وجل جاعل لك ولمن معك من المستضعفين فرجا ومخرجا , إنا قد عقدنا بيننا وبين القوم صلحا وأعطيناهم على ذلك وأعطونا عليه عهدا وإنا لن نغدر بهم) واتە:- ئەبو جەندەل خۆ ڕاگر بە وپشت بە خوا ببەستە دڵنیابە خوای گەورەی بە دەسەڵات بۆ تۆ و ئەوانەی لەگەڵ تۆدان لە چەوساوەکانی مەککە دەرووی خێرو خۆشی و ڕزگاریتان لێ دەکاتەوە ئەوەش پەیمانمان بە یەکتر داوەو وە ئێمەش هەرگیز ستەمکارو پەیمان شکێن نابین لەگەڵیاندا دەڵێت:- عومەر بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە لای ئەبو جەندەل ولە تەکیەوە دەرۆیشت ودەی وت:- دان بە خۆدا بگرە ئەبو جەندەل ئەوانە موشریکن خوێنی هەر کەسێکیان وەك خوێنی سەگ وایە عومەر خۆی لێ نزیك کردبۆوەو باوکیشی دەستی گرت بوو پەل کێشی دەکرد بە دوای خۆیدا عومەریش دەیووت:- ئەوە تەنها کەسێکە شمشێر لە خزمەتت دایە ئەبو جەندەل ئەوە شمشێرەو بیگرە یەك بە یەك دەوەستنەوە سوهەیل وتی:- ئەی عومەر ئەو یارمەتی دەدەیت لە دژی من دەڵێت:- عومەر — خوای لێ ڕازی بێ — دەسکی شمشێرەکەی لێ نزیك دەخستەوە بۆی دەبردە پێش عومەر — خوای لێ ڕازی بێ — دەیووت:- دەمویست شمشێرەکە وەربگرێت وباوکی بکوژێت ئەویش هەر لە پاڵ باوکیدا مایەوە وبەوەش بڕیارەکە جێ بە جێ کرا ونەەسراوەکەش تەواو بڕایەوە کاتێك نوسراوەکە کۆتایی پێ هات ومۆر کرا بە ئامادەبوونی کەسانێك لە موسڵمانەکان وموشریکەکان لەوانەی ئامادەیی ڕێکەوتنەکە بوون لە موسڵمانەکان ئەبو بەکری صدیق وعەمەری کوڕی خەتتاب وعەبدورەحمانی کوڕی عەوف وعەبدەڵڵای کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر وسەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ومەحموودی کوڕی مەسلەمە وموکریزی کوڕی حەفص کە ئەو کاتە موشریك بوو وە عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش کە نووسەری ڕێکەوتننامەکە بوو.[216]

وەدەربارەی ئەبو جەندەل و ئەوانەی تریش وەك پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دابوو دەقا و دەق هاتە دی دەرووی خێر و خۆشی و ڕزگاریان لێ کرایەوە .

---

[216] ( أخرجه البخاري ( ٢٧٣٦ ) ( ٢٧٣٢ ) ومسلم ( ١٧٨٤ ) وأحمد ( ١٨٩١٠ ) وقال محققه إسناده صحيح.

## ٢٢١. ﴿ بەسەر هاتی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع پاڵەوانە ناودارەکەی غەزای ( ذي قرد ) ﴾

عیمرانی کوڕی حوصەین – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- هۆزی ثە قیف کە لە طائف نیشتە جێ بوون هاوپەیمانی خێڵی عوقەیل بوون دوو کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەریان (ﷺ) بە دیل کرتبوو هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە تۆڵەی ئەوەدا کەسێکیان لە خێڵی عوقەیل بەووشتوەکەیەوە دەستگیر کرد بە ناوی (عضباء) کە پێشڕەوی ئەو ووشترانەی دەکرد کە بۆ کاتی حەج دیاری دەکران وەك هەدیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە لای ئەو دەست بەسەرە لە کاتی بەندکرانەکەی دا وتی:- ئەی موحەممەد ؟ پێغەمبەری خواش (ﷺ) لیی نزیك بووەوە وفەرمووی:- چیت دەوێت ؟ وتی:- لەبەر چی منتان گرتووە؟ ئەوە منیش لێگەڕێن ئەی لەبەر چی ئەو ووشترەی پێشڕەوی ووشترەکانی هەدیەی حەجتان دەست گیر کردووە واتە:- تاوانێکی گەورە بوو ئەوسا عیمران دەڵێت:- ئەو ووشترە پێشڕەوی ووشترەکانی دیاری کراوی حەجی دەکرد لە سەردەمی نەفامی دا هەر ووشترێکی لەو جۆرەش لەو سەردەمەدا ڕێگری لێ نەدەکرا لە هەر حەوزو ئەستێلێك ئاوی بخواردایەتەوە لەهەر پاوان ولەوەڕگایەکیش بلەوەڕایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:- تۆ لە بەر هاوپەیمانە ثە قەفیەکانت دەست بەسەر کراویت ئنجا تەشریفی ڕۆیشت لەلای وبانگی کردەوە پیاوەکە ئینجا وتی:- ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد پێغەمبەری خواش (ﷺ) کەسایەتیەکی نەرم ونیان وبەبەزەیی بوو لای کردەوە بەلای دا وفەرمووی : ئینجا چیت دەوێت ؟ وتی: من موسڵمانم پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (لو قلتها وأنت تملك أمرك أفلحت كل الفلاح) واتە:- ئەگەر بەر لە دەست بەسەریەکەت ئەمەت بووتایە کاری خۆت دەکەوتەوە دەست سەرفرازی تەواوت بۆ خۆت بە دەست دەهێنا واتە:- ئازاد بوونت ئیسلامت دەبردەوە پاشان تەشریفی ڕۆشت لەلای ئەوەوە دیسان بانگی کردەوە و وتی:- ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەوە لای وفەرمووی:- چیترت دەوێت ؟ وتی:- من برسیمە پێخۆرم بدەنێ بیخۆم وە زۆرم تینووە ئاوم بدەنی فەرمووی:- ئەوە پێداویستی ڕۆژانەتە ئامادەیە دواتر ئاڵوگۆڕیان پێکرا بە

دووکەسە موسڵمانەکە کە هۆزی ئەقیف بە دیل گرتبوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عضباء)ی لای خۆی گلدایەوە بۆ گەشت وسەفەری خۆی ئەوە بوو (عضباء) لەگەڵ مێگەڵە ووشترەکەی تر نێردرا بۆ لەوەڕگا کە هی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو تا لە لەوەڕگاکانی مەدینە بلەوەڕێن پاشان موشریکەکان دایان بەسەر مێگەڵ ومالآتی شاری مەدینەدا بە تالآن بردنیان (عضباء) یش لە ناو ئەو مالآتانەدا بوو سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەع – خوای لێ ڕازی بێ – لەو بارەوە دەڵێت:- لە حودەیبیە گەڕاینەوە پاشان گەیشتینەوە شاری مەدینە ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) مێگەلێك ووشتری خۆی لەگەڵ خزمەتکارێکی خۆی نارده دەرەوە کە ناوی ( رەباح) بوو بۆ لەوەڕگا منیش لە گەڵی دا بووم ڕۆیشتم ئەسپی طە لحەی کوڕی عوبەیدڵلآم پێبوو ئاوم داو پاشان مێگەلەکەمان نار دبە ووشترەکەی پێغەمبەری خواشەوە (ﷺ) بۆ لەوەڕگا کاتێك ڕۆیشتین بانگی یەکەمی بەیانی دابوو ڕانە ووشترەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناوچەی (ذي قرد) دەلەوەڕان کە کێوێکی ڕەش بوو لە دووری (٣٥ کم) لە باکوری ڕۆژهەلآتی شاری مەدینەوە بەلای ناوچەی غابەوە دواتر خزمەتکارێکی عەبدورەحمانی کوڕی عەوفم پێگەیشت پێم وت:- بێ قەزا بیت ئەوە چی بووە ؟ وتی: مێگەلە وشترەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتم:- کێ بەتالآنی بردوونی ؟ وتی:- تاقمێك لە هۆزی غە طە فان وفوزارە.[٢١٧] سەلەمەی پاڵەوانی ئەم داستانە دەڵێت:- کاتێك بەیانیمان کردەوە دەبینین عەبدورەحمانی کوڕی عەیینەی کوڕی حوصەینی فوزاری داویەتی بە سەرمالآتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ژمارەیان بیست وشتری مێینە بوو هەموویانی داوەتە پێش خۆی وشوانەکەشی کوشتوە کە ذەڕی کوڕی ئەبو ذەڕی غەفاری بوو ئەوە بوو بەپەلە و هەڵە داوان خۆیی وئەوانەی لە گەڵی دا بوون لە ئەسپ سوارەکان بە ڕاوەدوونان مێگەلەکەیان لە شار دوور خستبووەوە لەو بارەوە ئیبن هیشام دەڵێت:- ئەو مالآتە پیاوێکی هۆزی غەفار شوانی دەکرد لەگەڵ هاوسەرەکەی پیاوەکەیان کوشت کە ذەڕی کوڕی ئەبو ذەڕ بوو ژنەکەشیان برد لەگەڵ مێگەلەکە ژنەکە ناوی لەیلا بوو سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت:- وتم رەباح وەرە سواری ئەم ئەسپە بەو بیگەیەنەوە دەستی طەلحەی کوڕی عوبەیدڵلآ – خوای لێ ڕازی بێ –

[٢١٧] ( أخرجه البخاري ( ٤١٩٤ ) ومسلم ( ١٨٠٦ ).

وە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕابگەیەنە کە موشریکەکان داویانە بەسەر مەڕو ماڵاتەکەیدا پاشان خۆشم بە شوێنیدا ڕۆیشتم بۆ سەر تەپۆڵکەیەك وەسەرکەوتم هەتا گەیشتمە قەدپاڵی غابەو لە ناوچەی (ثنية الوداع) سەیرم کردن ئەوان مێگەلەکەیان ڕاوناوە وبە شیرزەیی داویانەتە پێش خۆیان تا بۆی دەرچن منیش سەرکەوتمە سەر کێوی سەلع وڕووم کردە شاری مەدینە وسێ جار بە دەنگی بەرز هاوارم کرد ( یا صبحاه – یا صباحاه – یا صباحاه) ئەمە بانگ کردنێك بوو بۆ هەر ڕووداوێك پێش بهاتایە لەو سەردەمەدا بە جۆرێك هەموو دانیشتوانی مەدینە گوێیان لێ بوو ئەوە بوو ڕووەو لای من هاتن منیش بە گورجی شوێنیان کەوتم چونکە من پێشتر دەرچوو بووم بۆ ڕاوشکار بە شمشێرو تیرو کەوانەوە خۆم پڕ چەك کرد بوو دەنگی هاوارو بانگە وازەکەم گەیشتبووە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەڵکی مەدینەش هاوارو بانگی دەرچوونیان لێدابوو فەرموویان :- فەوماوە – فەوماوە سەرەنجام هەشت سوار چاك لە دەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆبوونەوە کە ئەمانە بوون ( میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندی – عوبادەی کوڕی بەشیری ئەنصاری – نوسەیدی کوڕی ظوهەیری ئەنصاری – عوکاشەی کوڕی میحصەنی ئەسەدی - موحەریزی کوڕی نەضلە ی ئەسەدی کە بە ئەخرەم ناسرابوو – وقەتادە حارثی کوڕی روبعی – ئەبو عەیاش عبیدەی کوڕی زەید ) کاتێك لە خزمەتیا کۆبوونەوە – سەعدی کوڕی زەیدی ئەنصاری – خوای لێ ڕازی بێ – کردە ئەمیریان وپێی فەرموون:- (اخرج في طلب القوم حتى الحقك في الناس) واتە:- بە گورجی بڕۆن بە شوێن ئەو چەتەو ڕێگرانە هەتا لەگەڵ خەڵکەکە پێتان دەگەین ئیبن ئیسحاق – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت:- لەولاشەوە سەلەمە بە گورجی کەوتبووە دوایان کە ژمارەیان چل کەس بوون وەك شێر هەڵمەتی دەبرد هەتا گەیشت پێیان ئنجا کەوتە تیرباران کردنیان کاتێك بە ئەسپەکانیانەوە بۆی دەگەڕانەوە بە پەلە ڕای دەکرد پاشان بەرەنگاریان بۆوە وە ئەگەر دەرفەتیشی بۆ دەڕەخسا تیریان تێ بگریت دەکەوتە تیر هاویشتن سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – خۆی لەو بارەوە دەڵێت:- ئەوە بوو لە بەر چاوم ون بوون هەتا گەیشتمەوە پێیان لەسەر ئاوێك لایان دا بوو ئاویان دەخواردەوە وهەڵیان دەهێنجا من تیر هاوێژێکی لێهاتوو بووم کەوتمە تیر باران کردنیان وکوشتنی ئەسپەکانیان لەو کاتەدا بە شێوازی هۆنراوە دەم وت:- ( أنا ابن

الأكوع اليوم يوم ترضع ) واتە:- من کوڕی ئەکوەعم ئەمڕۆ ڕۆژی لە ناوچوونی ناکەس بەچەو نا پیاوانە ئەو لەو کاتەدا بوو کە درەخت ودەوەن زۆر سەوز بوون لە ناویان خۆم گەیاندە کەسێکیان لەسەر وشترەکەی بوو تیرێکم تێگرت ئەوە بوو بەر قاچی کەوت وخزی سەری تیرەکە لە شانی چەقی وپێم وت:- بگرە من ئەوەی ئەکوەعم ئەمڕۆکە ڕۆژی ڕیسوا بوونی سووك وچروکانە سوێند بەخوا بەو جۆرە تیرم تێ دەگرتن ودەمێکیان بە بەردەوامی وبێ وچان هەر کاتێك ئەسپ سوارەکانیان بۆ دەگەڕانەوە من دەڕۆیشتمە ژێر درەختێکەوە ناو تەنگە بەرانی شاخەکەوە بەناو هەڵات ودۆڵەکەدا ڕۆیشتن چوونە شوێنی سەخت وتەنگەوە منیش سەرکەوتمە سەربەرزایی شاخەکەوە بەردم بەسەردا گلدانە خوارەوە بەوشێوە کۆڵم نەدا وبەردەوام بووم ئەوە حاڵی من وئەوان بوو بەردەوام بووم لە شوێن کەوتنیان ولە دوایان نەبوومەوە هەتا هەرچی خوا درووستی کردبوو لە وشترەکانی پێغەمبەر ماڵاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێم دەسەندەوە ودەمخستە دوای خۆمەوە ڕزگارم دەکرد لە دەستیان وجێم دەهێشتن ودوای ئەوان دەکەوتم وتیرم تێ دەگرتن هەتا زیاتر لە سێ عەبای خەت خەت وڕمیان کەوتە دەستم منیش دەمشاردنەوە وکۆمەڵە بەردێکم کەڵەکە دەکرد لەسەری وهەر ئاوا فڕێم نەئەدا ولە سەر ڕێگاکە دام دەنا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وهاوەڵانی بیناسنەوە هەتا گەرما تینی سەند ئنجا عوینەی کوڕی حوصەینی کوڕی بەدری فوزاری هات بە هاواریانەوە وبۆ ئەوەی پشتیوانیان بکات ئەوانیش لەقەد پاڵێکی تەنگەبەردا بوون دانیشتبوون بۆ ئەوەی نانی بەیانی بخۆن منیش سەر کەوتم بۆ قەد پاڵی شاخەکەو چوومە سەر لوتکەی شاخەکە دانیشتم بە سەریاندا دەمڕوانی وئەوان کەوتبوونە لای خوارەوە عویینە وتی:- ئەوە کێ یە ؟ من دەیبینم ؟ ووتیان :- ئەوە دوو چاری نارەحەتیەکی سەختی کردووین وەڵلاهی لە تاریکی بەرە بەیانەوە هەتا ئێستا بە دوامانەوەیە لە کۆڵمان نابێتەوە وتیرمان تێ دەگرێت هەرچی بەر دەستمان کەوتبوو لێی وەرگرتینەوە ولە دوای خۆی دایناوە بەجێی هێشتووە عویینە وتی:- ئەگەر ئەو دڵنیا نەبوایە لەوەی کە پشتیوانی هەیەو بە دوایدا دێن گەروا نەبووایە دەستی لێ هەڵدەگرتن ئادەی با چوار کەستان بۆی هەستن وسەرکەونە سەر شاخەکە بۆی سەلەمە دەڵێت:- کاتێك گوێم لە دەنگیان بوو ئەوەندە نزیك بووین دەمان توانی لەیەك تێ بگەین پێم

وتن:- دەزانن کە من کێم ؟ ووتیان:- نەخێر تۆ کێی ؟ وتم:- من سەلەمەی کوڕی عەمری کوڕی ئەکوەعم سوێند بەوەی ڕێزی لە موحەممەد (ﷺ) گرتووە بمەوێت بەهەر کەسێکتان بگەم ڕزگاری نابێت لە دەستم وە هیچ کەسێکیش لە ئێوە ناتوانێت دەست بگەیەنێتە من ولەبەینم ببات یەکێکیان وتی:- وا گومان دەبەم ڕاست دەکات سەلەمە بەوە ترساندنی ئەوانیش گەڕانەوە بێ ئەوەی هیچ بکەن منیش شوێنی خۆم چۆڵ نەکردو نەڕۆیشتم هەتا هەشت سوار چاکەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی لە ناودرەختەکانەوە دەهاتن یەکەمین کەسیان ئەخرەمی ئەسەدی بوو کە ناوی موحەڕیزەی کوڕی نەضلەیە بە دوای ئەوەدا سوار چاکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو قەتادەی کیندی – خوای لێ ڕازی بێ – موشریکەکان کە ئەمیان بینی پشتیان هەڵکردو کەوتنە ڕاکردن منیش لە شاخە هاتمە خوارەوە چاوم کەوت بە ئەخرەم پێم وت:- ئەخرەم یەکەمین ووریای خۆت بە دەورت نەگرن لەسەر خۆ بە هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی پێمان دەگەن فەرمووی:- ئەی سەلەمە ئەگەر تۆ باوەڕت بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە دەزانی کە بەهەشت ودۆزەخ ڕاستەقینەیە تۆ مەبە ڕێگر لە نێوان من ودەست خستنی شەهادەتدا سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- ئینجا وازم لێ هێنا ئەوە بوو بەرەنگاری عەبدوڕەحمانی کوڕی عویینە بووەوە وە کەوتنە وەشاندنی شمشێر لەیەکتر ئەوە بوو ئەخرەم ئەسپەکەی عەبدوڕەحمانی سەربڕی وئەویش شمشێرێکی وەشاندە ئەخرەم وە شەهیدی کرد وە سواری ئەسپەکەی بوو ئەبو قەتادەی سوار چاکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە سەری و کەوتنە شمشێر وەشاندن لەیەکتری عەبدوڕەحمان ئەسپەکەی ئەبو قەتادەی پێکاو کوشتی ئەبو قەتادەش توانی شمشێرێکی پێیدا بکێشێت وبیکوژێت پاشان سواری ئەسپەکەی بێت کە ئەسپەکەی ئەخرەم بوو پێشتر ئەوانی تریش بەهەڵەداوان ڕایان کرد ئەبو قەتادە عەباکەی سەر شانی دانا وپێی داپۆشی واتە :- لاشەی عەبدوڕەحمانی پێ داپۆشی سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت - بەوەی ڕێزی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوە لەسەر پێیەکانی خۆم دەرۆیشتم وشوێنیان کەوتم لە کاتێکدا هیچ کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دوای خۆمەوە نەدە دی وتۆزو خۆڵیشیان دیار نەبوو هەتا بەر لە خۆر ئاوا بوون شۆڕبوونەوە بۆ ناو دۆڵێک کە ئاوی تێدا بوو پێیان دەوت ( ذي قرد) زۆریان تینوو بوو بۆ ئەوەی ئاوی لێ

بخۆنەوە سەیری منیان دەکرد کە شوێنیان کەوتبووم منیش لای سەرەوەم لێ گرتبوون ورێگەم نەدان یەك دڵوپ ئاو بخۆنەوە ئەوە بوو هەستان ئاوەکەیان بەجێهشت خۆیان دوو چاری نارەحەتی کرد لە قەدپاڵێکی سەخت ودژواردا لەوێدا خۆرئاوا بوو منیش دوایان کەوتبووم گەیشتم بە کەسێکیان تیرێکم تێگرت ولە ناوەڕاستی شانیم دا و پێم وت :- من نەوەی ئەکوەعم ئەمرۆ ڕۆژی ڕیسوا بوونی سوك وناکەس بەچانە وتی:- دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکات ئەمە ئەکوەعەکەی بەرەبەیانە ؟ وتم :- ئەی دوژمنی نەفسی خۆت ئەکوەعەکەی بەرە بەیانە ؟ ئەو پیاوەش ئەو کەسە بوو کە لە سەرەتای بەیانیدا تیرێکم تێ گرت بوو پێکا بووم ئێستا تیرێکی تریشم تێگرت وپێکام دوو تێری پێوە بوو لەوێشدا دوو ئەسپم پێ بە جێ هێشتن لە سەر قەد پاڵە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پێنج سەد کەس لە موسڵمانەکانەوە تەشریفی هێناو عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتومی بەسەر کاری مەدینە دانا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی تێپەر بوونی بە ناوچەکەدا خەڵکەکەی بینی شڵە ژابوون ودەیان وت :- ئەبو قەتادە کوژراوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :- ( ليس بأبي قتادة ولكنه قتيل أبي قتادة وضع عليه برده لتعرفوا أنه صاحبه خلو عنه وعن سلبه  ثم قال امعنوا في أثر القوم فأمعنوا واستنقذوا بعض اللقاح) واتە :- ئەوە ابو قەتادە نیە بەڵکو کوژراوی دە ستی ئەبو قەتادەیە بە عەباکەی خۆی داپۆشیووە بۆ ئەوەی بزانن کە خۆی کوشتوویەتی دەست لە کولو پەلی سەربازی یەکەی نەدەن ولێی گەڕێن پاشان فەرمووی:- بەردەوەام بن بابرۆین بە شوێن پێیان دا تا دەگەینەوە پێیان هاوەڵان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن ئەوە بوو هەندێك لە ماڵاتەکانیان ڕزگار کرد لە دەستیان ، سەلەمە دەڵێت : - بە دوو ئەسپەکەی دەستم کەوتبوو پێش خۆم دابوون وبەرەو خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەهاتم مامیشم عامر پێشم کەوتبوو دوای ئەوەی کەشەو تاریك بوو دوو قاپی پێبوو یەکێکیان تۆزێ شیری تێدا بوو ئەوی تریشیان ئاوی تێدا بوو هەندێکم لێ خواردەوە وە ئەوەشی مایەوە دەست نوێژم پێ شۆرد نوێژم کرد پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو تەشریفی هێنا بووە سەر ئەو ئاوەی کە موشریکەکانم لێ دوور خستنەوە ونەمهێشت دەمیانی لێ تەڕ بکەن کە پێیان دەوت (ذي قرد) کاتێك گەیشتم پێی دەبینم ئەو ووشترانە وهەموو ئەو شتانەی لە دەستی موشریکەکانم ڕزگار کرد بوو لەگەڵ

هەموو ڕمەکان وە هەموو عەباکانیشیان پێ یەو دەستیان کەو تووە لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە دابەش کردنی بەسەر هاوەڵاندا بۆ هەر سەد کەسێکیان ووشترێکی بۆ سەربڕین ودابەش کرا بەسەریاندا وە لەولاوە بیلال – خوای لێ ڕازی بێ – ووشترێکی مێیەی سەر بڕی کە من لە دەستی چەتەو ڕێگرەکان ڕزگارم کرد بوو ئەوە بوو کۆپاڵ وجەرگەکەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبرژاند عەرزم کرد وتم :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگەم بدە تا لە ناو هاوەڵانت سەد کەس دەست نیشان بکەم وهەڵیان بژێرم پاشان بیان بەم بۆ ئەوەی لە کاتی عیشادا بدەن بەسەر ئەو هاوبەش پەیداکەرانەدا وهەموویان بکوژن ویەك کەسیان نەمێنێتەوە کە هەواڵی دوای خۆیان بباتەوە ؟ فەرمووی : - (یا سلمة اترك كفت فاعلا ذلك) ؟ واتە:- سەلەمە تۆوا دەزانی دەتوانی بەو کارە هەستی وئەنجامی بدەی ؟ وتم : - بەڵێ سوێند بەوەی کە ڕێزی لە تۆ ناوە بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە پێکەنی هەتا لەبەر ڕووناکی ئاگرەکە خرێکانم بینی وتم:- بە دایك وباوکەوە بە قوربانت بم من ڕێگەم نەدا ئەو بێ باوەڕانە لە ئاوەکە بخۆنەوە لە کاتێکدا زۆریان تینو بوو با بۆ ساتێك بگەڕێمەوە سەریان ؟ فەرمووی :-(یا ابن الأكوع ملكت فأسجد أي قدرت فأعفوا أنهم الأن بغطفان يقرون أي : يضافون في قومهم ) واتە :- ئەی کوڕی ئەکوەع توانا دار بوویت بەسەریاندا بەڵام دەست هەڵگرە ئێستا ئەوان لە ناو هۆزی غەتەفان میوان داریان بۆ دەکرێت سەلەمە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت :- کەسێك هات لە هۆزی غەتەفان وتی :- میوانی فلآنە کەسی غەتەفانی بوون ئەویش چەندین حەیوانی بۆ سەربڕین کاتێك کەوڵیان کردن تەپو تۆزیان لە دوورەوە بەدی دەکرد ووتیان :- موسڵمانەکان هاتن بەپەلە بۆی دەرچوون وڕایان کرد کاتێك بەیانیمان کردەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (خير فرساننا اليوم أبو قتادة وخير رجالنا سلمة ) واتە :- ئەمڕۆ باشترین سوار چاکمان ئەبو قەتادە بوو وباشترین پیادەشمان سەلەمە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو بەشی لە دەست کەوت پێدام بەشی ئەسپ سوار وبەشی پیادەش هەردووکیانی بۆ کۆ کردمەوە وپێی بەخشیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دواتر شەو وڕۆژێك لەسەر ئاوی (ذي القرد) مایەوە موسای کوڕی تەلحەی کوڕی عوبەیدەڵلا –خوای لێ ڕازی بێ – لەو ڕۆژەدا چەندین ووشتری سەربڕی واتە :- لە غەزای (ذي قرد) داخ واردن

وخواردنەوەی بۆ هاوەڵان ئامادە دەکرد ودەرخواردی دەدان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەر ئەو هەڵوێستە پڕ لە جوامێریەی پێی فەرموو ( یا طلحة الفیاض) واتە ئەی تەلحەی زۆر بەخشندە وسەخاوەت هەر لە بەر ئەوە ناونرا بە تەلحەی فەیاز.[٢١٨]

## ٢٢٢. ﴿پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگاکانی چاکەی پیشانی مەعازی کوڕی جەبەل دا﴾

پێغمبەر (ﷺ) لە گەشتێکدا بوو لەگەڵ هاوەڵانی مەعازی کوڕی جەبەل – خوای لێ ڕازی بێ – هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) وتی :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردەوەیەکم پێ بڵێ کە بمخاتە ناو بەهەشت ودوورم بخاتەوە لە دۆزەخ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پێدا بە ڕێگاکانی چاکە فەرمووی :- خوا بپەرستەو شەریکی بۆ بڕیار نەدەی وە نوێژ ئەنجام بدەیت وزەکات بدەیت وڕۆژووی ڕەمەزان بگریت وسەردانی ماڵی خوا بکەیت واتە :- حەج بکەیت وە ڕێنمایی کرد بۆ خێر کردن وە ڕێنمایی کرد بۆ شەو نوێژ کردن وە زۆر دووپاتی کردەوە لە سەر نوێژ وجیها دلە ڕێی خوادا ئەنجا فەرمووی :- ئەی مەعاز : پێت بڵێم کۆی هەموو ئەمانە لە چیدایە ؟ مەعاز وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) زبانی خۆی گرت وفەرمووی :- ئەمە لەسەر خۆت بگرە مەعاز وتی :- ئێمە موحاسەبە دەکرێین لەسەر ئەو شتانەی دەیڵێین ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :- دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی مەعاز ئایە شتێك هەیە کە خەڵکی ڕابکێشێ لە سەر ڕوی بۆ دۆزەخ یان لە سەر لوتیان جگە لە بەرهەمی دروێنەی زمان نەبێت.[٢١٩]

---

[٢١٨] أخرجه الحاكم (٣/ ٣٧٤) وصححه ووافقه الذهبي والحديث من أوله إلى هنا من رواية مسلم (١٨٠٦ ١٨٧٢ ١٦٤١) وأحمد (١٦٥٣٩) و(١٦٤٩٥) وبعضه عند البخاري (٤١٩٤) وأبي داود (٢٣٩١) و(٣٢٩٢) والترمذي (١٦١٥) والطبراني الكبير (٦٢٧٨) وأبن حبان (٧١٧٣) والبيهقي الدلائل (٤/ ١٩٠) واللفظ لمسلم والزيادة لأحمد والبخاري وابن حبان والطبراني وابن هشام السيرة (٣/ ٢٣٥ ).

[٢١٩] رواه الترمذي

## ٢٢٣.﴿ لە ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) تەنها یەك پەرداخ شیر هەبوو ﴾

لە ڕۆژی گواستنەوەی عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی پێغەمبەردا خواردن نەبوو تەنها پەرداخێك شیری تێدا بوو پێغەمبەر (ﷺ) هەڵیگرت ولێی خواردەوە پاشان دای بە دەستی عائیشەوە بەس ئەو شەرمی کردو تەریق دەبوویەوە کە وەریبگرێ بەلاّم ئەو ئافرەتانەی لای ئامادە بوون ووتیان بە عائیشە دەستی پێغەمبەر (ﷺ) مەگێڕەوە وە لێی وەرگرە عائیشە وەری گرت وبە سەرمێکەوە لێی خواردەوە ئەنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە عائیشە بیدە بەو ئافرەتانەی لە دەورتن ئافرەتەکانیش ووتیان ئارەزوومان لێی نیە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون :- برسیەتی و درۆ کۆمەکەنەوە ئەسمائی کچی عومەیس – خوای لێ ڕازی بێ – وتی :- ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر یەکێك لە ئێمە حەزی لە شتێك بێت بڵێت حەزم لێی نیە بە درۆ حساب دەکرێ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی :- درۆ بە درۆ دەنوسرێن بەڵکو درۆی بچووك دەنوسرێت بە درۆی بچوك.[٢٢٠]

## ٢٢٤.﴿ منداڵەکە بەرگە تازەکەی پۆشی و دڵخۆش بوو ﴾

جابری کوڕی عەبدوڵلا – خوای لێ ڕازی بێ – لە جەنگێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوو لە ڕێگەی گەڕانەوەدا جابر پشویدا لە ژێر سیبەری دارێکدا وە داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە لە گەڵی لە ژێر ئەو سێبەرەدا بێت پێغەمبەر (ﷺ) وەلاّمی داواکەی جابری دایەوە دوای تۆزێك منداڵێك هات کە شوانی ئاژەڵەکانی جابر بوو منداڵەکە کە دوو پۆشاکی کۆنی لەبەردا بوو پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کردو وتی بە جابر : ئەوە جگە لەم دوو بەرگەی هیچی تری نیە ؟ جابر – خوای لێ ڕازی بێ – وتی بەڵێ هەیەتی دوو پۆشاکی تری هەیە کە لە جەژندا بۆم کردووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بانگی بکەوە پێی بڵێ بیان پۆشێت ئیتر جابر منداڵەکەی بانگ کردوو فەرمانی پێدا کە پۆشاکە تازەکان لەبەر بکات جا منداڵەکە بەرگە تازەکانی پۆشی ودڵخۆش بوو کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بینی فەرمووی : ئەوە چیە ؟ ئایە ئەمە چاکتر نیە ؟ -----[٢٢١]

---

[٢٢٠] ( رواه ابن ماجة وأحمد ).

[٢٢١] ( رواه البزار ).

## ٢٢٥. ﴿ بەسەر هاتی حودەیر ئەو کەسەی کە خوای گەورە جبریلی نارده لای پێغەمبەر ( ﷺ ) لە پێناوی ئەودا ﴾

لە نافعەوە لە ئیبن عومەرەوە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی بەرێ کرد پیاوێکیان لە ناودا بوو بە ناوی حودەیر وە ئەو ساڵە ساڵی گرانی بوو زۆر خۆراك بەکەمی دەست دەکەوت وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆراکی بەشی هەموویان داو وحودەیری لە یاد چوو بەلاّم حودەیر بە ئارامی وئومێدی پاداشتی خودا لەگەڵ سوپاکەدا بەرێ کەوت وە لە دوای هەموویانەوە بوو دەیووت : ( لا إله إلا الله , والله أكبر , والحمد لله , سبحان الله , ولا حول ولا قوه إلا بالله ) دەیوت : ئا ئەمانە باشترین توێشووە پەروەردگار وبەردەوام ئەو ووشانەی دەوتەوە ولە دوای کۆمەڵەوەکەوە بوو دەڵێت جبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو : ( إن ربي أرسلني إليك يخبرك إنك زودت أصحابك ونسيت أن تزود حديرا وهو في أخر الركب يقول ( لا إله إلا الله , والله أكبر , والحمد لله , وسبحان الله , ولا حول ولا قوة إلا بالله) ويقول : ( نعم الزاد هو يا رب ) دەڵێت پەروەردگارم ناردوومی بۆ لات تا پێت بڵێم کە توێشووت بۆ هاوەلاّنت رێکخستووە وحودەیرت لە بیر چووە کە ئەو لە دوای قافڵەکەیانەوە یەو بەردەوام دەڵێت (هیچ خودایەك نیە جگە لە (الله) , (الله) لە هوموو شت گەورەترە پاك وبێگەردی بۆ خوا , سوپاس و ستایش بۆ خوا , وە هیچ گۆران وهیچ هێزو توانایەك نیە مەگەر بە وویستی خوا دەڵێت : ئا ئەمە باشترین توێشووە پەروەردگار جبریل ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) دەڵێت : ئەو ووشانەی کە دەیڵێتەوە لە رۆژی قیامەتدا بۆی دەبێتە رووناکی یەك کە نێوان زەوی و ئاسمان داگیر دەکات ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشی خۆی توێشووی بۆ بنێرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی بانگ کردو برێك خۆراك وتوێشووی دایە کە بەشی حودەیر بوو وفەرمانی پێ کرد کە گەیشتە لای حودەیر وکەل وپەلەکەی دایە گوێی بۆ راگرێ بزانێ دەڵێت چی و لەبەری بکات و ئەو جا پێی بڵێت ( إن رسوا الله (صلى الله عليه وسلم) يقرأ عليك السلام ورحمة الله , ويخبرك إنه كان نسي أن يزودك , إن ربي تبارك وتعالى أرسل إلى جبريل يذكرني بك , فذكره جبريل واعلمه مكانك ) فەرمووی : بڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلام ورەحمەتی

خوات بۆ دەنێرێت وهەواڵت پێ دەدات کە ئەو لە یادی چوو بوو توێشووت پێ بدات وە خوای گەورەو پەروەردگار جبریلی نارده لام تا تۆم وە بیرخاتەوە جبریلیش ( سەلامی خوای لەسەر بێ) تۆی خستە وە بیرم وجێگا کەتی نیشان دام پیاوەکە گەیشتە لای حودەیر دەبینێ هەر ئەمانە دەڵێتەوە ( لا إله إلا الله , والله أكبر , والحمد لله , وسبحان الله , ولا حول ولا قوة إلا بالله ) وە دەڵێت : ئا ئەمە باشترین توێشووە ئەی پەروەردگار دەڵێت : ئەو جا پیاوەکە لێی نزیك بوویەوە وپێی وت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەلام ورەحمەتی خوات بۆ دەنێرێت ومنی لەگەڵ برێك توێشوودا ناردووە پێت دەڵێت : لە ڕاستیدا تۆم لە بیر چوو بەڵام خوا جبریلی لە ئاسمانەوە بۆ ناردم تا تۆم وەبیر بخاتەوە پیاوەکە دەڵێت : حودەیریش سوپاس وستایشی خوای کردو خوای کردو درودو سەلاواتی دا لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) وپاشان وتی : سوپاس بۆ خوای جیهانیان کە منی لەبیرە لەسەر حەوت ئاسمانەوە لەسەر عەرشی موبارەکی و بەزەیی بە برسیەتی ولاوازیمدا هاتۆتەوە ئەی خوای پەروەردگار هەر وەك چۆن تۆ حودەیرت بیر نەچووە وا بکە لە حودەیریش تۆ لە بیر نەکات پیاوەکەش ئەمانەی لە بەر کردو گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وهەموو شتەکانی بۆ گێڕایەوە لەو کاتەوەی کە بە حودەیر گەیشت تا ئەو کاتەی خوا حافیزی لێ کرد پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : ( اما إنك لو رفعت رأسك إلى السماء لرأيت لكلامه ذلك نورا ساطعا ما بين السماء والأرض ) دەفەرموویت : ئەگەر سەرت بۆ ئاسمان بەرز کردبایەتەوە ڕووناکیەکی پڕشنگدارت لە ووتەکانیدا بەدی ئەکرد لە نێوان زەوی وئاسمان -----[٢٢٢]

[٢٢٢] ( ابن الجوزي له ( صفة الصفوة) ( ١/ ٣٥٦ , ٣٧٨) باسی کردووه هه روه ها ( أبو نعيم ) يش له (الحليه ) دا باسی کردووه

## ٢٢٦.﴿ بەسەرهاتی ئەو پیاوەی کە فریشتەکان شەرمیان لێ دەکرد ﴾

لە عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو ڕانی بەدەرەوە بوو , ئەبو بەکر مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگرت ئەویش هەر بەو شێوەیە مۆڵەتی دا , ئەوجا عومەر مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگرت بۆ ئەویش بە هەمان شێوە مۆڵەتی دا بەڵام کاتێ عوسمان مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی وەرگرت پێغەمبەری خوا (ﷺ)جلەکانی دا بەسەر ڕانیدا ودایپۆشی دوای ئەوەی هەڵسان پرسیم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو بەکرو عومەر مۆڵەتیان وەرگرت تۆش فەرمووت لێکردن لە کاتێکدا هەر بەو حاڵە بوویت کە بوویت ڕانەکانت بەدەرەوە بوون کەچی کاتێ عوسمان مۆڵەتی وەرگرت جلەکانت دابەسەر ڕانتدا فەرمووی (یا عائشة ألا أستحي من رجل والله وإن الملائکة تستحي منه ) واتە : ئەی عائیشە ئایە شەرم لە پیاوێك نەکەم کە سوێند بەخوا فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن.[٢٢٣]

## ٢٢٧.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سالم مولای ئەبو حوزەیفەی بە چاکە کار وەسف کرد ﴾

دایکی ئیمانداران عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەوێکیان پێی فەرمووم : (ماحسبك) ؟ واتە : بۆچی وا دوا کەوتی ودرەنگ گەشتی ؟ وتم : لە مزگەوت دەنگێك هات خۆشترین دەنگ بوو بیستبێتم لە قورئان خوێندندا واتە: گوێم بۆی ڕاگرتبوو پێغەمبەری خواش (ﷺ) ڕۆبەکەی هەڵگرت وچووە دەرەوە وگوێی بۆ ڕاگرت دەبینێ سالم مەولای ئەبی حوزەیفەیە فەرمووی: ( الحمد لله الذي جعل في أمتي مثلك ).[٢٢٤] واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی وێنەی کەسێکی وەك تۆی لە ناو ئوممەتی ئیسلامدا بەدی هێناوە .

---

[٢٢٣] ( أخرجه : مسلم ).

[٢٢٤] ( صحيح أخرجه احمد وحاكم ( ٣/ ٢٢٦ )

## ٢٢٨.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کرد بە پیاو چاك ﴾

سالم لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت  هەر پیاوێك لە ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خەونێکی بدیبایە بۆی دەگێڕایەوە وەمن کوڕێکی سەڵت ولاو بووم وەلە مزگەوت دەخەوتم جارێك لە خەونمدا دوو فریشتە هاتنە لام وبردمیان بۆلای دۆزەخ دەبینم ئاگری دۆزەخ هەر وەك بیر لولی خواردووە پێچراوەیە وشاخی هەیەو خەڵکێکی تێدا بوو ئەمناسینەوە وهەر لەبەر خۆمەوە دەمووت (أعوذ بالله من النار) پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگر ئەوجا فریشتەیەك هاتە لامان وفەرمووی  ئەوە چارەنووسی تۆنیە منیش خەونەکەم گێڕایەوە بۆ حەفصەی کچی عومەر – خوای لێ ڕازی بێ – وخوشکی عەبدوڵڵا ودایکی ئیمانداران ئەویش گێڕایەوە بۆ پێغەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( نعم الرجل عبد الله لو كان يصلي من الليل ) واتە : باشترین پیاو عەبدوڵڵایە ئەگەر شەو نوێژ بکات ئەوە بوو عەبدوڵڵا دوای ئەوە زۆر بەکەمی شەو دەنووست وزۆربەی کاتەکانی شەوی زیندو دەکردەوە.[٢٢٥] هەروەها نا فع هاو شێوەی ئەمەی گێڕایەوە وتیایدا هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( أن عبد الله رجل صالح ) بە ڕاستی عەبدوڵڵا پیاوی چاکە .

---

[٢٢٥] صحيح رواه البخاري و مسلم

## ٢٢٩.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە گوێ بیستی قورئان خوێندنەکەی زەیدی کوڕی ثابت بوو سەرسام بوو پێی ﴾

زەید یەکێ بووە لە زیرەك وبلیمەتەکان کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە موسڵمان بووەو تەمەنی ئەو کاتە تەنها یازدە ساڵ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ کرد کە فێری زمانی نووسینی جولەکە بێت تا پەیام و نووسراوەکانیان بۆ بخوێنێتەوە ودەیفەرموو ( فإني لا أءمنهم) چونکە من باوەڕیان پێ ناکەم واتە : باوەڕ بە جولەکە ناکەم بۆم بخوێننەوە لە خارجەوە لە باوکیەوە دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنامی بۆ داخلی مەدینە ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە غولامێکە لە ( بني النجار) ولەو قورئانەی بۆ تۆ دابەزیوە حەڤدە سووڕەتی خوێندۆتەوە منیش بۆم خوێندەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی سەرسام بوو فەرمووی : ئەی زەید خۆت فێری نووسینی جولەکە بکە بۆم چونکە لە ڕاستیدا من لێیان بە گومانم پەیامەکانم بنووسن دەڵێت منیش خۆم فێری کردوو پانزە ڕۆژی نەبرد تیایدا کارامە بووم ئەوجا دوای ئەوە ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەیامی بۆیان بناردایە من بۆم دەنووسی.[٢٢٦]

## ٢٣٠.﴿ حارثە ی کوڕی نوعمان دووجار جبریلی بینی لە ژیانی خۆی دا ﴾

حارثە هاوەڵێکی بەڕێزی ئەنصاری خەزرەجی بوو لە بەدر وئەوانی تریشدا بەشدار بووە دیندارێکی باش وکەسێکی زۆر چاکە کار بووە بۆ دایکی وە ئەم هاوەڵە – خوای لێ ڕازی بێ – هەتا جێنشینایەتی معاویە ژیاوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لێ بووە کە لە بەهەشتدا دەوری قورئانی کردۆتەوە وبە دەنگی زوڵاڵ خوێند وویەتی لە عائیشەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( ودخلت الجنة سمعت فيها قراءة , قلت : من هذا ؟ قالوا : حارثة بن النعمان كذاكم البر كذاكم البر ) واتە : چوومە بەهەشت لەوێ گوێم

---

[٢٢٦] رواه البخاري في ( التأريخ كبير) و ابو داود (٣٦٤٥)

لە خوێندنی قورئان بوو پرسیم : ئەمە كێ یە ؟ ووتیان : حاریسەی كوڕی نوعمانە ئا ئەوە چاكەیە ئا ئەوە چاكەیە وئەو لەگەڵ دایكی چاكە كار بوو حاریسە دەگێڕێتەوە دەڵێت : جبریلم لە تەمەنمدا دووجار بینیوە جاری یەكەم لە ڕۆژی (الصورين) جێگایەكە دەكەوێتە بەقیع لە شاری مەدینە كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە دەرەوە بۆ غەزای ( بني قريظة) جبریل – سەلامی خوای لە سەر بێ – لە سەر وێنەی دەحیەی كلبی كە هاوەڵێكی بە ڕێزو جوان چاك بوو جبریل لە شێوەی ئەودا خۆی دەر دەخست بە لاماندا ڕۆیشت وفەرمانی پێ كردین خۆمان ببەستینەوە وچەك هەڵگرین جاری دووەم ڕۆژی دانان وشوێنی جەنازەكان كە لە حونەین گەڕاینەوە من تێپەڕیم دەبینم لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) قسە دەكات من سەلامم نەكرد جبریل – (سەلامی خوای لە سەر بێت ) فەرمووی : ئەمە كێ یە ئەی موحەممەد ؟ فەرمووی : حاریسەی كوڕی نوعمانە فەرمووی : ( أما أنه من المائة الصبارة يوم حنين الذين تكفل الله بأرزاقهم في الجنة , ولو سلم لرددنا عليهم ) واتە : بێ گومان ئەو یەكێكە لەو سەد كەسەی لە ڕۆژی حونەین دا خۆگریان كردو لە گەڵتدا مانەوە ئەمانەی كە خوای پەروەردگار بووە كەفیلی ڕۆزی دانیان لە بەهەشتدا خۆ ئەگەر سەلامی بكردایە وەلاٌمان دەدایەوە هەروەها بە ئیسنادێكی پچڕ پچڕ گێڕاویەتەوە كە حاریسە چاوی بینایی لە دەست داوە بۆیە گوریسێكی لە نێوان جێگای نوێژەكەی و ژوورەكەیدا داناوە بۆ ئەوەی دەستی پێوە بگرێت لەو نێوانەدا وهەروەها بڕێك خورما وشتی تری لە ژوورەكەی داناوە هەر كە هەژارێك سەلامی بكردایە بەشی دەدا ودەستی بە بەنەكەوە دەگرت هەتا دەگەیشتە لای دەرگای ژوورەكەی و دەیدایە دەستی هەژارەكە ماڵ وخێزانەكەی پێیان دەوت كە ئەو كارە بۆ ئەوان دانێت بەلاٌم ئەو دەیوت : گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووە فەرموویەتی : ( مناولة المسكين تقي ميتة السوء ) واتە : بەخشین بە نەداران بە دەستی خۆت دەتپارێزێ لە مردنی خراپ وعاقبەتی خراپ.[٢٢٧]

---

[٢٢٧] ( رواه الطبراني ٣ / ٢٥٨ ).

## ٢٣١.﴿پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگای نەدا ئافرەتەکە نەزرەکەی بەرێتەسەر﴾

عیمرانی کوڕی حوصەین – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت موشریکەکان ووشترە ناسراوەکەی پێغەمبەری خوایان (ﷺ) برد کە ناوی ( عضباء) بوو وەژنی شوانەکەو ماڵاتەکەیان دەستگیر کرد بردیان لەگەڵ خۆیان دەڵێت : ئافرەتەکەیان بەستبۆوە دەستەکانیان شەکەت کردبوو خۆشیان سەر قاڵی لەوەڕاندنی ماڵاتەکانیان بوون لە بەردەم ماڵاکانیاندا شەوێکیان ژنە خۆی کردەوە لە کاتێکدا ئەوان نووستبوون وخۆی گەیاندە لای ووشترەکان کاتێك نزیك دەبۆوە لە هەر کامێکیان بۆ ئەوەی سواری بێت چۆکی دانەدەدا سەرکەشی دەکردو دەیکردە گرمە گرم ئەویش دەستی لێ هەڵدەگرت هەتاکو گەیشتە لای ووشترەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بە ( عضباء) ناسرابوو وشترێکی ڕام کردوو ملکەچ بوو هیچ سەرکەشی لاملی نیشان نەداو دەنگی لێوە نەهات تاکو سەر کەوتە سەر پشتی ئنجا تێی خوڕی وبۆی دەرچوو بەڕاکردن بەر لەوەی بگاتەوە مەدینە پێیان زانی وکەوتنە دوای بەلام دەستەو سان بوون ونەیان توانی دەستگیری بکەنەوە ئافرەتەکەش نەزری کرد ئەگەر خوا ڕزگاری بکات بە هۆی ئەو ووشترەوە ئەوە بیکاتە قوربانی سەری ببڕێت ئەوە بوو ڕزگاری بوو کاتێك گەیشتەوە شاری مەدینەو خەڵکی بینیان ووتیان ئەوە (عضباء)ـە وشترەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئافرەتەکەش وتی من نەزرم کردووە لە سەر خۆم ئەگەر خوا ڕزگارم بکات لەسەری بیکەمە قوربانی وسەری ببڕم ئافرەتەکە بردی بۆ سەر بڕینی خەڵکەکەش نەیان هێشت وڕێگریان لێی کرد وچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنگو باسەکەیان بۆ باس کرد زەردە خەنەیەکی کردو فەرمووی : ( سبحانه الله بئسما جزتها ونذرت ان نجاها الله عليها لتنحرنها لا وفاء لنذر في معصية الله ولا وفاء لنذر فيما لا يملك العبد ) واتە پاك وبێ گەردی بۆ خوا خراپترین پاداشتی دەداتەوە نەزری کردووە ئەگەر خوا ڕزگاری کرد بە هۆیەوە بیکاتە قوربانی نەزریك بەجێ ناهێنرێت سەر پێچی خوای تێدا بێت وە ئەو نەزرەش بەجێ نا هێنرێت لە شتێکدا کە موڵکی خۆی نەبێت ئافرەتەکە هاتە خزمەتی وئەوەیان پێ ڕاگەیاند پێغەمبەریش (صلى الله

علیه وسلم) فەرمووی : ( إنما هي ناقة من إبلي فإرجعي إلى أهلك على بركة الله ) واتە : ئەمو وشترە لە وشترەکانی منە وتۆش لە ژێر فەڕو بەرەکەتی خوادا بگەڕێوە بۆ ناو کەس وکارت [٢٢٨]

## ٢٣٢.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەنجینەیەکی بەهەشتی پیشانی ئەبو موسا دا ﴾

لە ئەبو عەسمانی نەهدیەوە هاتووە کە ئەبو موسای ئەشعەری ووتویەتی : لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووم کاتێ کە نزیك بووەوە لە مەدینە خەڵکەکە بەدەنگی بەرز ( الله اکبر ) یان کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی خەڵکینە ئێوە بانگی کەسێ ناکەن کە نەبیستێ یان غائیب بێت بانگی خوایە دەکەن کە دەنگتان دەبیستێ ودەتانبینێ لە پاشدا فەرمووی ئەی ئەبو موسا هۆشیار بە با ووشەیەکت نیشان بدەم کە یەکێکە لە گەنجینەکانی بەهەشت وتم : ئەو ووشە کامەیە ؟ فەرمووی : ( لا حول ولا قوه إلا بالله ) یە واتە : هیچ گۆڕان وهێزێك نیە مەگەر بە خوای گەورەوە.[٢٢٩]

---

[٢٢٨] أخرجه احمد (٣/٤٣٠) ومسلم (١٦٤١) وابی داود (٣٢٩٢ ، ٣٣١٦) والترمذی (١٥٦٢) وابن ماجه (٢١٢٤) والنسائي (١٩/٧) وابن حبان (٤٣٩٢) وقال محققه : اسناده صحيح وابن هشام (٣/٢٤٠) واللفظ لمسلم والزيادات لاحمد وابن حبان وابن هشام .

[٢٢٩] ( صحيح سنن أبي داود رقم ( ١٥٢٦ ) وصححه الشيخ الألباني .

## ٢٣٣.﴿ پیاوە ئەسەدیەکە کە گوێ بیستی ووتەکەی پێغەمبەر بوو داوای هیچ شتێکی نەکرد ﴾

لە عطائی کوڕی یەسارەوە لە پیاوێکی هۆزی ئەسەدەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی من وخێزانەکەم هاتین بۆ مەدینە لە دەوروبەری (بقیع الغرقد ) دابەزین ( بقیع ) گۆرستانی خەڵکی مەدینەیە ( غرقد ) یش ناوی درەختێکە لەو گۆرستانە هەیە خێزانەکەم پێی وتم : برۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای شتێکی لێ بکە با بیخۆین منیش چووم بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکم بینی داوای لێ دەکرد کە شتێکی بداتێ فەرمووی : هیچم نیە هەتا بتدەمێ پیاوەکە پشتی هەڵکردو تورە بوو دەیوت سوێند بێ ئەوەی بتەوێ پێی دەبەخشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لێم توورەی کە هیچم نیە هەتا بتدەمێ ئەوەی ئۆقیەیە کە چل درهەمی زیوە یان هێندەی هەبێت وسواڵ بکات ئەوە بە زۆر سواڵ دەسێنی لە خەڵك وئیلحاحی کردووە پیاوە ئەسەدیەکە وتی : وتم : وشترەکەم کە شیر دەدات گەلێ چاکترە لە ئۆقیە یە ئۆقیە یە دەکاتە چل درهەمی زیو پیاوە ئەسەدیەکە وتی گەڕامەوە بۆ شوێنەکەی خۆم وداوای هیچ شتێکم لێ نەکرد پاش ماوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) جۆ ومێوژی بۆ هات لەوە بەشیدانین یان وتی : هەتا خوای گەورە دەوڵەمەندی کردین.[٢٣٠]

---

[٢٣٠] ( صحيح سنن أبي داود رقم (١٦٢٧ ) وصححه الشيخ الالباني.

## ٢٢٤.﴿ پیاوە جولەکەکە هەر کە زانی زاوای پێغەمبەری خوایە (ﷺ) دینارەکەو ئاردەکەی بەخشیە ئیمامی عەلی ﴾

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێڕنەوە کە پێشەوا عەلی – رەزای خوای لێ بێ – چوو بۆلای فاتیمەی خێزانی بینی حەسەن وحوسەین دەگرین وتی : ئەوە بۆچی دەگرین ؟ فاتیمە وتی لە برسانا دەگرین عەلی لە ماڵ دەر چوو لە بازاڕ دینارێکی دۆزیەوە هێنایەوە بۆ فاتیمەی خێزانی وپێی ڕاگەیاند کە لە بازار دۆزیومەتەوە وتی : برۆ لای فلانە جوولەکە کە ئاردمان بۆ بێنە ئەویش چوو بۆلای کابرای جوولەکە وبایی دینارەکە ئاردی لێ کڕی جوولەکەکە وتی : تۆ زاوای ئەو کەسەی کە پێی وایە پێغەمبەری خوایە ؟ وتی بەڵێ وتی : ئەوە دینارەکەت و ئاردەکەش بۆ خۆت عەلی هاتەوە بۆلای فاتیمە وهەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە وتی بڕۆ بۆلای فلانە قەساب بایی درهەمێ گۆشتمان بۆ بکڕە چوو بۆلای قەسابەکە ودینارەکەی بە ڕەهن دانا لە جیاتی بایی درهەمێك گۆشتی هێنایەوە بۆ فاتیمە وئەویش شێلای وخستیە سەر ئاگر ناردی بەدوای باوکیدا ئەویش هات بۆلایان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر هاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە جا ئەگەر پێت وا بوو کە حەڵاڵە بۆمان ئەوە لێی دەخۆین وتۆش لەگەڵمان بخۆ لێی فەرمووی : بە ناوی خواوە لێی بخۆن ئەوانیش لێیان خوارد لە جێگەی خۆیاندا نەجوڵابوون غوڵامێك هات بە ناوی خواو ئیسلامەوە بانگەوازی بۆ دینارە ونیووەکەی دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد کە بۆی بانگ بکەن لێی پرسی وتی : لە بازاڕ لێم کەوتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی عەلی بڕۆ بۆلای قەسابەکەو پێی بڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێت دەفەرموێت : دینارێکم بۆ بنێرە دەرهەمەکەت لەسەر من قەسابەکە دینارەکەی بۆ نارد ئەویش دینارەکەی دا بە غوڵامەکە.[٢٣١]

[٢٣١] ( سنن أبي داود رقم ( ١٧١٦ ) وحسنه الشيخ الألباني ).

## ٢٣٥.﴿ کە گوێبیستی ئایەتەکە بوو هۆن هۆن فرمێسك بە چاوە پیرۆزەکانیدا هاتە خوارەوە ﴾

ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودی فەرموو  قورئانم بەسەردا بخوێنە عەبدوڵلاش وتی : ئەی پێغەممبەری خوا (ﷺ) من قورئانم بۆ تۆ بخوێنم لە کاتێکدا قورئان بۆ تۆ دابەزیوە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : پێم خۆشە لە کەسێکی ترەوە گوێی لێ بگرم عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی(النساء) هەتا گەیشتە ئەو فەرمایشتەی کە دەفەرموێت  ( فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيدا )  (النساء / الأية ٤١ )

واتە : ئنجا دەبێت حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێت کاتێك لە هەر میلەتێك شایەتێکمان هێناو تۆشمان هێنا ئەی موحەممەد (ﷺ) بە شایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە کە پەیامی خوات پێڕاگەیاندون پاشان پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموێت  بەسە لێرەدا بوە ستە عەبدوڵلا سەیری پێغەمبەر (ﷺ) دەکات ودەبینێت کە دەگری وهۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارەوە.[٢٣٢]

## ٢٣٦.﴿ عومەری کوڕی خەتتاب زۆر دڵخۆش بوو بە ووتە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ﴾

عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا بچم بۆ عەمرە ئەویش مۆڵەتی پێدام وە فەرمووی : لە بیرمان نەکەیت براکەم لە دووعاکانتدا عومەر دەڵێت  ووتەیەك کە زۆر دڵخۆشی کردم لە دونیا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە بە ئەندازەی هەموو دونیا لام خۆش بوو.[٢٣٣]

---

[٢٣٢] ( متفق عليه ).

[٢٣٣] ( رواه أبو داود ).

## ٢٣٧.﴿ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر پابەند بوو بە ڕێنماییەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

کاتێك کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تێپەڕی بە بەردەمی پێغەمبەرداو جل وبەرگی درێژ بوون پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی جلەکانت بەرز بکەرەوە چونکە نیشانەی سادەیی وخاکی بوونی تیایە درێژی جل وبەرگ نیشانەیە بۆ خۆ بە گەورە گرتن ئیتر عەبدوڵڵا جلەکەی بەرز کردەوە بەڵام هەر درێژ بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی زۆر تر بەرزی بکەرەوە ئیتر عەبدوڵڵا وای کرد بەردەوام گرنگی دەدا بە شۆڕ نەبوونی جل وبەرگی تا خۆی لە خۆیە گەورە گرتن دوور بگرێ یەکێك لە هاوەڵەکانی پێی وت عەبدوڵڵا بۆ کوێ بەرزی دەکەیتەوە ؟ عەبدوڵڵا وتی : بۆ ڕەفایی قاچم.[٢٣٤]

## ٢٣٨.﴿ پیاوەکە گوێ ی لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو پێش ئەوەی خزمەتکارەکە بگاتە لای ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی یەکێك لە هاوەڵانی کرد لەماڵەوە پیاوێك لە هۆزی (بەنی عامر ) بەمەی زانی وویستی بڕواتە ژوور کاتێك پیاوەکە کە لەبەر دەم ماڵی هاوەڵەکەیدا وەستا وتی: ئایە مۆڵەت هەیە بێمە ژوور پێغەمبەر (ﷺ) بە خزمەت کارەکەی فەرموو بچۆ دەرەوە بۆلای ئەو پیاوە فێری مۆڵەت خواستنی بکە وبڵێ با بڵێت سلاوی خواتان لێ بێت ئایە بێمە ژوورەوە ؟ کابرا گوێی لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو پێش ئەوەی خزمەت کارەکە بگاتە لای وتی : سلاوی خواتان لێ بێت ئایە بێمە ژوورەوە ؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) بینی وا مۆڵەت خواستنەکەی تەواو بوو وەفسەکانی بە سلاو دەست پێ کرد مۆڵەتی داو پیاوەکەش هاتە ژوورو بە بینینی پێغەمبەر (ﷺ) شادمان بوو.[٢٣٥]

---

[٢٣٤] رواه المسلم .

[٢٣٥] رواه ابو داود.

## ٢٣٩. ﴿ فریشتەکان سەردانی عمرانی کوڕی حوصەینیان دەکرد ﴾

مطرفي کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت : عمرانی کوڕی حوسەین وتی : شتێکت بۆ باس دەکەم بەڵکو خوا بیکاتە مایەی سوودو قازانج بۆت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەج وعەمرەی پێکەوە گرێ دەدا وڕێگریشی لێ نەکردووە هەتا وەفاتی کردووە وە قورئانیشی لەو بارەیەوە بۆ دانەبەزیوە کە حەرامی بکات هەروەها دەمەوێ پێت بڵێم کەمن هەتا داخ کرام فریشتەکان دەهاتن وسەلامیان لێ دەکردم بەڵام دوای ئەوەی داخ کرام نەهاتنەوە هەتا وازم لە داخ کردن هێنایەوە دووبارە گەڕانەوەو سەلامیان لێ دەکردم.[٢٣٦]

## ٢٤٠.﴿ بەسەر هاتی موسڵمان بوونی جەریری کوڕی عەبدوڵلا لە خزمەتی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ﴾

جەریری کوڕی عەبدوڵلای بجلی پێشەوای خانەدان وجوانچاك ولە (محطان)ە کانەوە لە هاوەڵە هەڵکەو تووەکانە بەیعەتی دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دڵسۆز وئامۆژگاریکەر بێت بۆ هەموو موسڵمانێك ذهبي دەڵێت : لە ڕادە بەدەر جوان بووە لە جوانیدا کامڵ بووە جەریر دەڵێت کاتێ لە مەدینە نزیك بوومەوە چۆکم بە وڵاخەکەم داو تورمکەکەم کردەوە وجل وبەرگی پاك وڕێك وپێکم لێ دەرهێناو لەبەرم کرد پاشان چوومە مزگەوت دەبینم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتار دەدات خەڵکەکە هەموو بەجارێ لە منیان ڕووانی لەوەی لە تەنیشتمدا دانیشتبوو پرسیم : باشە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی منی کردووە وا سەیرم ئەکەن ؟ وتی : بەڵێ بە باشترین شێوە باسی تۆی کرد لە کاتێکدا ووتاری دەدا لە نیوەی ووتارەکەیدا فەرمووی: ( إنه سيدخل عليكم من هذا الفج من خير ذي يمن , الا وان على وجه مسحة ملك ).[٢٣٧]

---

[٢٣٦] رواه المسلم (٦٢٢٦ ، ١٦٧) لە باسی حە ج دا

[٢٣٧] اخرجه احمد في (المسند) (٤ /٣٦٤) ارنائوط سير (٢/٥٣١).

واتە لەم ڕێیەوە کەسێك دێتە لاتان کە لە باشترینی خەڵکی یەمەنەوە ولەسەر دەم وچاوی (مسحة) یەکی فریشتەیی هەیە واتە : دەڵی ی فریشتەیە (مسحة) شوێنەوارێکی کەم بەلاَم بەر چاوو دیارە ئەوجا سوپایی خوام کرد کاتێ جەریر هاتە ژوورەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاخەرەکەی بۆ دانا تا لەسەری دانیشێت بەلاَم جەریر لەسەر زەوی یەکە دانیشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو ( أشهد أنك لا تبغي علوا في الأرض ولا فسادا ) واتە : شایەتی دەدەم بۆت کە تۆ ناتەوێ لەسەر زەوی خراپەکاری بلاَو بکەیتەوە ولە خۆت بایی ببیت ئەویش موسڵمان بوو پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە هاوەلاَنی فەرموو ( إذا أتاكم كريم القوم فأكرموه ) واتە : ئەگەر پیاوێکی بەڕێز هاتە لاتان ڕێزی بگرن لە جەریرەوە دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم ( الا تريحني من ذي الخلصة بيت خضعم ) واتە ناتەوێ ڕاحەتمان کەیت لەو بتە کە ناوی ( بيت خضعم )ە ؟ بە کەعبەی یەمەنی ناسرا بوو دەڵێت : ئێمەش ڕووخاندمان یان سوتاندمان و وەك حوشتری کەڕ وازمان لێ هێناو هاتین تا مژدە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەین پێنج جار بەسەر ئەسپەکەمەوە دابەزیم دەڵێت ئەوجا وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناتوانم بەسەر ئەسپەوە خۆم ڕاگرم ئەویش دەستی موبارەکی لەسەر دەم وچاوم دانا لە ڕیوایەتێکی تردا لەسەر سنگم داناو فەرمووی : ( اللهم اجعله هاديا مهديا )[٢٣٨] واتە ئەی پەروەردگار بیکەرە کەسێکی هیدایەتدار وڕێنمونیکار هەروە ها لە جەریرەوە دەڵێت:

لەو کاتەوە موسڵمان بووم هەرگیز پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی لێم لانەداوە وهەر کات منی بینیبێت لە ڕومدا پێکەنیوە.[٢٣٩]

---

[٢٣٨] صحيح رواه البخاري و مسلم و احمد.

[٢٣٩] صحيح رواه البخاري (٣٨٢٢).

## ٢٤١. ﴿ بەسەرهاتی ئەسمائی کچی یەزید و شاندێکی ئافرەتان لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەنە دایکی عامرو دایکی سەلەمەی ئەنصاری ئەشهەلیە پورزای مەعازی کوڕی جەبەلە ویەکێکە لەوانەی بەیعەتیان داو یەکێکە لە تێکوشەران ئەسما – خوای لێ ڕازی بێ – هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەگەڵ هاوەڵانیدا بوو پێی وت : دایك وباوکم بە قوربانت بن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من نێردراوی کۆمەڵێك لە موسڵمانانم کە هەموویان هەمان قسەی من دەکەن ولەسەر رای منن بێگومانین کە خوا بۆ پیاوان وئافرەتانی ناردوویت وئێمەش باوەڕمان پێ هێنایت وشوێنت کەوتین ئێمەی ئافرەتانیش کە پەیوەست وپەردە نشینین ولە ماڵەکانماندا ماوینەتەوە جێگای ئارەزووی پیاوانین ومنداڵەکانیان بۆ هەڵدەگرین وە پیاوان بە جومعەو نوێژە جەماعەتەکان وئامادەبوون لە کۆڕی جەنازەو خەباتی ڕێ ی خوادا چاکەیان بەسەرماندا دراوە وە کاتێ ئەوان بۆ جیهاد ئەڕۆن ئێمەی ئافرەتان ماڵ وناموسیانمان پاراستووە ومنداڵەکانیانمان بۆ پەروەردە کردوون داخۆ ئێمەش بەشداری پاداشتی ئەوانین ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە هاوەڵانی وفەرمووی : ( هل سمعتم مقالة إمرأة أحسن سؤالا عن دينها من هذه ؟ ) واتە تا ئێستا ووتەی هیچ ئافرەتێکتان گوێ لێ بووە کە بەم باشی یە پرسیار لەسەر دینەکەی بکات ؟ ووتیان : بە ڕاستی وایە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گومانمان نەدەبرد کە ئافرەتێك بەم شێوە دەربڕینە داوای مافی خۆی بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە ئەسماء وفەرمووی : بڕۆ ئەی ئەسماء وبەوانش ڕابگەیەنە کە تۆیان ناردووە پێیان بڵێ کە باشە یان بۆ هاوسەرەکانیان وهەوڵدانیان بۆ ڕازی کردنی وشوێن کەوتنی ویست وفەرمانەکانی هاوسەرەکەی هاوتای هەموو ئەوانەیە کە بۆ پیاوان باست کرد ئەسمائیش بەدەم وتنی (لا إله إلا الله ) و (الله أكبر )ە وە بەخۆشی ئەو موژدەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دان ڕۆیشت لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە وە دەڵێت :- لەگەڵ چەند کەنیزەکێکی هاوتەمەندا بووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دای بە لاماندا وفەرمووی: ( إياكن وكفر المتعمين) واتە : نەکەن

بەخششەکان ونیعمەتەکان ناسوپاس گوزاربن وبەکەم سەیری کەن من لە هەموویان ئازاتربووم بۆ پرسیار کردن لێی وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت ناڕازی بوون ونا شوکری لە بەخششەکان چی یە ؟

فەرمووی : لەوانەیە یەکێکیان ماوەیەکی زۆر بە ڕەبەنی لە ماڵی باوکیدا بمێنێتەوە پاشتر خوا هاوسەرێکی پێ ببەخشێ ولەو هاوسەرە منداڵی پێ ببەخشێ کەچی تووڕە بێت و کوفر بکات و بڵێ : هەرگیز خێرو چاکەم لێ نەدیویت.[٢٤٠]

## ٢٤٢.﴿ عکاشەی کوڕی محصن شکۆمەندی دونیاو قیامەتی بەدەست هێنا ﴾

ئەم پیاوە بەختەوەرە عکاشەی کوڕی محصن شکۆمەندی دونیاو قیامەتی بەدەست هێنا پێغەمبەری خوا (ﷺ) مزدەی پێ داوە کە یەکێکە لەو حەفتا هەزار کەسەی بەبێ لێ پرسینەوە دەچنە بەهەشت لە ئیبن عەبباسەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : نەتەوەکانم پیشان درا تێپەڕ دەبوون دەمبینی پێغەمبەری وا هەبوو چەند کەسێکی لەگەڵ بوو هەبوو هیچ کەسی لەگەڵدا نەبوو تاوەکو ڕە شایی یەکی گەورەم بەسەردا هەڵدرایەوە واتە : کەسانێکی زۆرم بەر چاو کەوت بەهۆی زۆریانەوە وەك پارچەیەك ڕە شی دەر دەکەوتن وتم : ئەمانە کێن ؟ ئوممەتەکەی منن ؟ پێم وترا نەخێر بەڵکو موساو ئوممەتەکەی ئەون پێم وترا سەیری ئەولا بکە دیم ڕەشایی یەك هەموو ئاسۆی داگیر کردوو پێم وترا سەیری ئەملا وئەولا بکە لە پانتایی ئاسماندا دەمبینی لەبەر زۆری خەڵکەکە ئاسمان ڕەش بوو پێم وترا ئەمە ئوممەتی تۆیە ولەوانە حەفتا هەزاریان بەبێ لێ پرسینەوە دەچنە بەهەشت پاشان چووە ژوورەوە هیچی بۆ بەیان نەکرین خەڵکەکەش دوای ئەوەی بڵاوەیان لێ کرد ووتیان : ئێمە لەوانەین چونکە باوەڕمان بەخوا هێناوە وشوێن پێغەمبەرەکەی کەوتووین یان منداڵەکانمان لەوانەن کە لەناو ئیسلامدا هاتوونەتە دنیاوە ئێمە لە جاهیلیە تدا

---

[٢٤٠] صحیح رواه البخاری فی الادب (المفرد) (١٠٤٧) واحمد فی المسند (٣٥٧/٤).

هاتووینەتە دونیا ئەمە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت چووە دەرەوەو فەرمووی (هم الذين لا يسرقون , ولا يتطيرون , ولا يسكتون , وعلى ربهم يتوكلون).

واتە :- بەڵکو ئەوانەن کە دزی ناکەن ورەشبین نابن وهەڵناسن بە داخ کردن بۆ چارەسەر وپشت بە خوای خۆیان دەبەستن عکاشە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لە ناو ئەوانەدا هەم ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەوجا یەکێکی تر لە ناویاندا هەڵسایەوە ئەویش پرسی : ئەی من چی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی ( سبقك بها عكاشه ) واتە عکاشە پێش تۆی دایەوە لەگەیشتن بەوەدا.[٢٤١]

## ٢٤٣.﴿مالیکی کوڕی حویرث ڕەتی کردەووە پێش نوێژی بۆ میوانەکانی بکات﴾

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر داکۆکی دەکرد لەسەر ئەوەی کە هەموو شتێ هەقی خۆی پێ بدرێ وە هەقی پیاو لە ئیسلامدا ئەوەیە کە گەورەی ماڵ بێت وە ئەم بۆی هەیە تەصەرووف بە ماڵ وحاڵەوە بکات هیچ کەس بۆی نیە بچێتە ماڵیەوە تەنها بە مۆڵەتی ئەو نەبێ وە کەس بۆی نیە دانیشێ وە پاڵ کەوێ لە ماڵیا تەنها بە ئیزنی ئەو دەتوانن ئەو کارانە بکەن وکەس بۆی نیە نوێژ بکا لە ماڵیاو ئیمامەت بکا بۆ جەماعەتێ تەنها مەگەر ئەم ئیزنیان بدات پێغەمبەر (ﷺ) بەم شێوەیە هاوەڵانی فێر کردووە ڕۆژێکیان مالکی کوڕی حویرث – خوای لێ ڕازی بێ – کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوو هەندێ هاوەڵی بەڕێز چوونە سەردانی بە میوانی کاتی نوێژ هات هاوەڵان شوێنێکیان کردە شوێنی نوێژ کردن وە قامەتیان کردو داوایان کرد کە مالك پێش نوێژیان بۆ بکات بەڵام مالك ئەمەی ڕەت کردەوە فەرمووی : کەسێك لە خۆتان پێش خەن با نوێژتان بۆ بکات وە بۆتان ڕوون دەکەمەوە کە من بۆ ئەم کارەم نەکرد چونکە بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیفەرموو هەر کاتێ سەردانی شوێنێکتان کرد با ئیمام لە خۆیان بێ.[٢٤٢]

---

[٢٤١] (صحيح أخرجه البخاري كتاب (الطب) (٥٧٠٥) ومسلم والترمذي ).

[٢٤٢] ( رواه أبو داود ).

## ٢٤٤.﴿ ئافرەتەکەی تیرەی بەنی ئەسەد پابەند بوو بە یادی خوا ﴾

ئافرەتێکی تیرەی بەنی ئەسەد دەهاتە لای دایکی موسڵمانان خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران – خوای لێ ڕازی بێ – بۆ بینینی جارێکیان لەلای عائیشە بوو پێغەمبەر (ﷺ) چووە لای عائیشە کە ئەو ئافرەتەی بینی فەرمووی : عائیشە ئەوە کێ یە ؟ عائیشە وتی ئەمە فلأن کەسە کە بە شەو ناخەوێت پاشان ئافرەتەکە ڕۆیشت وعائیشە باسی نوێژو ئارامگری کرد لەسەر خوا پەرستی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لەسەر ئێوە یە ئەوەی لە تواناتان دایە سوێند بەخوا خوای گەورە ماندوو نابێت بەڵکو ئێوە ماندوو دەبن عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – هەواڵیدا کە خۆشەویست ترین دینداری بە لای پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت.[٢٤٣]

## ٢٤٥. ﴿ خوریمی ئەسەدی پابەند بوو بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) ﴾

ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو : خورە یمی ئەسەدی چەند پیاوێکی چاکە ئەگەر قژی زۆر درێژ نەبوایە وجل وبەرگی درێژ نەبوایە خورەیم لەوێ نەبوو هاوەڵان ئەم ووتە جوانەی پێغەمبەریان گەیاندە خورەیم دوای زەمەنێك خورەیم گەڕایەوە وبە قسەکەی پێغەمبەری زانی بە پەلە بڕ ڕێکی ئامادە کردو قژی سەری پێ کورت کردەوە بۆلای گوێی وە قژی پاك وخاوێن کردو دای هێنا وە جلەکانی کورت کردەوە تا ڕەقاپی قاچی لەبەر گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەم هەڵوێستە خورەیم بوو بەو شێوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چەند پیاوی چاکە.[٢٤٤]

---

[٢٤٣] ( متفق عليه ).

[٢٤٤] ( رواه أبو داود ).

## ٢٤٦.﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئامۆژگاری ئەبو بەکر وعومەری کرد لە بارەی شەو نوێژەکانیان ﴾

ئەبو قەتادە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەوێك لە ماڵ دەرچوو بە لای ئەبو بەکردا تێپەڕی خەریکی شەو نوێژ بوو بە دەنگی نزم قورئانی دەخوێند ئەبو قەتادە وتی : بەلای عومەردا تێپەڕی خەریکی شەو نوێژ بوو بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند ئەبو قەتادە وتی : کاتێ کە هەردووکیان لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) کۆبوونەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی ئەبو بەکر بەلاتدا تێپەڕیم شەو نوێژت دەکرد بە دەنگی نزم قورئانت دەخوێند وتی ئەو کەسەی کە من گفتو گۆم لەگەڵی دەکردو ولێی دەپاڕامەوە گوێی لێم بوو ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە پێویست ناکات دەنگم بەرز کەمەوە بە عومەریشی فەرموو  ئەی عومەر بەلاتدا تێپەڕیم شەو نوێژت دەکرد بە دەنگی بەرز قورئانت دەخوێند ڕاوی وتی : عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەو لە چاوی خەواڵوەکان دەتۆرێنم وخەبەریان دەکەمەوە شەیتانیش ڕاودەنێم ودووری دەخەمەوە حەسەن لە فەرموودە کەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو بەکری فەرموو  ئەی ئەبوبەکر کەمێ دەنگت بەرز کەرەوە بە عومەریشی فەرموو : ئەی عومەر تۆش کەمێ دەنگت نزم کەرەوە.[٢٤٥]

[٢٤٥] ( سنن أبو داود رقم (١٣٢٩) وصححه الشيخ الألباني.

## ٢٤٧.﴿ کە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا هاتەوە یادی ئەبو بەکر زۆر بە سەختی گریا ﴾

لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە جارێك ئەبو بەکر تینووی بوو جامێکیان بۆ هێنا کە ئاو هەنگوینی تێدا بوو کاتێ نزیکی کردەوە لەدەمی دەستی کرد بە گریان و ئەوانەی دەوورو بەریشی خستە گریان ئەو بێ دەنگ بوو کەچی ئەوان هەر ئەگریان پاشان دەستی کردەوە بە گریان بە ڕادەیەك خەڵکەکە وایان دەزانی ناتوانن پرسیاری لێ بکەن لە هۆی گریانەکەی پاشان دەم وچاوی سڕی وهاتەوە سەر خۆ پێیان وت : چی یە وەها ئەو گریانە ؟ فەرمووی : جارێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووم دەمبینی بەردەوام شتێکی لە خۆی دوور دەخستەوە ودەیفەرموو : ( وازم لێ بێنە , وازم لێ بێنە) وەمن هیچم نەئەدی وتم : ئەی پێغەمبەری خوا دەبینم شتێك لە خۆت لا ئەدەیت وهیچیشت لەگەڵدا نابینم ؟ فەرمووی : (هذه الدنيا مثلت لي بما فيها فقلت لها إليك عني , فتنحت وقالت أما والله لئن أنفلت مني لا ينفلت مني من بعدك ) واتە : فەرمووی : ئەوە دونیایەو خۆیم بەهەموو شتێکەوە نیشان ئەدات , منیش پێم وت : وازم لێ بێنە ئەویش خۆی لاداو وتی : سوێند بەخوا ئەگەر تۆ لە دەستم دەرچووی ئەوانەی دوای تۆ لە دەستم دەر ناچن ئەبو بەکر وتی منیش ترسام ئەوە دونیا بێت گەیشتبێتە من ئەوە گریاندمی.[٢٤٦]

[٢٤٦] (رواه الحاكم والبزار – وقال العراقي : إسناده جيد.

## ٢٤٨.﴿ هەواڵ دانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەقاو دەق هاتە دی ﴾

لە ئیبن عەباسەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت ئوم فە ضلی کچی حارث بۆی گێڕامەوە وتی : کاتێ تێپەڕ بووم وپێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەردەم دەرگادا بوو فەرمووی : ئەی ئوم فە ضل وتم : بەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( إنك حامل بغلام ) واتە : کوڕێك لە سکت دایە وتم چۆن ؟ لە کاتێکدا قورەیش پەیمانیان بەیەکداوە ژنەکانیان منداڵی نەبێ فەرمووی ( هو ما أقول لك , فإذا وضعتيه فأتيني به ) فەرمووی هەر ئەوەی پێم وتی : وایە جا ئەگەر لێت بووەوو لە دایك بوو بۆم بێنە منیش کاتێ لە داێك بوو هێنام بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش ناوی نا عەبدوڵڵا ولیکی موبارەکی هێنا بە مەلا شوویدا وفەرمووی (إذهبي به فلتجدنه كيسا ) واتە بیبە بە ڕاستی ئەو کەسێکی زاناو بەهرەمەندو لێ هاتووی لێ دەردەچێ , دەڵێ : هاتم بۆلای عەباس وهەواڵەکەم پێ دا ئەویش زەردە خەنەیەکی کردو هەڵساو چوو بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەباس – خوای لێ ڕازی بێ – کە پیاوێکی جوان وچاك وبالا بەرز بووە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پێی کەوت هەڵسایەوە نێو چەوانی ماچ کردو لەلای ڕاستی خۆی داینیشاندو پاشان فەرمووی : ئەمە مامی منە کێش حەز ئەکات بابە مامیەوە بنازێ عەباس هەندێ شتی وت وەك ئەوەی تەریق بێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ولم لا أقول وأنت عمي وبقية أبائي , والعم والد ) واتە : جا بۆچی ئەمە نەڵێم کە تۆ مامی منی وباوانی منی چونکە مام لە جێی باوکە یاخود وەك باوکە.[٢٤٧]

---

[٢٤٧] ئیسنادەکەی حەسەنە تەبەرانی گێڕاویەتیەوە ، هەیسەمی دەڵێت دانە پاڵەکەی حەسەنە ، المجمع ژمارە (١٢٢١٤).

## ٢٤٩.﴿ پێغەمبەر (ﷺ) نزای تەمەن درێژی کرد بۆ دایکی خالید ﴾

جلێکی ئاورێشمی زەردی قۆپچە داریان هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش هەڵیگرت وسەیری کرد پاشان فەرمووی بەوانەی دەوورو بەری کێ دەبینن شیاو بێت ئەم پۆشاکەی بدەینێ ؟ بێدەنگ بوون وکەسیان قسەیان نەکرد ئەنجا فەرمووی دایکی خالیدم بۆ بهێنن کەس وکارەکەی ڕۆیشتن هێنایان ومنداڵێکی بچووکیان لەگەڵ هێنا کە لە خاکی حەبەشە منداڵێکی بوو کاتێك کۆچیان کرد لەگەڵ دایك وباوکی لە ترسی پیرۆزی خۆی پۆشاکەکەی پێدا بە گاڵتەوە پێی فەرموو ئەی دایکی خالید ئەمە چاکەو جوانە ئیتر منداڵەکە بوو بە هاودەمی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەوری پێغەمبەردا دەهات ودەچوو دەستی دەخستە سەر شانی پێغەمبەر (ﷺ) باوکی سەرزەنشتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وازی لێ بێنە وە فەرمووی بە دایکی خالید تەمەنت درێژ بێت وجلەکانت بدڕێنی ئەمە پاڕانەوە بوو بۆ تەمەن درێژی چونکە هەرکەس تەمەنی درێژ بێت جلەکانی دەدڕێنێ.[٢٤٨]

## ٢٥٠. ﴿ ئەبو بەکر هەرکە گوێ بیستی گورانی دوو کچەکە بوو تووڕەبوو ﴾

لە یەکێك لە جەژنەکان دا دوو کچ لای خاتوو عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – گۆرانیان دەوت وبە هۆنراوەی جەنگی ( بعاث) ئەمەش یەکێك بوو لەو جەنگانەی عەرەب لە نەفامیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە ژوورەوە لە جێگاکەی دانیشت وسەیری دوو کچەکەی کرد دواتر ئەبو بەکری صدیق – خوای لێ ڕازی بێ – گوێ لە گۆرانی ئەو دوو کچە گرتوو بە تووڕەیی قسەی لەگەڵدا کرد نکۆڵی لەوە کرد ئەیان وت فەرمووی حوزەلەی شەیتان لای پێغەمبەرخوا ؟ پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو فەرمووی : وازیان لێ بێنە ئنجا ئەبو بەکر – خوای لێ ڕازی بێ – هێواش بووە وعائیشە ئاماژەی کرد بۆ دوو کچەکە هەردووکیان چوونە دەرەوە لەم جەژنەدا خەڵکی حەبەشە یاریان بەلقات وخەنجەر دەکرد کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) زانی عائیشە حەز دەکات یاریەکەیان ببینێ لە دوای خۆیەوە وەستانی بۆ ئەوە بیان بینێ تا تەواو ماندوو بوو سەیری کردن ئنجا چوونە ماڵەوە . . . .[٢٤٩]

---

[٢٤٨] ( أخرجه : البخاري ).

[٢٤٩] ( رواه مسلم ).

## ٢٥١. ﴿ ڕێنمایی یەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﴾

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ڕۆیشت بۆلای خوشکەکەی کە عائیشەیە – خوای لێ ڕازی بێ – هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) قسەیان دەکرد لەگەڵ یەکتردا دوای ماوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە ئەسمائی بینی پۆشاکێکی تەنکی پۆشی بوو هەندێ لاشەی دەرکەو تبوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی قەدەغە کرد چونکە ئەسمائی کچی ئەبو بەکر گەورە بوو بوو سوڕی مانگانەی بینی بوو پێغەمبەر (ﷺ) ویستی ئەسماء ئاگادار بکات لەو هەڵەیەی کە تێی کەوتووە فەرمووی: ئەی ئەسماء ئافرەت کە سوڕی مانگانەی بینی ئیتر ناگونجێ هیچ شوێنێکی ببینرێ جگە لە دەستەکانی و دەم وچاوی نەبێت کە خۆی ئاماژەی کرد بۆ دەست و دەم و چاوی.[٢٥٠]

## ٢٥٢. ﴿ خۆ بەگەورە گرتن ڕەت کردنەوەی ڕاستیە ﴾

پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو لە نێو هاوەڵاندا فێری ڕەوشتێك لە ڕەوشتەکانی ئیسلامی دەکردن تا بەختەوەر بن پێی لە دونیاو قیامەتدا ئەویش ڕەوشتی خۆ بە کەم گرتن بوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون : ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی تۆزێك لەخۆ بە گەورە گرتن لە دڵیدا هەبێت یەکێك لە هاوەڵان ترسا کە ئەو ڕەوشتە چووبێتە دڵیەوە کە گرنگی بە جل وبەرگ دەدات یان نەعلەکانی پرسیاری کرد پیاو پێی خۆشە کە جل وبەرگی جوان بێت یان نەعلەکانی جوان بن ئایە ئەمە خۆ بە گەورە گرتنە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی کردەوە کە گرنگی دان بە جل وبەرگ شتێکی جوانە وخوا پێی خۆشە چونکە خوا جوانە وجوانی خۆش دەوێت حەز دەکات مرۆڤە کان لەسەر شێوەیەکی جوان بن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( خوا جوانە وجوانی پێ خۆشە ) پاشان تێگەیشتنی درووستی بۆ نەخۆشی خۆ بە گەورە گرتن کرد فەرمووی : ( خۆ بە گەورە گرتن و ڕەدکردنەوە ومل کەچ نەکردنە بۆ ڕاستی وە خەڵك بەکەم سەیر کردنە[٢٥١]

---

[٢٥٠] ( رواه أبو داود ).

[٢٥١] ( رواه مسلم ).

## ٢٥٣. ﴿ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بەرتیلی جوولەکەکانی ڕەت کردەوە ﴾

لە سلێمانی کوڕی یەسارەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی نارد بۆ خەیبەر لەوێ لەگەڵ جوولەکەکاندا مامەڵەیەکی بۆ دەخەملاند ن هەڵسان بڕێك خشڵی ئافرەتەکانیان بۆ کۆ کردەوە و ووتیان ئەمە بۆ تۆ وکارەکەمان لەسەر سووك کە فەرمووی : ئەی جوولەکە پنە سوێند بە خوا لە ناو درووست کراوانی خوادا کەس نیە هێندەی ئێوە رقم لێیان بێت بەلاّم ئەمەش وام لێ ناکات نادادی لەگەڵ تاندا بکەم هەروەها بەرتیلیش حەرام ونارەوایە ووتیان : ئا بەمە ئاسمان وزەوی ڕاگیراون.[٢٥٢]

## ٢٥٤. ﴿ حەکیمی کوڕی حزام جل وبەرگی ژی یەزنی بە دیاری برد بۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) ﴾

لە عراکی کوڕی مالیکەوە حەکیمی کوڕی حزام وتی موحەمەد (ﷺ) لە پێش هاتنی ئیسلامدا خۆشە ویسترین کەسم بوو بەلاّم لە پاش ئەوەی پەیامی ئیسلامی بۆ هات وکۆچی کرد بۆ مەدینە حەکیم ئەو وەرزە بە بێ باوەڕی مایەوە پاشان دەبینێ جل وبەرگێکی ذي یەزن کە یەکێکە لە پاشاکانی یەمەن دەفرۆشن چوو کڕی بە پەنجا دینار تا بە دیاری بیداتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە بوو هێنای بۆ مەدینە دای بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دیاری بەلاّم وەری نەگرت عەبدوڵڵا دەڵێت : وەك ئەوەی گوێم لێ بوو فەرمووی : ( إنا لا نقبل من المشركين شيئا , ولكن إن شئت بالثمن ) واتە : ئێمە هیچ شتێك لە موشریکەکان قبوڵ ناکەین بەلاّم ئەگەر ڕازیت ئەوە بەنرخەکەی لێت وەردەگرم دەڵێت : منیش کە زانیم بە دیاری وەری ناگرێ بەنرخەکەی پێم دا،[٢٥٣] هەروەها (طەبەرانی ) لە ڕیوایەتێکدا ئەمەی زیاد کردووە ئەوجا لە بەری کردوو لەسەر بڵند کۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) م بینی لەبەری کرد

---

[٢٥٢] ( سير اعلام النبلاء ) ( ١ - ٢٣٧ ).

[٢٥٣] (رواه احمد (٣/٤٠٢ , ٤٠٣) الحاكم(٣/٤٨٥,٤٨٣) وقال صحيح الاسناد(٢٦٨).

بوون هیچ شتێکی لەو جوانتر نەبوو ئەو ڕۆژە پاشان دای بە ئوسامە وحەکیم بە ئوسامەوە بینی وتی : ئەی ئوسامە ئەلێی کراسەکەی (ذي يزن ) ن لەبەر کردووە ؟ وتی : بەڵێ سوێند بە خوا من لەو باشترم واتە : مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو لە پاشا ( ذي يزن ) باشترە وە وتی : باوکیشم لە باوکی ئەو باشترە حەکیم دەڵێت : منیش چووم بۆ مەککەو بە قسەکانی ئوسامە سەرسامم کردن . .

## ٢٥٥.﴿ عومەر پۆشاکەکەی دا بە برا بێباوەڕەکەی لەبەر جێ بە جێ کردنی فەرمانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

عومەری کوڕی خەتاب – خوای لێ ڕازی بێ – دەڕۆیشت لە بازاڕدا لای فرۆشیارێك پۆشاکێکی جوانی بینی زۆر پێی جوان بوو کڕی وەکو دیاریەك بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ) کە لە بەری بکات کاتێك کە میوانی دێت یان لە ڕۆژی جومعە لەبەری بکات کە پێغەمبەر (ﷺ) بینی زانی کە ئاوریشمە وخوا حەرامی کردووە لەسەر پیاوان فەرمووی : ئەوانەی ئەمە دەپۆشن بەشیان لە قیامەت دا نیە وە ئەو پۆشاکەی دا بە عومەر , عومەر سەری سوڕما وتی : ئەمە چۆن ئەو جلە وەرگرم کە تۆ فەرمووت : کە ئاوریشم حەرامە لەسەر پیاوان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بێگومان بۆیە ناردم بۆلای تۆ تا بیفرۆشی یان بیپۆشی عومەر ڕۆیشت وپۆشاکەکەی دا بە برا بێ باوەڕەکەی لەبەر جێ بە جێ کردنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ).[٢٥٤]

[٢٥٤] (رواه بخاري).

## ٢٥٦.﴿ ئیمانەکەی ( أبو ثە علە بە ی خوشنی ) لێوان لێو بوو لە دڵنیایی ومتمانە ﴾

( دار قطني ) وغەیری ئەویش دەڵێت أبو ثە علە بە ی خوشنی – خوای لێ ڕازی بێ – یەکێکە لەوانەی لە بەیعەتی (رضوان ) دا بەشدار بوون وڕۆژی خەیبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە غەنیمە بەشی ئەویشی جیا کردەوە هەروەها ناردوویەتی بۆلای هۆزەکەی وە عەمری کوڕی جرهەمی برای هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمان بووە،[٢٥٥] کاتێ لە ڕاستی ئەم ئاینە گەیشتبوو موسڵمان بوو دڵنیا بوو لەوەی ئەم ئاینە بۆ هەمیشەیی بە نەمری دەمێنێتەوە وخوای پەروەردگار ئەهلەکەی باڵا دەست دەکات ومنەت وچاکەی خۆی بەسەر چەوساوەکانی سەر زەویدا دەبارێنێ ودەیانکاتە پێشەواو میراتگر لەسەر زەویدا أبو ثە علە بە دەڵێت : هاتم بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێم وت : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بمنێرە بۆ فلاّن جێگا لە شام تا ئەم ئاینەیان پێ ڕاگەیەنین ئەو کاتە هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی نەگەیشتبووە ئەو جێگایانە فەرمووی (ألا تسمعون ما يقول هذا ؟ ) واتە : گوێتان لێ یە ئەم پیاوە چی دەڵێت ؟ ئەبو ثە علە بە وتی : سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دڵنیام کە دەگەینە ئەوێ وتیایدا باڵا دەست دەبین پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەیامی خۆی نووسی وپیایدا ناردی.[٢٥٦]

[٢٥٥] (الاصابة (٢٧٦/٧) ژیانی عەمری کوڕی ئەعلەبەی خوشنی.

[٢٥٦] (صحیح: رواة الامام احمد في {المسند} ١٩٣,١٩٤/٤).

## ٢٥٧. ﴿ بەسەرهاتی عوینەی کوڕی حیصن وئەقرەعی کوڕی حابیس لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

لە سەهلی کوڕی (حنظلة) وە دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی  عوینەی کوڕی حیصن وئەقرەعی گوڕی حابیس هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وداوایان لێ کرد کە شتێکیان بداتێ فەرمانی دا کە بیاندەنێ موعاویە فەرمانی دا نامەی نووسی بۆیان ئەوەی کە داوایان کردووە بیاندەنێ ئەقرەع نامەکەی وەرگرت وپێچایەوە بە عەمامەکە یەوە  ورۆیشت عوینەش نامەکەی وەرگرت وهات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی  ئەی موحەمەد من نازانم ئەم نامەیە چە تێدایە وەك نامەکەی (متلمس) ە ؟

( متلمس ) ی شاعیر بەسەر هاتێکی بە ناو بانگە لەلای عەرەبەکان چووەتە لای یەکێك لە فەرمانڕەواکان وهەجوی کردووە واتە  بە هۆنراوە سەرزەنشتی کردووە ئەویش نامەیەکی بۆ نووسیووە کە بیبات بۆلای یەکێك لە سەرکارەکانی گومانی وا بووە کە خەلآت دەکرێت لە ڕێگادا نامەکە دەکاتەوە دەبینێ نوسراوە هەرکە گەیشتە لات بیکوژە ئەویش نامەکە دەدڕێنێ و بۆی دەردەچێت ئیتر لەو کاتەوە عەرەبەکان ئەو نامەیان کردووە بە پەندو دەیلێنەوە جا موعاویە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای بۆ گێڕایەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ (ئەوەی بەشێ خۆی هەبێ وسواڵ بکات ئەوە داوای ئاگری زیاتر دەکات بۆ خۆی ) نوفەیلی لە جێگایەکی تردا دەڵێت  فەرمووی  ( داوای پشکۆی ئاگری دۆزەخ زیاتر دەکات بۆ خۆی ) ووتیان  ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرۆڤ  چەندی هەبێ بەشی دەکات ؟ نوفەیلی لە جێگایەکی تردا دەڵێت  ( مرۆڤ  چەندی هەبێ بەشی دەکات وئیتر نابێ سواڵ بکات ؟ ) فەرمووی : ئەوەندە ی هەبێ کە بەشی شەو ڕۆژێ تێری لێ بخوات.[٢٥٧]

---

[٢٥٧] (سنن ابي داود رقم الحديث {١٦٢٩} وصححه الشيخ الالباني }.

## ٢٥٨.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مانای هاوەڵیەتی فێری پیاوە ئەنصاریە کە کرد ﴾

ڕۆژێك لە ڕۆژان پێغەمبەر (ﷺ) بە سەفەر چوو کابرایەکی ئەنصاری بوو بە هاوەڵی ڕێگای بە ڕێگەی خۆیاندا دەڕۆشتن هەرکەس بە سواری وولاخی خۆی لە میانەی ڕێگا پێغەمبەر (ﷺ) بە شوێنێکا ڕۆشت هەندێ داری تیادا بوو ڕۆشتە ناو دارەکان دوای ماوەیەك دەرچوو دوو لقی لە دارەکان هێنا یەکێکیان ڕاست بوو یەکێکیان لار بوو , ڕاستەکەیانی دایە هاوەڵەکەی خۆی ئەوی تریانی هەڵگرت هاوەڵەکەی وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ شایان تری بەم پەلە ڕاستەیان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دایەو فەرمووی دەبێت هاوەڵ لە ئامادە باشی وجێ بە جێ کردنی پێویستیاتی هاوەڵەکەیدا بێت ئەنجا فەرمووی وا نی یە فلاّن کەس ؟ هەموو هاوەڵێ کە هاوەڵی یەکێکی تر دەکات ئەوە بەر پرسە لە هاوەڵەکەی ئەگەر هاوەڵەتیەکەیان سەعاتە ڕۆژێکیش بێت.[٢٥٨]

## ٢٥٩. ﴿ ڕێزو ئەدەبی عەبدوڵلاّی کوڕی عەباس بەرامبەر پێغەمبەری خوا بێ ئەندازە بوو﴾

عەبدوڵلاّی کوڕی عەباس – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : لە کۆتایی شەوێکدا هاتم بۆلای پێغەمبەری خواو (ﷺ) لە پشتیەوە نوێژم کرد ئەویش دەستی گرتم وڕایکیشام تا گەیاندمیە لای قاچی واتە : تەنیشت خۆی وکاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە ڕووگە چوومە دواوە وپێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژەکەی کردو کە لێ بوویەوە فەرمووی : چیتە بۆچی دەتخەمە تەنیشت خۆمەوە بەلاّم تۆ ئەچیتەوە دواوە ؟ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەگەر ئەگرێ کەسێك لە تەنیشت تۆوە نوێژ بکات کە پێغەمبەری خوایت وخوا ئەو ڕێزەی بە تۆ بەخشیوە ؟ دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرسام بوو بە قسەکانم ودووعای بۆ کردم کە خوا زیاتر زانست وتێگەیشتنم پێ ببە خشێت.[٢٥٩]

---

[٢٥٨] (رواه الطبراني).

[٢٥٩] هە یە می دەڵێت ئەحمەد گێراویەتیەوە پیاوانی صەحیحن (المجمع) (١٥٥٢٦).

## ٢٦٠.﴿ بەسەرهاتی نەزری ژنە ڕەشە دەف لێدەرەکە لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

بورەیدە – خوای لێ ڕازی بێ – وتی : پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو ڕۆیشت بۆ غەزایەك کە هاتەوە وگەڕایەوە بۆ ماڵەوە کەنیزەکێکی ڕەش هات وتی : ئەی پێغەمبەری خوا نەزرم کردووە ئەگەر خوا بە خێرو خۆشی تۆی هێنایەوە لەم غەزایە لە خزمەتتدا دەف لێ بدەم وگۆرانی بڵێم ؟ پێی فەرموو  ئەگەر نەزرت کردووە لێی بدە ئەگینا مەیکە جا کەنیزەکەکە دەستی کرد بە دەف لێدان جا ئەبو بەکر هات ئەو هەر دەڤ خۆی لێ دەدا لە پاشان عەلی هات ئەو هەر دەڤ خۆی لێ دەدا لە پاشان عوسمان هات ئەو هەر دەڤ خۆی لێ دەدا لە پاشان عومەر هات ئیتر ژنەکە دەفەکەی دانا لە ژێر خۆی دا ولەسەری دانیشت جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی عومەر بە ڕاستی شەیتان لە تۆ دەترسێت من خۆم دانیشتبووم ئەو ژنە هەر دەڤ خۆی لێ دەدا ئەبو بەکر هات ئەو هەر دەڤ خۆی لێ دەدا عەلی هات ئەو هەر دەفی خۆی لێ دەدا عوسمانیش هات ئەو هەر دەڤ خۆی لێ دەدا بەلآم کە تۆ هاتیت ئەی عومەر ئیتر دەفەکەی فڕێ دا.[٢٦٠]

---

[٢٦٠] (رواه الترمذي بسند صحيح).

## ٢٦١. ﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نزای کرد بۆ حوزەیفە ودایکی ﴾

حوزەیفە – خوای لێ ڕازی بێ – وتی دایکم لێی پرسیم له کەیەوە بە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) نەگە یشتووی ؟ وتم له فیسار وەختەوە بە خزمەتی نەگەیشتووم دایکم قسەی پێ وتم پێم وت لێم گەڕێ دەچم بۆ خزمەتی ونوێژی شێوان له گەڵیدا دەکەم وداوای لێ دەکەم کە هەم بۆمن وهەم بۆ تۆ بپاڕێتەوە وداوای لێ خۆشبوونمان بۆ بکات جا چووم ونوێژی شێوانم له پشتیەوە کرد ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) هەر نوێژی تری دەکرد هەتا نوێژی خەوتنانی کرد له پاشان گەڕایەوە منیش شوێنی کەوتم کە گوێی لێ دەنگم بوو فەرمووی : ئەوە کێ یە ؟ حوزەیفەیە ؟ وتم : بەڵێ فەرمووی : چیت دەوێ وداخوازیت چیە ؟ خوا له خۆت وله دایکت خۆش بێت له پاشان فەرمووی : ئا ئەمە فریشتەیەکە یەکەم جارە کە دێ بۆ سەرزەوی رووخسەتی خواستووە له خوا کە بێ بۆلای من وسلاوم لێ بکات وە مزگێنیم بداتێ کە فاتیمە گەورەو سەروەری ئافرەتانی بەهەشتە وە حەسەن وحوسەینیش گەورەو سەروەری هەموو لاوانی بەهەشتن.[٢٦١]

## ٢٦٢. ﴿ پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕووی وەرگێرا له خاوەنی باڵە خانە بەرزەکە ﴾

ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) جارێك چاوی بە باڵە خانەیەکی بەرز کەوت فەرمووی : ئەوە چیە ؟ ووتیان : هی فلانە پیاوی ئەنصاریە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کاتە دەنگی نەکرد بەلام گرتیە دڵ هەتا ڕۆژێ خاوەنی ئەو باڵەخانەیە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ سلاوی لێ کرد پێغەمبەر (ﷺ) پشتی تێکردوو ڕووی لێ وەرگێرا پیاوەکە چەند جارێ وای کرد هەموو جارێك پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی نەدەدایێ جا تێگەیشت کە پێغەمبەر (ﷺ) له بەر شتێك لێی دلگیرە دەچێ سکالای حاڵی خۆی لەلای هەندێ له یاران دەکات ئەوانیش باسی باڵەخانەکەی بۆ دەگێڕنەوە ئەویش دەچێ دەیڕوخێنێ وتەختی دەکا

---

[٢٦١] (رواه الترمذي بسند حسن).

لەگەڵ زەویدا هەتا رۆژێ پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی لەوێوە دەڕوا سەیر دەکات باڵە خانەکە نەماوە کە هۆی ئەوە دەپرسێ دەڵێت خاوەنەکەی کە زانی تۆ لەبەر ئەم باڵە خانەیە ڕووی پێ نادەی ئەویش چوو ڕووخاندی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەی باش باش بزانن کە هەموو خانووێك ئەگەر بۆ ڕەزای خوا نەبێ لە ڕۆژی زیانەوەدا دەبێ بەبارگرانی بۆ خاوەنەکەی بەڵام ئەوەی کە ناچار دەبێ بۆ رەزامەندی خوا بێ ئەوە قەینا کات واتە ئەوەی کە بە پێی کات وشوێن بوونی پێویست بێ ئەوە قەیدی نیە.[٢٦٢]

## ٢٦٣ ﴿ بەسەرهاتی ئەو هاوەڵەی کە سکاڵای کرد لە برایەکەی لە خزمەتی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ﴾

ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – وتی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دوو برا هەبوون یەکێکیان دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە خزمەتیدا فێری زانست وزانیاری ئاین دەبوو ئەوی تریشیان کارو کەسابەتی دەکردو خۆیشی وبراکەیشی بەخێو دەکرد ئیشکەرەکەیان لەلای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵای لە دەست براکەی کرد کە گوایە ئیش وکاری بۆ گوزەرانی خۆی ناکات فەرمووی : رێ ی تێ دەچێ کە خوا لەبەر خاتری ئەو رزق وڕۆزی تۆیش بدا کەواتە گلەیی لێ مەکە.[٢٦٣]

---

[٢٦٢] (رواه ابو داود بسند صالح).

[٢٦٣] (رواه الترمذي بسند صحيح).

## ٢٦٤. ﴿ بەسەرهاتی شووشە زێڕەکەی ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) ﴾

عوقبە – ڕەزای خوای لێ بێ – وتی  لە مەدینە جارێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی عە سری بۆ کردین کە سڵاوی دایەوە بە پەلە هەستاو چوو بۆ ماڵی یەکێك لە هاوسەرەکانی لە پاشان گەڕایەوە وکە هاتەوە تەماشای ڕووی خەڵکەکەی کرد ڕوانی خەڵکەکە سەیریان دێ لەم پەلە کردنەی  فەرمووی  ئەوە بۆیە وام کرد چونکە لە ناو نوێژەکەدا بیرم کەوتەوە کە شووشەیەك زێڕمان لەلا هەیە جا حەزم نەکرد لە ماڵی مندا ئێوارەی بەسەردابێ یان فەرمووی شەوی بەسەردا بێ وە لە ماڵەوە پێم وتن کە دابەشی بکەن بەسەر هەژاران دا لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا لە ماڵەوە شووشەیەك زێر کە هی زەکات بوو مابوو حەزم نەکرد کە ئەم شەو لە ماڵی مندا بمێنێ.[٢٦٤]

## ٢٦٥. ﴿ بەسەرهاتی نەزرەکەی ئەبو ئیسرائیل ﴾

ئیبن عەبباس – خوای لێ ڕازی بێ- وتی : جارێك پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری دەدا پیاوێکی بینی لەبەر هەتاوەکە راوە ستا بوو پرسی بۆچی ئەو پیاوە وا ڕەق ڕاوەستاوە ؟ عەرزیان کرد ئەوە ئەبو ئیسرائیلە نەزری کردووە بە پێوە لەبەر خۆر ڕەق ڕاوەستێ ودانەنیشێ ونەچێتە بەر سێبەر وقسە نەکاو لە هەمان کاتدا بە ڕۆژویش بێ فەرمووی : فەرمانی پێ بکە ولە زمانی منەوە پێی بڵێ : کە قسە بکا و بچێتە بەر سێبەر و دانیشێ بەڵام ڕۆژوەکەی تەواو بکات.[٢٦٥]

---

[٢٦٤] أخرجه: البخاري {٨٥١}.

[٢٦٥] أخرجه: البخاري{٦٧٠٤}.

## ٢٦٦.﴿ عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل پەیوەندی پچڕاند لەگەڵ خزمەکەی ﴾

ئەبو سەعید عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل – ڕەزای خوای لێ بێ – وتی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پەلە پیتکە هاویشتنی نەدەدا دەیفەرموو : ئەمە نە نێچیری پێ دەکوژرێ ونە دوژمنی پێ کۆڵەوار دەکرێ وەلێ ڕێ دەکەوێ دەدا لە چاوی بێ تاوانێك کوێری دەکات یا دەدا لە ددانی دۆستێك وبە ناهەق دەیشکێنێ دیارە شتێکیش کە هەر زیانی ڕووت بێ زۆر ناپەسەندە.[٢٦٦]

لە گێڕانەوەیەکی تردا خزمێکی ئیبنو موغەففەل پەلە پیتکەی دەهاوێشت ئەویش قەدەغەی لێ کردو وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پەلە پیتکەی هاوێشتنی نەدەدا دەیفەرموو : شتی وا ڕاوی پێ ناکرێ بەڵام خزمەکەی دوو بارە تێ هەڵچووەوە ودەستی کردەوە بە پەلە پیتکە وەشاندن عەبدوڵڵایش تووڕە بوو وتی من پێت دەڵێم کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی شتی وا نادا کەچی دوو بارە پەلە پیتکە فڕێ دەدەی کەوا بوو ببڕای ببڕ قسەت لەگەڵ ناکەم .

## ٢٦٧. ﴿ کە فەرمانەکەی پێغەمبەری پێگەیشت پیاوە نەخۆشەکە هەموو تفاقەکەی خۆی دایە ئەسلەمیەکە ﴾

ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – وتی: لاوێکی ئەسلەمی وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من دەمەوێ بچم بۆ غەزا وەلێ هیچ کەرەستەیەکم نیە کە خۆی پێ ڕێك بخەم فەرمووی : برۆ بۆلای فلانە پیاو ئەو خۆی ئامادە کرد بوو تفاقی ڕێك خستبوو بەڵام نەخۆش کەوتووە وناچێ لاوەکە چوو بۆلای ووتی پێغەمبەر (ﷺ) سلاوت لێ دەکات ودەفەرمووی : تفاقەکەی خۆت بدەی بەمن پیاوەکەش بەژنەکەی خۆی وت کچێ ئەو تفاقەی کە بۆ خۆمم ئامادە کردبوو گشتی بێنەو بیدە بەمە وە هیچی لێ گل مەدەرەوە سا بەو خوایە هەرچی لەو تفاقە گل بدەیتەوە بۆ خۆمان خێری لێ نابینین.[٢٦٧]

---

[٢٦٦] (أخرجه: البخاري {٦٢٢٠} ومسلم {١٩٥٤}.

[٢٦٧] (رواه مسلم {١٨٩٤}.

## ٢٦٨.﴿ ئوبەی كوڕی كەعب دەستی كرد بە گریان لە خۆشی ئەوەی كە خوای گەورە ڕێزی لێ ناوە ﴾

ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – وتی : پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوبەی كوڕی كەعبی فەرموو خوای گەورە وسەروەر فەرمانی پێ كردووم كە سوورەتی (لم یكن الذین كفروا)ت لەلا بخوێنم ئوبەی وتی خوا بۆ خۆی ناوی منی هێنا بۆت ؟ فەرمووی بەڵێ ئیتر ئوبەی لە خۆشی ئەوەی كە خوا ئەو دەستی قەدرو ڕێزەی لێناوە دەستی كرد بە گریان.[٢٦٨]

## ٢٦٩.﴿ عەبدوڵلای كوڕی عەمر ئاواتە خواز بوو مۆڵەتەكەی پێغەمبەری خوای قبووڵبكردایە ﴾

لە عەبدوڵلای كوڕی عەمرەوە دەڵێت : باوكم ئافرەتێكی قوڕەیشی بۆ مارە كردم ئەوە بوو كاتێ هاتە ژوورەوە بۆلام دەبینم تاقەتم نیە بچم بە دەوریدا بەهۆی كۆشش و ووزەی زۆر كە لە پەرستشی وەك نوێژ وڕۆژو وبە كاری دێنم پاشان عەمری كوڕی عاصی باوكی هات بۆلای بووكەكەی وپرسی : هاوسەرەكەت چۆن دەبینی ؟ وتی : باشترین پیاوە یان باشترین هاوسەرە لە ناو ئەو پیاوانەدا كە بە هیچ جۆرێ نەهاتوون بە دەوری ئافرەتانیان دا ولێیان نزیك نەبوونەتەوە دەڵێت : باوكیشم هات بۆم ولێم تووڕەبوو وتی ئافرەتێكی خاوەن پلەو پایەی قوڕەیشم بۆمارە كردووی تا پشتی تێ بكەیت و سارد و سڕبی لەگەڵیدا ؟ دەڵێت : پاشان بەرەو لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو بۆ سكالاَ كردن لێم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بە دوامداو فەرمووی : ( أتصوم النهار؟ ) واتە : بە ڕۆژوو دەبیت ؟ وتم : بەڵێ فەرمووی : شەو نوێژ دەكەی ؟ وتم : بەڵێ فەرمووی : (ولكن أصوم وأفطر , وأصلي وأنام , وألمس النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني ) واتە بەلاَم من هەندێ جار بە ڕۆژوو دەبم وهەندێ جاریش بە ڕۆژوو نابم وە شەو نوێژیش دەكەم ودەشخەوم وەماقی خێزانەكانیشم دەدەم بەوەی

---

[٢٦٨] أخرجه: البخاري {٣٨٠٩} ومسلم {٧٩٩}.

خۆمیان لێ دوور نەخەمەوە هەر کەسیش لە سوننەتی من لابدات ئەوە لەمن نیە فەرمووی : ( أقرأ القران من كل شهر ) واتە قورئان لە هەموو مانگێکدا خەتم بکە وتم : توانای لەوە زیاترم هەیە فەرمووی : ( فأقرأ في كل عشرة أيام ) دەی لە دە ڕۆژ جارێکدا خەتمی کە وتم توانای زیاتر لەوەشم هەیە فەرمووی ( فأقرأه في كل ثلاث ) واتە دەی لە ماوەی سێ ڕۆژدا خەتمی کە وپاشان فەرمووی : ( صم في كل شهر ثلاثة أيام ) واتە : لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بە وتم : لەوە زیاتریش ئەتوانم دەڵێت : بەردەوام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە گەڵمدا هات تا فەرمووی : ( صم يوما وأفطر يوما افضل الصيام و هو صيام أخي داود ) واتە : ڕۆژێ نا ڕۆژێ بە ڕۆژوو بە وئەوە باشترین بە ڕۆژوو بوونە وداودی برایشم هەر بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبوو پاشان فەرمووی : ( فإن لكل عابد شرة , ولكل شرة فترة , فأما الى سنة واما الى بدعة فمن كانت فترته الى سنة فقد اهتدى , ومن كانت فترته الى غير ذلك فقد هلك ).[٢٦٩]

واتە هەر عابیدێك گوڕجو گۆڵی وسەرگەرمی یەکی تیایەو هەر سەرگەرمیەکیش یان خواستێك کاتێکی تیایە مرۆڤ لەشی خاوە ئەو ماوەیە یان بەرەو سوونەتی دەبات یان بەرەو بیدعە لەبەر ئەوە هەر کەسێ ماوەی ووچان وسستی یەکەی بەرەو سوونەتی بەرێت ئەوە ڕێنموونی کراوە وئەوەشی بەرەو بیدعەی بەرێت ئەوە تیاچووە وە ئەم پیاوە گەورەو عابیدە بەڕێزە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر- خوای لێ ڕازی بێ – کاتێ چوو بە ساڵدا دەیفەرموو: خۆزگە ئەو دەرفەت ومۆڵەتانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دابووم وبۆی خستمە ڕوو قبەڵم بکردایە. . .[٢٧٠]

---

[٢٦٩] (صحيح: ابی عاصم گێراویتیەوە, وە ابن حبان لە صەحیحەکەیدا}.

[٢٧٠] (صحيح بخاری٤/١٨٩,١٩١) وە بڕوانە سير اعلام النبلاء ٣/٨٤).

## ٢٧٠. ﴿ ئوم شورەیك لە ئاسمانەوە سەتڵێك ئاوی بۆهات ﴾

ئوم شورەیك خاتوو غوزەییەی کچی جابری کوڕی حەکیمی دۆسی یە زۆربەی زانایان دەڵێن : ئەو ئافرەتە بوو کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد وئوم شورەیك شووی نەکرد هەتا وەفاتی کرد ئیبن عەباس دەڵێت : ئیسلام کەوتە دڵی ئوم شورەیك وهەر لە مەککە موسڵمان بوو لەو کاتەدا هاوسەری ( أبی العسکری دوسی ) بوو پاشان بە نهێنی دەچووە لای ئافرەتانی قورەیش وهانی ئەدان بۆ لای ئیسلام تاوەکو لای ئەهلی مەککە ئاشکرا بوو برديان وپێیان وت : ئەگەر لەبەر خاتری هۆزەکەت نەبوایە وەهاو وەها مان لێ ئەکردی بەڵام ئەتگێڕینەوە بۆلای هۆزەکەت دەڵێت : پاشان خستمیانە سەر پشتی وشترێك بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەسەر پشتی وشترەکەوە هەبێت پاشان سێ ڕۆژ بەو جۆرە بەجێیان هێشتم بەبێ ئەوەی نان و نە ئاوم پێ بدەن وە کاتێ لە جێ یەك دابەزین منیان لەبەر خۆردا ئەبەستەوە وخۆشیان ئەچوونە سێبەرێك و نان و ئاویان لێ بڕیبووم ئەوە بوو لە کاتێکدا کە لە جێیەك دابەزیبوون ومنیان لەبەر خۆرەکە دابەستبووە وەهەستم بە ساردی یەك کرد کەوتە سەر سنگم دەبینم سەتڵێك ئاوە گرتم وبڕێکم لێ خواردەوە پاشان لە دەستم وەرگیرایەوە وبەرز کرایەوە پاشان گەڕایەوە و گرتم ودیسان لێم خواردەوە وبەرز کرایەوە وچەند جارێك ئەمە دوو پات بوویەوە تا تێر ئاو بووم ونەوەی تیایدا مایەوە کردم بە سەر لەش وجلەکانمدا ئەوە بوو کە بە خەبەر هاتن و شوێنەواری ئاویان پێوە بینیم حاڵم باش بوو پێیان وتم : خۆت بەرداوە و لە ئاوەکەی ئێمەت خواردۆتەوە ؟ وتم  نە بەخوا شتەکە بەو جۆرە بوو کە بۆتان باس دەکەم ووتیان  ئەگەر ڕاست بڵێیت ئەوا ئاینەکەی تۆ باشترە لە ئاینەکەی ئێمە ئەوە بوو کە سەیری ئاوەکەی خۆیانیان کرد هیچی لێ کەم نەبوو بوو هەر لەوێدا موسڵمان بوون.[٢٧١]

---

[٢٧١] (صفه الصفوه(٢/٣٧/٣٨).

## ٢٧١.﴿ پرسیارەکەی ئوم سەلەمە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی درێژی پۆشاکی ئافرەتان ﴾

ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە هاوەڵەکانی کە جل وبەرگ کورت بکەنەوە تا هۆکاری خۆ بەکەم گرتنی پێوە دیار بێت وترساندنی لە درێژی جل وبەرگ فەرمووی : هەر کەس جل وبەرگی درێژ لەبەر بکات بۆ خۆ بە گەورە گرتن وفیزو خۆ نواندن خوا لە ڕۆژی دواییدا سەیری ناکات ئوم سەلەمە وویستی پرسیار لە حوکمی درێژی پۆشاکی ئافرەتان بکات وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئافرەتان چی بکەن لە درێژی پۆشاکیان ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی با بستێك بۆ پۆشاکیان تەواوە ئوم سەلەمە وتی کەواتە قاچیان دەردەکەوێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دەی با پۆشاکەکە درێژ بکەنەوە باڵێك کە نزیکەی شەست سانتیمەتر با زیاتر نەبێت.[٢٧٢]

## ٢٧٢. ﴿ ئافرەتێك بەسەر وولاخێکەوە ڕاچەڵەکی لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ﴾

ئیبن عەباس – ڕەزای خوای لێ بێ – دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕەوحا کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا گەیشت بە کۆمەڵە سوارێك سەلامی لێ کردن وفەرمووی : ئێوە لە کام هۆزن ؟ ووتیان : لە هۆزی موسڵمانانین ووتیان ئەی ئێوە کێن ؟ ئەوانەی کە لە خزمەتیدا بوون ووتیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئافرەتێك بەسەر وولاخێکەوە ڕاچەڵەکی لەو شوێنەدا کە وەك کەژاوە وایە بەلاَم سەقفی نیە پەلی منداڵێکی گرت وهێنایە دەرەوە وتی : ئەی پێ غەمبەری خوا (ﷺ) ئایە ئەم منداڵە حەجی بوو دەبێ ؟ فەرمووی : بەڵێ بۆ تۆش پاداشتی هەیە . . .[٢٧٣]

---

[٢٧٢] (رواه الترمذي).

[٢٧٣] (سنن ابو داود رقم (١٧٣٦) وصححه الشيخ الالباني.

## ٢٧٣.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنەکەی بەجی گەیاند بۆ عەبدوڵلاّ ی کوڕی ئەبو لحەمسائە ﴾

صەحابەیەك مە ناوی عەبدوڵلاّی کوڕی ئەبو لحە مسائە یە بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت : لە پێش ئەوەدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکرێ بە پێغەمبەری شتێکم لێ کری هەندێ لە بەهاکەی لە سەرم مابوو نەمدابوویە وە عدو بەڵێنم دایە کە لە فلاّن شوێندا لە فلاّن ڕۆژدا لەو کاتەدا ئەوەی کە لەلام ماوە تەسلیمی بکەم بەلاّم بەهۆی مەشغەڵی بەشتی ترەوە وەعدەکەی خۆم لە بیر چۆوە پاش سێ شەو ئەمجا بیرم کەوتەوە کەمن وەعدەم داوە کە بچم ئەو پلرەیە بۆ موحەمەد (ﷺ) ببەم خۆ ئەو لەوێ چاوەڕێم دەکات بۆیە بە پەلە ڕۆیشتم بۆ شوێنە دیاری کراوەکە تەماشا دەکەم وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ یە هێشتا هەر چاوەڕێی من دەکات بە تەریقیەوە چوومە خزمەتی وعەرزم کرد : ئەوە خۆمن وەعدەکەی خۆم لەبیر چوو بۆوە ئەی جەنابت لە کەیەوە لێرە وە ستاوی ؟ وامزانی ئەو ڕۆژە کە هاتوومو من نەهاتووم ڕۆیشتۆتەوە وئێستا سەری لێرە داوەتەوە بزانێ نامبینێ بەلاّم پێغەمبەری خوا فەرمووی : { یا فتی لقد شققت علي أنا هنا منذ ثلاث أنتظرك }.[٢٧٤]

واتە : - فەرمووی : ئەی کوڕی لاو بە ڕاستی تووشی سەغڵەتی زەحمەتت کردم ئەمە سێ شەوە من لێرە چاوەڕوانت دەکەم .

---

[٢٧٤] ( رواه أبو داود ).

## ٢٧٤.﴿ بەسەرهاتی کلیلی دەرگای کەعبە وبنەماڵەی { بەنی عبد الدار } ﴾

لە زەمانی پێش ئیسلامدا کلیلی دەرگای کەعبەی پیرۆز بە دەست تایەفەی {بەنی عبدالدار}ە وە بوو کاتێکیش خوای گەورە موحەمەدی (ﷺ) کرد بە پێغەمبەر لەو کاتەدا کلیلی کەعبە بە دەست کابرایەکەوە بوو ناوی ( عوسمانی کوڕی تەلحە) بوو کە لە هۆزی (بەنی عبد دار ) بوو ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە تەنیشت کەعبە دانیشتبوو چاوی لێ بوو وا چەند کەسێك لەگەورە پیاوان وناودارانی قوڕەیش وا چوونە لای ( عوسمانی کوڕی تەلحە) و ئەویش دەرگاکەی کەعبەی بۆ کردنەوە چوونە ژوورەوە پێغەمبەری خواش بە خێرایی چوو بۆلای عوسمان وفەرمووی : - ئەی عوسمان ئایە ڕێگام دەدەی منیش بچمە ژوورەوەی کەعبەی پیرۆز ؟ عوسمان بە زمانێکی ڕەق وزبر وەڵامی دایەوە وتی : نەخێر ڕێگا بۆ هەموو کەس هەیە تەنها بۆ تۆ نەبێ پێغەمبەری خوا هیچ خۆی تووڕە نەکرد بەڵکو بە نەرمیەکەوە فەرمووی : (يا عثمان لعل يوما يأتي يكون المفتاح معي ولا أعطيه لك )

واتە : ئەی عوسمان دونیا هەر وانابێ ڕەنگە ڕۆژێك بێتە پێشەوە من دەسەڵات پەیدا بکەم وتۆ بێدە سەڵات بکەوی وکلیلی ئەم کەعبەیە لای من بێت وتۆ داوای بکەی ومنیش نەت دەمێ . عوسمانی کوڕی تەلحە بە لە خۆبایی بوون وگاڵتە جاریەوە وتی : - { إن جاء ذلك اليوم فبطن الأرض خير لي من ظهرها }

واتە : - دە هەرکاتێ ئەو ڕۆژە هات ئەی موحەممەد کە تۆ کلیلی کەعبەت بکەوێتە دەست و من چاوەڕێی دەستی تۆبم ئەوە ئەو کاتە ناوسکی زەوی وقەبر بۆمن باشترە تا ئەوەی لەسەر زەوی بژیم بەڵێ ئەو ووتوێژە لە نێوانیاندا ڕوویدا و لە یەکتری دوور کەوتنەوە ڕۆژگار هات و چوو ڕۆژان ڕۆژیان لە دوایە ئیسلام هێزو دەسەڵاتی پەیدا کردو پێغەمبەری خوا (ﷺ) شاری مەککەی فەتح کردو لە بت وبتپەرستان پاکی کردەوە خەڵکی مەککە چەند کەسێکی کەمی نەبێ هەموویان موسڵمان بوون یەکێ لەوانە عوسمانی کوڕی تەلحە پێغەمبەری خوا چووە لای کەعبەوە و چاوی بە عوسمان کەوت و فەرمووی : ئەی عوسمان کوا کلیلەکەی کەعبە ؟

عوسمان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا کلیلەکەی کەعبە لەماڵەوە دامناوە لای دایکم بچم بیهێنمە خزمەتت ؟ فەرمووی : برۆ بیهێنە عوسمان چووە ماڵەوە بە دایکی وت دایە گیان کلیلەکە کانی کەعبەم بدەیە پێغەمبەری خوا داوای دەکات دایکی وتی : ها رۆڵە گیان ئەوە ئەو رۆژەیە کە پێغەمبەری خوا پێی وتی رۆژێك دێ کلیلی کەعبە دەست من دەکەوێ وتۆ چاوەڕێی دەستی من دەکەی عوسمان وتی دایە واز لەو قسانە بێنە خێرا کلیلەکەم بدەیە پێغەمبەری خوا چاوەڕێمە وموشتاقە بۆ چوونە ناو کەعبەوە تا لە بت پاکی بکاتەوە دایکی وتی : دە برۆ وا کلیلەکان لە ناو جلو بەرگە دانراوەکەمدا یە بەڵێ تا عەسمان کلیلەکەی دۆزیەوە ماوەیەکی پێچوو وکەمێ دوا کەوت پێغەمبەری خوا فەرمووی عوسمان دوا کەوت ونەهاتەوە ئەی عومەری کوڕی خەتتاب بچۆ بۆ ماڵی عوسمان کلیلەکەی لێ وەربگرە وبەپەلە بۆم بێنە ئیمامی عومەر چوو بۆماڵی عوسمانی کوڕی تەلحە ولە دەرگای دا وفەرمووی ئەی عوسمان کوا کلیلەکە ؟ لەو کاتەدا دایکی عوسمان هەستاو خێرا کلیلەکەی هێناو دایە دەست ئیمامی عومەر چونکە دەیزانی عومەر نەرم ونیانی نیە بەرامبەر کەسێك کە سەر پێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا بکات ئیمامی عومەر کلیلەکەی وەرگرت وعوسمانی کوڕی تەلحەش بە شوێنیدا هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) کلیلەکانی لێ وەرگرت وڕووی کردە عوسمان وفەرمووی : { يا عثمان أتذكر يوم قلت لك : لعلي أخذه منك فلا أعطيه لك } دەستدا بێ وتۆش چاوەڕێی ئەوە بکەی بیدەمەوە دەستت بەڵام نەتدەمەوە ئایە لە بیرتە ؟ عوسمانی کوڕی تەلحە بێدەنگ بوو تەریق بۆوە لە شەرمان سەری دانەواند لەو کاتەدا عەباسی مامی پێغەمبەر هات وفەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا دەرگای کەعبە بکەوە وکلیلەکان بدە دەست من با لەمەودوا بە دەست بنەماڵەی ( عەبدولموتەلیبەوە ) بێ کلیلەکان مەدەوە دەست عوسمانی کوڕی تەڵحە بەڵام ئەوە پێغەمبەری خوایە زۆر لەوە گەورەترە کە تۆڵە لە کەس بکاتەوە وئەمانەت تەسلیمی خاوەنەکەی نەکاتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە داوای کلیلەکەی لە عوسمان کردو پاشان ئیمامی عومەری نارد مەبەستی ئەوە بوو کە دوای کردنەوەی دەرگای کەعبە تەسلیمی بکاتەوە بۆیە ئەو بەڵێنەی کە لە ناو دڵی خۆیدا دابووی کە کلیلەکە بداتەوە بە عوسمانی کوڕی تەلحە هەر چەندە بە زووبانیش نەیوتبوو هەر لە بیری بوو فەرمووی : {

لا يا عباس إنه يوم بر ووفاء يوم بر ووفاء } . دوو جار لەسەر يەك فەرمووى :- نا نا ئەى عەباس نابێ دەست بە سەر كليلەكانى كەعبەدا بگرم ولە عوسمانى بستێنم وبيدەم بە تۆ چونكە ئەمڕۆ ڕۆژى چاكە كردن و وە فادارى يە بەرامبەر بە بەڵێن وپەيمان .ئێمە وەعدو بەڵێنمان دا بە خەڵكى مەككە كە ژيان وبيرو باوەڕو ماڵ و سامانيان پارێزراوە وكەس دەستيان بۆ درێژ ناكات يەكێ لەوانەى بەر ئەو پەيمان وبەڵێنە دەكەوێ عوسمانە كە كليلەكان هەر لاى خۆى وبنە ماڵەكەى بێ ئيتر چۆن بەڵێن بشكێنم وكليلەكەى نەدەمەوە پاشان بانگى عوسمانى كوڕى تەلحەى كرد ولە بەر چاوى هەموو صەحابەكان فەرمووى :- { خذها يا بني عبد الدار خالدة معكم لا يأخذها منكم إلا ظالم }.[٢٧٥] واتە : - وەرن ئەى بەنى (عبد الدار) كليلەكانى كەعبە وەربگرن وهەتا هەتايە لاى ئێوە دەبێ وهيچ كەس دەست درێژيتان ناكاتە سەر وكليلەكانتان لێ ناسەنێ ئەو كەسە نەبێ كە زاڵم وستەمكارە وخراپەكارە بەم شێوەيە كليلەكانى كەعبەى دايەوە دەست عوسمانى كوڕى تەلحە وهەتا ڕۆژى ئەمڕۆش كليلى كەعبەى پيرۆز هەر لاى بنەماڵەى (عبد الدار ) ە وهيچ مەليك وسەركردەيەك بۆى نيە بچێتە ناو كەعبەوە بە ئيزن ورەزامەندى ئەو بنەماڵەيە نەبێ وەكو وەفايەك بۆ ئەو عەهدو بەڵێنەى كە كاتى خۆى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) پێى دان .

---

[٢٧٥] (رواه الطبراني ).

## ٢٧٥.﴿وەفاداری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرامبەر خێزانەکەی خەدیجە - خوای لێ رازی بێ﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) شاری مەککەی پیرۆزی فەتح کردو وئاواتی لە مێژینەی هاتە دی‌و ئیسلام رەگی داکوتاو وە بت وبتخانەکان لە ناو بران وخەڵکی پۆل پۆل دێنە ناو ئاینی خوای گەورەوە بە راستی رۆژیکی بێوێنە بوو لە مێژووی ئیسلامدا پێغەمبەری خوا زۆر سەرقاڵ و مەشغوڵە هەموو کەس دەیەوێ قسەی لەگەڵدا بکات داوا کاری خۆی پێش کەش بکات ئا لەم جەوە ناسکە دا لەم هەموو کاروبارە گرنگە دا چاوی بە پیرە ژنێکی پشت چەماوەی دەست بە گۆچان کەوت پێغەمبەری خوا وازی لە هەموو خەڵکەکە هێنا بەرەو رووی پیرە ژنەکە رۆیشت ودەستی گرت وهێنای لای خۆیەوە دانیشاند وعەبای موبارەکی خۆی بۆ راخست ماوەی یەك سەعات زیاتر گوێی لە قسەی پیرە ژنەکە گرت لەو کاتەدا یەکێ لەو هەموو کەسانەی کە ئەم رەفتارەی پێغەمبەری خوا سەرنجی راکێشا کە لەم وەختە ناسکەدا وا پێغەمبەری خوا ئەو هەموو کاتەی خۆی لەگەڵ ئەو پیرە ژنەدا بەسەر بردو عەبای خۆی بۆ راخست عائیشەی خێزانی فەرمووی : - ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیرە ژنە کێ بوو وا رێزت گرت وئەوەندە لەگەڵیدا دوای ؟ پێغەمبەر (ﷺ) کە چاوەکانی پڕ ببوو لە فرمێسك فەرمووی - { إنها صاحبة خديجة كانت تأتينا أيام خديجة } . واتە :- فەرمووی ئەی عائیشە ئەوە یەکێ بوو لە دۆستەکانی خەد یجە خاتوونی خێزانم ئەم پیرە ژنە خەد یجەی زۆر خۆشدە وویست وبەر دەوام سەردانی دەکردین عائیشە وتی :- ئەی پێغەمبەری خوا زیاتر لە سەعاتێك لەگەڵ ئەو پیرە ژنەدا دانیشتبووی ئەوە باسی چیتان دەکرد ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :- { كنا نتذكر الأيام الخوالي } واتە :- ئەی عائیشە باسی ئەو رۆژگارە شیرین وپڕ خۆشیەمان دەکرد کە کاتی خۆی خەد یجە لە ژیاندا بوو زۆر بەخۆشی ژیانم لەگەڵدا گوزەراند بە راستی باشترین و وەفادارترین هاوسەر بوو عائیشە – رەزای خوای لێ بێ – غیرە گرتی وبە تووڕەییەکەوە بە پێغەمبەری خوای فەرموو :- ئەوە چیە دیسان باسی ئەو پیرە ژنەت کردەوە کە خەد یجە یە کە گڵ رزاندوویەتی لە گۆڕەکەیدا لە

کاتێك دا خوای گەورە لەو باشتری پێ بەخشیووی مەبەستی لە خۆی بوو کە ئەم کچەو ئەو بێوەژن بوو ئەم گەنجە وئەو کاتی خۆی لە پێغەمبەر بە تەمەنتر بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك وەفادارترین هاوسەر بۆ خێزانی خۆی فەرمووی :- { لا والله ما أبدلني الله من هي خير منها وستني حين منعني الناس أمنت بي حين كذبني الناس }

واتە نەخێر ئەی عائیشە نەبە خوا خوای گەورە کەسی لە خەد یجە باشتر پێ نەبەخشیبووم چونکە خەدی جە ئەو کەسە وەفادارە بوو کە کاتێ خەڵکی ماڵ وسامانی خۆیان لێ قەدەغە کردم ئەو هەموو ماڵ وسەروەتەکەی خۆی بە قوربانی من و دینەکەم کرد وە لەو کاتەدا خەڵکی بڕوایان پێ نە دەهێنام وبە درۆیان دەخستمەوە کە دەموت پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوام لەو کاتەدا یەکەم کەس کە ئیمانی پێ هێنام خەد یجە بوو بە ڕاستی ئەوە وەفاداریە ئەوە بەڵێن وپەیمان بردنە سەرە کە هاوسەر بە هاوسەری خۆی بدات دەزانن کەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوا وەسفی خەدیجەی کرد ؟ لە کاتێکدا بوو کە چواردە ساڵ بوو خەدیجە وەفاتی کرد بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) چواردە ساڵ بوو لە خەدیجە دابڕابوو چەند ژنی تری هێنابوو عائیشەی کچی ئەبو بەکری صدیقی هاوسەری بوو کەچی وەفادار بوو بەرامبەر خەدیجە وهەرگیز لە بیری نەدەچۆوە.[٢٧٦]

---

[٢٧٦] ( دین وژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە ٦١٦ – ٦١٧ ).

## ٢٧٦. ﴿ بەهەشتی لێ حەرام کرا چونکە خۆی کوشت ﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی کەسێك دەگێڕێتەوە کە لە نەتەوەکانی پێشوودا بووە لە شەڕێکدا بریندار دەبێ ئازاری برینەکە زۆری بۆ دێنێ بۆیە چەقۆیەك دێنێ ودەمارێکی قۆڵی خۆی دەبڕێ تا وەکو ئەوەندەی خوێن لێ دێت دەمرێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە دەربارەی ئەو کەسە کە ئاوا خۆی کوشت فەرمووی :- عەبدەکەم پەلەی کرد وئارامی نەگرت بە مردنی خۆی بمرێ خۆی کوشت منیش بەهەشتم لێ حەرام کرد.[٢٧٧]

## ٢٧٧. ﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزای کرد بۆ پیاوەکە کە دەستەکانی جوان بێتەوە ﴾

موسلیم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە جابیرەوە – ڕەزای خوای لێ بێ – دەگێڕێتەوە ودەڵێت :- پیاوێکی بە ناو بانگ وناودار وزمان ڕەوان کە ناوی (طفيل إبن عمر الدوسي) بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لوتف بکەی و ڕەزامەندی بفەرمووی خۆت ویارانت لە زوڵم وستەمی خزمە نادان ونەفامەکانت ڕزگار بکەیت ومەککە بەجێ بێڵی وکۆچ بکەی بۆ وولاتی ئێمە ئەوا بۆت دەبین بە قەڵای پۆڵایین وشوورای ئاسنین وهەمووومان خۆمان بە قوربانی خۆت ودینەکەت دەکەین بەڵام پێغەمبەری خوا قبووڵی نەکرد کە کۆچ بکا بۆ ئەوێ چونکە خوای گەورە ئەو سەر بەرزی وشانازی ودەستی خێر لێنانەی هەڵگرتبوو بۆ یاریدەدەرەکانی مەدینەو کردی بە خەڵاتی ئەوان جا کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەی مونەوەرە توفەیل وپیاوێك لە هۆزەکەی هەردووکیان نیشتیمان و وولاتی خۆیان بەجێ هێشت وکۆچیان کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ شاری مەدینەی پیرۆز وەلەوێ پیاوەکە نەخۆش کەوت ونوقرەی لێ بڕوا لە تاوی ئازاری لەشی بە دەمە تیرێکی پانکۆڵە جەمسەری پەنجەکانی دەستی خۆی بڕییەوە ئیتر هەردوو دەستی

---

[٢٧٧] ( رواه البخاري والمسلم ).

برینداز بوون وخوێنیان بەربوو وە خوێنەکەیان نەوەستایەوە هەتا مرد پاش ماوەیەك توفەیل ئەم خزمە مردووەی خۆی لە خەودا دەبینێ تەماشا دەکا شێوەی دەم وچاوی زۆر جوانە وڕووی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە بەڵام هەردوو دەستی خۆی داپۆشیوە وەکو ئەوەی کە ناشرین بن ونەیەوێ کەس چاوی پێیان بکەوێ توفەیل لە خەوەکەیدا بە خزمەکەی دەڵێ فلأن کەس خۆ دەزانم تۆ مردووی ودوونیات بەجێ هێشتووە باشە پێم بڵێ خوای گەورە چۆن بوو لەگەڵت دا ؟

کابراش دەڵێ : بە بەرەکەتی کۆچ کردنم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا کەلە خۆشەویستی ئەو زاتە ماڵ وحاڵ ونیشتیمان وقەومم بەجێ هێشت لە پاداشتی ئەوەدا خوای گەورە لێم خۆش بوو توفەیل دەڵێ ئەی باشە دەبینم هەردوو دەستی خۆتت داپۆشیوە ئەوە بۆچی دەریان ناخەی ؟

ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ : ئەی توفەیل خۆت ئاگاداری کە وەختێ ئازاری زۆری بۆ هێنام لە تاوی لەشم بەو دەمە تیرە سەری پەنجەکانی خۆمم بریندار کرد هەر چەندە من بۆیەم وانە کرد کە پێی بمرم بەڵام ئەوە بوو تووشی خوێن بەربوون بووم ومردم جا لە لایەن خواوە پێم ووترا بە هۆی خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەری خوا کۆچ کردنت بۆ خزمەتی لە هەموو گوناهێکت خۆش بووم بەڵام ئەوەی کە بە دەستی خۆت خراپت کردووە لە لەشی خۆت کە دەستەکانی خۆتن چاکی ناکەینەوە بۆت بەڵێ بۆ بەیانی توفەیل دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا وخەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ ئەم خەوە ڕاستە وپاشان فەرمووی (اللهم وليديه فأغفر) واتە: ئەی خوای گەورەمان لە دەستەکانیشی خۆش بە ئەوانیشی بۆ جوان بکە .

## ٢٨٧.﴿ئامۆژگاریە ناوادارو گرنگەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پیاوێکی دڵ رەق﴾

صەحابی بەرێز ئەبی دەرداء (رەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت جارێکیان کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر شەکوای حاڵی خۆی کرد کە دڵی رەقە وهەر چەند قورئانی بۆ بخوێندرێتەوە وبیر لە مردن وقەبر وقیامەت بکاتەوە دڵی نەرم نابیٚ ودڵی رەقە عەرزی پێغەمبەری کرد ئایە چی بکات ؟پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر حەز دەکەیت دڵت نەرم بێت و بەپێویستی وئاواتی دڵی خۆت بگەیت ئەوا (إرحم اليتيم, وإمسح رأسه, وأطعمه من طعامك, يلين قلبك, وتدرك حاجتك ).[٢٧٨] واتە : بەزەییت بە هەتیودا بێتەوە ودەست بە سەریدا بهێنە ولە خواردنی خۆتی دەر خوارد بدە بەوە دڵت نەرم دەبێت وبە ئاواتی دڵی خۆت دەگەی .

## ٢٧٩.﴿ ئافرەتێك بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوو لەبەر خاتری دوو کچەکانی ﴾

دایکی ئیمانداران عائیشە – رەزای خوای لێبێت – بۆمان دەگێرێتەوە ودەڵێت : رۆژێکیان لە ژوورەکەی خۆمدا لە ماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دانیشتبووم لەو کاتەدا ژنێکی هەژار لە دەرگای ژوورەکەمی داو کە دەرگام لیٚ کردەوە تەماشام کرد دوو کچۆڵەی لەگەڵ دا بوو نیشانەی برسیەتی بە دەم وچاویانەوە دە خوێندرایەوە بۆیە دایکەکەیان داوای لێکردم کە شتێکیان پیٚ بدەم بیخۆن منیش هەموو ژوورو ماڵکەم گەڕام تەنها سیٚ دەنکە خورمام دۆزیەوە سیٚ دەنکە خۆرماکەم دایە دەست ژنەکە وئەویش یەکی دەنکیٚ خورمای دایە کچەکانی وهەر خێرا خواردیان وقووتیان داو ئەم دایکە کە ئاگری برسیەتی تینی بۆ هێنا بوو دەنکە خورماکەی کە بەر خۆی کەوتبوو بردی بۆ دەمی بۆ ئەوەی کەمێك لەو برسیەتیەی بێتە خوارەوە بەڵام هەردوو کچەکەی داوایان لیٚ کرد کە دەنکە خورماکەی خۆی بدات بەوان ئافرەتەکەش دەنکە

---

[٢٧٨] ( رواه الطبراني وصححه الالباني ).

خورماکەی خۆشی کە خەریك بوو بیخوات کردی بە دوو کەرتەوە ودای بەوان وبۆ خۆی هیچی نەخوارد عائیشە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : ئەم کارەی ئەو ئافرەتە بێومژنەم بۆ ئەو دوو کچۆڵە هەتیوانەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام وکارەکەی زۆر لام پەسەند بوو زۆر بە دڵم بوو لەبەر ئەوە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەوە بۆ ماڵەوە بۆم گێڕایەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (إن الله قد أوجب لها بها الجنة , أو اعتقها بها من النار).[279] واتە خوای گەورە لەبەر خاتری ئەو دوو کچە بەهەشتی بۆ دایکەکەیان مسۆگەر کردووە یان فەرمووی خوای گەورە بە هۆی چاکە کردن و خزمەت کردنی ئەو دوو کچۆڵە یەوە ئەو دایکەیان لە ئاگری دۆزەخ ئازاد دەکات .

## ٢٨٠.﴿ نیەتی دڵ لە کارو کەسابەتدایە ﴾

کەعبی کوڕی عومرە –ڕەزای خوای لێ بێ – بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت : ڕۆژێکیان کە کۆمەڵێ هاوەڵ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا دانیشتبوون ئا لەو لەو کاتەدا گەنجێکی زۆر جوان وڕێك وپێك بە بەردەمیاندا هات و سەلامی کرد زۆر لەش سووکانە دەهات ودەچوو شتی دەکڕی ودەفرۆشت وکەل وپەلی باردەکردو دادەگرت صەحابەکان ڕوویان کردە پێغەمبەری خۆشەویست و ووتیان : (لو کان هذا في سبيل الله) واتە : خۆزگایە ماندوو بوونی ئەو کوڕە گەنجە کە ئاوا بۆ کارو کاسپی لەشی سووکە بە هەڵمەتە ودانیشتن نازانێ خۆزگە بۆ خوا بوایە ولە ڕێگای خوادا ئاوا تێکۆشەر بوایە چونکە صەحابەکان وا حاڵی بوو بوون کارو کاسپی کردن با حەلاڵیش بێ هەر پەیوەندی بە دونیاو ژیانی دونیاوە هەیە وهیچ پاداشێك بۆ کاسپ کار لای خۆی دانانێ جا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونە هەڵەیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی دانەوە وفەرمووی ئەی صەحابەکان ئەی هەموو موسڵمانان دەی بزانن ئا ئەم گەنجە ڕوح سووکە لەش سووکە کاسبە (إن كان خرج يسعى على ولده صيغارا فهو في سبيل الله) .

---

[279] ( رواه مسلم ).

واتە : ئەم کوڕە کاسبە ئەگەر بۆیە ئاوا هەڵپە دەکا وئەملاو ئەولا دەکاو نازانێ دانیشێ مەبەستی لەم کاسبی کردنەی ئەوە بێ کە ئەگەر منداڵی بچووکی هەبێ منداڵە بچووکەکانی کە چاوەڕێی دەستی ئەم باوکەیانن ئێوارە شتێکیان بۆ بەرێتەوە وتێریان بکاو پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکاو ماڵ ومنداڵی چاو لە دەست ودەمی دەرو دراوسێ وخەڵك نەبن ئەگەر بەم نیەتەوە کاسپی بکات ئەوا هەموو هەنگاوێکی بە چاکەیەك بۆ دەنووسرێ وپاداشتی وەکو ئەو کەسانەیە کە لە پێناوی خوادا تێدە کۆشن، (وإن كان خرج يسعى على أبوين شيخين كبيرين فهو في سبيل الله).

واتە : هەروەها ئەگەر ئەم کوڕە گەنجە لەم کاسپی وهاتوو چۆیەیدا مەبەستی ئەوە بێ کە باوك ودایکی پیرو پەککەوتەی کەلای ئەمن وبەخێویان دەکاو ناهێڵێ موحتاج بن ورووت ورەجاڵی ونەداری پیریان پێوە دیار بێ ئەگەر بەم نیەتەوە کاسپی بکا ئەوە ئەو کارو کەسابەتەی بە تێکۆشان لە ڕێی خوادا بۆ حیساب دەکرێ دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (وإن كان خرج يسعى على نفسه يعفها فهو في سبيل الله).

واتە : ئەگەر ئەم کوڕە گەنجە بەیانی کە لە ماڵ دێتە دەرەوە بەو نیەتەوە بێتە ئەم بازارەوە وئاوا خۆی هیلاك دەکا بۆ ئەوەی کە پێویستیەکانی ژیانی خۆی دابین بکاو تووشی دەست پانکردنەوە لەم ولەو نەبێ وخەڵکی نەڵێن بەرەڵایە وبە خۆڕایی دەسووڕێتەوە بۆ ئا ئەم مەبەستە کاسپی بکات ئەوە هەر بە جیهاد بۆی حیسابە وخوا پاداشتی گەورەی دەداتەوە بەڵام (وإن كان خرج يسعى رياء ومفاخرة فهو في سبيل الشيطان).[٢٨٠]

واتە ئەگەر ئەم کوڕە کاسپە مەبەستی لەم کاسپی کردن وپارە پەیدا کردنەیدا هەر ئەوەبێ کە خۆی دەوڵەمەند بکاو وپاشان بە ماڵ وسامانەکەی فیزو دەعیە بکا بەسەر خەڵکیدا ئەوە بۆ ڕێگای شەیتانە وخوا لێی ڕازی نابێ کە واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە چوار نیەتی دڵ لە کاروکاسپیدا بۆ سیانیان فەرمووی ئەو کاسپیە بەخوا پەرستی حسابە بە مەرجێك واجبە دینییەکانی لەسەر نەفەوتێنێ ئەمجا بەشی چوارەمی بە بەشی شەیتان دانا .

[٢٨٠] ( رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح ).

## ٢٨١. ﴿ ئیمامی عەلی ئیشی بۆ پیرە ژنێك كرد بە شازدە دەنك خورما ﴾

ڕۆژێكیان ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) چوو ئیشی بۆ پیرە ژنێك كرد ئیشەكەش ئەوە بوو ئاوی بۆ لە بیر دەردەهێنا بەلام دۆلچەكە كە زۆر گەورە بوو زۆری ئاو دەگرت وقورس بوو پەتەكەش زۆر زبرو ناخۆش بوو بۆیە دەستی ئیمامی عەلی سوور ببۆوە وقلش قلش بوو كاتێ لە ئاو هەلكێشانەكە بۆوە وە پیرە ژنەكە شازدە دەنكە خورمای دایە ئیمامی عەلی لە ڕێگای ماڵەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی ئیمامی عەلی بوو كە تەوقەی لەگەڵدا كردو سەیری دەستی كرد وا سوور بۆتەوە وئاوساوە فەرمووی ئەی عەلی ئەوە بەچی وات لێ هاتووە ؟ ئیمامی عەلی فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ئاوم هەڵكێشاو شازدە دەنكە خورمام وەرگرت پێغەمبەری خوا فەرمووی : دەبێنە با منیش لەو خورما پاك وحەلاڵەی بە دەستت هێناوە بخۆم جا ئیمامی عەلی لەو بارەوە دەفەرمووی :

لحمل الصخر على قمم الجبال أحب إلي من منن الرجال

يقول الناس لي في الكسب عار فقلت العار في ذل السؤال

واتە هەلگرتنی بەردی گەورە وهێنانە خوارەوەی بە پشت لەسەر شاخی بەرزەوە بە لامەوە خۆشترە لەوەی كەمنەت باری خەڵكی بم وچاو لە دەستیان بم خەڵكی پێم دەڵێن كە لە هەندێ كارو كاسپیدا عەیب وعار هەیە وخەڵكی بە چاوی سووك سەیری دەكەن بەلام من دەڵێم : عەیبە وكەم وكوڕی ئەوەیە كە ئینسان دەست لە خەڵكی پان بكاتەوە ودوور كەوێتەوە لە كارو كاسپی حەلاڵ وبە هۆی سواڵ كردن وپاڕانەوە لە خەڵكیەوە تووشی زەلیلی ببێ.[٢٨١]

---

[٢٨١] ( دین وژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەكانی (رب العالمین) لاپەرە ٤٩٩ ).

## ٢٨٢.﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئامۆژگاری میوە فرۆشێك دەكات ﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر گرنگی دەدا بەوەی کە لە کاتی فرۆشتنی میوە وهەر کەلو پەلێکدا دیوی دەرەوەو ناوەوەی وەکو یەك بێت وەکو جارێکیان پێغەمبەری خوا بەلای کابرایەکدا ڕۆیشت کە خواردەمەنی ومیوەی دەفرۆشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (صاحب الطعام أسفل هذا مثل أعلاء ؟ فقال نعم یا رسول الله ) فەرمووی : ئەی خاوەنی ئەو خۆراکە وفرۆشیاری ئەو میوەیە ئایە ژێرەوەی ئەو خۆراکە ومیوەیەش وەکو سەرەوەکەی وایە ؟ کابرا وتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی دەی بزانن وئاگادار بن (من غش المسلمین فلیس منهم) واتە هەر کەسێك فێڵ وغەش لە موسڵمانان بکات ولە کاتی کڕین وفرۆشتندا دەستیان ببڕێ وخراپیان بە چاك پێ بفرۆشێ ئەوە لە کۆمەڵی موسڵمانان حیساب نیە.[٢٨٢]

## ٢٨٣.﴿ دادپەروەری پێغەمبەر ( ﷺ ) لە دانەوەی قەرزدا ﴾

خەولە کچی قەیس خێزانی سەرکردەی شەهیدانی ئیسلام حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب – ڕەزای خوای لێ بێت – بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت کابرایەك لە بەنی ساعیدە هەندێ خورمای بە قەرز بە پێغەمبەری خوادا بوو دوای تەواو بوونی ماوەی قەرزەکە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای قەرزەکەی کردەوە پێغەمبەری خواش فەرمانی کرد بە پیاوێك لە یاریدەدەرانی مەدینەیی کە بچێ خورماکە بداتەوە بە خاوەنی خورماکە بەڵێ کابرا لەگەڵ خاوەن قەرزەکەدا ڕۆیشت وبردیە ئەو شوێنەی کە خورمای لێبوو خورماکەی بۆ کێشاو دایەوە بە کابرای خاوەن خورما تەماشای کرد ئەم خورمایە وەکو خورماکەی خۆی باش نیە وبە دڵی نەبوو بۆیە وتی : من ئەم خورما خراپە لە جیاتی خورما چاکەکەی خۆم کە کاتی خۆی بە قەرز داومە بە پێغەمبەری خوا وەری ناگرمەوە وخورمای باشم دەوێ کابرای مەدینەیی وتی :

[٢٨٢] ( رواه الطبراني في الكبير والأوسط ).

(أترد علی رسول الله ؟ ) ئەوە تۆ شت بەسەر پێغەمبەری خوا دادە یەوە ؟ کابرا وتی : (نعم ومن أحق بالعدل من رسول الله )بەڵێ شتی خراپ لە جیاتی شتی باش وەرناگرمەوە ونامەوێ باشە چ کەسێك لایەق ترە بەوەی کە بە دادپەروەری هەقی خاوەن ماف بداتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ بەم شێوەیە هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو بەسەر هاتەکەیان بۆ گێرایەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو چاوی پیرۆزی پڕ بوو لە فرمێسکی خۆشی وفەرمووی (صدق ومن أحق بالعدل مني لا قدس الله أمة لا يأخذ ضعيفها حقه من شديدها ولا يتعتقه ) واتە ئەم کابرا خاوەن هەقە ڕاست دەکات ئایە چ کەسێك لە من لایەقترە بۆ ئەوەی کە مافی خەڵکی بە داد پەروەری بداتەوە ؟ خوای گەورە ئەو گەل ومیللەتە بە رزناگاتەوە وخۆشی ناوێن لە کاتێکدا کە هەژار وبێ دەسەڵات وبێکەسیان نەتوانێ داوای مافی خۆی لە دەسەڵاتدا بکات وهەقی خۆی بە تەواوی لێ وەربگرێتەوە ئەمجا فەرمووی: ئەی خەولەی کچی قەیس کە ئامۆژنمی برۆ خورمایەکی زۆر باشی بدەوە ئەو خورمایەی بدەوە کە دڵی پێی ڕازی دەبێ چونکە (فإنه ليس من غريم يخرج من عند غريمه راضيا إلا صلت عليه دواب الأرض ونون البحار, وليس من عبد يلوي غريمه وهو يجد إلا كتب الله عليه في كل يوم وليلة إثما) واتە : هەر کاتێ خاوەن قەرز لە کاتی دیاریکراوی قەرز وەرگرتنەوەدا چوو بۆ لای قەرزارەکە وئەویش بو ڕووی گەش ودڵی فراوانەوە هەر وەکو یەکەم جار کە قەرزەکەی وەرگرتبوو ئاوا بە ڕوو خۆشیەوە قەرزەکەی دایەوەو دڵی خاوەن قەرزەکەی ڕازیکرد ئەوە زیندەوەرانی سەر زەوی وماسی دەریاکان دووعای خێری بۆ دەکەن وهەر قەرزدارێ لە کاتی دیاریکراوی دانەوەی قەرزەکەدا توانای هەبوو پارەو ماڵەکەی لەبەر دەستدا بوو بەلاچم ئامادە نەبوو قەرزەکە بداتەوە تا وەکو خاوەن قەرزەکە بێ ئومێد بوو لەوەرگرتنەوەی چونکە هەر ئەمرۆ سبەی پێ کرد بوو ئەوا بە هەموو شەوو ڕۆژێك کە ئەم قەرزدارە بەناڕەوا دەست بەسەر ئەو ماڵەدا دەگرێ خوا تاوانێکی لەسەر دەنوسێ.[٢٨٣]

---

[٢٨٣] (دین وژین لە ژێر ڕۆشنایی راسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە – ٥٧٠ –

## ٢٨٤. ﴿ ڕاست کۆیی لە قسەدا درووشمی مرۆڤی بڕواداره ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی عامیر (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت : ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ماڵی ئێمەدا دانیشت بوو لەو کاتەدا من منداڵ بووم لە دەرەوەی ماڵ یاریم دەکرد دایکم بانگی کردم وە فەرمووی (هیا تعال أعطيك) ڕۆڵە گیان وەرەوە شتێکت دەدەمێ ؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی (ما أردت أن تعطيه ؟ )نیازت وایە چی بدەیتێ ؟ دایکم وتی خورمای دەدەمێ خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی (أما إنك لو لم تعطه شيئاً كتبت عليك كذبة) ئەگەر هیچت نەدابایە بە درۆیەکت لەسەر دەنووسرا.[٢٨٤]

## ٢٨٥.﴿ ڕێنمایی یەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ پیاوێکی ئەنصاری بوو بەمایەی خێرو بەرەکەت ﴾

ئیمام ئەبو حەنیفە – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە موسنەدەکەیدا لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە – ڕەزای خوای لێ بێت – دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە ئەنصاریەکان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا چەند ساڵێکە ژنم هەیە تا ئێستا خوا منداڵی پێ نەبەخشوین وهیچ منداڵمان نیە ئەی پێغەمبەری خوا بەهۆی ئەوەوە دڵی خۆم وخێزانم زۆر تەنگە باشە چی بکەین ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (فأين أنت من كثرة الإستغفار وكثرة الصدقة ترزق بها )واتە: باشە تۆ فلان کەس لەگەڵ زۆر داوای لێبوردن کردن لە خوا (أستغفر الله) و وتنی ئەو زیکرە هەروەها خێرات کردن وبەخشینی ماڵدا چۆنی تا بەهۆی ئەوەوە خوا منداڵت پێ ببەخشێ ؟ واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) کابرای ڕێنموونی کرد بۆ دوو شت :

**یەکەم** : زۆر زیکری (استغفر الله) بکات

**دووەم** : بە پێی تواناو دەسەڵاتی مادیی خۆی لە خێرو خێرات کردن درێغی نەکات .

بەڵێ کابرا دوای ئەوە زۆر خێری دەکرد ویارمەتی هەژارو نەدارانی دەدا وبەردەوام زیکری پیرۆزی (استغفر الله)ی دەکرد , جابر – خوای لێ ڕازی بێت – دەڵێت : دوای ئەوە ئەو کابرایەم بینی یەوە خوای گەورە نۆ کوڕی پێ بەخشی .

---

[٢٨٤] (دین وژین لە ژێر رۆشنایی راسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە (٦١٣).

## ٢٨٦.﴿ ئافرەتێکی تەلاَقدراو لە خزمەتی پێغەمبەر دا (ﷺ) سکالاَی کرد لە دژی مێردەکەی ﴾

عەبدوڵلاَی کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم بەسەر هاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە ودەڵێت :

(إن أمرأة قالت  يا رسول الله, إن إبني هذا كان بطني له وعاء, وثدني له سقاء, وحجري له حواء, وإن أباه طلقني, وأراد أن ينتزعه مني, فقال رسول الله (ﷺ) أنت أحق به مالم تنكحي).[285]

واتە  ژنێکی تەلاَقدراو هاتە خزمەتی پێغەمبەر وعەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕە بچکۆلەی کە لە باوەشمدایە پێش ئەوەی کە لە دایك ببێ سکم بۆی کیسە بووە نۆ مانگ بە چەرمی سکم هەڵمگرتووە دوای لە دایك بوونیشی مەمکم کوندە ناوی ئەو بووە وە باوەشم یاتاغ وڕاخەری ئەو بووە وتیاخەوتووە وئیسراحەتی کردووە ئیستا باوکی منی تەلاَق داوە ودەیەوێ لە منی وەربگرێتەوە بەخوا نازانم لە تاوی ئەم جگەر گۆشەیەم چی بکەم ئایا دەتوانێ لێم بستێنێتەوە و بیباتەوە بۆلاَی خۆی ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی  تۆ مافت زیاترە کە منداڵەکەت لابێ و بۆ خۆت بەخێوی بکەی تا ئەو کاتەی شوو بە پیاوێکی تر دەکەی .

---

[285] (رواه أبو داود وأحمد وصححه الحاكم ).

## ٢٨٧.﴿کە گوێ بیستی بەسەر هاتی پیاوەکە بوو پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گریا﴾

سەر دەمی بەختەوەریەو رۆژی زێرینی ئیسلام بەسەر زەویدا بلاَوبۆتەوە صەحابەکان لە مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) لە خزمەت (رسول الله) دانیشتبوون وهەموو لاشەیان بۆتە گوێچکە بۆ ئەوەی فەرمایشتێك لەو دەمە پیرۆزە بێتە دەرەوە ونەوانیش وەری بگرن ودونیاو قیامەتی خۆیانی پێ ئاوەدان بکەنەوە جارو بارەش قسەی خۆش وپرسیارو وەلاَمێك دەکەوێتە نێوان (رسول الله) وصەحابە دڵسۆزو وەفادارەکانیەوە وخۆشەویستی خوا زەردەخەنە دەیگرێ وددانی پیرۆزی وەك گەوهەر ومرواری بەڵکو زۆر جوانتر دەدرەوشێتەوە صەحابەکانیش زەردەخەنە وپێکەنین دێتە سەر لێویان ونێوچەوانیان دەدرەوشێتەوە (الله أکبر) لەو دیمەنە, (الله أکبر) لەو مەجلیسە پڕ بەختەوەرییە داوا دەکەم لە خوا منیش وئێوەش وهەموو ئیمانداران لە بەهەشتی بەریندا بە خزمەت مەجلیسی پێغەمبەر وهاوەلاَنی بگەیەنێ (اللهم امین) بەڵێ پێغەمبەری خوا یەك بە یەك سەرنجی صەحابەکانی دەدات ولێیان وورد دەبێتەوە لە ناو هەموویاندا وا کابرایەك دانیشتووە بەلاَم غەمبارە دڵی خۆش نیە بەڵکو زۆربەی کات چاوەکانی پڕن لە فرمێسکی قەتیس ماو باشە دەبێ چی لێ قەومابێ ؟ خەم خۆری هەموو ئوممەتی ئیسلام موحەممەد (ﷺ) ڕوو لەو کەسە دەکات ودەفەرمووێ ئەرێ دەگرێ پێم بڵێی هۆی چیە وا غەمباریت ؟ هۆی چیە زەردەخەنە لەسەر لێوت تۆراوە ؟ ئەویش وەلاَم دەداتەوە وباسی خۆی دەگێڕێتەوە بەڵێ کابرا دەست بە گێڕانەوەی هۆی غەمگینی یەکەی دەکاو دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا من لە زەمانی جاهیلیمدا پێش موسڵمان بوونم هەرچەندە موسڵمانیش بووم بەلاَم خوا لەو گوناهە گەورەم خۆش نەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بۆم باس بکە ئەو گوناهە گەورەیە چیە کە تۆ کردۆتە کابرا وتی قوربان من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە زۆر ڕقم لە بوونی کچ بوو بەلاَم ئەوە بوو کاتێ کە ژنم هێنا ومنداڵمان بوو کچمان بوو وویستم هەر بە مەلۆتکەیی بیخەمە ژێر گڵەوە وبیکوژم بەلاَم ژنەکەم زۆر لێم پاڕایەوە کە وازی لێ بێنم ونەیکوژم چونکە نۆبەرەیەتی ودڵی پێی دەکرێتەوە

و ئاو دەنگی یەکە لە ماڵەوە لە گەڵیدا منیش لەبەر خاتری خێزانەکەم دڵم نەرم بوو و وازم لێ هێنا بەڵێ ساڵ بە ساڵ ئەم کچە گەورە بوو تا بالغ بوو ئەوەندە جوان بوو لە جوانترین کچی ئەو دەورو بەرە دەژمێردرا ئەوە بوو خەڵکی هاتن بۆ خوازبێنی منیش بەمە نارەحەت بووم دەمارگیری جاهیلیم جووڵا وبیرم کردەوە ئەگەر بیدەم بە شوو هەر عەیبە وکەم وکوڕیە بۆم وچۆن خەڵکی ببن بە زاوام خۆ ئەگەر بە شووشی نەدەم ولە ماڵەوە بیهێڵمەوە خەڵکی باشم باس ناکەن وپێی عەیبدار دەبم بۆیە لە دڵی خۆم دا بریارمدا کە بیکوژم بۆ ئەم مەبەستەش خێزانەکەمم بانگ کردو وتم کچەکەمان حازر بکە دەمەوێ سەردانی خزمانمان بکەم و ئەویش لەگەڵ خومدا دەیبەم خێزانەکەم وتی نەخێر چۆن شتی وا دەکەم ژنەکەم وتی دە سوێندم بۆ بخۆ وپەیمانم بدەرێ کە بە سەلامەتی دەیهێنیتەوە بۆم منیش وەعدو بەڵێنم پێدا ولەگەڵ کچەکەم بە رێ کەوتین تا گەیشتینە چۆڵەوانیەك دەستی کچەکەمم گرت و بردم بۆ لای بیرێکی قووڵ سەیری ناو بیرەکەم کرد زۆر قووڵ بوو لە دڵی خۆمدا وتم : زۆر باشە لەم بیرەدا دەیخنکێنم وهەرگیز ناتوانێ لەم بیرە قووڵە بێتە دەرەوە جا کاتێ سەیری ناو بیرەکەم دەکرد وسەیری کچەکەمم دەکرد کچەکەم حاڵی بوو کە نیازی لە ناو بردنیم هەیە چونکە ئەویش دەیزانی کە بوونی کچ مایەی عەیب وعارە لەو کۆمەڵگایەدا بۆیە زۆر بە توندی باوەشی پێدا کردم وماچی کردم ودەستی کرد بە گریان وزۆر پاڕایەوە کە نەیکوژم منیش سۆزم جووڵا وبڕیارم دا کە لە ناوی نەبەم بەڵام دیسان دەمار گیری نەفامی ونەزانیم جووڵایەوە پێی وتم چۆن قبووڵ دەکەی کچت هەبێ وخەڵکی بێنە خوازبێنی وکچەکەت ببێتە ژنی خەڵك بۆیە ئەمجارەیان زۆر بە توندی پەلاماری کچەکەمم داو لەسەر سەر فڕێم دایە ناو بیرەکەوە وئەویش قیژاندی وهاواری کرد بابە گیان لەسەر چی منت کوشت ؟ ئیتر هەر هاواری دەکرد ودەپاڕایەوە تا ئەوە بوو دەنگی نەماو بە تەواوی خنکا ئیستاش ئەی پێغەمبەری خوا ئەو دەنگەی کە وتی: بابە گیان لەسەر چی منت کوشت هەر لە مێشکمدایە ولە بیرم ناچێتەوە جا لەوە دەترسم و چەندە موسڵمان بووم و زۆر لەو کردەوەیەم پەشیمانم بەڵام تاوانەکەم ئەوەندە گەورەیە دەترسم خوا لێم خۆش نەبێ کاتێ کابرا قسەکانی تەواو کرد پێغەمبەری خوا فرمێسك بە چاوە پیرۆزەکانیدا هاتە خوارەوە وزۆر گریا هەموو صەحابەکانیش دەستیان

کرد بە گریان ئەمجا پێغەمبەر (ﷺ) بەو کابرایەی فەرموو : (لو أمرت أن أعاقب أحداً بما فعل في الجاهلية لعاقبتك)

واتە  ئەگەر فەرمانم پێ بدرایە سزای کەسێك بدەم لەسەر ئەو کردەوانەی کە لە سەردەمی نەفامیدا پێش مەسڵمان بوونی کردوونی ئەوا من سزای تۆم دەدا لەسەر کوشتنی ئەو کچە بەستەزمانە بێتاوانەت.[٢٨٦]

## ٢٨٨ – ﴿ ڕازی کردنی دڵی منداڵ دەبێتە هۆی ڕازی کردنی خوای گەورە ﴾

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆلای عوسمانی کوڕی مەزعون لەو کاتەدا عوسمان منداڵێکی بچکۆلەی خۆی لابوو لە باوەشی گرتبوو ماچی دەکرد وبە دەمیەوە پێدەکەنی ویاری وگاڵتەی لەگەڵدا دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی  ئەی عوسمان ئەمە کوڕتە ؟ عوسمان وتی : بەڵێ فەرمووی  ئەی عوسمان ئەم کوڕەی خۆتت زۆر خۆش دەوێ ؟ عوسمان وتی : ئەرێ وەڵڵاهی ئەی پێغەمبەری خوا بە قەدەر هەردوو چاوم خۆشم دەوێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : دە گوێ بگرە با منیش شتێکت پێ بڵێم کە خۆشەویستی ئەو منداڵەتِ لەلا زیاتر بکات عوسمان فەرمووی  بە خۆم ودایکم وباوکمەوە بە قوربانت ببن ئەی پێغەمبەری خوا بفەرموو وا گوێم لێتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (إنه من ترضى صبيا من نسله حتى يرضى ترضاه الله يوم القيامة حتى يرضى)  واتە  هەر کەسێك منداڵێکی بچکۆلانەی وەچەی خۆی ڕازی بکات تا دڵی ڕازی دەبێت خوای گەورەش لە ڕۆژی قیامەتدا دڵی ئەو کەسە ڕازی دەکات هەتا دڵی ڕازی دەبێت - - -.[٢٨٧]

---

[٢٨٦] (دین وژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە  ٢٢٠ – ٢٢٢)

[٢٨٧] (دین وژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە  ٢٦٠ ).

## ٢٨٩. ﴿ خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ حەسەن وحوسەین بێ سنوور بوو ﴾

تەبەرانی لە سەلمانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)گێڕاویەتەوە کە دەڵێت : لە دەوری پێغەمبەری خوادا بووین ئوم ئەیمەن – ڕەزای خوای لێ بێ – هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەسەن وحوسەین بزر بوون لە ماڵ چوونە دەرەوە ونەهاتوونەتەوە دەفەرمووێ : کاتەکەی کاتی نیوەڕۆ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (قوموا فأطلبوا إبني ) واتە : هەست بە دوای کوڕەکانمدا بگەڕێن صەحابەکان هەر کەسەی بە لایەکدا ڕۆیشتن ودەستیان کرد بە گەڕان سەلمان دەفەرمووێ منیش بە دوای پێغەمبەری خوادا ڕۆیشتم ئەوەندەی پێ نەچوو گەیشتینە بناری شاخەکە سەیر دەکەین وا حەسەن وحوسەین لە ترسان خۆیان لەیەك ئاڵاندووە وباوەشیان بەیەکدا کردووە لە بەرامبەریاندا مارێك لە سەر کلك وەستاوە وزمانی دەردێنێ وبڵێسەی ئاگر وژەهر لە دەمیەوە دەر دەچێ پێغەمبەری خوا بەپەلە بەرەو مارەکە ڕۆیشت مارەکەش سەرەنجی پێغەمبەری خوای داو پاشان ڕۆیشت وخۆی کرد بە کونێکدا ئینجا پێغەمبەری خوا (ر) چوو بەلای حەسەن وحوسەین ولێکی کردنەوەو دەستی بە ڕوویاندا هێناو فەرمووی : (بأبي وأمي أنتما ما أكرمكما على الله) واتە : دایك وباوکم بە قوربانتان بێت چەند بەڕێزن لای خوا پاشان یەکێکیانی خستە سەر شانی ڕاستی وئەوی تریشیانی خستە سەر شانی چەپی وهێنانیەوە بۆ ماڵەوە .

## ٢٩٠.﴿ پێغەمبەر (ﷺ) پیاوەکەی ڕاسپارد کە دادگەریێ لە نێوان منداڵەکانیدا ﴾

ئیمامی بەیهەقی گێڕاویەتەوە لە ئەنەسەوە کە پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبو کوڕێکی هات ماچی کرد ولە سەر باوەشی خۆی داینا پاشان کچێکی هات و وویستی لەسەر باوەشی باوکی دانیشێ بەلاّم باوکی دەستی گرت ولەسەر باوەشی لایبرد لە تەنیشت خۆیەوەدادینیشاند پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم دیمەنە ناڕەحەت بوو فەرمووی (فما عدلت بینهما) ئایە بۆچی دادگەر نەبوویت لە نێوانیاندا ؟ ئایە ئەو منداڵە تاوانی چینە کە نەتهێشت لە باوەشتدا دابنیشێ ؟ تەنها تاوانی ئەوەیە کە کچە ؟ ئایا نازانی ئەو منداڵە کچە چەند دڵی شکا ؟ چۆن بەزەیی بە خۆیدا هاتەوە ؟ چۆن هەستیکرد براکەی لای باوکی خۆشەویست ترە ؟ کە ئەمەش وا دەکات ئەو کچە لە کاتی گەورەیشدا ئەو هەڵوێستەی باوکی لە یاد نەچێ وڕقی لە باوك وبراکەی بێ.

## ٢٩١.﴿ پێغەمبەری خوا چەند ووشەیەکی پڕشنگداری فێری عەبدوڵلاّی کوڕی مەسعود کرد﴾

ئیبن عەساکیر ودەیلەمی لە ئیبن مەسعوودەوە – ڕەزای خوای لێ بێ – گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی : عەرزی پێغەمبەری خوام کرد کە چەند ووشەیەکم فێر بکە سوودی زۆری تێدا کۆببێتەوە . واتە : ووشەکان کەم بن بەلاّم لە مانادا زۆر سوودمەند بن خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: (اعبد الله ولا تشرك به شيئا ) خوا بەهەق بپەرستە و هیچ شتێك مەکە بە شەریك وهاوبەشی (وزل مع القرآن أينما زال ) لەگەڵ قورئاندا بە لە هەر کوێیەك دا بوو هەرچی قورئان فەرمووی هەر ئەوە جێ بە جێ بکە (واقبل الحق ممن جاء به صغيراً أو كبيراً) وە هەق قبوڵ بکە جا ئەو هەقە هەر کەس هێنابێتی وتبێتی گەورە بێت یان بچووك (وإن كان بغيضا بعيدا) با ئەو کەسەی قسەی هەقەکەت پێ دەڵێ کەسێکی بێگانەش بێ وکەسێك بێ ڕقیشت لێ

بێ (وردد الباطل ممن جاء به صغيرا أو كبيرا كان حبيبا قريبا ) فەرمووی شتی ناڕەوا ونابەجێ وباتیلیش وەرمەگرە و وازی لێ بێنەو بیدەرە دواوە جا هەر کەس ووتبێتی وهێنابێتی بچووك بێت یان گەورە بێت با ئەو کەسەی ئەو قسەو کردەوە نا بەجێ و بەتاڵە دەکاو دەڵێ کەسێك بێ خزمەت بێ ونزیك وخۆشەویستت بێ - - -

## ٢٩٢.﴿ بەسەر هاتی عەبدوڵڵای کوڕی بیشیری مازنی لە خزمەتی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ﴾

عەبدوڵڵای کوڕی بیشیری مازنی – ڕەزای خوای لێ بێت – کە صەحابیی پێغەمبەرە (ﷺ) دەفەرمووێ : من منداڵ بووم دایکم بانگی کردم وهێشووە ترێ یەکی دامێ کە بیبەم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش بەر لەوەی بیگەیەنم لە ڕێگا لێم خوارد کاتێ گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر وترێ یەکەم دایە دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیری هێشووە ترێ یەکەی کرد بینی بۆڵ کێشم کردووە ولێم خواردووە بۆیە گوێ ی ڕاکیشام وفەرمووی ئەی فێڵباز ئەوە بۆچی ئەو ترێ یەت والێ کردووە ؟ واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم گوێ ڕاکێشانە ئەو منداڵەی ئاگادار کردەوە کە کارێکی نا بەجێی کردووە بێگومان ئەو ئاگادار کردنەوەیە بەگوێ ڕاکێشان تەئسیرو کاریگەری خۆی هەبووە ومنداڵەکە دەرسی لێورگرتووە ونەوەتا گەورە بووە وبۆتە پیاو ئەم باسەی هەر لە بیرە.[٢٨٨]

[٢٨٨] (دین وژین لە ژێر رۆشنایی راسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەرە ٣٠٠).

## ٢٩٣.﴿ ئیمامی عومەر ئاواتە خواز بوو کە کوڕەکەی وەڵامی پرسیارەکەی پێغەمبەری خوای بدابایەوە ﴾

صەحابی گەنج و شارەزا عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت: جارێکیان کە من تەمەنم منداڵ بوو لە خزمەت باوکمدا چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چووینە خزمەتی تەماشامان کرد وا چەند صەحابی لە پیرو لە گەنج لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا دانیشتبوون و دەوری پێغەمبەریان داوە وبە ڕاستی نوورو بەرەکەت لە مەجلیسەکە بەرز دەبۆوە دەڵێت : من و باوکم سەلاممان کردو چووین لە شوێنێکدا کە چۆڵ بوو دانیشتین وگوێمان بۆ فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ڕاگرت جا یەکێك لە ئوسلوبە پڕ حیکمەتەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ڕازاندنەوەی مەجلیس وکردنەوەی مێشك ودڵ ودەروونی گوێگر بۆ فەرموودەکانی ئەوە بوو کەلێ جار پرسیاری لەو کەسانە دەکرد کە گوێیان بۆ گرتووە بۆ ئەوەی ئەوانیش قسەی خۆیان هەبێ وئازادی ڕادەربرینی بۆچوونەکانیان لێ زەوت نەکرێت عەبدوڵڵا دەڵێت : جا هەر لەو مەجلیسەدا پێغەمبەری خوا بە چاوە جوان وپڕ میهرەبانییەکانی سەیرێکی یەکە بە یەکەی ناو مەجلیسەکەی کردو فەرمووی : خۆشەویستانم ئەی هاوەڵە بەڕێزەکانم پرسیارێکتان لێ دەکەم کێتان زانی وەڵامم بداتەوە پرسیارەکەشم ئەمەیە ( إن من الشجرة شجرة لا سيقط ورقها وإنها مثل المؤمن فحدثوني ما هي؟ )

واتە : بە ڕاستی درەختێك هەیە لە ناو درەختەکاندا هیچ کاتێ گەڵاکانی هەڵناوەرێ وزۆر خۆڕاگرو ڕەگ داکوتراوە وهێزی ڕەشەبا نایجووڵێنێت  ئەم درەختە وەکو ئینسانی ئیماندار وایە ئیمانداریش ئاوا خۆڕاگرو بە عەزیمەت و وورە بەرزو چاونەترس وهەمیشە گەش ودڵ کراوەیە فەرمووی  دەی پێم بڵێن ئەو درەختە چیە ؟ عەبدوڵڵا دەڵێت  دانیشتوانی مەجلیسەکە دەستیان کرد بە ناو بردنی درەختەکانی بیابان وشیوو دۆڵەکان بەڵام هیچیان وەڵامەکەیان ڕاست نەبوو منیش کە منداڵ بووم لە مەجلیسەکەدا دانیشتبووم یەکسەر بە مێشکمدا هات کە ئەو درەختە داری خورمایە وویستم قسە بکەم وبڵێم : ئەی پێغەمبەری خوا من دەزانم ئەو درەختە چیە , ئەوە داری خورمایە بەڵام کە سەرم هەڵبڕی تەماشام کرد

ئیمامی ئەبو بەکرو عومەری باوکم دانیشتبوون بۆیە شەرمم کرد قسە لە مەجلیسێکدا بکەم کە ئیمامی ئەبو بەکرو باوکمی تیا دانیشتبێ ئەوە بوو قسەم نەکرد پاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی دەی مادام کەستان نەتانزانی ئەو درەختە کامەیە وا من پێتان دەڵێم : ئەوە درەختی دار خورمایە عەبدوڵلا دەڵێت : جا کاتێ چووینەوە بۆ ماڵەوە بە باوکم وت بابە گیان بەخوا من دەمزانی کە ئەو دارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی پرسیاری کرد چیە دەمزانی داری خورمایە بەڵام بەخوا شەرمم کرد تۆ وئیمامی ئەبو بەکرد دانیشن و من قسە بکەم ئیمامی عومەر فەرمووی بەڵام ڕۆڵە گیان بزانە ئەگەر بتوتایە وقسەت بکردایە لە لای من خۆشتر بوو لەوەی کە ڕانە حوشتری سوور کە بەنرخترین سامانە لای عەرەب هی من بوایە.[٢٨٩]

## ٢٩٤. ﴿ ( ئەبی شەهم ) تەوبەی کردو بەڵێنی دا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

(ئەبی شەهم) — ڕەزای خوای لێ بێت — بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت : من کەسێك بووم بێ ئیش وکار دەسووڕامەوە وزۆر حەزم بە نزیکی لە ئافرەتان دەکرد تا ئەوە بوو لەگەڵ کۆمەڵێك دا هاتم بۆ شاری مەدینەی پیرۆز بۆ ئەوەی پەیمان بدەین بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وەعدی بدەینێ کە دیفاع لە ئیسلام بکەین وجیهاد لە پێناوی خوادا بکەین بەڵام کە گەیشتینە مەدینە کات زۆر درەنگ بوو شەو بوو پێغەمبەری خواش چەند ئیشێکی زەرووری هەبوو نەیدە توانی چاوی بەم کۆمەڵە خەڵکە بکەوێ لەبەر ئەوە دەبوایە تا بەیانی چاوەڕێمان بکردایە ئەوە بوو بڵاو بووینەوە من لە یەکێك لە کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا لەو شەوەدا تووشی ئافرەتێك بووم نزیك بوومەوە لە ئافرەتەکە وجل وبەرگەکەیم ڕاکێشا ئافرەتەکە وەڵامی نەدایەوە ورۆیشت بۆ بەیانی هەمووومان کۆبووینەوە وچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەری خوا زۆر دڵ خۆش بوو سڵاوی لە خەڵکەکە کردو بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازی لێ کردن ویەکە یەکە دەستی خستە دەستی پیاوەکانەوە وعەهد وپەیمانی لێ وەرگرتن تا سەرە گەیشتە سەر

[٢٨٩] ( رواه البخاري).

من منیش وەکو ئەو خەڵکە دەستم درێژ کرد بۆ ئەوەی دەست بخەمە دەستی (رسول الله ) وە وپەیمانی بدەمێ بەلاَم پێغەمبەری خوا دەستی نەهێنایە پێشەوە وفەرمووی : (أحسبك صاحب الغيرة ؟ ) فەرمووی : ئایا تۆ نەبووی دوێنێ شەو جلی ئافرەتەکەت ڕاکێشا ؟ دەڵێ زانیم خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە ئەگینا خۆ کەس ئاگای لە من نەبوو بۆیە دانم نا بە هەڵەی خۆمداو وتم : بەڵێ فەرمووی : برۆ دەست ناخەمە دەستتەوە و پەیمانت لێ وەرناگرم چونکە ئینسانێك داوێن پاك نەبێ لە ئیسلامدا جێگای نابێتەوە بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی تێ کردم ورۆیشت منیش زۆر بەلامەوە سەیر بوو ئایا پێغەمبەری خوا هەر لە سەر ئەوەی دەستم بۆ بەرگی ئافرەتێك بردووە پەیمانم لێ وەرناگرێ ودەست ناخاتە دەستمەوە ئایا ئەمەش بە داوێن پیسی حیسابە ؟

بۆیە یەکسەر لە دڵی خۆمدا بڕیارم داو هاوارم کرد ئەی پێغەمبەری خوا پەیمانم لێ وەرگرە ومەحرووەمم مەکە لەو دەستە پیرۆزەت بەڵێن بێ جارێکی تر شتی وا ناکەم وەعد بێ داوێن پاك بم ئەمجا پێغەمبەری خوا ئاوڕی بۆ دامەوە وزەردەخەنەیەکی بۆ کردم وفەرمووی : ئایا وەعدو بەڵێن دەدەی لەمەودوا ڕەفتاری وا نابەجێ نەکەیتەوە ؟ وتم بەڵێنت دەدەمێ فەرمووی دەی کەواتە دەستت بێنە ئەمجا دەستی خستە ناو دەستمەوە وپەیمانی لێ وەرگرتم.[٢٩٠]

---

[٢٩٠] ( ئیمامی ئەحمەد ڕوایەتی کردووە ).

## ٢٩٥.﴿مژدەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ پیاوێکی پیر﴾

لە تەفسیری ئیبن کەثیر ج٦ ص١١٧ باسی بەسەرهاتێك دەکاتێك دەڵێت جارێکیان کابرایەکی پیر کەلەبەر پیری برۆکانی هاتبوونە سەرچاوی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کابرایەك هەرچی خراپە و تاوانە کردویەتی هەرچی بێ شەرعی و کاری نارەوا بۆی ڕێ کردبێ درێغی لێ نەکردووە ئەو کابرایە ئەوەندە گوناهبارە ئەگەر گوناهەکانی بەسەر هەموو ئەهلی سەر زەویدا دابەش بکرێن لێیان زیاد دەبێت ئایا ئەگەر بەم هەموو گوناهەوە تەوبە بکات خوا لێ ی خۆش دەبێ ؟ پیاوەکە مەبەستی خۆی بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئایا موسڵمان بوویت ؟ پیاوەکە وتی من بەراستی و لە دڵەوە بڕوام هەیە و بە زمانیش دەڵێم : (أشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له ، واشهد ان محمدا عبده ورسوله) شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە شایەنی پەرستن بێ جگە لە زاتی خوا ئەو خوایە هیچ هاوبەش و شەریکی نیە وە من شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەی خوایە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (فان الله غافر لك ما كنت كذالك ومبدل سيئاتك) واتە فەرمووی ئەی مامە پیرە بزانە کە مادام تۆ ئاوا ئیمانت بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی هێناوە و خۆت بە تاوانبار دەزانی و لە قاپی ئەودا تەوبە دەکەیت ئەوا موژدەت لێ بێ خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانت خۆش دەبێت و هەرچی خراپەشە بۆت دەکات بە چاکە ، کابرا بەسەر سوڕمانەوە و لە خۆشیان وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا خوا هەموو تاوان و خراپکاریەکانم بەم ئیمان هێنان و تەوبەکردنە بۆ دەگۆڕێت بە چاکە فەرمووی بەڵێ دڵنیابە صەحابەکان دەڵێن : کابرا پیرەکە لەخۆشی ئەم موژدەیە ڕۆیشت و لە ڕێگادا هەر دەیوت : (الله اكبر الله اكبر) هەتا لە چاوان ون بوو .

## ٢٩٦. ﴿کراسەکەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت تا ببێ بە کفن بۆی﴾

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا (خوای لێ ڕازی بێت) یەکێك بوو لە موسڵمانە هەژارەکانی چوار دەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکیش بوو لەو دە هاوەڵەی کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە هەشتەمین کەس بوو کە مسوڵمان بووە لە مەککەدا پێنجەمین کەس بووە لەسەر دەستی ئەبوبەکری ڕاستگۆدا موسڵمان بووە ، هەروەها یەکێك بووە لەو شەش کەسەی کە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب بۆ شورا هەڵی بژاردن ئەم هاوەڵە بەڕێزە پیاوێکی هەژار و دەست کورت بوو هەمیشە لەپشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد و لە هیچ نوێژێکدا دووا نەدەکەوت زۆر خۆشەویست بوو لە دڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم پیاوە تەنها جلێکی هەبوو لەبەری دەکرد بۆکاتی نوێژەکان ڕۆژێك دووای نوێژ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەحاڵی تەلحەی پرسی ئەویش لەوەڵامدا وتی : سوپاس بۆ خوا وەزعم باشە بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی لەماڵەوە کراسێکی خۆی هەبوو هێنایان و پێشکەشی تەلحەی کرد کاتێك تەلحە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە هاوسەرەکەی کراسەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ بینی وتی ئەوە چیت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتوە ؟ ئایا شکاتت لای خوای گەورە لێ کردووە ؟ دەخیل شتی وات نەکردبێ تەلحە وتی سوێند بەخوا نەخێر شکاتم نەرکدووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆی پێشکەشی کردم وتی : ئەی بۆ قبوڵت کرد تەلحە وتی: سوێند بەخوا تەنها لەبەر ئەوە قبوڵم کرد کە بیکەمە کفن کاتێك کە مردم و مەلائیکەتەکان هاتن و لێ یان پرسیم کە دەبارەی ئەو پیاوە چی دەڵێیت کە خوا ناردویەتی ؟ منیش دەڵێم کفنەکەم کراسی ئەو پێغەمبەرەیە (ﷺ) هەر لەبەر ئەوەش وەرم گرت.[٢٩١]

---

[٢٩١] (قصص و عبر محمد احمد یونس ص ٣٠-٣١).

## ٢٩٧.﴿ئافرەتە بێوەژنەکە ئیمانەکەی لێوان لێو بوو لە قەناعەت و متمانە﴾

ڕۆژێك پاش نوێژی ئێوارە پیاوێك دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پارچەیەك گۆشتی جوانی هێنابوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گۆشتە بدە بەیەکێك لە هەژارە موسڵمانەکان پێغەمبەری خواش (ﷺ) تەماشای کرد هەژارەکانی چوار دەووری هەموو نانی ئێوارەیان خواردووە لەگەڵ ئەوەش لێ ی پرسین کێتان ئەم گۆشتە دەباتەوە ؟ وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستیمان پێ ی نیە نانمان خواردووە پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە ئەبوو هورەیرەی فەرموو : ئەی ئەبوو هورەیرە ئەم گۆشتە ببە بۆ فلان دایکی هەتیوان کاتێك ئەبوو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ گۆشتەکەی بردوو لەدەرگای دا ئافرەتەکە پرسی کێ یە ؟ وتی : ئەبوو هورەیرە ، وتی : خێرە بەم شەوە ؟ وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گۆشتەی بۆخۆت و منداڵەکانت ناردووە ، ئافرەتەکەش وتی : سلاو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکە و عەرزی بکە منداڵەکان نانیان خواردووە و خەوتووشن ئەبوو هورەیرە وتی : هەڵی گرە بۆ سبەینێ یان تا هەڵدەستن ئافرەتەکەش وتی : لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بپرسە ئایا کەفالەتی دەکات کە منداڵەکانم تا سبەینێ دەمێنن تا من گۆشتیان بۆ هەڵبگرم ؟ با پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینێرت بۆ ئەوانەی لەمن هەژارترن ئیتر ئەم ئێوارەیە تازە نانمان خواردووە و تا سبەینێش خوا کەریمە.[٢٩٢]

[٢٩٢] قصص و عبر محمد احمد یونس ص ٩٠-٩١.

## ٢٩٨. ﴿بەسەرهاتی گەنجێك کە فریشتەکان خواردنیان دەکرد بە دەمیەوە لە میوە و بەرهەمی بەهەشت﴾

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا لەشاری مەددینە ڕۆیشتبووە دەرەوە تەماشایان کرد وا وشتر سوارێك بەغار دێت بەرە و ڕووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشای کرد و فەرمووی وادەزانم ئەو سوارە بەرە و ڕوی ئێمە دێ و دەیەوێ بگاتە ئێمە پاش کەمێ سوارەکە گەیشت و دابەزی و پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی بەخێرهاتنیان کرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی لە کوێوە هاتووی ؟ لاوەکە بەدەم هەناسە بڕکێ و ماندوو بوونی سەفەر و تەپ و تۆزی بیابانەوە وتی لەلای خێزان و مناڵ و هۆزەکەمەوە هاتووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەی دەتەوێ بەرەو کوێ بڕۆی ؟ وتی : دەمەوێ بگەم بە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەی دەزانی ئەو کەسەی قسە و گفتوگۆی لەگەڵ دەکات پێغەمبەری خوایە (ﷺ) ، فەرمووی باشت دەست کەوت گەنجەکەش تێگەیشت کە ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە خۆشیاندا دەم و چاوی گەشایەوە ئازار و ماندوو بوونی سەفەری نەما یەکسەر ڕووی کردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی (یارسول الله علمني مالامان ؟) واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شارەزام بکە و پێم بڵێ ئیسلام چیە ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئیسلامەتی ئەوەیە کە شایەتمان بێنی بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە کە شایەنی پەرستن بێ تەنها خوا نەبێ شایەتمان بدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وە نوێژ بکەی و زەکات بدەی و ڕۆژووی ڕەمەزان بگری و حەجی ماڵی خوا بکەی گەنجەکە وتی : وا شایەتمانم هێنا و بڕیارم دا ئەوەی فەرمووت : بە پشتیوانی خوا جێ بە جێ بکەم گەنجەکە سواری ووشترەکەی بۆوە و هێشتا دوو سێ هەنگاو دوور نەکەوتبۆوە کە قاچی ووشترەکەی کەوتە کونێکەوە و ووشترەکە کەوتوو گەنجەکەی فڕێ داو هەر خێرا هەڵیان گرتەوە دووا هەناسەی داو مرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەو پیاوەم بۆ لا بێنن عەماری کوڕی یاسر و حوزەیفە چون بەلایەوە و ویستیان هەڵی بستێنن و دایبنیشێنن بەڵام دانەنیشت بەلادا کەوت جوڵاندیان جوڵەی تیادا نەمابوو بۆیە وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مردووە ،

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرە و لای هات و کاتێ نزیك بۆوە لێ ی سەیری دەکرد بەڵام لەناکاو ڕووی کرد بەرە و لای عەمار و حوزەیفەوە و فەرمووی : (فانی رأیت ملکین یدسان في فیه من ثمار الجنة فعلمت أنه مات جائعا).[٢٩٣]

واتە بەراستی من بینیم کە دوو فریشتە لەلای بونوو خواردنیان دەکرد بە دەمیەوە لە میوە و بەرهەمی بەهەشت بۆیە منیش زانیم کە بە برسیەتی مردووە .

## ٢٩٩.﴿پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە گۆشتی مەڕەکەی نەخوارد چونکە پرس بە خاوەنەکەی نەکرابوو﴾

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و چەند هاوەڵێکی بەلا گوندێکدا تێپەڕین ئافرەتێك نانیان بۆ ساز دەکات لەکاتی نان خواردندا پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم دەستی بۆ دەبات و ئیتر ناتوانێت بیخوات و دەفەرموویت : (هذه شاة ذبحت بغیر اذن اهلها) واتە : ئەم مەڕە بەبێ پرسی خاوەنەکەی سەر بڕدراوە ئافرەتەکەش دەڵێ : ئێمە لەگەڵ سەعدی کوری مەعازدا ئەوە لە نێوانمان دا نیە ئێمە ئاژەڵی ئەوان بەبێ پرس دەبەین و ئەوانیش هی ئێمە دەبەن.[٢٩٤]

---

[٢٩٣] (رواه الامام احمد بسند حسن).

[٢٩٤] رواه الامام احمد برجال الصحیح.

## ٣٠٠.﴿سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی چاکترین خێر﴾

سەعدی کوڕی عوبادە دەڵێت بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وت : (یا رسول الله ان امي ماتت فأي الصدقة افضل؟) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایکم کۆچی دووای کردووە و ئایا چ خێر و صەدەقەیەك لەهەموو خێر و چاکەیەك باشترە کە بۆی بکەم بە خێر ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئاوی بۆ بکە بە خێر (فحفر بئرا و قال : هذه لام سعد) ئیتر سەعدیش بیرە ئاوێکی لێدا و وتی : ئەمە بۆ دایکی سەعد خێر و خێرات بێ.[٢٩٥]

## ٣٠١.﴿ عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل شەکوای حاڵی خۆی کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

موفەسیرینی قورئان ئەوانەی قورئانیان تەفسیر کردووە دەڵێن : ئایەتی (لایسخر قوم من قوم عسی أن یکونوا خیرا منهم) واتە با هیچ گەل و پیاوێکتان گاڵتە و مەسخەرە بە گەلە پیاوێکی دی نەکات لەوانەیە گاڵتە پێکراوەکان لای خوا لە گاڵتە چیەکان چاکتر بن لەبارەی عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهلەوە هاتە خوارەوە کاتێ عیکریمە موسڵمان بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسڵمانەکان کاتی چاویان پێ کەوت وتیان : (ابن فرعون هذه الامة) واتە ئەمە عیکریمەیە کە کوڕی فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە واتە کوڕی ئەبوجەهلە کاتێ عیکریمە گوێ ی لێ بوو کە موسڵمانەکان لەناو خۆیاندا بە چرپەوە گاڵتەی پێ دەکەن و تەماشای یەکتر دەکەن و چاو لەیەکتر دادەگرن و ئاماژە دەکەن کە ئەوە کوڕی ئەبوجەهلە کە فیرعەونی ئەم ئوممەتەیە ، عیکریمە شەکزوای حاڵی خۆی لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردوو وتی من لە رابردووی باوکم بەرپرسیار نیم وە من لە ناخی دڵمەوە موسڵمان بووم ئیتر بۆچی موسڵمانان ئاوام پێ بڵێن ؟ ئیتر ئەم ئایەتی هاتە خوارەوە و قەدەغەی کرد کەس بە چاوی سوکوو قسەی ڕووشێنەر و گاڵت ئامێز تەماشای بری ئیمانداری خۆی بکات و قبوڵ نەکرا جارێکی تر لەلای عیکریمە باسی ئەبوجەهلی باوکی بکرێ بۆ ئەوەی ئەو ئازاری پێ نەخوا .

---

[٢٩٥] رواه ابو داود

## ٣٠٢.﴿ پلە و پایەی عەبدوڵای كوڕی مەسعود لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

ئیمامی علی دەفەرمووێت  ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵی بەڕێز عەبدوڵای كوری مەسعود كرد كە بچێتە سەردارێك و شتێكی بۆ بێنێ لە هەندێك ڕیویەتدا داری سوكی دەویست جا كاتێ كە عەبدوڵا چووە سەردارەكە چووە سەر دارەكە قاچی دەركەوت چونكە بەرگەكەی هەڵكرا هاوەڵەكان تەماشای قاچی عەبدولایان كرد و هەموو دەستیان كرد بە پێكەنین و تەماشای یەكتریان دەكرد ئاو لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی تێكردن و فەرمووی : ( ماتضحكون لرجل عبدالله أثقل في الميزان يوم القيامة من أحد).[٢٩٦]

واتە بەچی پێدەكەنن و زەردەخەنەتان دێتێ و گاڵتە دەكەن بە قاچە باریكەكانی عەبدوڵای كوری مەسعود ؟ دەی سوێند بێ ئەو قاچە باریكەی عەبدوڵا لە تەرازووی كردەوەكاندا لە ڕۆژی قیامەتدا لە شاخی ئوحود قورسترە .

---

[٢٩٦] رواه الامام احمد بأسناد الصحيح

## ٣٠٣. ﴿ دوور کەوتنەوە لەڕەفتاری سەردەمی نەفامی ﴾

جابری کوڕی عبدالله خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت  لە غەزایەکدا لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووین خەڵکێکی زۆری کۆچەران لە خزمەتی دابوین جا لەناو ئەو خەڵکە زۆرەی کۆچەراندا پیاوێکی تێدا بوو کە زۆر کات یاری بە ڕمەکەی دەکرد و هەڵی دەسوڕاند و ڕمەکەی فڕێ دەدا و دەیگرتەوە لەناکاوێکدا سەری ڕمەکەی بە پاژنە پێ ی کەسێکی مەددینەیی یارمەتیدەر کەوتوو ئازاری دا یارمەتی دەرەکەی داو یارمەتی دەرەکە زۆر زۆر تورە بوو هەتا هاوای کرد و داوای لە یارمەتیدەرکانی خزمی کرد کە فریای بکەون و تۆڵەی بۆ بکەنەوە و وتی  ئەی کۆمەڵی ئەنصار ئای خزمەکانم وەرن تۆڵەم بکەنەوە کابرای موهاجیریش کە ڕمەکەی پێ بوو ترساو ئەویش هاواری کرد کەی موهاجیرەکان ئەی خزمەکانم وەرن بەهانامەوە وا هێرشم دەکەنە سەر لەم کاتەدا  پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێ بیستی ئەو دەنگە دەنگە بوو بە پەلە هاتە ناوەوە و فەرمووی ئەوە چییە وا بە بانگەوازی خەڵکی جاهیلی بانگ دەکەن و گەلە کۆمەکی لەیەکتری دەکەن پاشان فەرمووی هێمن ببنەوە وەرن دانیشن بزانم لەسەر چی وا دەکەن ؟ ئیتر بۆیان باس کرد کە لەسەر ئەوە بووە کە ڕمەکەی ئەو موهاجیرە بەر پاژنەی پێی ئەو ئەنصاریە کەوتووە و زۆر ئازاری داوە و ئیتر داوای یارمەتی و گەلە کۆمەکی لە خزمەکانی کردووە و موهاجیرەکەش بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( دعوها فانها خبیثة ) واتە وازی لێ بێنن لەو ڕەفتارەی سەردەمی نەزانی کە گەلەکۆمەکی و خزم کۆکردنەوە و لەشکر کێشیە بۆ سەر یەکتر و لە جیاتی چارەسەری گرفتێکی بچووك دروست کردنی شەڕێکی گەورە و خوێناوی لێ دەکەوێتەوە چونکە بەڕاستی ئەوە پیسە و بۆگەنیوە و لە ئەهلی موسڵمان ناوەشێوەتەوە.[٢٩٧]

[٢٩٧] رواه البخاری ومسلم .

## ٣٠٤.﴿ فریشتەکان بەژداریان کرد لە بەخاك سپاردنی سەعلەبەی کوڕی عەبدوڕەحمان﴾

جابری کوڕی عبدالله خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕێتەوە و دەڵێت لاوێك لەنێو شاری مەددینەدا موسڵمان بوو ناوی سەعلەبەی کوری عەبدوڕەحمان بوو یەکێك بوو لە هاوەڵانی ئەنصارِ ئەم لاوە خزمەتی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەکرد ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەینێرێت بۆ کارێك بەلای ماڵێکدا تێ دەپەڕێت و تەماشای ماڵێك دەکات نافرەتێك دەبینێت لە ژوورەوە خۆی دەشوات دەست بەجێ هەست دەکات تاوانی کردووە لەدەرگاوە سەیری ماڵێکی کردووە دەترسێت نایەتی لەسەر بێتە خوارەوە ئیتر دەڕوات بۆ نێو ئەشکەوتی شاخەکانی نێوان مەککە و مەددینە لەوێ زۆر بە پەشیمانی لە خوا دەپاڕێتەوە کەلێ ی خۆشبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ماوەی چل ڕۆژ هەواڵی نازانێت بۆیە جبریل (سەلامی خوای لێ بێ) دێتە خوارەوە هەواڵ دەدات بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پەروەردگار دەفەرموویێت : لاوێك لەنێو ئوممەتەکەتدا لەو شاخەدایە و پەنای بۆلای من هێناوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو بەڕێزان عومەری کوڕی خەتتاب و سەلمانی فارسی دەنێرێت بە دووای سەعلەبەدا لە ڕێگە تووشی شوانێك دەبن و پرسیاری لێ دەکەن ئەویش دەڵێت : بەدوای ئەو کەسەدا دەگەڕێن کە لەترسی دۆزەخ هەڵاتووە ؟ ئێمە هەموو شەوێك دەیبینین لە نیوە شەودا هەردوو دەستی لەسەر سەری داناوە و هاوار دەکات و دەپاڕێتەوە و دەگری لە ترسی لێ پرسینەوەی دواڕۆژ ، ئیمامی عومەر وتی ئەو کەسەمان دەوێت ئیتر شوانەکە بردنی بۆ نزیکی شوێنەکەی سەعلەبە و کاتێك نیوە شەو ئیمامی عومەر بینی باوەشی پێداکردوو گووشی بەخۆیەوە سەعلەبە وتی : ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەتاوانەکەمی زانیوە ؟ ئیمامی عومەر وتی : من نازانم بەڵام من و سەلمانی ناردووە بەشوێنتا سەعلەبە وتی دێمەوە لەگەڵتان بەڵام بەمەرجێك با لەکاتی نوێژدا بچینە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە گەڕانەوە بۆ مەددینە و چون بۆ مزگەوت کاتی نوێژ بوو سەعلەبە گوێ ی لە دەنگی پێغەمبەر (ﷺ) بوو لە هۆش خۆی چوو دووای نوێژ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە لای و دەست و قاچی بۆ جوڵاند و

سەعلەبە هاتە هۆش خۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بۆ لێمان وون بوویت ؟ سەعلەبە وتی لەبەر گوناهباریم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئایەتێکت پێ بڵێم ئەگەر بیخوێنیت تاوانەکانت ڕادەماڵێت ئەویش ئایەتی بەقەڕە (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ {٢٠١} ) وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تاوانی من لەوە گەورەترە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی فەرمودەکەی خوا گەورەترە و خوێندنی تاوانەکە ڕادەماڵێت : پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکرد بچێتەوە ماڵی خۆیان و ئیسراحەت بکات بەڵام کە دەچێتەوە بۆ هەشت ڕۆژ نەخۆش دەکەوێت پاشان سەلمان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێت کە سەعلەبە نەخۆشە پێغەمبەری خواش (ﷺ) تەشریفی دەچێت بۆ سەردانی و سەری لەسەر ڕانی خۆی دادەنێت بەڵام سەعلەبە سەری لا دەبات پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : بۆ لای دەبەیت دەڵێت : سەری من پڕی تاوانە با لەسەر ڕانتەوە نەبێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەپرسێت کوێت ئازاری هەیە ؟ سەعلەبە دەڵێت : وا هەست دەکەم مێروولە لە نێوان پێست و گۆشت و ئێسقانەکانمدا دەڕوات پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی حەزت لە چییە ؟ سەعلەبە وتی : حەزم لە لێ خۆش بوونی پەروەردگارە ئیتر جبریل (سەلامی خوای لێ بێ) هاتە خوارەوە وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەروەردگار سەلامت لێ دەکات و دەفەرموێت ئەگەر ئەم بەندەی منە تا قەراغی ئاسمان گوناهی هەبێت من لێ ی خۆش دەبم پێغەمبەری خواش (ﷺ) مژدەی دا بەسەعلەبە بەڵام کە سەعلەبە گوێ بیستی ئەو موژدەیە بوو هاوارێکی کردووە گیانی دەرچوو و کۆچی دووای کرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد شۆردیان و کفن کرا و نوێژی لەسەر کرد و لەگەڵیدا ڕۆیشت بۆ سەر قەبران بۆ بەخاك سپاردنی بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆیشتندا لەسەر نووکی پەنجەکانی پێی دەڕۆیشت پاشان هاوەڵان لە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) پرسی بۆ لەسەر نووکی پێت دەڕۆیشتی فەرمووی : بەو خوایەی منی بە پێغەمبەر ڕەوانە کردووە نەمتوانی پێم لەسەر زەوی دابنێم ئەوەندە مەلائیکە دابەزیوە بۆ بەخاك سپاردنی سەعلەبە.[٢٩٨]

---

[٢٩٨] كتاب التوابين ص ١٠٥-١٠٨ الامام ابن قدامة المقد سي : تحقيق : عبدالقادر الآرنائوط .

## ٣٠٥.﴿خه یثه مه و کوڕەکەی سەعد هەردوکیان ئامەزرۆ بوون بۆ دەست کەوتنی بەهەشت﴾

لەرۆژی غەزای بەدردا باوك و کوڕێك ئامادە بوون باوکەکە ناوی خه یثه مه بوو کوڕەکەشی ناوی سەعد بوو لەبەر ئەوەی ماڵ و منالی ووردیان زۆر بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی یەکێکتان بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە چونکە کاروانەکەمان لەدەست چووە و لەوە دەچێت تووشی شەڕ ببین و ئێوەش دەبێ یەکێکتان بگەڕێتەوە بۆلای خێزانە زۆر و هەژارەکەتان و ئاگای لێیان بێت و بژێوی ژیانی رۆژانەیان بۆ پەیدا بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم باوکو کوڕەی فەرموو : یەکێکتان بگەڕێنەوە بۆلای ژن و ماڵەکەتان بەڵام ئەو باوك و کوڕە هیچیان ڕازی نەبوون بە گەڕانەوە تا ناچار پێغەمبەری خوا (ﷺ) قورعەی بۆ کردن لە قورعەکەدا ناوی کوڕەکە سەعد دەرچوو واتە ناوی کوڕەکەی دەرچوو کە لە خزمت پێغەمبەری دا (ﷺ) بمێنێتەوە و دەبێ باوکەکە کەناوی خەیثە مە بوو بڕواتەو بۆ ناو ماڵ و منالەکەیان ئا لەم کاتەدا باوکە پیرەکە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە چووە بەردەم کوڕەیی و بە زمانی لاڵانەوە پاڕانەوە وتی ( یا بني اثرني الیوم ) واتە : ڕۆڵە گیان توخوا هیچم لە تۆ ناوی ئەوە نەبێ ئەمڕۆ نۆرەی خۆت بدەیت بە من من بمێنمەوە و تۆ بڕۆیتەوە بۆ لای ماڵ و منالْ کوڕەکەش بە ئەو پەڕی ئەدەبەوە وەڵامی باوکی دەداتەوە وەکو ئەوەی پێ ی بڵێ بابە گیان دەزانم داوای چی دەکەیت دەڵێ ئەی باوکی شیرینم ( یا ابت لو کان غیر الجنە فعلت ) واتە : بابە گیان بەخوا ئەگەر باسەکە غەیری بەهەشت بووایە بە قسەم دەکردی و پێشەکەشم دەکردی بەڵێ ئەم کوڕە گەنجە وەکو ئەوەی چاوی لەبەهەشت بێو لەناویا بێ و بچێ ئاوا بەیەقینەوە باسی بەهەشتی دەرکرد بەڵێ باوکەکە بە گریان و دڵشکاویەوە گەڕایەوە و پاشان جەنگی بەدر دەستی پێکرد و سەعدی کوڕی شەهید بوو ئاواتەکەی هاتە دی و شاد بوو بە بەهەشتی بەرین باوکی پیری کە جەنازەی تاقە کوڕەکەی گرتە باوەش نەیفەرموو : ئای ڕۆڵە چیمان بەسەر هات ئای من بەم پیریە بەتەنها ئەم هەموو خێزانە چۆن بەخێو بکەم چونکە ئەوەندە بەتەواوی متمانەی بەخوای گەورە بوو باوکە پیرەکە تەنیا یەك خەمی هەبوو ئەویش

ئەوە بوو چۆن بگاتە بەهەشت ئەو بەهەشتەی هەموو دووای نوێژێکی بەیانی و ئێوارە داوای لە خوا دەکرد کە بەو بەهەشتەی شاد بکات بەم شێوەیە ڕۆژان هاتن و ڕۆیشتن دووای ئەوە جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە خەیثە مە کە سەعدی کوڕی لە غەزای بەدردا شەهید بووبوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواو (ﷺ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : بەڕاستی ڕۆژی بەدرم لەدەست چوو خۆ بەخوای گەورە سور بووم لەسەر بەژدار بوونم لە جەنگی بەدردا ئەوەبوو گەیشتە ڕادەی قورعە کردن لەگەڵ کوڕەکەمدا سەعد ئەوەبوو ناوی ئەو دەرچوو بۆمانەوە و شەهیدی دەست کەوت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ( وقد رايت البارحة ابني في النوم في أحسن صورة يسرح فی ثمار الجنة وانهارها ويقول : الحق بنا ترافقنا في الجنة فقد و جدت ماوعدني ربي حقا ) واتە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا ئەم شەوی ڕابردوو کوڕەکەمم لەخەودا بینی لەسەر جوانترین شێوە بوو هەر حەزت دەکرد تەماشی ئەو دەم و چاوە جوانەی بکەی لەبەهەشتدا بوو لە میوەی درەختەکانی بەهەشتی دەچنی و لەبەهەشتدا پیاسەی دەکرد و ئاوی دەخواردەوە و کوڕەکەم پێی وتم : بابەگیان وەرە بۆ لامان وەرە با لەهەشتدا بەیەکەوە بین بەڕاستی ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێدا بووین من پێی گەیشتم و لەناوی دام و بەڕاستی وەعد و بەڵێنی خوا حەقە کاتێك ئەو باوکە ڕیش سپیە ئەو خەونەی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گێڕایەوە بە گریانەوە فەرمووی : ( وقد والله يا رسول الله اصبحت مشتاقا الى مرافقته فی الجنة وقد كبرت سني و رق عضمي و احببت لقاء ربي ، فادع الله يا رسول الله ان يرزقني الشهادة ومرافقة سعد في الجنة) واتە : بەڕاستی قەسەم بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا مەزرۆم و هەموو هیوا و ئاواتم تەنها و تەنها ئەوەیە کە بگەمەوە بە کوڕەکەم لەبەهەشتدا و چۆن لە دنیادا شەو ڕۆژ بەیەکەوە بووین و دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی وا بووین لەبەهەشتیشدا ئاوا بەیەکەوە بین و تامەزرۆی ئەو بەیەك گەیشتنەی ناو بەهەشتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕاستی پیر بووم و چوومە ساڵەوە سەر و ڕیشم سپی بووە و پشتم چەماوەتەوە و ئەژنۆم دەلەرزێ و ئێسقانم زەعیف بووە ئای حەز دەکەم کە بە دیداری پەروەردگارم شاد بم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی خۆشەویستی خوا دووعام بۆ بکە کە خوای گەورە شەهیدیم بە قسمەت بکات و بگەمەوە بە هاوڕێیەتی کوڕە تاقانە

خۆشەویستەکەم سەعد لەبەهەشتدا ( فادعا له رسول الله (ﷺ) بذالك ، فقتل بأحد شهيدا )
واتە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعای بۆ کرد کە خوای گەورە شەهیدی بکاتە قسمەتی و بە کوڕەکەی شاد بێتەو لەبەهەشتدا ئەوە بوو لە جەنگی ئوحودا شەهید بوو ڕەزای خوا لەخۆی و کوڕە تاقانەکەی بێ.[299]

## ٣٠٦.﴿ موجاهیدێك وازی هێنا لەزەماوەند کردن لە پێناو بەرگری کردن لە ئایینەکەی﴾

پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك سەرکردەیەکی لێهاتوو خەمخۆر و باوکێکی دڵسۆز بەدەنگ گیروگرفتی هەموو کەسێکەوە دەچوو چاودێری حاڵ و گوزەرانی بژێوی هەموو هاوەڵانی دەکرد کاتێك بینی یەکێك لە هاوەڵە هەژارەکانی کەناوی سەعد بوو لەبەر هەژاری ناتوانێت هاوسەر و خێزان پێکەوە بنێت ئیتر خۆی ڕاستەوخۆ ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ و کەوتە هەوڵدن بۆی پاش ئەوەی داوای کچی یەکێك لەهاوەڵانی بۆ کرد مارەیی و مەسەرف و ماڵ پێکەوە نانی خستە ئەستۆی سێ کەس لە هاوەڵان و بەسەعدی فەرموو بڕۆ بۆ لای عوسمانی کوڕی عەفان و دووسەد درهەمی لێ وەر بگرە بڕۆ بۆ لای عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دووسەد درهەمی لێ وەربگرە بڕۆ بۆ لای علی کوڕی ئەبو تالیب دووسەد درهەمی لێ وەربگرە ئیتر سەعد ڕۆیشت بۆ لای هەرسێکیان و ئەوانیش خوایان لێ ڕازی بێ هەریەکەیان زیاتری پێشکەش کرد لەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دیاری کردبوو ئیتر سەعد ڕۆیشت بۆ بازاڕ تا شتوومەکو کەل و پەل و پێداویستیەکانی خێزانی بکڕێت کاتێك لەبازاڕ بوو گوێی لە بانگەوازێك بوو بانگەوازی جیهادی لێ دەدا و دەیوت : ئەی سوارچاکی ئیسلام بەڕێکەون بۆ مەیدانی جیهاد کاتێك سەعد بینی وا هاوەڵانی هەموو کەوتنە خۆ بۆ بەدەنگەوە چوونی بانگەوازەکە ئیتر ئەویش سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و وتی : ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی ئەی پەروەدگاری موحەممەد (ﷺ) ئەم پارەیە ئێستا لەدەستمایە بیگێڕە بە جۆرێك سەرفی بکەم کە جێگەی

---

[299] الاصابة لابن حجر ٣١١٨.

ڕەزامەندی و پێخۆشبوونی خوای پەروەردگار و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) و بڕوادارن بێ ئیتر لەباتی كڕینی كەل و پەلی كاڵ دەستی كرد بە كڕینی ئەسپێك و شمشێرێك و تیروكەوانێكی كڕی و خۆی توند پێچایەوە بەجۆرێك تەنها هەردوو چاوی دیار بوو ئیتر سواری ئەسپەكەی بوو ڕۆیشت و خۆی گەیاندە برا موجاهیدەكانی ئەوانیش نەیانناسیەوە و وتیان : ئەو سوارە كێ یە نایناسین ئیمامی علی وتی وازی لێ بێنن ڕەنگە خەڵكی بەحرەین یان شام بێت هاتبێ پرسیاری دینەكەتان لێ بكات بەڵام پێی خۆش بێت خۆی ماوەیەك لەگەڵتان بێت بەڵام بینیان وا شمشێری هەڵكێشاوە و گەیشتە مەیدانی جەنگ و شێرانە دەستی كرد بە جەنگ تا ئەسپەكەی پێكرا و پاشان خۆی قۆڵی لێ هەڵماڵی و دەجەنگی كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی ناسیەوە سەعدە فەرمووی تۆ سەعدی ؟ وتی بەڵێ دایك و باوكم فیدات بێ ئیتر سەعد بێ گوێدانە دوژمن و بێ سڵ كردنەوە لە مردن مەزدانە كەوتە گیانی دوژمنانی تا پێكرا و شەهید بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە سەر تەرمەكەی و سەری لەسەر ڕانی موبارەكی خۆی دانا و تەپ و تۆزی لە دەم و چاوی بە جلەكانی خۆی سڕی و فەرمووی : ئای كە بۆنت خۆشە و چەند خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خواشی (ﷺ) پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی كرد بە گریان و ڕووی وەرچەرخان و فەرمووی : ( ورد الحوض و رب الكعبة ) واتە : ئاوی حەوزی كەوسەری خواردەوە سوێند بەخوای كەعبە ئەبوو لوبابە خوای لێ ڕازی بێت پرسی دایك و باوكم بە فیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەوز چیە ؟ فەرمووی دیاریەكی خوای پەروەردگارە پێی بەخشیوم پانیەكەی لە صەنعاوەیە بۆ حەزرەمەوت لێوارەكانی بەدووڕ و یاقوت داڕێژراوە و ئاواەكەی لە شیر سپیترە و لە هەنگوین شیرینترە هەر كەس جارێك لێ ی خواردەوە هەرگیز تینوی نابێت ئینجا ڕوی وەرگێڕا فەرمووی : گریانەكەم بۆ سەعد بوو پێكەنینەكەم دڵخۆشیم بوو لەبەر بەرزی پلە و پایە و ڕێز و پاداشتی لای خوای گەورە ڕوو وەرگێڕانەكەیشم بینیم هاوسەرانی حورلعەینی دەووریان دابوو لاقیان پڕی خڕخاڵ و پاوەنە بوو لەشەرما ڕوم وەرگێڕا ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا چەك و كەل و پەلەكەی بنێرنەوە بۆ هاوسەرەكەی.[٣٠٠]

---

[٣٠٠] رضينا بالاسلام دينا ابراهيم النعمة .

## ٣٠٧. ﴿ بەسەرهاتی ئەبو مەحزورە بانگدەرەکەی مزگەوتی حەرام ﴾

لەدووای ڕزگارکردنی طائیف پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەشکرەکەی بەرە و جەعرانە برد و ئەوێشی ڕزگار کرد کابرایەك لە جەعرانە موسڵمان بوو ناوی ئەبو مەحزورە بوو ئەم پیاوە دەنگی زۆر خۆش بوو بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی خۆش بوو ببێتە بانگبێژی مزگەوتی حەرام هەر بۆیە نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستی شاری مەککە کەناوی عیتابی کوڕی ئەسید بوو داوای لێکرد کە ئەبوو مەحزورە بکاتە بانگدەری مزگەوتی حەرام ئیتر بەپێی ئەو بڕیارە ئەبوو مەحزورە بوو بە بانگبێژی هەمیشەیماڵی خوا لە دووای خۆشی ئەم کارە گەورە و گرنگە و پیرۆزە بۆ کوڕەزاکانی مایەوە ڕۆژێك ئەبوو مەحزورە بانگ دەدات دەنگە خۆش و زوڵاڵەکەی کارایی زۆری لەسەر دڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادەنێت و دەستی پیرۆزی بەسەر و سنگی دا دەهێنێ و دوعای خێری بۆ دەکات ئیبن و موحەیریز دەڵێت ڕۆژێك ئەبوو مەحزورەم بینی قژی زۆر درێژ بوو لێم پرسی ئەوە بۆچی پرچت کورت ناکەیتەوە ؟ لەوەڵامدا وتی : پرچێك دەستی پێغەمبەری خوای (ﷺ) بەر کەوتبێت و دوعای بۆ کردبێت چۆن کورتی دەکەمەوە ؟ لە ڕاستی دا قژی زۆر درێژ بوو کاتێك دادەنیشت قژەکەی بەردەدایەوە دەگەیشتە سەر زەوی.[٣٠١]

[٣٠١] – الرسول في قلوب اصحابه وليد الاعظمي ص ١٧٩.

– الاستيحاب لابن عبدالبر ١٢١/١

## ٣٠٨.﴿بەسەرهاتە ناودارەکەی بەردەم ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) لە نێوان ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عەلی دا خوایان لێ ڕازی بێ﴾

ڕۆژێکیان ئیمامی ئەبوبەکر خوای لێ ڕازی بێ لەگەڵ ئیمامی علی خوای لێ ڕازی بێ ئەبن بە هاوەڵ پێکەوە بەرە و ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەڕۆن بۆ دیدەنی لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕائەوەستن و کێشەی پێشکەوتن ئەکەوێتە بەینیانەوە بەو شێوەی خوارەوە ئەبوبەکر دەڵێت ئەی علی فەرموو پێشکەوە ئیمامی علی وتی نەخێر ئەی ئەبوبەکر چۆن من پێش تۆ ئەکەوم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ فەرموویەتی لەوەتی دونیا هەیە و ڕۆژ هەڵدێت و ئاوا ئەبێت لە دووای پێغەمبەرانەوە هیچ کەسێك هێندەی ئەبوبەکر بەڕێز و گەورە نیە ئەبوبەکر دەڵێ : ئەی علی من چۆن پێشی تۆ دەکەوم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ نافەرمووێ : چاکترین ئافرەتی سەر دونیا کە فاتیمەیە لە چاکترین پیاوی سەر دونیا کە عەلی یە مارەم بڕیوە ، عەلی وتی ئەی ئەبوبەکر دڵ لە دڵ مەدە بەڕاستی من پێش تۆ ناکەوم چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ ئەفەرمووێ : ئەگەر بیرو باوەڕی هەموو ئادەمیزادەکانی سەر دونیا بکێشرێ لەگەڵ بیروباوەڕی ئەبوبەکردا هێشتا باوەڕی ئەبوبەکر قورسترە و بەسەرهەموویاندا سەر ئەکەوێ ئەبوبەکر وتی : ئەی عەلی هیچی کە ڕاگیرمان مەکە و پێش کەوە چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ فەرموویەتی لەڕۆژی دووایدا کە هەموو ئادەمیزادەکان پەرێشان و نارەحەتن لەبەر ڕاوەستانی ڕۆژی دووایی و کرداریان لەو کاتەدا ئیمامی عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین بەسواری دێن و ڕا ئەگیرێن ئادەمیزادەکان ڕوو لە ئیمامی علی ئەکەن و ئەڵێن ئەو پیاوە نورانیە ناناسین چ پێغەمبەرێکە ؟ وەڵامیان ئەدرێتەوە ئەوە پێغەمبەر نیە عەلی کوڕی ئەبوتالیبە عەلی وتی ئەبوبەکر پێشکەوە من پێشی تۆ ناکەوم ئەدی نەتبیستووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ فەرموویەتی ئەگەر من خۆشەویست و هاوەڵێکم لە دونیا بە غەیری خوا هەڵبژاردبایە ئەبوبەکرم هەڵئەبژارد ئەبوبەکر وتی : ئەی عەلی برۆ پێشکەوە من پێشی تۆ ناکەوم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی تۆ فەرموویەتی من لە دووا ڕۆژدا لە گەڵ عەلیدا ئەبم خوای گەورەش ئەفەرموێت ئەی خۆشەویستی خۆم موحەممەد بزانە ئیبراهیمم سەلامی خاوی لێ بێ بە دڵسۆزترین باوك بۆ هەڵبژاردوی وە عەلیشم بە دڵسۆزترین

هاوەڵ و برا بۆ هەڵبژاردوی عەلی وتی ئاخر ئەبوبەکر چۆن پێشی تۆ ئەکەوم کە خوای میهرەبان لەبارەی تۆوە فەرموویەتی لە سورەتی زومەر ( وَالَّذِي جَاء بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ {٣٣}) واتە ئەو کەسەی لەلایەن خواوە ئایینی و بەرنامەی ڕاستی هێناوە و باوەڕی پێی هەیە بەڕاستی ئەوانی پارێزگار و خۆ پارێزن یان وەکو ئەبوبەکر کە بەبێ بیر و تێڕوانین باوەڕی هێنا بەو قورئان و پێغەمبەرە پاك ڕەوەشتە وە ئەم ئایەتە هەموو باوەڕدارێك لە ڕابردوو لە ئێستاو لەمەودوواش ئەگرێتەوە کە ئەو قورئان و ئایینە بەڕاست بزانێ بە شوێنی فەرموودە بەرزەکانیدا بڕوات وەبەراستیش تەنها ئەوانەن بڕواداری لەخوا ترس و ڕاستەقینە و خۆیان لەو شتانە ئەپارێزن کە هۆی نارەزای خوان ئەبوبەکر فەرمووی : ئەی عەلی پێشەکەوە چونکە من پێش تۆ ناکەوم خوا ڕێزی زۆری لێ ناوی لەبارەی تۆوە فەرموویەتی لە سورەتی بەقەرە (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاء مَرْضَاتِ اللّهِ وَاللّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ {٢٠٧} ) واتە لەناو کۆمەڵی ئادەمیزاددا هیوا هەیە گیانی خۆی بەخیت ئەکات لەرێگای ڕەزامەندی خوادا وە ئیمامی عەلیش یەکێك بوو لەوانەی کە گیانی بەخت کرد لە پێناوی خواو پێغەمبەری خوادا ، کەلەناو جێگەکەی پێغەمبەردا نوست بەڵام خوای گەورە پاراستی و بەسەلامەتی ڕزگاری بوو لە دووایدا هاتە مەددینە بە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشت وەبەراستی خواش خاوەن میهرەبانی یوە بەرامبەر بە بەندەکان خۆی بەم شێوەیە ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عەلی خوای گەورە لێیان ڕازی بێ لەو حاڵەدا بوون جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ هاتە خوارەوە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەبوبەکر و عەلی لەبەر دەرگا راوەستاون پێغەمبەر هەر خێرا پێشوازی لێکردن کەسەیری کرد وا کێشەیانە لەسەر پێشکەوتن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئیمامی ئەبوبەکری لەلای ڕاستی ڕاگرتوو ئیمامی عەلیشی لە لای چەپ ڕاگرت و فەرمووی : بابرۆینە ژورەوە بەڕاستی ڕۆژی دووای لە قیامەت بەو شێوە کۆ ئەکرێینەوە و حەشرمان دەکرێت وە بەو جۆرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆتای بە کێشەی پێشکەوتن هێنا.[٣٠٢]

[٣٠٢] انيس المؤمنين دۆستی باوەرداران ئامادەکردنی صفوك سعدالله المختار / وەرگێرانی عەبدوڵا حەسەن سعید لاپەرە ٢٩/٣٠.

## ٣٠٩.﴿لەماڵی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) تەنها یەك پارچە خورما هەبوو﴾

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ – لەدوای ئەوەی كە دایكی موسڵمان بوو جارێكیان ئەبو هورەیرە بەتەواوەتی برسیەتی تینی بۆ دێنێ و لەدایكی دەپرسێ كە ئایا هیچ شك دەبەی كە بیخۆم ؟ دایكی وتی بەخوا هیچ جۆرە خواردنێك لەماڵماندا نیە ئەبو هورەیرە لەبرسان ماڵەوە بەجێ دەهێڵی و بەرە و مزگەوت بەرێ دەكەوێ كە دەچێتە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشا دەكا وا چەند كەسێكی تر لەیارانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وا لە مزگەوتن لە ئەبو هورەیرە دەپرسن و دەڵێن : ئەرێ ئەوە بەو گەرمایە چ شتێك هێناویتیە دەرەوە ؟ دەڵێ چیتان پێ بڵێم بەخوا غەیری برسیەتی هیچ شتێكی تر وای لێ نەركردووم لە ماڵ بێمە دەرەوە ئەوانیش وتیان : ئێمەش هەر لەبرسان لەماڵ هاتوینە دەرەوە و خۆ هیچ شوێنیكیش شك نابەین تەنها ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) با هەموومان برۆین بۆ خزمەتی دەڵێت : كە لەدەرگامان داو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرگای لێ كردینەوە چاوی پێمان كەوت فەرمووی : ( ماجاء بكم هذه الساعة ) واتە : ئەوە خێرە گەیشتونەتە ئێرە : وتمان : بەخوا برسیەتی پاڵی پێوەناوین لەم كاتەدا بێینە خزمەتت پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەدەم و چاوێكی گەش و روپەكی بەزەردەخەنەوە یەك بەیەك بەخێرهاتنی كردین و فەرمووی : با بزانین لەماڵی ئێمە هیچمان هەیە ؟ كە چووە ژوورەوە فەرمووی خەمتان نەبێ وا پارچەیەك خورمای لێ یە لەهەموو ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها پارچەیەك خورمای لێ یە كە چەند دەنكە خورمایەكە بەڵام ئەو زاتە بەرزە كە لەهەموو كەس سەخیتر و دەست واڵاتربوو هەر خێرا خورماكەی هێناو هەركەسەی دوو دەنك خورمای خستە دەستیانەوە و فەرمووی : ( كلو هاتین التمرتین وأشربوا علیها من الماء فانها ستجزیانكم یومكم هذا ) واتە : هەریەكەتان ئەم دوو دەنكە خورمایە بخواو ئاوی بەسەردا بخۆنەوەو خەمتان نەبێ ئەمرۆ لەبرسایەتی رزگارتان دەكات و بەستانە ئەبو هورەیرە دەڵێ : من دەنكە خورمایەكم خوارد و دەنكەكەی ترم هەڵگرت و شاردمەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( یا ابا هریرة لم رفعت هذة التمرة ؟) واتە : ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە بۆچی ئەو دەنكە خورمایەت هەڵگرت و نەتخوارد ؟ منیش وتم

قوربان بۆ دایکمم هەڵگرت بەخوا ئەویش وەك من برسیەتی و هیچ خواردنێکیش لەماڵماندا نیە هەرچەندە بۆخۆم زۆرم برسیە بەڵام ئەم دەنکە خورمایەیان با بۆ دایکم بێ و ئەویش تۆزێك لەبرسیایەتیەکەی لاچێ و لەو بەرەکەتەی جەنابت بەری بکەوێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( کلها فانا سنعطیك لها تمرتین ) واتە فەرمووی ئەو دەنکەشیان بۆخۆت بخۆ و دوو دەنکە خورمای ترت دەدەینێ و بیبەرەوە بۆ دایکت ، دەڵێت منیش ئەمجا دەنکە خورماکەی ترم خواردوو دوو دەنکیشم بۆ دایکم وەرگرت و بۆم بردەوە بۆ ماڵەوە.[٣٠٣]

## ٣١٠.﴿بەسەرهاتی گەنجێك کەخوای گەورە بەهۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەئاگر ڕزگاری کرد﴾

ئیمامی ئەحمەد و تەبەرانی لە صەحابی بەڕێز عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە (خوا لێ ی ڕازی بێت) گێڕاویانەتەوە کە فەرموویەتی ڕۆژێکیان لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین (ﷺ) لەوکاتەدا کەسێك بەپەلە و هەڵە داوان هاتە خزمەتی و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوڕێکی گەنج وا لەسەر مەرگدایە و خەریکە ڕۆحی دەردەچێ هەرچەندە لەلای دەڵێین (لا اله الا الله) بەڵام ئەو نایڵێ و شایەتمانی بۆ نایەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئایا ئەم کوڕە گەنجە لە ژیانیدا نوێژی دەکرد ؟ وتی : بەڵێ قوربان زۆر نوێژی باشی دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : دەهەستن با بەکۆمەڵ بڕۆین بۆ لای ئەو گەنجە بەڵێ کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و صەحابەکان گەیشتنە لای گەنجەکە بینیان حاڵی پەرێشانە و لە دەقە و سەعات دایە کە دونیا بەجێ بهێڵێ جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە نزیك سەری گەنجەکەوە و فەرمووی : ئەی کوڕی گەنج بڵێ (لا اله الا الله) گەنجەکە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زمانم ئەو قسەیەی بۆ نایات پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی : کێ لە ئێوە زۆر لەو کوڕە نزیك بووە و ئاگای لە ڕەوشت و کرداری بووە ئایا ئەو کوڕە گەنجە کردەوەکانی چۆن بووە لە ژیانیدا ؟ عەرزیان کرد : ئەم کوڕە گەنجە هیچ ڕەوشت

---

[٣٠٣] دین و ژین لە ژێر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی (رب العالمین) لاپەڕە ١٢١

و کردەوەیەکی خراپی نەبووە تەنها ئەوە نەبێ زۆر بۆ دایکی خراپ بووە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : دایکی زیندووە ؟ وتیان بەڵێ : فەرمووی : بڕۆن بۆم بانگ بکەن جا کاتێ دایکی کوڕەکە هات پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدایکی کوڕەکەی فەرموو : تۆ دایکی ئەم کوڕەی ؟ وتی : بەڵێ : فەرمووی : ( ارایت لو أججت نار ضخمة ، فقیل لك ان شفعت له خلینا عنه ، والا أحرقناه بهذه النار اكنت تشفعین له؟ ) واتە ئەی دایکی ئەم کوڕە گەنجە ئەگەر ئێستا ئاگرێکی گەورە بکرێتەوە و بیانەوێت کوڕەکەتی تێ بخەن خەڵکیش پێت بڵێن ئەگەر تۆ تکای بۆ بکەی ئەوا وازی لێ دەهێنین ئەگینا بەو ئاگرە دەسووتێنین ئایا تۆ تکای بۆ دەکەی کە نەیخەنە ناو ئاگرەکەوە ؟ ئافرەتەکە وتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تکای بۆ دەکەم هەرگیز دڵم قبووڵ ناکات لەبەرچاوی خۆم بەئاگر بیسوتێنن ، ئەکجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( فأشهدي الله واشهدني قد رضیت عنه ) واتە دەی کەواتە خوای گەورە بکە بە شاهید وەمنیش بکە بە شاهید کەتۆ لەو کوڕەت ڕازی بوویت چونکە ئەگەر تۆ لێ ی ڕازی نەبی خواش لێ ی ڕازی نابێ و بە ئاگری دۆزەخ دەیسووتێنێ ، دایکی کوڕە گەنجەکە وتی : خوایە وا تۆ دەکەم بە شاهید وە پێغەمبەرەکەشت دەکەم بە شاهید کە من لەم کوڕەم ڕازی بوم و وا گەردنیم ئازاد کرد لەو هەموو خراپەیەی کە بەرامبەر بە منی کردوویەتی ، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە لای سەری کوڕە گەنجەکە و فەرمووی ( یا غلام قل (لا اله الا الله) وحده لا شریك له واشهد ان محمدا عبده ورسوله ) واتە : ڕۆڵە گیان بڵێ جگە لە خوا هیچ خوایەکی دیکە نیە وەهیچ هاوبەشێکی نیە و شاهێدیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە کوڕەکەش یەکسەر بە دووای پێغەمبەری خوا (ﷺ) شایەتمانی هێنا و پاشان وەفاتی کرد جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( الحمد لله الذی انقذه بی من النار ) واتە : فەرمووی سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەهۆی منەوە لە ئاگر ڕزگاری کرد .

## ٣١١.﴿ ڕێز و حورمەتی ئیمانداران لای خوای گەورە ﴾

جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدەوری کەعبەدا دەسوڕایەوە فەرمووی : ( ما أطيبك وما أطيب ريحك ) واتە : ئای چەند شیرین و جوانی وەچەندە بۆنت خۆشە ( ما أعظمك وما أعظم حرمتك ) واتە : ئەی کەعبەی خانەی خوا و بیلبیلەی چاوی ئیمانداران چەند بەرزو گەورەیی و خوای گەورە چەند حورمەتی لێ گرتووی ( والذي نفس محمد بيده حرمة المؤمن عندالله أعظم من حرمتك ماله ودمه ) واتە ئەی کەعبەی خۆشەویست ئەی ئەو جێگایەی ملیۆنەها ئیماندار شەوانە و ڕۆژانە ڕوت تێ دەکەن و تەوافت دەکەن لەگەڵ ئەوەدا کە تۆ ئەوەندە بەڕێزی بەڵام سوێند ئەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە ڕێز و حورمەتی ئیماندار لای خوای گەورە زۆر گەورەترە لە ڕێز و حورمەتی تۆ لای خوا ماڵی ئیماندار و خوێنی ئیماندار.[٣٠٤]

## ٣١٢.﴿خوای گەورە دیمەنی جەنگی موئتەی هێنایە بەرچاوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

لەجەنگی موئتەدا لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی سێ هەزار کەسی نارد بۆ شام بەسەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریثە و فەرمووی ئەگەر زەید تووشی شتێ هات با جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب سەرۆك و ئاڵا بەدەست بێ ئەگەر جەعفەریش تووشی شتێ هات با موسڵمانان بۆخۆیان فەرماندەیەك هەڵبژێرن کاتێ سوپای ئیسلام گەیشتە مەعان بیستیان کە دوژمن دوو سەد هەزار کەسن کەوتنە ڕاوێژ لەناو خۆیاندا و خەریك بوو ڕایان بێتە سەر ئەوەی کە هەواڵ بدەنەوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا بزانن یارمەتیان بۆ دەنێرێ یان فەرمانی بەچیە عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە کەوتە هاندانیان و وتی : خزمینە بەخوا ئەو شتەی ئێستا پێتان ناخۆشە ئەوەیە کە ئێوە هەوڵی بۆ دەدەن ئەویش

---

[٣٠٤] رواه ان ماجه

شەهیدیە ئێمە بە باوەڕی ئایینەكەمانەوە دە جەنگین ئێمە یەكێ لەو دوو خۆشی چاكەیەمان دەستگیر دەبێ سەركەوتن یان شەهیدی لەسەرەتای جەنگەكەدا زەیدی كوڕی حاریثە شەهید بوو ئینجا جەعفەری كوڕی ئەبوتالیب بوو بەفەرماندەی لەشكری ئیسلام و ئەویش هەردوو قۆڵی لەشەرەكەدا قرتان و ئاڵاكەی بەبەینی هەردوو ڕانی گرت بوو دوواتر شمشێریان لەهەردوو ڕانی داو شەهید بوو ئینجا عەبدوڵای كوڕی ڕەواحە ئاڵاكەی هەڵگرت و ڕاڕایی و دوو دڵیەكی تووش بوو بەڵام هەر خێرا ئامۆژگاری نەفسی خۆی كرد و بەچەند دێڕە هۆنراوەیەك بەخۆی وت : ئەی نەفسەكەم خۆ ئەگەر لەم شەڕەشدا نەكوژرێی ڕۆژێك هەر دەبێ بمری خۆ لەدەست مردن ڕزگارت نابێ ئەی نەفسەكەم ئەوەی چەند ساڵە ئاواتی بۆ دەخوازی كە شەهید بوونە لە پێناوی خوادا و گەیشتنە بە كاروانی شەهیدانی ئیسلام وا ئەمڕۆ نزیك بۆتەوە دەبڕۆ مەیدان و ئاڵای ئیسلام بەرز بكەوە و لە دوژمن بدە یان سەركەوتنی ئیسلام یان گەیشتنەوە بە هاوەڵان زەید و جەعفەر بەڵێ چووەوە مەیدان و شەڕێكی زۆر مەردانە و دلێرانەی كرد و سەرئەنجام بە پایەی بەرزی شەهیدی گەیشت ئینجا موسڵمانان لەسەر وەسیەت و ڕاسپاردەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خالیدی كوڕی وەلیدیان كرد بەسەركردەی خۆیان و ئەویش پاش چەند ڕۆژێك شەڕ كردن توانی سوپای ئیسلام ڕزگار بكا و بەكەمترین زیان و كوشتار بیانگێڕیتەوە خالید لەبارەی ئەو ڕۆژەوە دەڵێت لەجەنگی موئتەدا ڕۆژێكیان نۆ شمشێر لەدەستمدا شكا وەشمشێر نەبوو لەدەستم دا خۆی بگرێت تەنیا شمشێرێكی یەمانی نەبێت لەشاری مەدینەدا وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو یارانیدا دانیشتووە و دەستی بە دەم و چاویەوە گرتووە و هەموو صەحابەكان وردوو بێدەنگ سەرنجی دەدەن و كەسێك قسەیەك ناكات و كەس گوێی لەدەنگی هەناسەیەكیش نیە پاش ماوەیەك خۆشەویستی خوا دەستی لەسەر دەم و چاوی لابردو فەرمووی ئێستا خوای گەورە دیمەنی جەنگی موئتەی هێنایە بەرچاوم چاوم لێ یە زەید ئاڵاكەی هەڵگرت و شەهید كرا پاشان جەعفەر ئاڵاكەی هەڵگرت و شەهید كرا ئینجا بێدەنگ بوو ئەنصارەكان ڕەنگیان تێك چوو ترسان لە هەڵوێستی عەبدوڵای كوڕی ڕەواحە چونكە پێش ڕۆیشتنیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دابوو كە دووای جەعفەر عەبدوڵا دەبێتە سەركردە ئەی بۆ باسی عەبدوڵای نەكرد تۆ بڵێی هەڵاتبێ ؟ هەموو

خزمەکانی و مەددینەییەکان ترسان پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : وا عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و شەهید بوو ئینجا فەرمووی : لەبەهەشتدا هێنرانە بەرچاوم لەسەر تەختی ئاڵتونی دانیشت بوون عەبدوڵام بینی تەختەکەی تۆزێ نزمترە لە زەید و لە جەعفەر صەحابەکان فەرموویان : قوربان بۆچی ؟ خۆ هەر سێکیان لەیەك شەڕدا و لەیەك مەیداندا و بەدەستی یەك دووژمن شەهید بوون ئیتر هۆی چیە عەبدوڵا لەبەهەشتدا نەگەیشتۆتە پلەی ئەوان ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : هەر دوو فەرماندەکە زەید و جەعفەر بەێ دوو دڵی و وەستان چونە مەیدانی شەڕ و شەهید بوون بەڵام عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە هەندێ دوو دڵی و ڕاڕایی و سڵەمینەوەی تووش بوو بۆیە لەبەهەشتدا بەهۆی ئەو دوو دڵی و ڕاڕاییەوە پلەیەك هاتە خوارەوە و نەگەیشتەوە بە دوو هاوەڵە شەهیدەکەی پێش خۆی.[٣٠٥]

## ٣١٣.﴿بەسەرهاتی سەلەمەی کوڕی هیشام پاڵەوانەکەی نێو زیندان﴾

یەکێك لەو ئیماندارانەی کە لە زیندانە تاریکەکاندا ئازار و ئەشکەنجەی زۆر نامرۆڤانەی چەشت بەدەستی برای خۆی سەلەمەی کوڕی هیشام بوو (خوا لێ ڕازی بێ) ئەو پێشمەرگە خۆڕاگرەی ئیسلام برای ئەبو جەهلی دڵ ڕەق و بێ باوەڕ بوو کەسەرکردایەتی بەرەی کوفری دەکرد لە دژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئیسلام و بڕواداران ئەوەندە دڵ ڕەق و بێ باوەڕ بوو هەر کەس شوێن ئیسلام بکەوتایە توندترین سزای دەدا با نزیکترین کەسیشی بوویە سەلەمە (خوا لێ ی ڕازی بێ) یەکێك بوو لەوانە هەر بەهەڵهاتنی خۆری زێڕینی ئیسلام ڕێگای ژیانی بۆ ڕوناك بویەوە و ئیمانی هێنا و لەگەڵ دەستە سەرەتاییەکانی شۆڕشە نوێیەکەدا بەنهێنی بە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگەیشت و فێری ئەو ئایەتانە دەبوون کە دەهاتنە خوارەوە و تەوجیهی دەکردن بەڵام سەلەمەش وەکو هەموو موسڵمانانی تر کەوتە بەر شاڵاوی ئەشکەنجەدان تا ئەویش وەك هاوەڵانی تری بۆخۆ دەرباز کردن ڕێگای ئاوارەییان گرتە بەر و بەرەو حەبەشە کەوتنی ڕێ بەڵام پاش ماوەیەك وای زانی بارودۆخی شاری مەککە چاك بووە

---

[٣٠٥] دین وژین لەژێر ڕۆشنایەکانی (رب العالمین) لاپەڕە (٦٥١-٦٥٢).

بۆیە گەڕایەوە مەککە بەڵام دووبارە ئاسایشەکانی ئەبوجەهل قۆڵبەستیان کرد و بەرەو زیندانە تاریکەکان ڕاپێچیان کرد لەگەڵ زیندانی کرانیشیدا ئازار و ئەشکەنجەشیان دەدا تا لەئاینەکەی پەشیمان بێتەوە بەڵام سەلەمە زۆر لەوە گەورەتر بوو کە ئەوان بتوانن لە ئاینەکەی پەشیمانی بکەنەوە ئینجا بڕوادارن دەستیان کرد بە کۆچ کردن بۆ مەدینە و پێغەمبەری خواش (ﷺ) هیجرەتی کرد بەڵام لەو کاتەدا سەلەمە و کۆمەڵێ لە هاوەڵان لە زیندانا بوون چەند ساڵێك تێپەڕی ئەوان هەر لە زیندانا بوون هەواڵی ئەشکەجەدرانیان و خۆڕاگری و نەبەزی ئەوان گەیشتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر دڵی سوتا بۆیان و لە قنوتەکانیدا هەمیشە دوعای بۆ دەکردن هەروەکو یەك مانگی تەواو لە قنوتی بەیانیدا دوعای ڕزگار بوونی بۆ دەکردن و دەیفەرموو ( اللهم أنج الوليد ابن الوليد اللهم أنج سلمة بن هشام اللهم أنج عياش بن ربيعة اللهم أنج المستضعفين فی المؤمنين اللهم اشدو طأتك على مضر اللهم اجعلها عليهم سنين كسني يوسف ) (أخرجه اصحاب الكت الستة ومنهم البخاري ومسلم في صحيحيهما) بەڵێ ئەو کۆمەڵە موجاهیدە هەتا جەنگی ئەحزاب لەساڵی پێنجەمی کۆچیدا هەر لە زیندانا بوون تا ئەبو هورەیرە دەڵێ بەیانیەك لە قنوتدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای بۆ نەکردن بە پێغەمبەری خوام (ﷺ) ووت بۆچی دوعات بۆ نەکردن فەرمووی ( أوتراهم قدموا) واتە ئایا نایانبینی بۆ لامان هاتن ؟ سەلەمە و کۆمەڵێ لە هاوەڵان نزیکەی پانزە ساڵ لە زیندانا مانەوە سەلەمە پانزە ساڵ لە زیندانەکانی ئەبوجەهلی برایدا بەدەستی ئاسایشەکانی ئەشکەنجە دەدرا تا ڕۆژێك خوا بۆیان ئاسان دەکات سەلەمە و عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و وەلیدی کوڕی وەلید دەتوانن لە زیندان هەڵبێن و بەرە و مەدینە بکەونە ڕێ هەرچەند بەدەیان مەفرەزەی ئاسایشیان بۆ دەردەچێت و ڕێگاکان دەچنن کە دیارە ئەو کاتە خالیدی کوڕی وەلید بەرپرسی ئاسایشەکانی مەککە بوو بەمەفرەزەکانیەوە دووایان دەکەوێت تا گوندی عەسفان کە لەنێوان مەککە و مەدینەدا بوو بەڵام خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنە شاری مەدینە و خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو هاوەڵان و جەماوەری شار پێشوازیەکی گەرمیان لێ دەکەن خوای گەورە و میهرەبانیش باسی خۆڕاگری ئەو کۆمەڵە پێشمەرگانەمان گیان لەسەر دەستانەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت لە سورەتی (النحل) (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ

هَاجَرُواْ مِن بَعْدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَاهَدُواْ وَصَبَرُواْ إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ) {١١٠} واتە : پاشان ئەی موحەممەد پەروەردگاری تۆ بە نیسبەت ئەوانەی کە هیجرەتیان کرد پاش ئەوەی ئازار و ئەشکەنجە دران هەروەها جیهادیان کردو خۆڕاگر و نەبەز بوون بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر لێبوردەو میهرەبان بوو ئیمامی تەبەری رەحمەتەی خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت : ئەم ئایەتە لەسەر ئەو موجاهیدە خۆڕاگرانە هاتە خوارەوە کە لە مەککە زۆر ئەشکەنجە دران پاشان خۆڕاگران هیجرەتیان کرد لەوانەش سەلەمەی کوڕی هیشام و عەیاشی کوڕی ئەبی رەبیعە و وەلید و غەیری ئەوانیش ئەم موجاهیدانە لەدووای رزگار بوونیان گەیشتنە شاری مەددینە و بە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتنەوە هەوڵیان دەدا قەرەبووی ئەو ساتانە بکەنوە کە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوور بوون بۆ لەبەر کردن و تێگەیشتنیان لە قورئان هەروەها بەشداری هەموو غەزا و جەنگەکانیان کرد تەنانەت سەلەمەی قارەمان و خۆڕاگر لە جەنگی موئتەشدا بەشداریەکی بەرچاوی کرد کە لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا ڕویدا لەم جەنگەدا ژمارەی موجاهیدانی ئیسلام سێ هەزار کەس بون و ژمارەی سوپای شرە خۆر و تاڵانچی دوژمنیش زیاتر لە دووسەد هەزار کەس بوون هەبدوڵای کوڕی عومەر خوایان لێ ڕازی بێت دەڵێ : کاتێك سوپای ئیسلام بەڕێ کەوت پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەیدی کوڕی حاریسەی کردە ئەمیریان و فەرمووی ( ان قتل زید فجعفر وان قتل جعفر فعبدالله بن رواحة ) ( رواه البخاري ) (٤٢٦١) واتە ئەگەر زەید کوژرا با جەعفەر ئەمیر بێت ئەگەر ئەویش کوژرا با عەبدوڵای کوڕی رەواحە ئەمیر بێ عەبدوڵا دەڵێ کاتێك بەنێو تەرمی شەهیدەکاندا دەگەڕاین تەرمی جەعفەرمان بینی زیاتر لە نەوەت برینی پێوە بوو هەموو شوێنی دەمی شیر و نوکی ڕم و تیر بوو ، پاش شەهید بوونی هەرسێکیان خالیدی کوڕی وەلید هەڵبژێردرا بەسەرکردەی سوپای موسڵمانان لەبەرپرسیەتی ئاسایشەوە دەبێتە فەرماندەی موجاهیدان و ئەویش زۆر زیرەکانە توانی سوپای ئیسلام پاشەکشە پێ بکات پاش وەشاندنی گورزێکی جەرگ بڕ بەسوپای دوژمن کاتێ سوپای ئیسلام گەڕایەوە مەددینە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جەماوەری شار چوونە پێشوازیان خەڵکەکە وتیان ڕاتان کردووە ( یا فرار فررتم في سبیل الله ) بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ( لیشوا بافرار

ولكنهم الكرار ان شاء الله ) واتە ئەمانە بە پشتیوانی خوای گەورە ڕایان نەکردووە و خۆ سازدانیان کردووە بۆ هێرشی تر لە دووای ئەم ڕوداوەوە سەلەمە لە ڕوی نەدەهات بچێتە ناو خەڵکەوە بۆیە کاتێك خێزانەکەی دەچێتە لای دایکی بڕواداارن ئوم سەلەمە هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش دەپرسێت ئەوە بۆچی سەلەمەی کوڕی هیشام نابینم لە نوێژدا لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ نەخش نیە ئێمە نەمانزانی بێت ؟ هاوسەرەکەی سەلەمەش دەڵێ نەوەڵا نەخۆش نیە بەڵام ناتوانێت بچێتە ناو خەڵك کە پێیان دەڵێن ڕاکردووەکان ئوم سەلەمەش بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەریش خوا (ﷺ) دەفەرموێت ( بل هم الكرار في سبيل الله فليخرج ) (الاصابة ٢م٦٧ ) واتە ئەوانە پاڵەوانی خۆسازدەری ڕێگای خوان با بێتە دەرەوە بۆ ناو خەڵك ئیتر سەلەمە وەك موجاهیدێکی گیان لەسەر دەست کە هەمیشە ئامادەیی مەیدان بوو تا لەسەردەمی خیلافەتی پێشەوا ئەبوبەکردا کاتێك سوپای ڕێك خست بۆ ڕوبەڕوبونەوەی سوپای ڕۆم سەلەمەش لەپێشەوەی موجاهیدان بوو تا لەیەکەم ساڵی سەردەمی عومەردا خوای لێ ڕازی بێت لە جەنگی ڕۆمەکاندا لە مانگی موحەڕەمدا لە ساڵی چواردەی کۆچیدا شەهید بوو پاش لەدەساڵ زیندانی و نۆ ساڵ جیهادی بەردەوام خوای گەورە لێ ی ڕازی بێ.[٣٠٦]

[٣٠٦] ١- الاصابة ابن حجر ٦٧/٢

٢- فرسان حول الرسول ٥٠٥/١ - ٥١٤.

٣- صحيح السيرة النبوية ابراهيم العلى ص ٤٩٦ - ٥٠٧.

## ٣١٤. ﴿عەبدوڵای کوڕی زەید ووشەکانی بانگی ئیسلامی فێرکرا لەخەودا﴾

عەبدوڵای کوڕی زەید دەڵێت : موسڵمانان چونە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوایان لێ کرد کە درووشمێك دەنگێك نیشانەیەك دیاری بکرێت بۆ ئەوەی موسڵمانانی پێ ئاگادار بکرێتەوە کە کاتی نوێژ هاتووە و ڕوو بکەنە مزگەوت و نوێژی جەماعەت ئەنجام بدەن کۆمەڵێك شت پێشنیار کرا لەناویاندا باسی ئەوە کرا کە ناقوس لێ بدرێ و هەر کەگوێیان لەدەنگی ناقوسەکە بوو بزانن کە ئەوە کاتی نوێژ هاتووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی هەرچەندە ناقوس هی گاورانە بەڵام بەنابەدڵیەوە فەرمووی : با لەمەو دووا ناقوس لێ بدرێت عەبدوڵای کوڕی زەید دەڵێت ئەو شەوە کە لە ڕۆژەکەی دا ئەو بڕیارە درا لەخەونمدا کەسێکم بینی زەنگێکی گەورەی پێ بوو وتم ئەوە بەچەند دەیفرۆشی وتی : پێم بڵێ بۆچیتە ؟ وتم : زەنگی پێ لێ دەدەین و موسڵمانانی پێ ئاگادار دەکەینەوە  کە کاتی نوێژ هاتووە وتی : ئا ئەم زەنگەیە بەکەڵکی ئەوە نایات بەڵام وەرە من شتێکی لەمە باشترت فێر بکەم ئیتر دەستی کرد بە (الله الكبر الله اكبر) تا کۆتای بانگەکە بەخەبەر هاتم نزیك نوێژی بەیانی بوو زۆر بەخەوەکە دڵخۆش بووم دەست نوێژم گرت و بەرە و مزگەوت ڕۆیشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەلەخزمەتیدا دانیشتم و خەونەکەم بۆ گێڕایەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی ئەوەندەی تر گەشایەوە سوپاسی خوای گەورەی کرد و فەرمووی بەڕاستی ئەم خەونە حەق و ڕاستە و بەڵام بیلال لەتۆ دەنگی خۆشترە و بەهێزترە هەر ئێستا بڕۆنە سەربانی مزگەوت و تۆ بانگەکە کەلەخەوندا پێیات وتی بەهێواشی بیڵێ و با بیلالیش بەدەنگی بەرز بیڵێ دەڵێ : لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ بیلال چووینە سەربانی مزگەوت من بەهێواشی بانگەکەم دەوتو بیلالیش بەدەنگە زوڵاڵەکەی بانگەکەی دەوتوو تاریکی ئەو شەوەی شەق کرد هاتینەوە ناو مزگەوت و عومەری کوڕی خەتتاب بەپەلە کەعەباکەی بەدووای خۆیدا ڕادەکێشا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی ( والذي بعثك بالحق لقد رأيت مثل الذي أرى ) واتە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەوخوایەی کەتۆی بەحەق ڕەوانە کردووە بە پێغەمبەر منیش هەمان ئەو ووشانەی بانگیان لەخەودا پێ وتم و ئەو خەونەی عەبدوڵای کوڕی زەید بینیویەتی و ئێستا گوێم لەبانگەکە بوو منیش هەمان خەونم بینی و ئەو ووشە ناسکانەی بانگیان بەمنیش وت پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیاتر دڵخۆش بوو فەرمووی : دەی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.[٣٠٧]

---

[٣٠٧] رواه احمد وابو داود والترمذي وقال حسن صحيح

## ٣١٥.﴿پێغەمبەر( ﷺ ) داوای کرد کە خوای گەورە لەنیازی ناودڵی فوضالەی کوری عومەیر خۆش بێت ﴾

پێشەوا ئەحمەدی کوری عەنبەل خوای لێ ڕازی بێ دەفەرموێت هەمیشە هەوڵ بدە نیەتت خێر بێت هەتا نیەتت خێر بێت ئەوا خۆیشت لەخێرا ئەژیت دووای ئەوەی شاری مەککە فەتح کرا و موسڵمانان بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر بەرزیەوە گەڕانەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) دای بەلای زەلامێکدا کەناوی فوضالە ی کوری عومەیر بوو کەبەنیاز بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژێت پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لێ ی پرسی ها فوضالە ها ئەوە بیرت لەچی دەکردەوە و خەیاڵی چی لێ ی دابویت ؟ فوضالە وتی  هیچ نەبوو ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دڵی خۆمدا یادی خوام دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی کرد بە پێکەنین و فەرمووی : داوا دەکەم کە خوای گەورە لەو نیازەت خۆش ببێت ئینجا دەستی موبارەکی خستە سەر سنگی فوضالە ، فوضالە دەڵێت سوێند بەخوا هێشتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی لانەبردبوو لەسەر سنگم وام هەست دەکرد کەسم خۆشنەویستووە بەقەدەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) .

## ٣١٦.﴿ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنەکەی بردە سەر بۆ ئەبی هە یثە م ﴾

ئەبو هورەیرە ئەو بەسەر هاتە دەگێڕێتەوە و دەڵێت ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتێکدا لەماڵ دەچووە دەرەوە کە پێشتر هەرگیز لەو کاتەدا نەچووبووە دەرەوە توشی ئەبوبەکر بوو خوا لێ ڕازی بێ ، فەرمووی ( ما جاء بك يا أبي بكر ؟ ) ئەوە چی تۆی هێناوەتە دەرەوە لەم کاتەدا بۆ ئەم شوێنە ئەی ئەبوبەکر ؟ ئەبوبەکر خوا لێ ڕازی بێ وتی : ( خرجت ألقي رسول الله (ﷺ) وانظر في وجهه والتسلم عليه ) واتە : بە ئومێدی بەخزمەت گەیشتنی تۆ هاتومەتە دەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا عومەریش خوای لێ ڕازی بێت هاتە دەرەرەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( ماجا بك يا عمر؟ ) واتە ئەی عومەر چی تۆی لەم کاتەدا تۆی لەماڵ هێناوەتە دەرەوە ؟ عومەر خوای لێ ڕازی بێت وتی ( الجوع يا رسول الله ) واتە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەخوا برسیەتی منی هێناوەتە دەرەوە لەتاو برسیەتی ئارامم لێ بڕاوە و لەماڵ هاتمە دەرەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( وانا قد وجد ت بعض ذالك ) واتە : منیش هەر شتێکی ئاوا کە برسیەتیە لەماڵ هێناومیەتیە دەرەوە ئەمجا هەرسێکیان ڕۆیشتن بۆ ماڵی (ابي هيثم بن التيهان الانصاری ) ئەم پیاوە خەڵکی مەددینە بوو ئاژەڵی زۆر و باخی خورمای چاکی هەبوو کە چوونە باخەکەیەوە لەوێ نەبوو لە خێزانەکەیان پرسی ئەوە ئەبی هەیثە م لە کوێ یە ؟ وتی چووە ئاوی سارد لەو کانیە بهێنێت ژنەکە زۆر بەجوانی پێشوازی لێ کردن و جێگای بۆ داخستن و بەخێرهاتنی کردن پاش کەمێك ئەبو هەیثە میش هاتەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەردا خوایان لێ ڕاوی بێت لوتفیان کردووە و سەردانیان کردووە دووای بەخێرهێنانێکی گەرم هەر خێرا چوو خورمای تازەی بۆ لێ کردنەوە و لەگەڵ ئاوی سارد بۆی دانان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەردووك هاوەڵەکەی لەخورما و ئاوەکەیان خوارد پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( هذا والذي نفسي بيده من النعيم تسألن عنه يوم القيامة ضل بارد ، ورطب طيب ، و ماء بارد ) واتە ئا ئەوەی خواردمان سوێند ئەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە کە زاتی خوای گەورەیە ئەوە ئەو نعمەتەیە کە خوای گەورە لە قیامەتدا لێمان دەپرسێتەوە

لەسەری سێبەرێکی فێنك و خورمایەکی تازە و ئاوێکی سارد و سازگار (٣١٢) پاش ئەوەی کە خواردنەکەیان خوارد پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵێنی بە ئەبی هەیثە م دا کە ئەگەر هاتوو مەڕ و ماڵاتی بێ باوەڕانم دەست کەوتوو خەڵکانیشم لێ بەدیل گرتن ئەوە کۆیلەیەکت بدەمێ ڕۆژگار تێپەڕی ڕۆژێك سێ کەسیان بەدیلی هێنایە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش دووانی دایە موسڵمانان پاشان یەکێکیان مایەوە لەو لاوە فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتوو داوای کرد تا ببێتە یارمەتی دەرێك بۆی بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) داواکەی فاتیمەی کچی قبوڵ نەکرد و فەرمووی پێش تۆ بەڵێنم بە ئەبی هەیثە م داوە و دەبێ بەڵێنەکەم نەشکێنم و بەوەفا بم بەرامبەری.[٣٠٨]

---

[٣٠٨] رواه الترمذي صحيح الجامع ١٨٠٥

## ٣١٧.﴿عومەری كوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێت دادوەری كرد لەنێوان جولەكەیەك و مونافیقێكدا﴾

لە عەبدوڵای كوری عەباسەوە خوا لەخۆی و باوكی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە كە ڕۆژێكیان كابرایەكی جولەكە و كابرایەكی مونافیق واتە دووڕوو لەسەر شتێك دەبێتە كێشەیان ئەوانیش كێشەكە دەگەیەننە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووای گوێ گرتن لە هەردوو لا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەق دەدا بە كابرای جولەكەكە بەڵام مونافیقەكە بەم حوكمە ڕازی نەبوو بۆیە وتی : حەز دەكەم سەرێكیش لە ئەبوبەكر ڕەزای خوای لێ بێ بدەین و بزانین ئەو دەڵێ چی سەبارەت بەم كێشەیەمان كاتێ چونە لای ئەبوبەكر ئەویش هەمان حوكمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا بەڵام كابرای مونافیق هەر دڵی دانەمركا بۆیە وتی حەز دەكەم سەرێكیش لە عومەری كوری خەتتاب خوای لێ ڕازی بێت بدەین و بزانین ئەو دەڵێ چی كە هاتنە لای عومەر كابرای جولەكە قەسی كرد و وتی : ئەی عومەر ئێمە چوینە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و حوكمێكی دا بەڵام ئەم پیاوە دڵی ئاوی نەخواردەوە و بۆیە وتی : با بچین بۆ لای ئەبوبەكر كاتێ چوین ئەویش هەمان حوكمی دا بەڵام ئەم كابرایە هێشتان دڵی دانەمركا وا ئێستا هاتوینە لای تۆ بزانین حوكمی تۆ چیە ؟ عومەر خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حوكمی بۆكرد و ڕازی نەبوو ؟ وتی بەڵێ فەرمووی : پاشان ئەبوبەكریش حوكمی دا هەر ڕازی نەبوو ؟ وتی بەڵێ عومەر فەرمووی دەتۆزێك بووەستن ئێستا دێمەوە چووە ژورەوە و شمشێرێكی لەگەڵ خۆی هێنا و لەملی كابرای مونافیقی داو فەرمووی : ئەمەش حوكمی عومەرە.[٣٠٩]

---

[٣٠٩] تفسير القرطبي ج٥ ص ٢٦٤.

## ٣١٨.﴿ کە گوێی لە قسەی ئەعرابیەکە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەردەوام دەیفەرموو ( سبحان الله سبحان الله ) ﴾

لەفەرمودەیەکی صەحیحدا کە ئیمامی ئەبو داود ریوایەتی کردووە دەڵێت جارێکیان کابرایەکی ئەعرابی دەشتەکی لەبیابانەوە بەهەڵە داوان و شپرزەیی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی ( یا رسول الله جهدت الانفس ، وضاعت عیال ، ونهکت الاموال ، وهلکت الانعام فاستسقي الله لنا فانا نستشفع بك على الله و نستشفع بالله عليك ) واتە کابرای ئەعرابی وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تینمان بۆ هاتووە خەریکە ماڵ و منداڵمان لەدەست دەچێت ماڵمان تەواو بوو ماڵات و مەڕمان بەهیلاك چوو لەدەست ووشکە ساڵی و بێ بارانی جا داوامان بۆ لەخوا بکە بەڵکو بارانمان بۆ ببارێنێ خۆ ئێمە کەسمان نیە پەنای بۆ بەرین ئەگەر ئیشمان بەخوا بێت دەبێت تۆ تکامان بۆ بکەی لەخوا ئەگەر ئیشیشمان بەتۆ بێ ئەوا دەبێ داوا لەخوا بکەین تکامان بۆ لەتۆ بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە گوێ ی لەم قسەیە بوو لەکابرا توورە بوو فەرمووی : ( ويحك اتدري ما تقول ؟ ) واتە : هەی هاوار بۆتۆ ئەوە تۆ دەزانی دەڵێ ی چی ؟ ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام دەیفەرموو (سبجان الله ، سبحان الله) تا ئەوەندەی (سبحان الله)ی فەرموو کە لەدەم و چاوی صەحابەکاندا بەدی دەکرا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نا رەحەت و دڵتەنگە پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کابرای ئەعرابی فەرموو : ( ويحك انه لا يستشفع بالله على احد من خلقه ، شأن الله أعظم من ذلك ) واتە : فەرمووی : هەی ماڵ وێران بزانە بەڕاستی خوای گەورە ناکرێ بە تکاکار لەسەر هیچ کەس لە دروستکراوەکانی پایە و حاڵی خوای گەورە زۆر گەورەترە لەوەی کە لەگەڵ مەخلوق و دروستکراوێکی خۆی یەکسان بکرێت .

## ٣١٩.﴿ کۆمەڵێك پرسیار و وەڵامی پڕشنگدار لەنێوان پێغەمبەری خواو (ﷺ) پیاوێکی دەشتەکی ﴾

خالیدی کوڕی وەلید (خوای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتومەتە خزمەتت تا هێندە پرسیارت لێ بکەم لەدنیا و قیامەتدا پێویستم بە شتی تر نەبێت پێغەمبەری خۆشەویستیش (ﷺ) فەرمووی : چی ئارەزوو دەکەی بپرسە .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ ببمە زاناترین کەس ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لە خوا بترسە زاناترین کەس دەبیت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ ببمە دەوڵەمەنترین کەس ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : قەناعەت بکە دەبیت بە دەوڵەمەنترین کەس .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ دادپەروەرترین کەس بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی چی بۆخۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت دادگەرترین کەس دەبیت

پیاوەکە وتی : دەمەوێ خێرۆمەندترین کەس بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : سوود ببەخشە بە خەڵکی خێرۆمەندترین کەس دەبیت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ لەهەموو کەس زیاتر لە خوا نزیك بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی زۆر یادی خوا بکە لەهەموو کەس زیاتر لەخوا نزیك دەبیت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ باوەڕم تەواو بێت ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ڕەوشتت چاك بكە باوەڕت تەواو دەبێت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ لە چاکە خوازان بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : وا خوا بپەرستە وەك ببینیت چونكە با تۆ نەیبینین خۆ ئەو ئەتبینێت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ لە گوێ ڕایەڵان بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : فەرزەکانی خوا پیادە بکە لە گوێڕایەڵان دەبیت .

پیاوەکە وتی : ئەمەوێ بە پاکی بە بینینی خوای گەورە شاد بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەلەش قورسی مەمێنەرەوە و خۆت بشۆ بێگوناح بە بینینی خوا شاد دەبیت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێت لە قیامەتدا لە نووردا حەشر بکرێم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ستەم لەکەس مەکە لە قیامەتدا لە نووردا حەشر دەکرێیت.

پیاوەکە وتی : دەمەوێ لە قیامەتدا خوا رەحمم پێ بکات ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : رەحم بەخۆت و خەڵکی بکە ، خواش لە قیامەتدا رەحمت پێ دەکات .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ تاوانم کەم بێت ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : زۆر تەوبە و ئیستغفار بکە تاوانت کەم دەبێت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ بەڕێزترین کەس بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : شکاتی حاڵت مەبەرە لای کەس بەڕێزترین کەس دەبیت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێت بەهێزترین کەس بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : پشت بەخوا ببەستە .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ ڕۆزیم فراوان بێت ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەدەست نوێژەوە بە .

پیاوەکە وتی : دەمەوێ لە خۆشەویستانی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەو شتانەت خۆش بوێت کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێت .

پیاوەکە وتی : دەمەوێت لە قیامەتدا لەخەشم و توڕەیی خوا دڵنیا بم ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لەکەس توڕە مەبە .

پیاوەکە وتی : دەمەوێت نزا و دوعام قبوڵ بێت ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لەحەرام دوور بکەوەرەوە

پیاوەکە وتی : دەمەوێت خوای گەورە لە قیامەتدا تاوانەکانم بۆ بشارێتەوە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : لە دنیادا تاوان و عەیبی براکانت بشارەوە .

پیاوەکە وتی : چی لەتاوان ڕزگارم دەکات ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : فرمێسك و ملکەچی و نەخۆشی .

پیاوەکە وتی : چ چاکەیەك لای خوا گەورەیە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ڕەوشت چاکی و تەوازع و ئارام و خۆگری لەسەر بەلا و ناڕەحەتی .

پیاوەکە وتی : چ تاوانێك لای خوا گەورەیە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ڕەوشت خراپی و ڕەزیلی و تەماع .

پیاوەکە وتی : تووڕەی خوا لە دنیاو قیامەتدا بەچی دادەمرکێتەوە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بەخێرکردنی نهێنی و بەجێهێنانی سیلەی رەحم .

پیاوەکە لە دوواهەمین پرسیاردا وتی : بەچی ئاگری دۆزەخ دەکوژێتەوە ؟

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بە ئارام گرتن لەسەر ناڕەحەتی دنیادا.[٣١٠]

---

[٣١٠] رواه الامام احمد .

## ٣٢٠.﴿ لاوێك سێ داواکاری هەبوو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ﴾

وەفدێك هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش هەرچیان وویست بۆی جێ بەجێ کردن پاشان کەخەریك بوو برۆن پێی فەرموون کەسی ترتان لەگەڵدایە ؟ وتیان بەڵێ لاوێکمان لەگەڵ دایە لای شتەکانمان بەجێمان هێشتووە فەرمووی : دەی بینێرن بۆلام کەلاوەکە هات پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو چیت داوایە تا بۆت جێ بە جێ بکەین ئەویش وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستی من وەك هاوەڵانم نیە من دەمەوێ دووعام بۆ بکەی کەخوا لێم خۆش بێت و رەحمم پێ بکات و دڵم دەوڵەمەند بکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بەرز کردەوە و دوعای بۆ کردوو فەرمووی : ( خوایە لێ ی خۆش ببە و رەحمی پێ بکە و دڵی دەوڵەمەند بکە ) ئینجا لاوەکە و وەفدەکە هەموویان گەڕانەوە جێ و ڕێی خۆیان پاشان لەساڵی دەی کۆچیدا لە مینا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو وەفدەی بینیەوە ئەحواڵی ئەو لاوەی لێ پرسی ئەوانیش وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز کەسی وەك ئەومان نەدیوە ئەو زۆر ڕازیی بەبەشی خوا ئەگەر خەڵکی هەموو دونیا دابەش بکەن ئاوڕیان لێ ناداتەوە پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : (من هیوادارم کە بە کۆیی بمرێت ) پیاوێکیش پرسیاری کرد باشە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو کەسێ بە کۆیی نامرێت (٣٥) ئەویش فەرمووی : ( نەخێر کەسی وا هەیە خەیاڵ و هەست و هۆشی پەرتەوازە بووە بە دنیادا و پەل دەکوتێ بە هەموو لایەکدا کاتێ ئەجەلی دێ خوا دەیباتەوە ئیتر هەر پەلەی لەهەر لایەك بێت و سەرگەرمی هەر شتێك بێت واتە : پێچەوانەی موسڵمانی کامڵە کە هەموو هەست و هۆش و خەیاڵی لای ڕەزامەندی خوایە و یەك پارچەیە و یەك مەبەست و یەك ئاوات و ئامانجە.[٣١١]

---

[٣١١] زاد المعاد ابن القيم الجوزى

## ٣٢١. ﴿خـوای گـەورە تـۆوی بـاوەڕی ناشـتبوو لـەدەروونی مـەعازی کـوڕی جەبەلدا﴾

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەعازی کوڕی جەبەلی پرسی ئەی مەعاز چۆنیت و چۆن ڕۆژت لێ بۆتەوە ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەباوەڕەوە ڕۆژم لێ بۆتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەی مەعاز هەموو قسە و باسێك ڕاست و دروستێکی هەیە نیشانەی باوەڕی تۆ چیە ؟ وتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ بەیانیەك نەبووە کە هەستم وا بزانم دەگەمە ئێوارە و هیچ ئێوایەکیش نیە بەتەمای بەیانی بم هەر هەنگاوێکیش دەنێم بەهیوای ئەوە نیم هەنگای دووای ئەو بنێم وە وا دەزانم کە هەموو گەلان وەستێنراون و هەر کەس نامەی کردەوەی خۆی بەدەستەوەیە خاوەن باوەڕان لەپەانی پێغەمبەرکانیاندان و کافران و بێ باوەڕانیش لەگەڵ بتەکانیاندا کەلەدنیادا دەیانپەرستن وە وا دەزانم چاوم لەپاداشتی بەهەشتی و تۆڵەی دۆزەخیانە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( ڕێگەت دۆزیوەتەوە ونی مەکە و لەدەستی مەدە خوا تۆوی باوەڕی لەدەروونتدا ناشتووە ).[٣١٢]

---

[٣١٢] (تهذيب مدارج السالكين ).

## ٣٢٢. ﴿کابرای جوولەکە شەرم دایگرت کە خوزەیمە شایەتیەکەی دا﴾

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەرزی جوولەکەیەکی لا دەبێت دەیداتەوە و کەس ئاگای لێ نابێت جوولەکەکە دێت و داوای قەرزەکەی لێ دەکاتەوە و پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرمووێت : (فلانە ڕۆژ دامیتیەوە) ئەویش دەڵێ : کێ شایەتە بابێت لەوێدا ، خوزەیمە کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی  من شایەتم کەپێی داویتەوە کابرا شەرم دایگرت و ڕۆیشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : خوەیمە خۆتۆ لەوێ نەبووی چۆن شایەتی وات دا ؟ ئەویش وتی : قابیلە ئێمە بڕوات پێ بکەین کە هەواڵی ئاسمانمان بۆ دێنی و بڕوات پێ نەکەین کە قەرزی ئەو کابرایەت داوەتەوە ؟ بێگومانم کەڕاست دەفەرموویت ، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو یەقینەی خوزەیمەی زۆر نرخاند فەرمووی (هەر کەس خوزەیمە شایەتی بۆ بدات بەسیەتی) دووای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە قورئان کۆکرایەوە هەموو ئایەتێك دەبوایە نوسرابێتەوە و دوو کەسیش لەبەری بووایە ئینجا تۆماریان دەرکرد تەنها یەك ئایەت نەبێ کە نووسرابوو بەڵام تەنها خوزەیمە لەبەری بوو لەبەر قسەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایەتەکەیان تۆمار کرد و وتیان : شایەتی خوزەیمە بەسمانە.[٣١٣]

[٣١٣] فەرهەنگی بانگخوازان لاپەڕە (١٥٨).

## ٣٢٣.﴿پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆستایەتیەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ زاهیری کوڕی حیرام﴾

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت : کابرایەکی دەشتەکی ناوی زاهیری کوڕی حیرام بوو جاروبار دەهاتە شاری مەدینەوە و کارو پیشەی خۆی دەکرد و دەگەڕایەوە لەگەڵ خۆیدا هەندێك کەشك و ڕۆنی گوندی دەهێنا بەدیاری بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێکیش بگەڕایەتەوە بۆ گوندەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك خورما و شتی تری تایبەتی لەگەڵ بەڕێ دەکردەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم کابرایەی زۆر خۆشدەوویست دەیفەرموو ( ان زاهرا بادیتنا و نحن حاضروه ) واتە : زاهیر گوندە بۆ ئێمە ئێمە شارین بۆ ئەو ئەم کابرایە هەتا بڵێ ی ناشیرین و هەژار بوو دەم و چاوی ڕەش بوو پرچی ئاڵۆز بوو سەری خوار و خێچ بوو لاواز و بێ هێز بوو ڕۆژێك لەگوندەکەی خۆیەوە دەرچوو هاتە ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵ نەبوو ئەویش هەندێ شتی گوندی هێنابوو بۆ فرۆشتن بۆیە ڕووی لەبازاڕ کرد بۆ فرۆشتنیان کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی زانی بەرەو بازاڕ بەدووایدا چوو لێ گەڕانی لێکرد هەتا پێی گەیشت ئەو سەرقاڵی فرۆشتن بوو ئارەقی گەرمی هاوینی لێ دەچۆڕایەوە جل و پۆشاکی لادێی لەبەر دابوو بەشێواز و بۆنی ناشیرن و ناخۆشەوە لەناو ئەو بازاڕەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپشتەوە گرتی زاهیریش پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەدیت نەیزانی ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە گرتویەتی بۆیە ترساو دەیووت : بەرم دە تۆ کێیت ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێدەنگ بوو خۆی ئاشکرا نەکرد زاهیریش هەر هەوڵی ئەوەی دەدا خۆی ڕزگار بکات لەو گرتنە ڕووی کردەوە دوواوە پێغەمبەری خوای (ﷺ) دی ئەو کات دڵی دڵنیا بوو لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ترسەکەی لێ ڕۆیشت بۆیە پشتی خۆی بەسنگی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەنا کاتێك زانی ئەوە پێغەمبەرە (ﷺ) بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی کرد بە سۆحبەت و گاڵتە کردن لەگەڵ زاهیردا بەدەنگی بەرزەوە بەخەڵکی دەفەرموو ( من یشتری العبد؟ من یشتری العبد؟ ) واتە کێ بەندە و کۆیلە دەکڕێت ؟ کێ بەندە و کۆیلە دەکڕێت ؟ زاهیریش وا جوان سەیری حاڵی خۆی دەکات کە هەژارێکی زۆر بێدارە و بێ نەوازە نەماڵ نەجوانی هیچیانی نیە بۆیە وتی : کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا کەس من لەتۆ ناکڕێت کەم بەهام بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەڵام تۆ لەلای خوای گەورە بێ بەبها نیت بەڵکو زۆر بەسەنگ و بەبەهایت لای خوای گەورە.[٣١٤]

---

[٣١٤] (استمتع بحیاتك ، چێژ لە ژیانی خۆت وەرگرە – نوسینی دکتۆر موحەممەد عەریفی وەرگێرانی ئەبوبەکر تۆفیق لاپەڕە ٤٦ – ٤٨).

## ٣٢٤.﴿فریشتەکان گوێیان دەگرت لە قورئان خوێندنەکەی ئوسەیدی کوڕی حوزەیر﴾

ئوسەید زۆر تامەزرۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو ئوسەید لەو ساتەوە کە ئیمانی هێنا و چووە ناو ڕیزی کاروانی خوا ویستان ئیتر بەیەکجاری خۆی بۆ خوا ساغ کردەوە و هەمیشە خەریکی عیبادەت و زیکر و خواناسی بوو هەروەها خەریکی شەو نوێژ و قورئان خوێندن بوو جگە لەوەی زۆر دەنگی خۆش بوو ئەوەندە بە دڵسۆزی قورئانی دەخوێند هاوەڵان پێش بڕکێ و کێ بەرکێیان دەکرد بۆ گوێ لێ گرتنی ، نەك هەر هاوەڵان لەسەر زەوی بەڵکو فریشتەکانیش لە ئاسمانەوە بۆ گوێ بیستنی دەنگی قورئان خوێندنی ئوسەید ئەهاتنە خوارەوە ئەوەتا ئەبی سەعیدی خودری لە ئوسەیدەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ شەوێك لەسەر شوێن خەرمانی خورما بووم لەنیوە شەودا قورئانم دەخوێند ئەسپەکەم ڕا دەچڵەکی دیسانەوە بەردەوام بووم لە خوێندن هەر ڕا دەچڵەکی ترسام بەدەم ڕاپەڕینەوە یەحیای کوڕم بشێلێ کە لەو لای خۆمەوە نووست بوو بۆیە ناچار هەڵسام بچم بۆ لای ئەسپەکە و وازم لە قورئان خوێندن هێنا بینیم تارماییەك بەسەر سەرمەوەیە و لەسەروو تارماییەکەوە ڕۆشنایی وەك چرا دەبینم بەرز دەبێتەوە بەرە و ئاسمان تا لەچاوم وون بوو بۆ سپەینێ ڕۆیشتم بۆ پێغەمبەری خوام (ﷺ) گێڕایەوە وەك چۆن ڕووی دابوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( تلك الملائكة كانت تسمع لك و لو قرأت لأصبحت يراها الناس ما تستر منهم ).[٢١٥]

واتە: ئەوانە فریشتە بوون گوێیان لە قورئان خوێندنەکەت گرتووە ئەگەر بەردەوام بویتایە تا بەیانی ئەونیش دەمانەوە و خەڵك دەیان بینی ئەوی کە لێ یان شاراوە بوو .

---

[٢١٥] (أخرجه مسلم ٧٩٦ و احمد ٨١/٣).

## ٣٢٥.﴿چیرۆکی هاوسەرگیریەکەی رەبیعەی ئەسلەمی﴾

رەبیعەی ئەسلەمی خوای لێ رازی بێ ئافرەتێکی خواست نەیتوانی مارەیی بداتێ ، رەبیعە رۆیشت بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کرد بەهاوەڵە بەرێزەکانی کە هاوکاری کۆ بکەنەوە ، هاوەڵە بەرێزەکان بۆیان کۆکردەوە رەبیعە هەڵی گرت و پێشکەشی هاوسەری کرد پاشان رەبیعە گەرایەوە بۆ جاری دووەم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێدا کە ناتوانێ و هیچی نیە بۆشاییەکەی یەکێ لە هاوەڵە بەرێزەکانی بەرانێکی دایە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی برۆ بۆ لای خاتوو عائیشە هەندێ جۆی لێ وەربگرە و بیکەن بە نان بۆ شاییەکە ، ئا بەم شێوەیە موسڵمانەکان هاوکاری برایەکەیان کرد بۆ تەواو کردنی ژن هێنانەکەی ، براکەیان دڵخۆش و شادومان کرد.[٣١٦]

[٣١٦] چیرۆکی رەوشتە جوانەکان لاپەرە ٨٦.

## ٣٢٦.﴿بەسەرهاتی ئەو شەهیدەی نوورێکی گەورە لە لاشەکەیەوە بەرە و ئاسمان بەرز بوویەوە ﴾

خالیدی کوری سەعید یەکێکە لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەتایبەتی دەسەلاتدارانی شاری مەککە بە دڕندانەترین شێوە لە ڕووی ئەم شۆڕشە خواییەدا وەستان، یەکێك لە سەرانی دەسەلاتدارانی مەککە سەعیدی کوڕی عاص بوو، کە باوکی خالیدە هەموو شێوازێکی دژایەتیکردنی پێغەمبەری ﷺ گرتبووە بەر ئەوەندە بە توندو تیژی لەڕووی بلاوبوونەوەی ئیسلامدا دەوەستا تا سەرنجی کوڕەکەی ڕاکێشا بۆ ئەوە کە حەزبکات بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بگات و بیبینێت و بزانێ ئەم بانگەوازەی ئەو چی یە ؟ شەوێك خالید خەوێك دەبینێ لە خەوەکەیدا لە قەراغی شیوێکی ئاگردا ڕاوەستاوە گەورەیی و پانی شیوەکە مەگەر هەر خوا بزانێت، یەکێك دێت پالی پێوە دەنێت بۆ ناو ئاگرەکە بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دەگرێ و ناهێلێ بکەوێتە ناو ئاگرەکەوە یەکسەر لە خەوەکەی ڕادەچلەکێ و خەبەری دەبێتەوەو دەلێ سوێند دەخۆم بەخوا ئەم خەوە ڕاستە یەکسەر سبەینێ دەڕوات بۆلای ئەبوبکری صدیق و خەوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە چونکە پێشەوا ئەبوبکر زاناترین کەس بوو لە تەفسیری خەودا ئەبوبکریش پێی دەلێ هیوای داهاتووی خێرت بۆ دەخوازم ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ دوای کەوەو مسولمان بە ئیسلام ناهێلێ بچیتە ئاگرەوە بەلام باوکت دەچێت ئیتر خالید دوای پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت تا بەخزمەتی دەگات و پێی دەلێ تۆ خەلك بۆچی بانگ دەکەی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ﴿ أدعوك الى الله وحده، لاشريك له وأن محمد وعبده ورسوله ، وتخلع ما أنت عليه من عبادة حجر لا يسمع ولايضر ولا يبصر و لاينفع ولايدري من عبده ممن لا يعبده) واتە من بانگ دەکەم بۆ باوەڕهێنان بە خوای پەروەردگای تاك و تەنها کە هیچ هاوبەشی نیەو موحەممەدیش بەندەو نێردراویەتی بانگت دەکەن بۆ وازهێنان لەو بتەی دەیپەرستی کە بەردێکی کەڕو لالە نابیستێ و بێ توانایەو نابینێ و بێ سوودەو ناشزانێ کێ دەیپەرستێ و کێ نایپەرستێ ) خالید وتی : ﴿ أشهد أن لا اله إلا الله واشهد أنك رسول الله﴾ ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دلخۆش بوو بە مسولمان بوونی خالید بەمەش خالید بوو بە پێنجەمین کەس کە ئیمانیان هێنا پاش ماوەیەك باوکی بە مسولمان بوونی خالیدی زانی و زۆر لە سەردلی قورس بوو ناردی بە شوێنیا کاتێك هات گۆچانێکی بە دەستەوەبوو لە سەروچاوی خایلدا شکاندی و وتی : سوێند

بەخوا ناهێڵم هیچ بخۆیت تا دەمریت یان واز لەدینی موحەمەد دەهێنی خالید وتی : ئەگەر تۆ خواردنم لێ دەگریتەوە خوای گەورەو پەروەردگار رزق و رۆزیم بۆ دەنێرێت. ئیتر خالید رۆیشت بۆلای پێغەمبەری خوا بەسەروچاوی خوێناوییەوە.[٣١٧]

خالید بوو بە پێنجەمین بڕوادار و پێش ئەویش ئەم بەڕێزانەش مسوڵمان بوو بوون (ئەبوبکری صدیق، عەلی کوڕی ئەبو تالیب، زەیدی کوڕی حاریسە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) خالید هەر بەو لێدانە ڕزگاری نەبوو باوکی هەردوو کوڕەکەی (ئەبان و عمرو رافعی) خزمەتکاری نارد بە شوێنیدا خالدی لەگەڵیان چوویەوە بۆماڵەوە باوکی پێی ووت پێت دەڵێم واز لەم ئاینە بهێنەو لەسەر ئاینی باو باپیرت بە ئەگەرنا بەخوا خواردنت لێ قەدەغە دەکەم، خالید ووتی : جا خوا رزقم ئەدا ئیتر باوکی کەوتە لێدانی زۆری لێدایەوە فەرمانی دا کردیانە ژووێکەوە زیندانیان کردو خواردن و خواردنەوەی لێ قەدەغە کرد هەتا سێ ڕۆژ نەی هێشت کەس بچێت بەلایدا لە ڕۆژی چوارەمدا هەندێ خزم و کەس پرسی باوکیان کرد لە زیندانە کە سەردانی خالیدیان کردو لێیان پرسی حاڵت چۆنە؟ خالید وتی لەنێو نازو نیعمەتی خوادا (عزوجل) تەپاو تل دەکەم ووتیان : کاتی ئەوە نەهاتووە بیرێ لە حاڵی خۆت بکەیتەوەو بێیتەوە سەر هۆش و بیرو ژیریت بخەیتە کارو بە قسەی باوکت بکەیت؟ خالید ووتی بە فەزڵی خوا ساتێك هۆش و بیرو ژیریم لێم دوور نەکەوتۆتەوە بۆ بەگوێکردنی باوکیشم هەرگیز بۆ نافەرمانی خوا بە قسەی باوکم ناکەم ووتیان بۆ ئەوەی باوکت لێت خۆشبێ و لەم زیندانە ڕزگارت ببێت بەچند ووشەیەك وەسفی لات و عوزرا بکە خالید ووتی : لات و عوززا دوو بەردی کەڕو لاڵن و من شتێکیان پێدا هەڵنادەم کە خواو پێغەمبەری خوا پێیان ناخۆشبێ و ڕازی نەبن باوکیشم چی لەدەست دێ با بیکات تەنها دەسەڵاتی بەسەر ئەشکەنجەدانمدا هەیەو ناتوانێت بیرو باوەڕم بگۆڕێت لەدوای ئەوەی‌ش باوکی خالید ئەوەندی تر ڕق ئەستور بوو، فەرمانیدا لە زیندانەکەشدا چوارپەلی ببەسترێ و هەموو ڕۆژێکیش بە کۆت و زنجیرەوە لە کاتی گەرمای نیوەڕۆدا بیبەن لەسەر شاخ بەڕووتی لەسەر ئەو بەردە گەرمانە پاڵی خەن و بەردی گەورەش لەسەر سکی دابنێن تا پەشیمان دەبێتەوە بەڵان هەرکاتێك خالیدیان دەردەکرد بۆ بەر هەتاوە گەرمەکە خالید دەیوت : (الحمد الله الذي أكرمي بالايمان وأعزبي لإسلام) واتە : سوپاس بۆ ئەو پەروەردگارەی بە ئیمان ڕێزی لێنام و بە ئیسلام سەربەرزی کردم بەخوا ئەم هەموو سزاو ئەشکەنجەیە ناکاتە یەك ساتی ئاگری دۆزەخ ئیتر با

[٣١٧] البداية والنهاية ٣/٣١.

سەعیدی باوکم چی لەدەست دێت کەمتەرخەمی نەکات من هەرگیز واز لە دینی خوا ناهێنم ماوەیەکی زۆر خالید لە زینداندا مایەوە بەڵام تەنها زیندانی نەبوو بەڵکو لەگەڵ کۆت و زنجیرەکەدا کیفلێ بە دەستەکانی سەعیدی سەرکردەی بێباوەڕان بێ شەرمانە و نامرۆڤانەترین شێوە ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیان دەدا بەڵام خالید ئەشکەنجەو ئازار نەك لە وورەی دانەبەزاند بەڵکو وازی لە دەعوەش نەهێنا هەر کاتێك براکانی دڵیان بۆی دەسووتاو سەریان لێدەدا خالید باسی ئیسلامی بۆ دەکردن و بانگی دەکردن بۆ ئیمان هێنان و هەمیشە مانای ئەم سروودەی دەووتەوە:

لەگەڵ زیادبوونی سێدارەو کۆت و زنجیرو بەربەستا

لەگەڵ ئاهی خرۆشاوی رەش و ڕووتانی ژێر دەستا

هەر دەبێ بازووی خوێناوی مەشخەڵی قورئان هەڵگرێ

چونکە پێویستە بەردەوام خوێن برژێ بەسەر مەبەستا

بەڵێ خالید توانی کاریگەری لەسەر براکانی دابنێ و وایان لێبکات ڕێگەی هەڵاتنی بۆ ئاسان بکەن تا لە نیوەشەوێکدا لە زیندان هەڵبێ و خۆی بگەیەنێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بە ڕزگاربوونی خالید لە زیندان هەردوو براکەشی خۆیان گەیاندە خزمەت پێغەمبەرو ﷺ خالیدی برایان ئەوانیش مسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند کاتێك سەعیدی باوکیان زانی هەردوو کوڕەکەی تریشی مسوڵمان بوون وماڵیان بەجێهێشتووە ئەوانیش وا لای پێغەمبەری خوانﷺ وتی : من یەکێك لە کەسە دەستڕۆیشتووەکانی مەککە هەرسێ کوڕ'کەم چوونە ریزی تاقمەکەی موحەمەدەوە و وازیان لە ئاینی باب و باپیرانیان هێناوە ئیتر چۆن لەڕووم بێ لەمەککە دا دانیشم ئیتر پەیمانیدا مەککە بەجێ بهێڵێت و بەماڵ منداڵەوە رۆیشتن بۆ گوندێك لە نزیك تائیف و تامردن نەگەڕایەوە لەو سات و کاتەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕزگارکردنی هەندێ لە هاوڵاتی لە ئازارو ئەشکەنجەی سەرانی مەککە ناردنی بۆ حەبەشە ئیتر کۆمەڵێك لە هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە و خالیدیش یەکێك بوو لەوانە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کەناوی ئامینەی کچی خەلەف بوو کۆچیان کردو ماوەی حەڤدە ساڵ لە حەبەشە مانەوە بەکاری دەعوەو بانگەوازەوە خەریکبوون بەڵێ خالید و ماڵ و منداڵی لە حەبەشە مانەوەو نەگەڕانەوە تا دوای فەتحی خەیبەر ئەوجا کۆچیان کرد لە حەبەشەوە بۆ مەدینە بەڵام پێغەمەبری خوا ﷺ لە دەستکەوتی جەنگی ڕزگارکردنی خەیبەر بەشی خالیدی دانا وەك چۆن بەشی بەشداربووانی دانا پاش ماوەیەك پێغەمبەری خواش ﷺ خالیدی کردە والی یەمەن هەتا پێغەمبەری خواش ﷺ کۆچی دوایی کرد خالید هەر والی بوو پاشان گەڕایەوە مەدینە

كاتێكیش جەنگی رۆم دەستی پێكرد خالیدو ئەبان و عەمری برای بەشداریان كردو رۆڵی زۆر قارەمانانەیان بینی بە تایبەتی عەمر كاتێك كافرەكان بینیان زۆر شێرانە شەڕ دەكات و روو لە هەر لایەك دەكات دوژمن خۆی پێناگیرێت ناچار بوون یەك تیپی سەر بەخۆیان دانا بۆ شەڕكردن لەگەڵ عەمردا ئیتر عەمر بریندار دەبێت و شمشێرێك بەر سەری دەكەوێت بەڵام هەر واز لە هێرش ناهێنێت تا دوژمن زەفەری پێدەبەن و شەهیدی دەكەن پاشان هاوەڵانی دەچنە سەر تەرمەكەی زیاتر لە سێ برینی نووكی شمشێری پێوە دەبێت بەڵام خوێنی عەمرو هاوەڵانی بە فیرۆ نارِوات و سوپای ئیسلام توانی سەركردەی رۆمەكان (سكلاریوس) بكوژن و نزكیەی دەهەزار كوژراو و برینداریان بە دوژمن بە جێ هێشت خالیدو ئەبانی برای لە جەنگەكانی تریشدا هەموو بەشداربوون تا جەنگی (ئەجنادین) رِوویدا زۆر پاڵەوانانە بەشداریانكرد و زۆربەی زانیان دەڵێن هەردووكیان لەو جەنگەدا شەهید بوون ئەو كەسی خالیدی شەهید كرد پاشان مسوڵمان بوو پرسیار دەكات ئەو پیاوە كێ یە ؟ دەڵێن بۆ چی دەپرسیت؟ ئەویش دەڵێ كاتێك شەهید بوو نوورێكی گەورەم بینی لەلاشەكەیەوە بەرەو ئاسمان بەرز بوویەوە( زەهەبی) رەحمەتی خوای لەسەربێ دەڵێت خالیدی كوری سەعید پیاوێكی زۆر قەشەنگ بوو لەجەنگی ئەجنادیندا شەهیدكراوە.(سیر أعلام النبلاء- ٢٦٠).[٣١٨]

---

[٣١٨] ١- البداية والنهاية إبن كثير ٣/٣١-٣٢.

٢- الإصابة ، ابن حجر ، ٢/٢٠٣.

أصحاب الرسول ، محمود المصرى ٢/٢٦٥- ٢٧٠

## ٣٢٧.﴿بەسەرهاتی ئەو ئافرەتەی شووکردنەکەی بانگەوازو مارەییەکەی ئیسلام بوو﴾

یەکێك لەو ئافرەتانەی کە پێنووس ناتوانی باسی هەڵوێستە مەردانەکانی بکات (ئوممو سولەیمی کچی مەلحانە) ئوممو سولەیم کە دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە- خوایان لێ ڕازی بێ – هەر بە هەڵهاتنی تیشکی زێرینی ئیسلام بە ئاسمانی شاری مەدینەدا بە تایبەتی پاش هیجرەتی یەکەم سەفیرو بانگخوازی ئیسلام موصعەبی کوڕی عومەیر – خوای لێ ڕازی بێ – دڵی بە نووری ئیمان ڕووناك بوویەوەو مسوڵمان بوو هەر بە مسوڵمان بوونی کەوتە بانگکردنی هاوسەرەکەی (مالیکی کوری نە ضر) بەڵام مالیك نەك هەر مسوڵمان نەبوو بەڵکو هەوڵێ زۆری دەدا تا (ئوممو سولەیم) لە ئیسلام پەشیمان بکاتەوە بەڵام ئومموسولەیم بەشێوەیەکی زۆر خەکیمانە بەردەوامبوو لەبانگکرنی و دەیوت : تۆ چۆن بتێك دەپەرستی کە دارتاشەکان لە دار دروستیان کردووە ئیتر دایکی ئەنەس لەگەڵ بانگکردنی هاوسەرەکەیدا هەوڵیدەدا ئەنەسی کوڕیشی لەسەر ئیمان و عەقیدە پەروەردە بکات بۆیە مێردەکەی پێی دەڵێت : سەر لە کوڕەکەم مەشێوێنەو بەرەو خراپەی مەبە دایکی ئەنەسیش دەڵێت : من عەقیدەی تەوحیدی فێر دەکەم دەیخەمە سەر ڕێگای ڕاست ئیتر مالیکی هاوسەری نەیتوانی لەگەڵیا بژی بە ڕەق هەڵساوی بەرەو شام بەڕێکەوت هەر لەوێ لەلایەن چەند ناحەزێکەوە دەکوژرێت و هەر لەوێش بەخاك دەسپێردرێت کاتێك هەواڵی کوژرانی دەگاتەوە دایکی ئەنەس زۆر دلگران دەبێت کە بەکافری سەری نایەوەو ئیمانی نەهێنا ئیتر ئەنەسی کوڕی گەورە بوو دایکی بڕیاریدا نەزری کرد هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، بۆیە ئەنەس تا ماوەی دەساڵ واتە : تا کۆچی دوای پێغەمبەر ﷺ هەر لە خزمەتیدا بوو لەلایەکی ترەوە کاتێك پیاو ماقووڵو گەورە پیاوانی شاری مەدینە بیستیان کە (ئومموسولەیم) بێوەژن کەوتووە ناردیانە خوازبێنی یەکێك لەوانەش ئەبو تەلحەبوو پێش ئەوەی مسوڵمان ببێ کاتێك خوازبێنی کرد (ئومموسولەیم) پێی وت : پیاوی وەك تۆ داوای ڕەت ناکرێتەوە بەڵام تۆ کافری و من مسوڵمانم لەبەرئەوە ناتوانم ئیسلام ڕێگەم نادات شووت پێ بکەم ئەگەر مسوڵمان ببیت شووت پێ دەکەم و مارەیەکەشم تەنها مسوڵمان بوونتە و هیچی ترم ناوێت ئینجا وتی : پیاوی وەك تۆ چۆن بیر ناکاتەوە ئاخر تۆ بتێك دەپەرستی لە دار دروستکراوەو ئەگەر سەرما تینت بۆ بێنێ دەیسوتێنیت و دەبێتە خۆڵەمێش وا نییە؟ ئەبو تەلحە وتی بەڵێ وتی :ئیتر چۆن شەرم ناکەیت کەشتی وا

دەپەرستیت؟ ئەی بۆ خوایەك کە دروستی کردوویت و ئەو هەموو نازو نیعمەتەی پێبەخشیوویت ناپەرستیت؟ ئیتر دوای ماوەیەك وتوووێژ ڕاگۆڕینەوە ئەبو تەلحە وتی : (أشهد أن لااله الاالله وأشهد أن محمداً رسول الله) ئیتر ئوموسولەیم بە ئەنەسی کوڕی وت : لەگەڵ ئەبو تەلحە برۆ مارەم ببڕەو مارەییەکەشم تەنها ئیسلامە کە ئەبو تەڵحە هەڵیبژاردووە.[٣١٩]

ئیتر ئەبو تەلحەو ئومموسولیەم بوون بە نموونەی ژن و پیاوی خاوەن پەیام و پەروەردەکراوی قورئان و هەڵوێستەکانیان تەعبیری لە بیرو باوەڕەکەیان دەکرد بۆیە ئەبو تەلحە بەشداری هەموو جەنگ و غەزاکانی دەکردو لە غەزای حونەیندا تەنها خۆی زیاتر لە بیست چەکداری هێرشکاری بێ باوەڕانی کوشت ئەو دوو بڕوادارە هەموو ژیانی خۆیان تەرخانکردبوو بۆ خزمەتی ئیسلام و پەیامە پیرۆزەکەی پاش ماوەیەك خوای پەروەردگار کوڕێکی پێبەخشین کە زۆر خۆشیان دەویست نازناوی (أبا عومەیر) بوو پێغەمبەری خواش ﷺ زۆرجار یاری لەگەڵ دەکردو دەیدواند ئەبا عومەیر باڵندەیەکی هەبوو پێی دەوترا (نوغەیر) پێغەمبەری خوا ﷺ کە تووشی ئەبا یومەیر دەبوو پرسیاری باڵندەکەی لێدەکردو دەستی بە سەریدا دەهێناو دەیفەرموو (یا أبا عمیر ما فعل النغیر؟) واتە : ئەبا عومەیر نوغەیر چیکرد؟ ماوەیەکی پێچوو ئەبا عومەیر نەخۆش دەکەوێت ئەبو تەلحە زۆر پەرۆشی بوو ڕۆژێك ئەبو تەلحە لەماڵ دەردەچێت ( ئەبا عومەیر) کۆچی دوایی دەکات ئیتر ئومموسولەیم خۆی دەیشوات و کفن و دفنی دەکات و بۆنی خۆشی پێوە دەکات و لەگۆشەیەکی ژوورەکەدا شتێك دەدات بە سەریداو بەماڵو منداڵی دەڵێت : کەس هەواڵی مردنی ئەبا عومەیر بە باوکی نەدات تا خۆم پێی دەڵێم ئێوارە ئەبو تەلحە دەگەڕێتەوە هەواڵی ئەبا عومەیر دەپرسێت دایکی دەڵێت : زۆر باشە خەوێکی لێکەوتبوو قەد خەوی وا خۆشی لێنەکەوتووە ئیتر نان و خواردن ئامادە دەکات و کاتی نووستنیش خۆی بۆ هاوسەرەکەی ئامادە دەکات و سەرجێی ئەنجام دەدەن و سبەینێ بە ئەبو تەلحە دەڵێت تۆچی دەڵێیت ئەگەر دراوسێیەك شتێکی لە دراوسێکەیان خواست و پاشان خاوەن شتکە داوای کردەوە ئایا بۆی هەیە نەیداتەوە یان نکۆڵی تێدا بکات؟ ئەبو تەلحە دەڵێ : کارێکی خراپی کردووەو پاداشتی چاکەشی نادرێتەوە ئینجا ئومموسولەیم دەڵێت : دەی ئەبا عومەیریش لای تۆ ئەمانەت بوو خوای گەورە پێی بەخشیبووین ئێستا لێی وەرگرتینەوە دەبرۆ بەخاکی بسپێرەو تەسلیمی پەروەردگاری بکە ئیتر ئەبو تەلحە یەکسەر هەواڵەکە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی (اللهم بارك لهما في

---

[٣١٩] رواه النسائي ٦/١١٤

لیلتهما) واتە ( پەروەردگارا فەڕو بەرەکەت بڕژێنە بەسەر ئەمشەویاندا) ئیتر هەر ئەو شەود خوا بەرەکەتیان بەسەردا دەڕژێنێ و سکی پڕ دەبێت پاش تەواوبوونی کاتەکەی خوا کوڕێکیان پێ دەبەخشێت و ئومموسولەیم بە ئەنەسدا دەینێرێت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و چەند دەنکە خورمایەکیش دەنێرێت پێغەمبەر ﷺ منداڵەکەی لێوەردەگرێت و دەفەرموێت : هیچی لەگەڵدایە دەڵێ بەڵێ چەند دەنکە خورمایەکی لەگەڵدایە ئیتر پێغەمبەر ﷺ خورماکە دەجوێت و دەیدات لە مەلاشوی منداڵەکەو ناویشی دەنێت عەبدوڵلا.[٣٢٠]

ئینجا ئیمامی بوخاری لە ئیبن عویەینەوە دەگێڕێتەوە لە پیاوێکی ئەنصارەوە دەڵێت : نۆ کوڕی ئەو عەبدوڵلایەم بینی هەموویان قورئان خوێنبوون شایانی باسە ئەو کەڵە ئافرەتە شۆخە کەم وێنەیە جگە لە بانگەوازکردنی لە زۆربەی غەزاکانیشدا بەشداربوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆیە ئەنەس – خوای لێ ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە دەڵێت لە جەنگی ئوحوددا عائیشەو ئومموسولەیم بینی باڵیان لێهەڵماڵیبوو کوندە ئاویان لەسەر پشت هەڵگرتبوو دەیان هێنان بۆ موجاهیدان و دەیانکرد بە دەمیانەوە کە تەواو دەبوو دەچوون ئاوی تریان دەهێنایەوە.[٣٢١]

هەروەها ئەنەس دەگێڕێتەوەو دەڵێ ئومموسولەیم لەجەنگی حونەیندا خەنجەرێکی پێبوو لە پشتی بەستبوو لە کاتێکدا بە عەبدوڵلا وەسکی پڕبوو کاتێك ئەبو تەلحە خەنجەرەکەی بە قەدیەوە بینی چوو بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت : پێغەمبەری خواش ﷺ بە زەردەخەنەوە فەرمووی : ئەی ئومموسولەیم ئەم خەنجەرەت بۆ چیە ؟ لە وەڵامدا وتی : ئەگەر موشریکێك لێم نزیك بوویەوە بەم خەنجەرە زکی دەدڕم هەروەها شەڕی ئەو کەسانەی پێ دەکەم ، کە ڕادەکەن و بەجێت دەهێڵن هەروەك شەڕی ئەو دوژمنانەی خوای پێدەکەم کە شەڕی تۆ دەکەن شایەتی باسە ئومموسولەیم هەر تەنها موجاهیدە نەبوو بەڵکو گرنگی زۆری بە زانست داوەو چواردە فەرموودەی ریوایەت کردووە هەروەها کۆمەڵێ لە هاوەڵان فەرموودەیان لێبوە ڕیوات کردووە لەوانە ئەنەسی کوڕی و عەبدوڵلای کوڕی عەباس و عەمری کوڕی عاص و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و زیدی کوڕی سابت ئەبو هورەیرە – خوای لێ ڕازی بێ ، دەگێڕێتەوە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی : ئەی پێغەمبەری

---

[٣٢٠] رواه البخاری ٥٤٧٠، ومسلم ٢١٤٤، وأحمد ١٨١/٣

[٣٢١] رواه البخاری

خوا ﷺ برسیەتی تینی بۆ هێناوم پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بۆلای خێزانەکانی تا خواردنی بۆ ئامادە بکەن بەلاّم کەسیان هیچیان نەبوو ئیتر پێغەمبەری خوا ڕووی کردە ئامادەبووان و فەرمووی ( الا رجل يضفه الليلة يرحمه الله) واتە : ڕەحمەتی خوا لەو پیاوەی ئەمشەو ئەم پیاوە بەرێتەوە پیاوێك لە ئەنصارەکان کە ئەبو تەلحەی هاوسەری نومموسولەیم بوو دەیباتەوە بۆ ماڵەوە بەلاّم لە ماڵەوە خواردنێکی کەمی منداڵەکان نەبێ هیچیان نابێت بۆیە لەگەڵ نومموسولەیم بەرنامەیەك دادەنێن بەمشێوەیە سەرەتا منداڵەکان بخەوێنین و پاشان خواردن بەرێت بۆ میوانەکەو کاتی نان خواردن چراکە بکوژێنێتەوە تا ئەبو تەلحە نەبینێت کەنان دەخوات و وابزانێ لەگەڵیدا نان دەخوات ئیتر ئومموسولەیم بەو شێوەیەی بەرنامەیەکی دانابوو ئەنجامی دەدات میوانەکە نان دەخوات خۆشیان و بەمنداڵەکانیشەوە بە برسیەتی سەر دەنێنەوە بۆ سبەینێ کە ئە بو تەلحە بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەگات پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :

( لقد عجب الله من فلان وفلانه) رواه البخاري - پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ) الحشر -٩ ، واتە ئەو بڕوا دارانە فەزلی بڕوا دارانی تر دەدەن. بەسەرخۆیاندا هەرچەند خۆیان زۆر هەژارو نەداریشن شایانی ئاماژە بۆ کردنە پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لێ دەدا لە ماڵەوە جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لێدەداو هەر لەماڵیاندا نوێژی سوننەت دەکات و بە ئوممموسولەیم دەفەرموێت: (ئوممموسولەیم) کە نوێژە فەرزەکانات کرد لە پاش نوێژەکان (ایە الكرسی) بخوێنەو پاشان سی و سێ جار بڵێ ( سبحان الله) و سی و سێ جار( الحمد الله) و سی و سێ جار (الله أكبر) بکە پاشان لە خوا بپاڕێرەوە وڵامت دەدرێتەوەو پێت دەوترێت بەڵێ بەڵێ.[٣٢٢]

---

[٣٢٢] ١- رواه مسلم والبزار و أبو يعلى.

٢- صفة الصفوة ابن الجوزی ٢/٤٦-٤٩.

٣- مجلة التربية الأسلامية الحدد (٩) سنة ٣٥ أب ٢٠٠٢

٤- رياض الصالحين، تحقيق عبدالعزيز رباح أحمد يوسف الدقاق

٥- نساء في حياة الرسول ﷺ نجوى عبدالعزيز ص ٧٣-٧٥.

## ٣٢٨.﴿بەسەرهاتی میقدادی کوڕی ئەسوەدو هاوڕێکانی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ﴾

لە هاوەڵی بەڕێز میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە- ڕەزای خوای لێ بێ – دەگێڕنەوە کە ووتویەتی : من و دوو هاوڕێم لە برسان چاومان کزو گوێمان گران بووبوو داوای هاوکاریمان لە صەحابەکان کرد کە هەندێك خۆراکمان بدەنێ بەڵام ئەوانیش هەروەکو ئێمە هەژارو نەدار بوون بۆیە کەسمان دەست نەکەوت کە هاوکاریمان بکات و شتێکمان بداتێ بیخۆین بۆیە چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسمان کرد کە برسیەتی کاری کردووەتە سەر بینینی چاوەکانمان و بیستنی گوێکانمان و حاڵمان خراپە بەڵکو شتێکمان پێ ببەخسی ئەویش فەرموی لێکردین بۆماڵی خۆیان و کە چوینە ماڵی پێغەمبەر ﷺ سێ بزنی لێ بوو کە گوانیان پڕ لە شیر بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی میقداد هەرسێ بزنەکە بدۆشەو شیرەکەیان بکە بە چوار بەشەوە منیش وەکو ئێوە برسیم و میقداد دەڵێت : لە خۆشیاندا هەر خێرا هەرسێ بزنەکەم دۆشی و شیرەکەم لە مەنجەڵێك کردوو پاشان چوار پەرداخم هێناو بەیەکسانی کردمە ناویانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پەرداخێك و من پەرداخێك و دوو هاوەڵەکەی تریش یەکی پەرداخێك من و دوو هاوەڵەکەم بەشە شیری خۆمان خواردەوەو بە تەواوەتی تێرمان خواردەوە و ئاسوودەییەك بەهەناوماند هات لەو کاتەدا کەسێك هات بە شوێن پێغەمبەری خوادا ﷺ بانگی کرد بۆ کارێکی پێویست بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فریانەکەوت بەشە شیرەکەی خۆی بخواتەوە شەو بەشێکی رۆیشت و پێغەمبەری خوا هەر نەهاتەوە لەدڵی خۆمدا ووتم : بەخوا دیارە پێغەمبەری خوا لە ماڵێك لای داوەو ئێستا تێری خواردووە بێشتەوە بۆ ماڵەوە پێویستی بەو شیرە نیە بۆیە هەستام بەشە شیرەکەی ئەویشم خواردەوە هەر ئەوەندەی لە خواردنەوەی شیرەکە بوومەوە ئیتر شەیتان دەستی کرد بەدڵە راوکێ بۆم و پێی دەوتم : ئای چیت کرد ئایە بەشە شیرەکەی موحەممەدت خواردەوە؟ ئێستا دێتەوەو زۆری برسیەو بە تەمای ئەو بەشە شیرەیەتی بەڵام کە زانی بەشەکەی خوراوەتەوە ئیتر بە هیلاك دەچی چونکە دووعات لێ دەکات

و بەم شێوەیە ماڵ وێرانی دونیاو قیامەت دەبیت دەڵێت : هەردوو هاورێکەم خەوتن بەڵام من لە داخان نەخەوتم جل و بەرگەکەم ئەوەندە کۆن بوو ئەوەندە کورت بوو بۆوە لە دڕاوی و پینەکردن ئەگەر سەری خۆمم پێ دادەپۆشی ئەوا تا ئەژنۆم دەردەکەوت ئەگەر قاچم پێ دادەپۆشی ئەوا سەرم دەردەکەوت بەخەمو خەفەتەوە دانیشتبووم کاتێکم زانی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەو چووە لای پەرداخە شیرەکەیەوە بەڵام تەماشای کرد شیری تێدا نەماوەو خوراوەتەوە بۆیە هەردوو دەستی موبارەکی بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان لە دڵی خۆمدا وتم : ئەی هاوار بەماڵم بەخوا ئێستا دووعام لێدەکات و بەهیلاك دەچم بەڵام نا ئەوە پێغەمبەری رەحمەتەو وشەی زەحمەت بەدەمی پیرۆزیدا نایەت، میقداد وتی گوێم شل کرد تا بزانم لە دوو عاکەیدا چی دەفەرموێت : گوێم لێ بوو فەرمووی : ( اللهم أطعم من أطعمني واسق من سقانی) واتە : خوای گەورە خۆراك بدەیتە ئەو کەسەی کە خۆراکم دەداتێ و ئەو کەسەش تێراو بکەی کەمن تێراو دەکات میقداد وتی کە گوێم لەم دووعایە بوو ئەو هەلەم قۆستەوەو لەجێگایەکەم هاتمە دەرەوە و رام کرد چەقۆم برد یەکێ لەو سێ بزنە کامیان زۆر قەڵەوە سەری ببڕم و پێغەمبەری خوای ﷺ پێی تێر بکەم هەرچەندە هی خۆم نەبوون بەڵام ووتم با ئەو دووعایەی پێغەمبەری خوام لە دەست نەچێت دواتر هەرچۆن بووە نرخی بزنەکە هەر پەیدا دەکەم بەڵام سوپاس بۆخوای گەورە کە چووم چی ببینم وا گوانیان خەریکە لە شیردا دەتەقێت، بیرم کردەوە باشە حەیوان ئێوار بدۆشرێ چۆن بەو خێراییە گوانی پڕ دەبێتەوە لە شیر؟ میقداد فەرمووی تەماشام کرد مەنجەڵێکی زۆر گەورە دیاربوو کەلەبەر گەورەیی هەرگیز شیریان تێدا نەدۆشی بوو ئەو مەنجەڵە گەورەیەم بردوو ( فجعلت فیه حتی علته رغوة) دەستم کرد بە دۆشینی هەتا کەف سەر مەنجەڵەکە کەوت بەڵێ ئەو مەنجەڵە گەورە پڕ لە شیرەم بردە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( اشربتم شرابکم اللیلة) ؟ واتە ئایا شیرەکەی ئێوارەتان خواردەوە؟ میقداد دەڵێت : خۆم لە وەڵامەکەی دزیەوە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شیرەکە بخۆرەوە خواردیەوە سێ جار وتم قوربان ئەم جارەش بخۆرەوە ئەم جارەش بخۆرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جارەکە خواردیەوە هەتا تێری خواردەوە ئیتر کە زانیم

دووعایەکەم مسۆگەرکرد (ضحكت حتى ألقيت إلى الأرض من الضحك) لە خۆشیا دەستم کرد بە پێکەنین هەتا ئەوەندە پێ کەنیم بە پشتا کەوتمە سەر زەوی پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی (إحدى سؤاتك يا مقداد) ئەمەش یەکێك لە گاڵتەو گەپ و بەزمەکانتە ئەی میقداد ئەم پێکەنینەت بێ هۆ نیە چیت کردووە بۆم بگێڕەرەوە منیش چی ڕووی دابوو بۆم گێڕایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ( هذه بركة ما هذه إلا رحمة من الله) فەرمووی ئەمە بەرەکەتە بەڕاستی پڕبوونەوەی گوانی ئەو بزنە لەو هەموو شیرە زۆرە لەکاتێکدا کە ئێوارە دۆشراوە غەیری رەحمەتی خوا نەبێت هیچی تر نیە بەرەکەتەکەی کردە بەرەکەتی خوای گەورە نەیفەرموو ئەوە بەرەکەتی دوو عای من بوو پاشان فەرمووی : ئەی باشە بۆچی ئەو دوو هاوەڵەشمان خەبەر نەکردەوە تا ئەوانیش لەوەی ئێمە خواردمانەوە بخۆنەوە میقداد دەڵێت : وتم : سوێند بەو خوایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری هەق و ڕاست گوێم بەوە نەداوە کێ لێی خواردووەتەو کێ لێی نەخواردووەتەوە دوای ئەوەی دووعای تۆم مسۆگەر کردو لەو بەرەکەتە بەر منیش کەوت واتە : لە خۆشیان لە بیرم چوو هەڵیان سێنم.[٣٢٣]

---

[٣٢٣] مسلم ٢٠٥٥، وأحمد ٣،٢/٦، وترمذي ٢٨٩

## ٣٢٩.﴿پیاوە ئەعرابیەکە کە گوێ بیستی فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو بەتەواوی دڵنیا بوو﴾

ڕۆژێك لە ڕۆژان لەڕەشماڵێکی غەرەبدا لە بیاباندا ئافرەتێك هاوار دەکات منداڵی دەبێت زیاتر ئازاری منداڵ بوونەکە زیاد بوو هەتا گەیشتە ئەوپەڕی ئازارەکە و منداڵەکە بوو بەڵام منداڵەکە ڕەش پێست بوو کابرا سەیری خۆی کردی سەیری ئافرەتەکەی کرد وا سەیر دەکات هەردوکیان سپی پێستن بۆیە سەری سوڕما ئەی چۆن ئەم منداڵە ڕەش پێستە بۆیە شەیتان دوو دڵی خستە دڵیەوە لەوانەیە ئەم منداڵە لەتۆ نەبێت لەوانەیە کابرایەکی ڕەش پێست داوێن پیسی لەگەڵ دا کردبێت ئەم منداڵە لەوەوە بوبێت لەوانەیە کابرا بۆ تێکچون دەچێت بۆیە کاروانی کرد بۆ شاری مەددینە هەتا چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وەهەندێك هاوەڵانیشی لە خزمەت دا بوون کابرا وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکەم لە ژێر نیکاحی مندا منداڵێکی ڕەش پێستی بووە ئێمەش لەڕەگەز و تیرەمان هەرگیز ڕەش پێستمان تیادا نەبووە پێغەمبەر ﷺ سەیری کرد و ڕوانی بۆی زانی دوو دڵی هەیە لە منداڵەکەی پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی ئامۆژگاریەکی ڕێك و پێکی بکات مە هەردەم گومانی باش بە خەڵکانی تر بەرێت گوناه و تاوان نەداتە پاڵ ژنەکەی خۆی بەبێ هیچ زانیاریەك بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت هەڵسوکەوتێکی وای لەگەڵ بکات چارەسەرێك بێت لەشێوازێکی تر بەوەی ویستی ئەم کابرایە خۆی بەخۆی ئەم کێشەیەی خۆی چارەسەر بکات بۆیە پێغەمبەر ﷺ نموونەی بۆ دەهێنێتەوە بەشێوەیەك وەڵامەکەی لێ نزیك بێتەوە بۆپە پێغەمبەر ﷺ تەماشای کابرای کرد شوێنەواری لا دێی پێوەبوو لە هەمان کاتدا هەمووی جۆرە هزرێك بە مێشك و هۆشیدا دێت دەربارەی ئافرەتەکەی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ئایا خاوەن حوشتریت؟ کابرا وتی : بەڵێ پێغەمبەر ﷺ ڕەگەزەکانیان چۆنە؟ وتی : سوورن پێغەمبەر ﷺ ئایا ڕەشیان تیدایە؟ کابرا وتی : نەخێر پێغەمبەر ﷺ ئایا لەناویاندا نیە ڕەنگی ڕەش و سپی تێکەڵ بوو بێت؟ کابرا بەڵێ پێغەمبەری ﷺ ئەی بۆچی ئەمە هەیە؟ وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموویت مادام هەموو حوشترەکان بە نێرومێ سوورن هیچ ڕەنگێکیان تیادا نیە بێجگە لە سوور ئەی چۆن و بۆچی بەچکە حوشتری ڕەش بە سوورو سوور بە ڕەش تیایدا دەبێت ڕەنگەکەی جیاوازە لە ڕەنگی نێرو مێ کابرا هەندێك بیرو تیارمانی کرد لە پاشاندا وتی : لەوانەیە لەباو باپیریانەوە ئەم جۆرە ڕەنگانە هەبێت هەر بۆیە ئەم بێچووەش چووتە سەر باو باپیرانیان بۆیە تیادا

دەرگەوت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەوانەیە منداڵەکەی تۆش لەباو باپیرانتان تۆیان خێزانەکەت رەش پێستی تیادا بوو بێ.[٣٢٤]

کابرا ئەم وەڵامەی پێغەمبەری گوێ لێ بوو هەندێك بیرکردنەوەی کردوو هزرهەمان هزری خۆیەتی بۆیە دڵنیابوو رازیش بوو بە وەڵامەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە گەڕایەوە بۆلای ئافرەت و منداڵەکەی خۆی.

## ٣٣٠.﴿ پێغەمبەر ﷺ داوکاریەکانی هۆزی ثە قیفی رەت کردەوە ﴾

کاتێك ئیسلام سەری هەڵدا هۆزەکان نوێنەریان دەهاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لەوانە وەفدی ثە قیف بوو چەند کەسێك بوون کاتێك هاتنە لای پێغەمبەر بردنی بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی گوێ بیستی قورئان بن ئەوان پرسیاری ڕیباو زیناو ئارەقیان کرد فەرمووی : ئەمانە هەموو حەرامن بتێکیان هەبوو ناوی (الربە) بوو (الطاغیة) زۆر لێی دەترسان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بیشکێنن ووتیان ئێمە لەباو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە تەنها سێساڵ بابمێنێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نەخێر چونکە ئەوە بیرو باوەڕو تەنازوول کردن تیایدا هەرگیز نابێت بۆیە عومەر وتی : ئەوە بتە لەچی دەترسن؟ ووتیان : ئێمە بۆلای تۆ نەهاتووین ئەی عومەر ئەویش بێ دەنگ بوو وتیان : بۆ دووساڵ ؟ فەرمووی : نەخێر ووتیان: بۆ یەك ساڵ فەرمووی نەخێر ووتیان تەنها بۆ مانگێك فەرمووی نەخێر کاتێك زانیان ئەمە بیرو باوەڕەو ئیسلام بەبێ بیرو باوەڕ هیچ سوودێکی نیە دابەزین وتیان : تۆ خۆت بیرو خێنە ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی من کەسێك دەنێرم ئەم ئێشەتان بۆ بکات کاتێك هاتنەوە بۆ لای هۆزەکەی خۆیان ئەوان مسوڵمان بوون بەڵام ترسیان هەرمابوو لە بتەکەی خۆیان بۆیە موغیرەو چەند هاوەڵێك چوون بۆ ڕووخاندن و شکاندنی بتەکە موغیرە وتی : ئێستا هەموو هۆزەکانی ثە قیف بە پێکەنین دەخەم؟ کاتێك چەك و شتێکی بەدەستەوە گرت چوو لە بتەکەی دا خۆی بوراندەوە هەندێك لاقاقرەی بەخۆی کرد ئەوانیش لە دوورەوە سەیریان دەکرد ووتیان : تەواوکەس ناتوانێ ئەو بنە بروخێنێ بەڵام موغیرە هەستایەوەو بەرد بە بەرد هەمووی لەسەر یەك لادا وتی : ئەو بتە هیچ سوودو زیانی بۆ ئێوە نیە.[٣٢٥]

---

[٣٢٤] رواه مسلم وابن ماجه واللفظ لابن ماجه.

[٣٢٥] استمتع بحیاتك – چێژ لە ژیانی خۆت وەرگرە نووسینی دکتۆر موحەممەد عەریفی وەرگێڕانی ئەبوبکر تۆفیق ، لاپەڕە ٧٥-٧٦

## ٣٣١.﴿ مسوڵمانان تووڕەبوون لە هەڵسوکەوتی پیاوە دەشتەکیەکە ﴾

کاتێك کابرایەکی دەشتەکی کەسێکیان کوشتبوو بۆ خوێن ، و فیدیەکەی هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی یارمەتی بدات بۆ کۆمەك کردنی لەسەر خوێن دانەکەی بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەندێك شتی پێی بەخشی لە پاشاندا وەك دڵنەواییەك فەرمووی چاکەمان لەگەڵ کردی یان چۆن؟ ئەویش وتی : نەچاکەت کرد نە جێگەی بۆ گرتم هەندێ لە مسوڵمانان تووڕەبوون خەریکبوو بۆی هەستن بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردن کەنەکەن هەستن بۆ لێدانی کابرای دەشتەکی لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە چووەماڵەوە هەندێك شتی لەوێشدا دەست کەوت بانگی کابرای دەشتەکی کرد فەرمووی تۆ هاتی بۆلای ئێمە داوات لێ کردین ئێمە هەندێکمان پێ بەخشیت تۆ یش ئەوەت وت کەوتت ئێستاش ئەوەندەی تۆم لەماڵی خۆم بۆ هێناوی کابراش وتی: بەڵێ باشەو خوا خێرت بنووسێ کە چاکترین کەس و کاری بۆ ئێمە پێغەمبەر ﷺ ئەم سوپاس کردنەی کابرای لەلا باش بوو بۆیە لەوە ترسا لە دڵی هاوەڵاندا شتێك مابێت نەوەکو لە جێگایەکدا ببینن و ناحەزی ڕقییان لێ ی بێتەوە بۆیە بە کابرای دەشتەکی فەرموو: ئەوەی لەلای من دەیڵێیت ئەوا لەناو هاوەڵاندا بیڵێرەوە بۆیە کابرای دەشتەکی هاتە ناو هاوەڵان بە پێغەمبەری ﷺ وت : خوا خێرت بنووسێ تۆ چاکترین کەس و کاری بۆ ئێمە بۆیە کابرا خەریك دەبێ دەرچێ و بگەڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ وویستی وانەیەکی تەکنیکی سەرنج ڕاکێشانی دڵان بە ئەوان بدات بۆیە فەرمووی : نموونەی من و ئەو کابرایە دەشتەکیە وەك نموونەی کابرایەك وایە حوشترەکەی لەدەستدا ڕابکات خەڵکیش شوێنی بکەون حوشترەکەش زیاتر بترسێ و غاردانی تیژتر بکات بۆیە کابرا بەخەڵکی دەڵێت: ئەی خەڵکینە لێم گەڕێن حوشتری خۆمەو دەزانم چۆن دەیگێڕمەوە هەندێك خواردنی بۆ ئامادە دەکات لەسەرخۆ بۆی دەڕوات حوشترەکەش خاوەنەکەی خۆی دەناسێتەوەو بەرەو خواردنەکەی دەگەڕێتەوە هەتا جڵەوی بەدەستەوە دەگرێت و سواری دەبێت بە لەسەر خۆییەوە ئەگەر ئێوە بەقسەی کابرای دەشتکیتان بکردایە وەك ئەوەی ئەو وتی ئەوا ئەویش دەچووە ئاگری دۆزەخەوە بەوەی پەشیمان دەبۆوە لە ئاین و بە کافری دەمرد.[٣٢٦]

---

[٣٢٦] رواه البزار.

## ٣٣٢.﴿ ئەگەر هاوەڵان تورە بکرێن خوای گەورە توورە دەبێ ﴾

ئەبو سوفیان تێپەڕی بەلای سەلمان و صوهەیب و بیلالدا ووتیان: شمشێری خوا جێی خۆی نەگرت لە گەردنی دوژمنی خوادا ئەبوبەکر کە لەوێدا بوو پێی وتن : ئەم ووتەیە بەرِیش سپی و گەورە پیاوی قورەیش دەڵێن؟ دوایی کە ئەبوبکر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی پێ گەیاند ئەویش فەرمووی: ئەبوبەکر دوورنیە ئەوانت زویر کردبێ ئەگەر تۆ زویرت کردبن بەڕاستی خوات زویر کردووە ئەبوبەکر هاتەوە بۆلایان و وتی : براکانم خۆ زویرم نەکردوون؟ ووتیان : نەخێر برا خوا لێت خۆش بێت.[٣٢٧]

## ٣٣٣.﴿ دوا کاری عەرەبە دەشتیەکیەکە وەك داواکاریەکەی پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل نەبوو ﴾

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەبێت بەمیوانی عەرەبێکی دەشتەکی زۆر ڕێز لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێت و خزمەتی دەکات ئەویش پێی دەفەرموێ: چیت دەوێ داوابکە کابرا وتی ئەی نێردراوی خوا حوشترێك بە پێداویستیەکانیەوەو بزنێك کە خێزانم بیدۆشێ ئەمەی دووجار دووبارە کردەوە پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: نەت توانی وەك پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل بیت هاوەڵان ووتیان: ئەی نێردراوی خوا پیرەژنەکەی بەنی ئیسرائیل چی یە ؟ فەرمووی : کاتێك موسا – سەلامی خوای لێ بێت – ویستی لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا شەو دەرچێ ڕێ ی لێ تێك چوو زانایانی بەنی ئیسرائیل ووتیان : ڕەنگە حیکمەتی تیا بێت وون بووین و ڕێمان لێ تێك چووە بۆ ئەوەی کە هەر خۆمان نەڕۆین و دەمانەوێ پێت بڵێین کە یوسف پێغەمبەر – سەلامی خوای لەسەربێ – پەیمانی لێ وەرگرتووین کە ئەگەر لە میسر دەرچووین لاشەی ئەویش لەگەڵ خۆمان ببەین موسا- سەلامی – خوای لەسەربێ فەرمووی کامتان دەزانێ قەبری یوسف لە کوێ یە ؟ ووتیان : تەنها پیرێژنێکی بەنی ئیسرائیل دەزانێ قەبری یوسف لە کوێ یە ناردی بەدوای داو کە هات پێی فەرموو : قەبری یوسفم پێ نیشان بدە وتی : بەخوا پیشانت نادەم هەتا وەکو نەبمە هاوەڵت لە بەهەشتدا ئەویش پێی ناخۆش بوو ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ کە ئەو داوایەی بۆ چوونە بەهشت بەدەست ئەو نیە یان لەبەرئەوەی کە ئەو

---

[٣٢٧] مسلم رقم ٤٦٦٣ ، ٢٢٦٧٦

پرسیارەی بۆ پیشاندانی قەبرەکە ی ئەوە دێنێ و ئەوەندە گەورەیە بەرامبەر بەهەشت بێ ؟ خوای گەورە سروشتی بۆ نارد کە پەیمانی بەهەشتی بدەرێ کە پەیمانی چوونە بەهەشت و هاوەڵێتی دایە ئەویش شوێنێکی پیشاندان کە ناوی تیا وەستابوو ووتی : ئاوەکە لابدەن کە لایان برد ووتی : دەی ئێرە هەڵکەنن کە هەڵیان کەند لاشەی پێغەمبەر یوسف — سەلامی خوای لێ بێ — دەرکەوت لاشەکەی هیچ تێك نەچووبوو کە دەریان هێنا دەدرەوشایەوەو ڕێگای بەو شەوە بۆ ڕووناك کردنەوەو ڕێ ی خۆیان دۆزیەوە.[٣٢٨] دەڵێن لاشەی یوسف و موسا- سەلامی خوایان لێ بێ — لە فەلەستین نێژراون.

## ٣٣٤.﴿ جەریر جلەکەی پێغەمبەری ﷺ ماچ کرد ﴾

ڕۆژێك هاوەڵێك کە ناوی جەریر بوو هات بۆ مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوەی جێگا نەبوو لەناو دەرگاکەدا وویستی دانیشێ پێغەمبەریش ﷺ جلێکی خۆی بۆ هەڵدا کە لەسەری دانیشێ ئەویش جلەکەی گرت و ماچی کرد و ڕازی نەبوو لەسەری دانیشێ ووتی ئەی پێغەمبەری خوا چۆن من لەسەر جلی تۆ دادەنیشم خوا ڕێزت لێ بگرێت وەك ڕێزت لەمن گرت.[٣٢٩]

---

[٣٢٨] بەهاری دڵان نووسینی ئەندازیار عوسمان ، ل١٥-١٦.

[٣٢٩] بەهاری دڵان نووسینی ئەندازیار عوسمان ، ل١٣٤.

## ٣٣٥. ﴿لە دوای مردنی عاصمی کوری سابت خوای گەورە تەرمەکەی پاراست﴾

موجاهیدانی ئیسلام لە جەنگی بەدردا توانیان گورزێکی جەرگبڕ وا لە دوژمنان بوەشێنن کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو پێغەمبەرﷺ وە هاوەڵانی بگەنە قۆناغێك بەو جۆرە توانای بەرگریان هەبێت بۆیە سەرانی قورەیش تووشی هستریا بوون و بڕیاریان دا کە گریان لە سەر کوژراوەکانیان قەدەغە بکەن هەروەها نەیانهێشت خەڵکی دیلەکانیان بە پارە ئازاد بکەن چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دابوو هەر دیلێك دەمندالی بروادران فێری خوێندەواری بکات و ئازاد بێ ئەوانەش خوێندەواریان نیە لەبەرانبەردا بە هەندێ پارە ئازاد دەکرێن.[٣٣٠]

هەروەها سەرانی قورەیش بۆ تۆڵە سەندنەوە بڕیاری شەڕێکی سەر تاسەریاندا بۆیە جەنگی ئوحود هاتە پێشەوە هەموو چین و توێژەکانیان بەشداری جەنگی کرد بە تایبەتی ئافرەتان کە هیندی خێزانی ئەبو سوفیان سەرکردایەتی دەکردن پیاوانیان هاندەدا بۆ شەڕو دەیان وروژاندن و باسی قارەمانیەتیان بۆ دەکردن هەروەها پاش کۆتایی شەڕ'کە سولافەی کچی سەعد کە یەکێك بوو لە ئافرەتانی قورەیش هەم لە شەرەکەدا بەشداربوو هەم دوای شەرەکە بەدوای تەرمی مێردەکەی و کوڕەکانیدا دەگەڕا تەرمی مێردەکەی لە شوێنێکدا دۆزیەوەو لەسەر لوتکەی کێوی ئوحودیش تەرمی هەرسێ کوڕەکەی کە ناویان ( مسافح ، کلاب و جلاس) بوو دۆزیەوە هەرچەندە جلاس گیانی تێدامابوو دایکی دەمی نا بە بن گوێیەوەو پێ وت : کێ کوشتنی کوڕێ خۆم؟ لەوەڵامدا وتی : عاصمی کوڕی سابت هەرسێکمانی کوشت پاش ماوەیەك ئەویش گیانی دەرچوو ئیتر سولافە پەیمانی بە (لات و عوزا) دا کە ئەبێ تۆڵەیان بسێنێ نابێ دانیشێ نابێ فرمێسکی چاوی ووشك ببێتەوە تا قورەیش تۆڵەی بۆ دەستێنێت و کاسەی سەری عاصمی بۆ دەهێنێت و عەرەقی تێدا بخواتەوە.[٣٣١]

---

[٣٣٠] الرحيق المختوم ، ص٢٥٦.

[٣٣١] صور من حياة الصحابة ، ص٣٩٨.

هەروەها بڵاوی کردەوە کە هەرکەسێك سەری عاصمی بۆ بهێنێت ئەوا دە وشتر پاداشت وەردەگرێ ئەم هەواڵە بەنێو قورەیشدا بڵاوبوویەوە گەنجەکانیان کەوتنە گەڕان و هەواڵ زانینی عاصم و هەرکەس هەوڵیدەدا ئەو دەستکەوتە بۆخۆی بێت،[٣٣٢] تا ڕۆژی کارەسانی رەجیع هاتە پێش لە ساڵی چواری کۆچیدا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر داوای تیرەی (عضل) و (قارە) دە هاوەڵی نارد بۆ بانگەوازو بڵاوکردنەوەی ئیسلام و عاصمی کوڕی سابتی کردە ئەمیریان کاتێك بە غەدرو خیانەت لەلایەن دووسەد چەکداری تیرەی (بەنی الحیان) ەوە دەورەدران و داوایان لێ کردن خۆیان بدەن بە دەستەوە هاوەڵەکانی چاوەڕوانی بۆچوونی عاصم بوون کە ئەمیریان بوو ئەویش پێی ووت: برایانی خۆم من بۆخۆم ئامادەنیم خۆم بدەم بە دەست کافرەوە ئیتر شمشێرەکەی هەڵگرت و ووتی پەروەردگارا من بەرگری لە ئاینی تۆ دەکەم ئاینی تۆ دەپارێزم تۆش لاشەی من و گۆشت و ئێسقانی من لەدەستی کافران بپارێزە هەروەها ووتی : پەروەردگارا هەواڵی ئێمە بگەیەنە بە پێغەمبەر چونکە غەدریان لێ کردین ئیتر لە هەر چوار لاوە تیر بارانیان کردن عاصم و شەش کەسی تریان لەوێدا شەهید کران هێزی خیانەتکاری (بەنی لحانیش) داوای لەو سێ کەسەی تر کرد کە مابوون خۆیان بدەن بەدەستەوە لەسەر بەڵێن و پەیمان خراپەیان لەگەڵ ناکەن ئیتر خوبەیب و زەید خۆیان دا بەدەستەوە ئەوەی تریشیان شەهید بوو خوبەیب و زەیدیان بردن و لە مەککە دا فرشتیانن و پاشان بەداردا هەڵیان واسین و تیربارانیان کردن و شەهید کران هێزی ڕاو رووتی کافرەکان زانییان لەنێو کوژراوەکاندا عاصمی تێدایە کەوتنە گەڕان بەدوای تەرمەکەیدا تا دەوشترەکە وەربگرن بەڵام خوای پەروەردگار نزاکەی عاصمی وەرگرت و تەرمەکەی بە زەردەواڵەو هەنگ پاراست و نەیانهێشت هیچ کەسێك بچێتە سەر تەرمەکەی زۆر هەوڵیاندا بەڵام بە ناچاری ڕۆیشتن و بەجێیان هێشت ووتیان دوای ڕۆژ ئاوابوون دەچینەوە، چونکە ئەوکاتە هەموو دەچنەوە لانەو ماڵی خۆیان بەڵام نەیانزانی پاراستنی تەرمەکەی دەسەڵاتی خوایەو ئەو مێروانەش بە فەرمانی خوا تەرمەکەیان پارستووە و ئەوانە لەسەربازانی خوان و خوای پەروەردگاریش کەس نازنێت ژمارەو جۆری سەربازەکانی چەندە هەرچەندە کات هاوین بوو هیچ هەورو هەڵایەکیش بە ئاسمانەوە نەبوو لەناکاو خوای باڵا دەست هەوری هێناو بارانێکی بەخوڕی باراندا کەدەشت و دەرو چەم و شیوەکان لافاو گرتیەوە و تەرمی پیرۆزی عاصمیش لافاو بردی و نەدۆزرایەوەو هێزی کوفرو گومرایی و راو ڕووتیش ئاواتیان بردە گڵو ئەو

---

[٣٣٢] اصحاب الرسول ، ج٢، ص١٧٧

دەستکەوتەیان دەست نەکەوت بۆیە کاتێك هەواڵی پاراستنی تەرمی (عاصم) گەیشت بە پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب خوای لێ ڕازی بێ – وتی خوا بەندەی بڕواداری خۆی دەپارێزێت عاصم نەزری کردبوو کە لە ژیانیدا نەدەستی بەر کافرو بت پەرستان بکەوێت و نەئەوانیش دەستیان بەر ئەو بکەوێت لەدوای مردنیش خوای گەورە تەرمەکەی پاراست و بێ باوەڕان دەستیان بەر تەرمەکەی نەکەوت.[٣٣٣]

## ٣٣٦.﴿ بەسەرهاتی شوجاعی کوڕی وەهەب هاوەڵە فیداکارەکەی دەوری پێغەمبەر ﷺ ﴾

هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ شوجاعی کوڕی وەهەبی ئەسەدی لە شاری مەککە چاوی بە دنیا هەڵهێناوە لە سەرەتای بانگەوازی ئیسلامدا ئیمانی هێناوەو چووەتە ڕیزی کاروانی خواویستانەوە لەگەڵ هاوەڵاندا هیجرەتی کردووە بۆ حەبەشەو دواتر گەڕاوەتەوە بۆ مەککەو دواتریش لەگەڵ دەست پێکردنی هیجرەتی هاوەڵان بۆ مەدینە شوجاعیش هیجرەت دەکات و خزمو کەس و کارو تیرەکەی(شوجاع) زۆربەی زۆریان مسوڵمان بوون بۆیە زۆربەیان هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە بە گەیشتنی شوجاع بە مەدینە ئیتر بوو بەیەکێك لە پێشمەرگە گیان لەسەر دەستەکانی ئیسلام و لەهەموو جەنگ و غەزاکاندا بەشداری کردووە بە قارەمانانە و لە هیچ غەزایەکی پێغەمبەردا ﷺ دوانەکەوتووە بەڵکو لە هیچ سریەکیش دوانەکەوتووە زۆر قارەمانانە و چاو نەترسانە و بوێرانە بەشداری کردووەو سەربازێکی گیان لەسەر دەست و گوێڕایەڵ بووەو شیاوی ئەوەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ پلەی بەرزبکاتەوە بۆیە لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەر ﷺ بۆ چالاکیەکی پارتیزانانە بۆ خێڵی هوازن کە ناوچەیەك کە پێنج ڕۆژ ڕێگە لە مەدینەوە دووربووەو پێیان دەووت ناوچەی (السی) ئیتر شوجاع خۆیی و تیپەکەی بەڕێدەکەون بە شەو ڕێگا دەبڕن و بەرۆژیش خۆیان حەشار دەدەن تا دەگەنە شوێنی مەبەست و دەتوانن ئەو چالاکیەی بۆیان دیاریکراوە ئەنجامی بدەن و بەسەرکەوتوویی بگەڕێنەوە لە ماوەی پێنج ڕۆژدا چالاکیەکە ئەنجام دەدەن و دواتر دەستکەوتەکە دابەش دەکەن

---

[٣٣٣] ١- البداية والنهاية، ابن كثير.

٢- الرحيق المختوم، المبار كفورى .

٣- أصحاب الرسول، محمود المصرى.

و هەریەکی پازدە حوشتریان بەردەکەوێ لە ڕاستیدا شوجاع ئەو چالاکییە وا ئەنجام دەدات کە زۆر کارایی لەسەر خێڵی هەوازن دادەنێ و دوای ئەو چالاکیە زۆربەیان دێنە خزمەتی پێغەمبەرو مسوڵمان دەبن لە ساڵی شەشەمی کۆچیداو لە مانگی (ذی الحجە) داو لە پێش فەتحی مەککەدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەری خۆی دەنێرێ بۆلای سەرۆك و پاشاکانی ناوچەکە یەکێك لەو سەفیرو نوێنەرانەی پێغەمبەر ﷺ شوجاع دەبێ کە پێغەمبەر ﷺ بە نامەیەکەوە دەینێرێ بۆلای سەرۆکی غەساسینەکان (حارسی کوری ئەبی شەمیری غەسانی) و بانگی دەکات بۆ ئیسلام بوون شوجاع باسی سەفەرە دیبلۆماسیەکەی خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ : نامەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆلای پاشای غەساسینەکان لە دیمەشق ئەوکاتە پێیان دەوت (غوطە) دادەنیشت دەڵێت گەیشتمە دیمەشق و چووم بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی پاشاو دارو دەستەکەی زۆر سەرقاڵ بوون، چونکە چاوەڕوانی هاتنی هرقل پاشای ڕۆم بوون کە بەنیازی سەردانی قودس بوو لەدوای سەرکەوتنیا بەسەر فارسدا دەڵێت من دووسێ ڕۆژ مامەوە مەجال نەبوو پاشا ببینم بۆیە بە سکرتێرەکەیم وت من نێردراوی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆلای پاشا ئەویش وت: تا فلان ڕۆژ نایبینی چونکە سەرقاڵی خۆسازدانە بۆ پێشوازی لە قەیسەری ڕۆم سکرتێرەکەی کەناوی (مورە) بوو پرسیاری پێغەمبەری خوای لێکردن منیش باسی پێغەمبەری خوام بۆ کرد باسی ڕەوشتە جوانەکانی و خەسڵەتە بەرزەکانی و باسی ئاینی پیرۆزی ئیسلامم بۆ کرد کە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤ لە کۆت و بەندی بتپەرستی و مرۆڤ پەرستی و بەردو دار پەرستی و سامان و ماڵپەرستی هاتووە مرۆڤ لە خۆی حاڵی بکات هاتووە مرۆڤ فێری تەوحیدو یەکتاپەرستی و عبادەت بۆ خواکردنو مرۆڤ دۆستی و ڕێزو خۆشەویستی بکات هێندە باسی ئیسلام و پێغەمبەری خوام بۆ کرد تا قورگی پڕبوو لە گریان و چاوەکانی فرمێسکی بە خوڕەم لێدەباری بەدەم هەنسکی گریانەوە وتی من باسی ئەو پێغەمبەرەم لە ئینجیلدا خوێندۆتەوە من باوەڕم پێی هەیە و بەڕاستی دەزانم بەڵام ناوێرم مسوڵمان بوونی خۆم ئاشکرا بکەم، چونکە پاشا دەمکوژێ شوجاع دەڵێ بەڕاستی ڕێزی دەگرتم و خزمەتی دەکردم هەروەها دەڵێ مامەوە هەتا ڕۆژێك حارس هات و لەسەر کورسیەك دانیشت و تاجێکی شاهانەی لەسەری نابوو ڕێگەیدا چوومە لایی و نامەکەی پێغەمبەری خوام پێدا کە نووسرابوو :( بسم الله الرحمن الرحیم من محمد رسول الله الی الحارث بن ابي شمر سلام علی من أتبع الهدی وأمن بالله وصدق فانی ادعوك انی أن تؤمن بالله وحده لا شریك له یبقی ملکك محمد رسول الله).

نامەکەی خوێندنەوە ئینجا فرێی داو تورە بوو وتی : کێ دەتوانێ ئەم دەسەڵاتەو سامانەم لێ بسینێ و لە چنگم دەربهێنی من وا دەرۆم بۆ گیانی ئەگەر لە یەمەنیش بێ هەردەچم بۆی ئادەی خەڵکم بۆ کۆکەنەوە ئیتر هەر دەیقیڕاندو قسەی دەکرد پاشان هەڵساو فەرمانی کرد ئەسپی بۆ ئامادە بکەن ئینجا ڕوی کردە من و وتی هاوەڵەکەت مەبەستی پێغەمبەر بوو ئاگادار بکە پاشان نامە دەنوسێ بۆ قەیسەری برادەری و هەواڵی نامەکەی پێغەمبەر ﷺ بڕیارەکەی خۆشی پێدەدات بەڵام قەیسر لەوەڵامدا دەنووسێ نەکەی هێرش بەریت بۆی هەروازی لێ بهێنە کاتێك وەڵامی قەیسەری بۆهات منی بانگکردو پێی وتم : کەی دەگەڕێیتەوە بۆلای هاوەڵەکەت ؟ وتم : سبەینێ ئیتر فەرمانی کرد سەد مسقاڵ ئاڵتونی پێدام و فەرمانیدا جل و بەرگو مەسرەفی ڕێگەم بدەنێ هەروەها فەرمانی دا سکرتێری تایبەتی خۆی مۆری بەرێشم بکات ئیتر مۆری بەڕێی کردم و پێی وتم : سەلام و ڕێزی من بگەیەنە پێغەمبەری خوا ﷺ منیش کە گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی هەڵوێستی حارسم پێداو فەرمووی دەسەڵاتی نامێنێ پاشان سەلامی مۆریم پێ گەیاندو هەواڵی ئیمان هێنانیم پێ گەیاند پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ڕاستی کردووە ئینجا حارس پاشای غەساسینەکانیش لە ساڵی ڕزگاری مەککەدا مردو کۆچی دوایی کرد کۆتایی بە دەسەڵاتی هات، شوجاع پێشمەرگەیەکی بەوەفاو هاوەڵێکی گیان لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا بوو تا پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆلای پەروەردگاری گەڕایەوە ئیتر شوجاع ژیانی لێ تاریك بوو حەزی دەکرد ساتێ زووتر شەهید ببێ و بەسەربەرزی بڕوات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ تا لەسەردەمی خیلافەتی پێشەوا ئەبوبکر دا – خوای لێ ڕازی بێ – جەنگی هەڵگەڕاوەکان دەستی پێکرد شوجاعیش زۆر قارەمانانە بەشداری کردو ڕۆڵی مەردانەی بینی تا لەو شەڕەدا شەهید بوو لەساڵی پازدەی کۆچیدا – هەزراران ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ.[٣٣٤]

---

[٣٣٤] ١- البداية والنهاية، ابن كثير

٢- طبقات ، ابن سعد.

٣- فرسان النهار من الصحابة الأخيار دكتور سيد بن حسين العفاني .

## ٣٣٧. ﴿ بەندەیەك خوا نووری خستبوویە دڵیەوە ﴾

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ به لاوێکی فەرموو کە ناوی _حارثە) بوو ( کیف أصبحت یا حارثە)؟ لەچی دایت ئەی حارثە وتی (أصبحت مؤمنا حقا یارسو الله) بوومەتە بڕوادارێکی تەواو ئەی پێغەمبەری خوا ئەویش فەرمووی : بزانە دەڵێ ی چی ؟ هەموو قسەیەك بەڵگەی دەوێ بەڵگەی تۆ چی یە ؟ لەسەر قسەکەت وتی : وام لێهاتووە بە ڕۆژ بە ڕۆژووم و بەشەوییش شەو نوێژ دەکەم و هەروەك عەرشی خوا بەسەر سەرمەوە ببینم وایە بەهەشت لەبەرچاومە کە چاکە کاران لەنازو نیعمەتدان و دۆزەخیش لەبەرچاومە کە خراپەکاران سزا دەدرێن پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (عرفت فالزم، عبد نور الله الایمان في قلبه) ڕێی خۆت دۆزیەوەتەوە بەردەوام بە ، بەڕاستی عەبدێکیت خوا نووری خستۆتە دڵتەوە جا ئەم حارثە یە لە غەزادا شەهید بوو دایکی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی : حارثە جێ و ڕێی چۆن دەبێت؟ ئەگەر لەبەهەشتایە با دڵخۆش بم و ئەگەر واش نیە با شیوەنی خۆمی بۆ بکەم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أجنة هی، بل هی جنان، وإن ابنك أصاب الفردوس الأعلی) واتە : هەر بەهەشت بگرە چەندەها بەهەشت کوڕەکەی تۆ بەڕاستی لە فیردەوسی ئەعلادایە دایکەکەش ڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە دەیوت (بخ بخ لك یا حارثة) واتە : بەهـ بەهـ بۆخۆت و جێت ئەی حارثە.[٣٣٥]

[٣٣٥] زیادەوە : نووسینی ئەدلازیار عوسمان، لاپەڕە ٢١٩.

## ٣٣٨.﴿بەسەرهاتی ئەعرابییەکەی بەنی فەزارە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﴾

ئەعرابیەك حوشترێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دێنێت و پێشکەشی دەکات و دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە هەدیەو دیاری منەو پێشکەشت بێ پێغەمبەری خواش ﷺ لێ ی وەردەگرێ و سوپاسی دەکات و وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی حەزی دەکرد پاداشتی بداتەوەو شتێکی پێشکەش بکاتەوە بۆیە کاتێ ئەعرابیەکە وویستی بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی پێغەمبەر ﷺ حوشترێکی زۆر چاکتر لەوەی خۆی پێشکەش کردەوە فەرموی : ئەمەش دیاری ئێمەیە بۆ تۆ بەڵام ئەو کەسە کە لە ئەعرابی بەنی فەزارەبوو لەو کەسانە بوو کە بەمێشك ووشك و قسە ڕەق ناسرابوون لە وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیاتی سوپاس و مەمنونی زۆر بە ڕەقی و زمانێکی تاڵ و زبر وەڵامی دایەوەو ووتی : ئائەمە پاداشتی دیاریەکەمە جا ئەمە چی یە ؟ لە ڕیوایەتێکدا دەڵێیت : پێغەمبەری خوا ﷺ شەش حوشتری دایە کەچی ئەو هەر دڵی ئاوی نەدەخواردەوەو هەر دەیوت ئەو حوشترەی من بە دیاری بۆتۆم هێنا ڕەفیقی ئەمانە نەبوو دەیوایە پاداشتی من زۆر زیاتر بوایە ئەوەندەی قسەی ناخۆش کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار بوو بچێتە سەر مینبەر فەرمووی :

ئەی خەڵکینە کەسی وا هەیە هەدیەو دیاریم بۆ دێنێ پاشان منیش بەوەندەی لەدەستمان بێ دەمەوێ پاداشتی بدەمەوەو پێی ببەخشمەوە کەچی ئەو کەسە هەر ناڕازیەو هەر قسەی ناخۆش دەکات دەی سوێند بەخوای گەورە لە دوای ئەمساڵەوە هەدیەو دیاری لە هیچ عەرەبێك وەرناگرم جگە لە ئەنصاریەکانی مەدینەو قوڕەیشی مەککەو هۆزی سەقیف و هۆزی دەوس نەبی چونکە ئەم چوارە بە بەرچاو تێری و بەخشندەیی و رەوشت بەرزی ناسراون.[٣٣٦]

[٣٣٦] رواه البخاري في الادب المفرد (٦٠٩) وحسنه الالباني .

## ٣٣٩. ﴿پێغەمبەر ﷺ بۆ چوونەکەی زیادی کوڕی لە بیدی ڕاست کردەوە﴾

جارێك پێغەمبەر ﷺ وەستاو ڕووی کردە ئاسمان وەك ئەوەی بیر بکاتەوە یان چاوەڕوانی شتێك بێت لە پاشاندا فەرمووی : ( هذا اوان ان يختلس العلم بين الناس حتى لا يقدروا منه على شئ ) واتە : ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە زانست خۆی بشارێتەوە لە نێوان خەڵکیدا هەتا هیچ توانایيەکیان بەسەریدا نامێنێ مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە خەڵکی پشت لە قورئان و فێربوونی حوکمەکانی دەکەن بۆیە هاوەڵێکی گەنجی خوێن گەرم بەناوی زیادی کوڕی لەبیدی ئەنصاری هەستاو زۆر بەدڵ گەرمییەوە وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن زانست لەناو ئێمەدا هەڵ دەگیرێ؟ لەکاتێکدا کە ئێمە قورئانمان خوێندووە بە خێزان و منداڵانیشمان فێرکردوون بۆیە پێغەمبەر ﷺ سەیری کرد وا سەیری دەکات گەنجێکی خوێن گەرمەو دڵی بە ئایین دەسووتێ بۆیە پێغەمبەر ﷺ وویستی ئاگاداری بکاتەوە بۆ تێگەیشتنەکەی فەرمووی :

( ثكلتك امك يا زياد أن كنت لا عدك من فقهاو اهل المدينه) واتە دایکت بۆت بگری ئەمەش ووشەیەکە نەریتە نەك دووعای لێ بکات فەرمووی من تۆم بەیەکێك لە زاناکانی شاری مەدینە دادەنا ئەمەش خۆی لەخۆیدا چاکی ئەو کابرایە دەردەخات لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا کە لایەنێکی پرشنگدارە بۆ زیاد لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( هذه التوورات والانجيل عند اليهود والنصارى فهاذا نفع عنهم؟) واتە ئەو تەورات و ئینجیلە لەناو جوولەکەو گاورەکاندا چ سوودێکی پێ گەیاندوون؟ مەبەست ئەوەیە تەنها بوونی قورئان لەناو خەڵکدا بەس نیە بەڵکو خوێندنەوە کارپێکردنی ئەوە سوود مەندییە.

## ٣٤٠.﴿کابرایەکی دەشتەکی موژدە پێدانەکەی پێغەمبەری ﷺ وەرنەگرت و رەتی کردەوە﴾

پێغەمبەرﷺ جارێك لە جێگەیەك دابەزی ناوی جەعرانە بوو لەنێوان مەککەو مەدینەدا بوو کابرایەك هات و داوای کۆمەکی و یارمەتی لێ کرد پێغەمبەریش ﷺ سۆزی پێدا کە یارمەتی بدات بەڵام کابرا زۆر بە پەلە بوو پێغەمبەریشﷺ دەرفەتی نەبوو کە کارەکەی بەو پەلەیە بۆ جێ بەجێ بکات بۆیە کابرا وتی : ئەی موحەممەد ئەوەی کە وەعدت پێ داوم پێم نادەیت پێغەمبەریش ﷺ وەك دڵدانەوەیەك فەرمووی مژدەو دڵنیابە پێت دەدەم چ ووشەیەك هەیە لە و ووشەیە جوانترو بەرزتر و ناسك ترو نەرم ترو خۆشتر مژدەت لێ بێ بەڵام کابرا هیچ کاریگەری لەسەری نەبوو بەڵکو بە دەنگێکی زۆر بەرزەوە وتی زۆرت وت مژدەت لێ بێ بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەم ووشەیە تووڕە دەبێت بەڵام ڕق و کینەی خۆی دەخواتەوە بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە باوکی موساو بیلال کە لەگەڵی دانیشتبوون لە پەنای ئەو کابرایەدا فەرمووی ئەو کابرایە مژدەی ناوێ ئێوە وەرن مژدەی خۆتان وەرگرن ئەوانیش ووتیان بەڵێ ئێمە ئەو مژدەیە وەردەگرین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاشاندا داوای قاپێکی کردوو ئاوی تێدابوو هەردوو دەستی خۆی تێدا شۆردو دووعای تیادا خوێند لە پاشاندا فەرمووی : لێی بخۆنەوە بە ڕووی خۆتانەوە بیهێنن گەردن و لاشەی خۆتانی پێ تەڕ بکەن ئەوانیش ئەمەیان کردوو زۆر دڵخۆش بوون دایکی سەلەمەش لەوێ بوو نزیك بوو لێیان دانیشتبوو لەو دیوی پەردەوە ئەویش وویستی ئەو پیرۆزی و بەرەکەتەی پێغەمبەری ﷺ لە کیس نەچێ بۆیە بانگی کردن لەو دیوی پەردەوەو وتی : هەندێك بۆ دایکی خۆتان بهێڵنەوە ئەوانیش هەندێك ئاویان لێ هێلایەوە بۆیان نارد ئەویش وەری گرت.[٣٣٧]

---

[٣٣٧] متفق عليه .

## ٣٤١.﴿عەبدوڵلای کوڕی مەسعود – ڕەزای خوای لێ بێ – کە گوێ بیستی فەرمایشتەکەی پێغەمبەرﷺ بوو لە جێگای خۆی دانیشت﴾

جابر – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت ڕۆژی جومعە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەری پیرۆزی فەرمووی : ئەی خەڵکینە دانیشن لە شوێنی خۆتان لەو کاتەدا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود- خوای لێ ڕازی بێ – دەهات بەرەو مزگەوت گەیشتە دەرگای مزگەوت و کە گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : دانیشن یەك هەنگاوی تری هەڵنەهێناو لە شوێنی خۆی دانیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی عەبدوڵلا وەرە پێشەوە بۆناو مزگەوت مەبەستم تۆ نەبوو.[٣٣٨]

## ٣٤٢.﴿خوای گەورە داوکاریەکەی خوبەیبی کوڕی عەدی جێ بەجێ کرد﴾

خوبەیبی کوڕی عەدی – خوای لێ ڕازی بێ – کاتێك بە دیلی کەوتە بەر دەستی کافرەکانی مەککە و بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرکرد و بەدار خورمایەکدا هەڵیان واسی و خەریکی تیرباران کردنی بوون بۆ ئەوەی بە ئازارێکی زۆرەوە بیکوژن ناو بەناو تیریان تێ دەگرت و لەو کاتەدا کە چەند تیرێك لەلاشەی پیرۆزیدا بوون و خوێن لە جەستەی دەهاتە خوارەوە ئەبو سوفیان لێ نزیك بۆوە ووتی : ئەی خوبەیب ( ایسرك أن محمداً عندنا نضرب عنقه وأنك في اهلك).

واتە : ئایا حەزت دەکرد و خۆزگە ناخوازیت کە ئێستا موحەممەد لای ئێمە دیل بوایە و لە گەردنیمان بدایە و تۆش بەسەلامەتی لەناو ماڵو منداڵی خۆتدا ژیانت بەسەر ببردایە؟ خوبەیب – خوای لێ ڕازی بێ – بەبێ دوو دڵی و زۆر بە دلێرانە وتی ( لا والله مایسرني أني في أهلي وأن محمداًﷺ في مكان الذي هو فيه يصيبه شوكة تؤذية) واتە : نەخێر سوێند بەخوای گەورە حەزناکەم و ئاوات ناخوازم کەمن لە ناو منداڵی خۆمدا سەلامەت و بێوەی بژیم بەلام پێغەمبەری خواﷺ لەناو جێگەی دانیشتنداو لەناو ماڵی خۆیدا تاکە دڕکێك ئازاری بدات ئەبو سوفیان کە ئەم وەڵامی لە خوبەیب – خوای لێ ڕازی بێ بیست ئاوا بەو پەڕی قەناعەتی و دڵەوە وەڵامی دایەوە وتی:

[٣٣٨] نووری مینبەر ، بەرگی یەکەم ، لاپەرە ٢٦٨.

( ما رأيت أحدا يحب أحد كحب أصحاب محمد محمداً) واتە : من نەمبینیوە کەسێك ئاوا بەدڵ و بەگیان کەسێکی خۆش بوێت بە وێنەی خۆشەویستی ڕاستەقینەی هاوەڵانی موحەممەد بۆ موحەممەدی سەرکردەیان ئینجا تیریان بۆ هاویشت و سەرنجام شەهیدیان کرد لەسەرەمەرگدا کۆتا وشەی خوبەیب خوای لێ ڕازی بێ ئەوەبوو کە ووتی : (خوایە گیان خۆت ئاگاداری کە من دەم و چاوی کافر نەبێت هیچم لێ دیار نیە خوایە بۆخۆت سەلامی من بگەیەنە بە پێغەمبەری خۆشەویستم ﷺ لە هەمانکاتدا ئەو داوایەی لە خوا گەورە کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوتەکەیدا بوو لە شاری مەدینە لەگەڵ هاوەڵە ئازیزەکانیدا لە ناکاو بەبێ ئەوەی کەس هاتبێتە مزگەوتەوە و سەلامی لێ بکات فەرمووی : (وعليك السلام و رحمه الله وبركاته) ئاگاداربن ئێستا خوبەیب شەهید کرا خوای گەورە داواکەی خوبەیبی دڵسۆزی ئیسلامی جێ بەجێ کردو سەلامەکەی بە جبریلی ئەمیندا گەیاندە خۆشەویستەکەی موحەممەدﷺ.[٣٣٩]

## ٣٤٣. ﴿بیلال لە ڕێگادا بە شوێن پێی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشت﴾

بیلالی حەبەشی تەماشا دەکات وا پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شوێنێك دەڕوات بیلالیش – خوای لێ ڕازی بێ – لە ترسی ئەوەی کە نەوەکو پێغەمبەر ﷺ تووشی مەترسیەك ببێت لەلایەن جولەکەو دوژمنانەوە بۆیە بە شوێنیدا ڕۆیشت ڕێگاکە تۆزێك قوڕ بوو کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەستی کرد کەسێك بە شوێنیەوەیەتی ئاوڕی دایەوە ئەوە بیلالە بەڵام هیچ جێگایەکی پێی دیار نیە فەرمووی ئەی بیلال ئەوە بە کوێدا ڕۆیشتوویت خۆ تەنها جێگە پێی من دیارە ؟ بیلال – خوای لێ ڕازی بێ – وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قاچم خستۆتە سەر شوێن پێیەکانی تۆو حەزم کرد کە لە هەنگاوی ڕێگەشدا بە شوێن پێی موبارەکی جەنابتدا بڕۆم.[٣٤٠]

---

[٣٣٩] رواه البخاري.

[٣٤٠] نووری مینبەر، بەرگی یەکەم ، لاپەرە ٢٩٢.

## ٣٤٤.﴿بەسەرهاتی ئەبوبکری صدیق و رەبیعەی ئەسلەمی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ﴾

ڕۆژێك ئەبوبكر قسەیەكی رەق بە رەبیعەی ئەسلەمی دەڵێ و هەر زوو پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ: رەبیعە قسەکەم پێ بڵێرەوە بۆ ئەوەی بیێ بە هەق بەهەق ئەویش ڕازی نابێ پێی بڵێتەوە ئەبوبکریش دەڵێ : ئاخر لای پێغەمبەر ﷺ شکاتت لێ دەکەم ئەویش دەڵێ : هەرگیز ئەو قسەیەت پێ نالێمەوە ئەبوبکر دەڕوات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و رەبیعەش بەدوایدا خزمانی رەبیعە دەیبیینن دەڵێن ئەوە چیە ؟ ئەویش مەسەلەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە ئەوانیش دەڵێن : خوا ڕەحمت پێ بکات لەسەرچی شکاتت لێ دەکات ئەو هێتشا ئەوەی ووتوە کە ووتوویەتی ؟ رەبیعەش دەڵێ بێ دەنگ بن ئەوە ئەبوبەکرە خوا لە بارمیەوە دەفەرمووێ:( ثَانِي اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ) التوبە : ٤٠ بە قوربانە بڕۆن لاچن نەك ئاوڕبداتەوەو بتانبینێ و وابزانێ گەلە کۆمەکیتان کردووە لە دژی ئەو تووڕە ببێ و پێغەمبەریش ﷺ لە بەر تووڕ بوونەکەی ئەوان و لێم زویر ببێ و رەبیعە تیابچێ پاشان بە تەنیا ڕۆیی و بە دوای ئەبوبکردا تا گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبکر بۆی گێڕایەوە پێغەمبەریش ﷺ سەری هەڵبڕی و بە رەبیعەی فەرموو : چیتە ڕەبیعە چیت هەیە لەگەڵ ئەبوبەکردا؟ رەبیعە وتی ، ئەی پێغەمبەری خوا ئەو قسەیەکی پێ ووتووم و پێم ناخۆش بوو ئینجا ووتی پێم بلێرەوە بۆ ئەوەی هەق بە هەق بێت و منیش رازی نەبووم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : چاکت کرد ئەی رەبیعە پێی مەڵێرەوە بەڵکو بڵێ خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبکر رەبیعەش وتی خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر ئەووبوبەکریش بەگریانەوە هەستاو ڕۆیشت.[٣٤١]

[٣٤١] ژیانەوە نووسینی ئەندازیار عوسمان، لاپەڕە ٢٨٣

## ٣٤٥. ﴿ئەبو هورەیرە ووشە زێڕینەكانی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت﴾

ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هاوەڵەكانیدا دانیشتبوو فەرمووی ( من يأخذ مني هذه الكلمات فيحصل بهن، أو يعلم من يحصل بهن؟) واتە: چ كەسێك ئامادەیی تێدایە كە ئەم چەند ووشەیەم لێ وەربگرێ و پاشان كاریان پێ بكاو بە كردەوە لە ژیانیدا جێ بە جێیان بكات یان فێری كەسێكیان بكات كە ئەو كەسە بە كردەوە جێ بەجێیان بكات و كاریان پێ بكات ئەبو هورەیرە دەڵێت : وتم : ئەی پێغەمبەری حوا ﷺ من ئەو ووشە زێرینانەت لێ وەردەگرم ئەبو هورەیرە – خوای لێ ڕازی بێ دەڵێت (فأخذ بيدي، وعد خمسا) واتە : دەستی گرتم و پێنج شتی ژمارد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

یەكەم إتق المحارم تكن أعبد الناس واتە خۆ پارێزبە لە حەرامكراوەكان دەبێ بە خواپەرسترین كەس.

دووەم : وأرض بها قسم الله لك تكن أغني الناس : واتە رازی بە بەوەی كە خوای گەورە دیاری كردووە دەبی بە دەوڵەمەنترین كەس.

سێ یەم و أحسن إلى جارك تكن مؤمنا واتە چاكا كاربە لەگەڵ دراوسێ كەت دەبی بە ئیماندار.

چوارەم : وأجب للناس ما تحب لنفسك تكن مسلما: واتە پێت خۆش بێ بۆ خەڵكی لە خێرو چاكە كە تووشیان ببێ لەوەی كە بۆ خۆت پێ خۆشە دەبیٚ بە موسڵمانێكی راستەقینە.

پێنجەم ولا تكثر الضحك، فإن كثرة الضحك تميت القلب واتە زۆر پێ مەكەنە چونكە پێكەنینی زۆر لە ڕادەبەدەر دڵ دەمرێنێ.

## ٣٤٦. ﴿بەسەرهاتی دوو برایەکەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ﴾

ئەنەسی کوڕ مالیك خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە شاری مەدینەدا دوو برا هەبوون یەکێکیان ڕۆژانە دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خواو گوێ ی لە فەرمایشتەکانی دەگرت و جوان لە بەری دەکرن و بە خەڵکی دەگەیاندن برایەکەی تریشی ئیشی دەکردو سەنعەتکار بوو ڕۆژێ برا ئیشکەرەکە شکاتی لە براکەی کرد لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی :

(یا رسو الله، إن هذا أخي لایعنني بشء) واتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم برایەم بە هیچ جۆرێ هاوکاریم ناکات و کارێکم لەگەڵ ناکات و پارەیەك پەیدا ناکات و هەر خەریکی فێربوونی زانستی شەرعیە هەردەبێ من پارەتی بدەم و گوزەرانی بۆ دابین بکەم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (لعلك ترزق به) بە خوا ڕەنگە خوای گەورە بەهۆی ئەو برا فێر خوازەتەوە رزق و ڕۆزی تۆش بدات و بەرەکەتت بۆ تێ بخات تۆ بەهۆی ئەوەوە نان بخۆیت نەك ئەو لەژێر منەتی تۆدا بژیت.[٣٤٢]،[٣٤٣]

## ٣٤٧. ﴿ڕێنماییەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتێکی هەوێ دار﴾

ڕۆژێك ژنێك بە پێغەمبەری ﷺ وت من سەر بە هەوێم خۆ قەیناکات ئەگەر لای هەوێکەم خۆم هەڵکێشم و بڵێم مێردەکەم فلان شتی بۆ کردووم و بۆشی نەکردبێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (المتشبع بها لم يحط كلا بس ثوبي زور).[٣٤٤] واتە : ئەوەی خۆی هەڵبکێشێ بە شتێکەوە کە نەیبێت و وەری نەگرتبێت وەك کەسێك وایە کە دووبەرگی دۆری پۆشیبێت چونکە لەلایەکەوە درۆ دەکات کەخۆی ئەوشتەی نیە وە لەلایەکی تریشەوە درۆ بەدەم کەسێکی دیکەوە دەکات کەشتێکی پێداوەو لە ڕاستیشدا پێی نەداوە.

---

[٣٤٢] حديث حسن صحيح سنن الترمذي( ١٨٧٦).

[٣٤٣] حديث صحيح أخرجه الترمذي (٢٣٤٦) وفي الصحيحة (٢٧٦٩)

[٣٤٤] رواه البخاري ومسلم

## ٣٤٨.﴿ئافرەتێك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ شكاتی كرد لە باوكی خۆی﴾

ڕۆژێك ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و شكاتی لە باوكی كردوو وتی باوكم بەبێ ڕەزامەندی خۆم بەشووی داوم بە ئامۆزاكەم پێغەمبەر ﷺ دەست بەجێ ناردی بە دوای باوكی ئافرەتەكەداو لە بەرچاوی ئافرەتەكەو گشت ئامادەبووان فەرمووی : كەس نابێت بە زۆر كچی بدات بە شوو ئینجا ئافرەتەكە ووتی : ئەی پێغەمبەر خوا من ڕازیم كە شوو بكەم بە ئامۆزاكەم بەڵام ویستم بەم كردارەم ئافرەتان ئاگاداربكەم لەوەی كە شوو كردنیان بەرەزامەندی خۆیان دەبێت و كەس زۆری نییە لە سەریان.[٣٤٥]

## ٣٤٩.﴿كابرا ئەعرابییەكە هەتا مرد هەر بە خەفەتباری ژیا﴾

ئیمامی بوخاری دەڵێت كابرایەك چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ناوت چی یە ؟ كابرا وتی ( حَزن) واتە : غەمگین پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : نا نابێت تۆ ناوت غەمگین و خەفەتبار بیت تەماشا بكەن ئەوەند دڵسۆزە ڕازی نابێت كەسێك لە ئوممەتی بەناویش خەفەتبار بێت نەك بە ژیان و كردار بۆیە فەرمووی ( بل أنت سهل) بەڵكو تۆ ناوت ئاسانكارە كابرا ئەعرابییەكی مێشك ژەنگاوی بوو وتی ( لا أغیر اسما سمانیه أبی) واتە نەخێر ئامادەنیم ناوێك كە باوكم لێ ناوم بیگۆڕم بە ناوێكی تر ئەم پیاوە ڕەتی ئەو هەموو دڵسۆزیەی پێغەمبەری خوای كردەوەو ڕەحمەتی نەویست و زەحمەتی هەڵبژارد بۆیە هەتا مرد بە غەمباری و خەفەتباری ژیا.

---

[٣٤٥] بەرەو پەروەردەی ئیسلامی نووسینی ، ئەندازیار عوسمان ، لاپەڕە ٩٢.

## ٣٥٠.﴿وتەکانی عەبدوڵلای کوڕی عومەر بوون مایەی سەر سوڕمانی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ﴾

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو کێ لە ئێوە چۆتە بەهەشتەوە؟ عەبدوڵلای کوڕی عومەر – خوای لێ ڕازی بێ ، وتی : من ئیمامی عومەر – خوای لێ ڕازی بێ – کەلەوێ دانیشتبوو وەڵامەکەی عەبدوڵلای کوڕی بەلاوە سەیر بوو ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی کێ لە ئێوە ناوی بەهەشتی خواردۆتەوە ؟ عەبدوڵلا – خوای لێ ڕازی بێ فەرمووی : قوربان من پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ئەی کێ لە ئێوە خواردنی بەهەشتی خواردووە؟ عەبدوڵلا – خوای لێ ڕازی بێ – فەرمووی : من ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئادەی بزانم چۆن ؟ بزانم چۆن لە خواردن و خواردنەوەی بەهەشتت خواردووەو هێشتا لە دونیادای چویتە ناو بەهەشت و بەهەشتت بە چاو بینیوە، عەبدوڵلا – خوای لێ ڕازی بێ فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ هەواڵت داوینێ کە لە ئیسراو میعراجدا بەهەشتت دیوەو لە ناوەکەیت خواردۆتەوەو لە لە خواردنەوەکەیت خواردووە جا کە تۆ چوویت مانای وایە ئێمەش چووین و هەواڵی تۆش گومانی تێدانیە هەروەکو من چووبم وایە ئەمەش جێی سەر سوڕمانی هاوەڵان بوو کەوا عەبدوڵلا – خوای لێ ڕازی بێ – بە ووردی بیری کردەوەو بە جوانی دەری بڕی.[٣٤٦]

---

[٣٤٦] نووری مینەبەر، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٢٩٧

## ٣٥١.﴿پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایەی گەنم فرۆشێك دەكات﴾

لە صەحیحی (موسلیمدا) هاتووە، كە جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بەلای پیاوێكدا كە خواردەمەنی دەفرۆشت گەنمی دەفرۆشت ڕووكاری دەرەوەی زۆر جوان بوو بەشێوەی سەرنجی پێغەمبەری خوای ڕاكێشا پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە ناویەوە تەماشای كرد ناوەوەی تەڕەو بۆنی كردووە فەرمووی ما هذا ؟ ئەوە بۆچی وا تەڕە؟ كابرای فرشیار وتی (أصابته السماء يار سول الله) واتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەومباران لێیداوە ئاوا تەڕی كردووە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (فهلا جعلته فوق الطعام حتى يراه الناس، من غشنا فليس منا) واتە فەرمووی ئەی بۆچی ئەم تەڕبووەت نەخستۆتە سەرەوە تاوەكو خەڵكی بیبینن وە بزانن ئەو جوانەی لەسەرەوە سەرنجیان ڕادەكێشێ ژێرەوەی وانیە و بەكەڵك نەماوە ئینجا فەرمووی : هەر كەسێك غەشمان لێ بكات لە ئێمە نیە.

## ٣٥٢.﴿پێغەمبەر ﷺ پیاوەكەی ڕاسپارد كە پابەند بێ بەڕیزی یەكەمی نوێژ﴾

جارێك كابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی كرد : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كردەوەیەكم پێ بڵێ ئەگەر ئەنجامی بدەم لەسەری بەردەوام بم بەهۆی ئەو كردەوە جوانانەوە بچمە بەهەشت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ببە بە بانگبێژی مزگەوت كابرا وتی ئەگەر نەمتوانی بانگ بدەم دەنگی بانگم نەبوو چ كردەوەیەكی تر بكەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : پێش نوێژی بۆ مسوڵمانان بكە كابرا ووتی : ئەگەر نەمتوانی ئیمامەتی بكەم و پێش نوێژی بۆ مسوڵمانان بكەم چ كردەوەیەكی تر ئەنجام بدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (فعليك بالصف الأول) ئامۆژگاریت دەكەم بەردەوام هەوڵ بدە كە لە ڕیزی یەكەمی نوێژدا بیت.[٣٤٧]

---

[٣٤٧] نووری مینبەر ، بەرگی یەكەم، لاپەڕە ٦٠٩

## ٣٥٣.﴿پیاوەکە مرد لە کاتێکدا خوای گەورە لێی تورە بوو﴾

ئەنەسی کوڕی ماڵیك دەڵێت : ( کنا عند رسول الله ﷺ ) واتە : ئێمە کۆمەڵێ هاوەڵەکان لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بووین (فجاء رجل، فقال : یا رسول الله مات فلان، قال : ألیس کان معنا آنفا؟ قالوا : بلی ، قال سبحان الله کأنها أخذة علی غضب ، المحروم من حرم وصیته)

واتە : پیاوێك بە هەڵە داوان هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد فلاّن کەس مرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نایە ئێستا لامان نەبوو؟ خۆ کەمێك لەمەوبەر بەیەکەوە بووین ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوار هەر ئەو پیاوەی کەمێك لەمەو بەر لەگەڵ ئێمە جیابوویەوە مرد پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو ئەوەی دەرسێکی گەورە لەو کاتەدا کە گونجاوە بۆ ئەم مەبەستە بە ئوممەتەکەی بڵێ نمونەی بەم پیاوە هێنایەوە فەرمووی پاکو بێگەردی بۆخوا ئەڵێی ئەم پیاوە لەسەر تورەبوونی خوا لێی مردووە چونکە وەصیەتی نەکردبوو کە مرد بێبەش ئەو کەسەیە کە لەوە صیەت نووسینی شەرعیانە پێش مردنی بێ بەشە.

## ٣٥٤.﴿خەڵکە سەریان سورماو دەمو چاویان تێك چوو کە گوێ بیستی هەواڵێك بوون لە پێغەمبەر ﷺ﴾

ئیمامی مالیك لە کتێبی ( الموطأ) دا دەڵێت زەیدی کوڕی جەهەنی وتویەتی لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا پیاوێك کە لەو غەزایەدا لەگەڵمان بوو مرد خەڵکەکە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان ڕاگەیاند : کە فلاّن کەس مرد کە کەسێکی دڵسۆزو ئازابوو مردووە، بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (صلوا علی صاحبکم) واتە : ئێوە خۆتان نوێژی مردوو لەسەر برادەرەکەتان بکەن و من ناچم نوێژی لەسەر بکەم خەڵکەکە هەموویان سەریان سورماو دەم و چاویان تێك چوو لە بیستنی ئەم هەواڵە کە دیارە ئەم پیاوە کارێکی ئەوەندە نا بەجێی کردووە کە شایەنی ئەوەی ماوە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی جەنازەی لەسەر بکات و ئەو هەموو فەزڵ و گەورەییەی لە دەست چوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بۆیە نوێژی لەسەر ناکەم چونکە (إن صاحبکم قد غل في سبیل الله) واتە هاوەڵەکەتان دزی کردووە لەو ماڵەی کە لە غەزاکەدا دەستکەوتی مسوڵمانان بووە زەیدی کوڕی خالید دەڵێت ( ففتحنا متاعه فوجدنا خرزات من خرز یهود ما تساوی درهمین).

واتە ئێمەش کەلوپەلەکەیمان کردەوە هەندێك ووردەشتی جولەکەکانمان دۆزیەوە کە بەهەر هەمووی بایی دوو درهەم نەدەبوو.[٣٤٨]

---

[٣٤٨] رواه مالك في الموطأ ، ج٢، ص٤٥٨، برقم ٩٧٨، وأحمد في المسند برقم ٢١٧١٩

## ٣٥٥. ﴿ پرسیارەکەی پیاوێکی دەشتەکی دەربارەی ئەحکامەکانی ئاین ﴾

پێغەمبەر ﷺ جارێك لەسەر مینبەرەکەی راوەستاو ووتاری دەخوێندەوە بۆ خەڵکی کابرایەك هاتە ژووری مزگەوتەوە سەیری پێغەمبەری ﷺ کرد لە پاشاندا وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ کابرایەك پرسیار لە ئاینی خۆی دەکات نازانێ ئاینەکەی چیەو چۆنە؟ پێغەمبەر ﷺ رووی کردە لای ئەو کابرایە وا سەیر دەکات کابرایەکی دەشتەکیە لەوانەیە ئامادەی ئەوەی تێدا نەبێت کە چاوەڕوانی بکات هەتا ووتارەکە تەواو دەبێت بۆیە پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆ یەکلایی دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئاینەکەی تێ بگەیەنێت، چونکە لەوانەیە کابرا لە مزگەوت دەرچێ و جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ مزگەوت، دیارە کابرا پرسیارەکەی زۆر بەلاوە گرنگ دەبێت هەتا وای لێ دەکات کە ووتارەکە بە پێغەمبەر ﷺ ببڕێت و بۆ ئەوەی ئەحکامەکانی ئاینی تێ بگەیەنێت پێغەمبەر ﷺ بیرو هزری لە بۆچوونەکانی بەرامبەری دەکردەوە نەك بۆچوونی خۆی بە تەنها پێغەمبەر ﷺ دابەزی لەسەر مینبەرەکەی داوای کرد کورسیەکی بۆ بهێنن کە بەرامبەر کابرای دەشتەکی دانیشت ئاینەکەی خستە ناو زاریەوە تێگەیشتنە پێویستیەکانی لە ئاینی تێ گەیاند هەتا تێگەیشت لە پاشاندا هەستاو کابرای بەجێ هێشت و گەڕایەوە سەر مینەبەرکەی و ووتارەکەی دەست پێ کردەوە هەتا تەواوی کرد.[٣٤٩]

[٣٤٩] استمتع بحياتك چێژ لە ژیانی لە خۆت وەرگرە: نووسینی دکتۆر موحەممەد عەریفی وەرگێڕانی: ئەبوبەکر تۆفیق ، لاپەڕە ٣٩١

## ٣٥٦.﴿عامری کوڕی رەبیعەی کە گوێ بیستی ووتەکەی پێغەمبەر ﷺ بوو یەکسەر گۆزە ئارەقەکەی ڕژاند﴾

پێغەمبەر ﷺ لە پێش بوونی بە پێغەمبەر و لەپاش بوونی بە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ئارەقی نەخواردۆتەوە زۆرجاریش خەڵك دیاری هێناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ بەکارهێنانی یان ئەویش دەیکردەوە بە دیاری تەنانەت زێرو زیو حەریرشیان بە دیاری بۆ دەهێنا ئەویش بە خێزانەکانی یان خەڵکی تری دەبەخشیەوە کاتێك عامری کوڕی رەبیعە گۆزە پڕ ئارەقەکەی خستە پێش پێغەمبەر ﷺ وەك دیاری پێغەمبەر ﷺ سەیری گۆزەکەی کردوو بەلایەوە جێی سەر سوڕمان بوو بۆیە فەرمووی ئەی عامر تۆ نازانی ئارەق حەرام بووە؟ عامر ووتی نەخێر پێغەمبەری خوا فەرمووی : حەرام بوو عامر هەڵی گرتەوە هەندێك بە گوێی عامریان وت بڕۆ بیفرۆشە پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو فەرمووی نەخێر ئەگەر خوا شتێکی حەرام کرد نرخەکەیشی حەرام دەکات بۆیە عامر یەکسەر ڕژاندی بە زەویدا.[٣٥٠]

## ٣٥٧.﴿بەسەرهاتی عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح ئەو کەسەی لەنوێژی بەیانیدا لە سوجدەدا مرد﴾

کەسێکی خەڵکی مەککە ناوی عەبدوڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح بوو موسڵمان بوو کاتبی وەحی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو هەر ئایەت و سورەتێکی قورئان بهاتایە خوارەوە لەدەمی پێغەمبەری خوای ﷺ دەبیست و دەینوسیەوە پاش ماوەیەك لە ئیسلام پاش گەز بۆوە و هەڵگەرایەوە و مورتەد بۆوە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد فەرمووی بیکوژن و فەرمووی خوێنی بەهەدەر چووە ئەم پیاوە کە زانی کاری تەواو بووە و سزای خیانەتەکانی وەردەگرێت ڕای کرد بۆ لای ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففان کە برا شیری ئیمامی عوسمان بوو ئیمامی عوسمانیش لەگەڵ خۆی هێنای بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیبەخشێ و ئەمانی پێ بدات کە صەحابەکان نەیکوژن کاتێك ئیمامی عوسمان ئەم پیاوەی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئەمانی بۆ کرد پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا لەناو کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵانی دابوو کاتێك ئیمامی عوسمان

---

[٣٥٠] رواه الطبراني و رجاله رجال الصحيح

ڕۆیشت و دوور کەوتنەوە کابرا لە کوشتن ڕزگاری بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەوانەی چوار دەوری فەرموو ( أما كان فيكم رجل رشيد يقوم الى هذا حيث راني كففت يدي عن بيعته فيقتله ؟ ) واتە ئەوە کەسێکی ئازا و ڕەشید و چالاکتان تێدا نەبوو کاتێك کە زانی من ئەوەندە بێدەنگ بووم بێ توو پەلاماری ئەو کابرایە بدات و بیکوژێت من بۆیە ئەو هەموو ماوەیە قسەم نەکردووە وەڵامی داواکەی عوسمانم نەدایەوە بۆ ئەوەی کەسێ لەئێوە خێرا پەلاماری بدات و بیکوژێت بەڵام کەستان ئەوەتان نەکرد صەحابەکان تێکڕا فەرموویان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی بۆچی ئاماژەیەکت نەداینێ ؟ بۆچی چاوێکت لێ دانەگرتین و بەتیلە چاوێك فەرمانی کوشتنیت پێ نەداین تا یەکسەر بمان کوشتایە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( ان النبي لا يقتل بالاشارة وفي رواية انة لاينبغي لنبي ان يكون لة خائنة اعين) (٢٥٥) واتە بەڕاستی نابێ پێغەمبەر بە ئاماژە فەرمان بە کوشتنی هیچ کەسێك بدات لە ڕیوایەتێکدا بە ڕاستی بۆ پێغەمبەر نەهاتووە، کە ئاماژەی چاوی هەبێ بە نیەتی لەناوبردنی کەسێك ئیبن هیشام دەفەرموێ: ئەم پیاوە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرحە کاتێ ئەو لێبوردنەی لە پێغەمبەری خوا بینی و ئەم دەنگ و باسەشی بیستەوە زۆر بە دڵ و بەکوڵ مسوڵمان بۆوە مسوڵمانێکی زۆر دڵسۆزی لێ دەرچوو وە زۆر خزمەتی بە ئیسلام کردەوە پێشەوا ئیبن کەسیر لەکتێبە نایەبەکەیدا البدايه والنهايه ج٤ ص ٢٩٦دا فەرموویەتی: ( مات و موساجد في صلاه الصبح) واتە: ئەم عەبدوڵڵایە لە نوێژی بەیانیدا لەکاتی سوجدەدا مرد.

## ٣٥٨. ﴿عومەر پرسیارەکەی کۆچەرانی ئاراستەی پێغەمبەرﷺ کرد﴾

ئەبو نەعیم لە (الحلیە ج١، ص١٨٢) لە پەوبانەوە – خوای لێ ڕازی بێ - هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە ڕێیەکدا بووین و ئێمەش لەگەڵی بووین کە کۆچەران وتیان : ئەگەر بمانزانیایە چ سامانێ باشە کاتێ خوا ئایەتی لەسەر زێڕو زیو دابەزاندووە؟ عومەر وتی ئەگەر دەتانەوێت لای پێغەمبەر ﷺ ئەو پرسیارەتان بۆ دەکەم وتیان : بەڵێ ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ منیش سواری ووشترەکەم بووم و کەوتمە شوێنی وتی پێغەمبەری خوا کۆچەران کاتێ بیستیان خوا چی لەسەر زێڕو زیو دابەزاندووە وتیان خۆزگە دەمانزانی چ سامانێ باشترە کاتێ خوا ئەمەی لەسەر زێڕو زیو دابەزاندووە فەرمووی : ( لیتخذ احدکم لسانا ذکرا وقلبا شاکراو زوجة مؤمنة تعین أحدکم علی ایمانه).

واتە: با هەر کامتان زامانێکی بە زیکرو دڵێکی سوپاسگوزارو هاوسەرێکی باوەڕدار بگرێتە خۆ کە یارمەتی نیمانتان بدات لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا (و زوجة تعینه علی الأخرة) واتە هاوسەرێ بۆ ڕۆژی دوایی یارمەتی بدات.[٣٥١]

---

[٣٥١] -رواه ابو داود (٢٦٨٣).

- رواه احمد والترمذي وابن ماجه

## ٣٥٩. ﴿وەسیەتی نووح – سەلامی خوای لێ بێ – بۆ كوڕەكەی ﴾

بەزار لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئایە وەسیەتی نووحتان بۆ كوڕەكەی پێ بڵێم ؟ ووتیان : بەڵێ فەرمووی : نووح وەسیەتی كرد بۆ كوڕەكەی و بە كوڕەكەی فەرموو : ئەی كوڕی شیرینم من وەسیەتت بۆ دەكەم بە (لا اله الا الله) چونكە ئەگەر بخرێتە تایەكو ئاسمانەكان و زەویش بخرێتە تایەك ئەو ( لا اله الا الله) لەوان قورسترە ئەگەر ئەڵقەیەك بوایە لێیان قورستر و زاڵتر دەبوو تا پوخت بۆلای خوا بچێت وەفەرمانت پێ دەكەم بە وتنی (سبحان الله العظیم و بحمده) چونكە پەرستشی دورستكراوانە بەوەش ڕۆزیان دەبرێتەوە ڕێگریشت لێ دەكەم لە دووشت هاوەڵ دانان و خۆ بە زل زانین چونكە ئەو دوانە ڕێگرن لە بەرەو خواچوون دەڵێت : ووترا ئەی پێغەمبەری خوا ئایە ئەگەر كەسێ خواردن بینێ و دەستەیەك لەسەری بن یان جلی پاك و چاك بپۆشی ئەوە خۆ بەزل زانینە ؟ فەرمووی :

( لیس یعنی بالكبر انما الكبر أن تسفه الخلق و تغمص الناس) واتە : لە بەخۆ زلزانین نیە بەڵكو خۆ بەزلزانین ئەوەیە خەڵك بە گەمژە بزانێ و سووك و كەم لەگەڵیان بجولێتەوە.[٣٥٢]

---

[٣٥٢] صحیح حاكم لە عەبدوڵڵاوە بەو شێوەیە هێناویەتی دەڵێت سەنەدەكەی صەحیحە وە لە (الترغیب والترهیب)، ج٣، ص(٧٧) داهاتووە

## ٣٦٠.﴿بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی طوفە یلی کوڕی عەمری دەوسی لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ﴾

طوفە یل کوڕی عەمری دەوسی نوێنەری هۆزەکەی بوو هات بۆ بازاڕی ( عکاظ) بۆ خوێندنەوەی هۆنراوەو شانازی کردن بە سەروەریەکانی هۆزەکەیەوە کە ئەبو جەهل و پیاوانی قوڕەیش بینیان ووتیان ئەگەر موحەممەد دەستی بگاتە طوفە یل مسوڵمانی دەکات بۆیە میوانداریەکی چاکیان بۆ سازکردو تێیان گەیاند کە بەهیچ جۆرێك لە موحەمەد نزیك مەکەوە تازیانت پێ نەگەیەنێ ئەوەندەیان تانەو تەشەر لە موحەمەد دا طوفە یل بڕیاری دا کە لەکاتی طه وافی کەعبەدا گوێ ی خۆی بە لۆکە بئاخنێ و بەهیچ جۆرێك گوێ لە موحەمەد نەگرێ لە کاتی طه وافدا پێغەمبەر ﷺ لەلای کەعبەدا نوێژی دەکردو گوفەیل ڕەنگو رووی پێغەمبەرو شان و شکۆی کاریان تێکرد بۆیە لە دڵی خۆی دا وتی : ماڵت وێران بێت طوفە یل خەڵکی بە شاعیرێکی چاك و پایەبەرزت دەزانن و قسەی چاك و خراپی خەڵکی دەتوانێ هەڵسەنگێنی چی ئەبێ ئەگەر گوێ لە موحەممەد بگری ئەگەر خراپ بوو بەگوێ ی مەکەو خۆ ئەگەر چاکیش بوو ئەوە هەقە دوای بکەوی طوفە یل لۆکەکانی لە گوێ ی دەرهێناو گوێ ی لە پێغەمبەر ﷺ گرت کە سورەتی (الرحمن) ی دەخوێندەوە زۆر کاری کردە سەر دڵ و دەروونی بۆیە دوای ڕۆیشتنەوەی پێغەمبەر ﷺ دوای کەوت و بۆ ماڵەوەیان و لەوێ مسوڵمان بوو ئینجا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من قسەم دەڕوات لەناو گەلەکەمدا کە گەڕامەوە بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام بەڵکو لە خوا بپارێیتەوە کەرامەتێکم پێ بدات تاوەك بەڵگەو نیشانەیەکبێ بۆم بۆ ئەوەی زووتر بڕوام پێ بکەن پێغەمبەریش ﷺ دەستی موبارەکی بەرزکردەوەو فەرمووی : خوایە بەڵگەو نیشانەیەك بدە بە طوفە یل کە یارمەتی بدات لەو نیەتە خێرەی کە هەیەتی جا کە طوفەیل گەڕایەوە لە ڕێگا ناوچەوانی دەدرەوشایەوە ترسا گەلەکەی وابزانن بتەکانیان دەستیان لێ وەشاندووە بۆیە دووعای کرد کە خوایە ڕۆشنایی بەکەم ، خوای گەورەش دووعاکەی گیراکردو ئینجا سەری گۆچانەکەی دەدرەوشایەوە یەکەم کەس کە بە طوفەیل گەیشت عەمری باوکی بوو بە خێرهاتنەوەی کردو کەوتنە گفتوگۆ و باسی بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە وتی : من لەتۆ بەریم ئەگەر مسوڵمان نەبی باوکی مسوڵمان بوو پاشان دایکی و هاوسەرەکەیی و عەمری کوڕیشی مسوڵمان بوون ئینجا کەوتە بانگ کردنی گەلەکەی و ئەوانیش بڕوایان نەهێنا بۆیە گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە دڵی شکاوەوە ووتی : ئەی

ڕەوانەکراوی خوا بە لکو دووعا لە گەلە دلڕەقەکەم بکەی خوا تەفرو تونایان بکات پێغەمبەری ڕەحمەت بۆ جیهانیش فەرمووی ئیمانداری بە زۆر نیەو ئێمە دووعایان بۆ دەکەین کە خوا هیدایەتیان بدات ئینجا بە طوفەیلی فەرموو بگەڕێرەوە ناو گەلەکەت و بەنەرم و نیانی و لەسەرخۆ بانگیان بکە بۆ ئیسلام بەڵێ طوفەیل گەڕایەوە و لەسەرەخۆ کەوتە بانگەوازکردن بەکەم کەس کە ئیمانی هێناو مسوڵمان بوو ئەو هورمیرەبوو کە پاشان بوو بەو بلیمەتەی کە زۆری فەرموودەکانی پێغەمبەری لەبەربوو بانگەوای بەردەوام بوو تا ساڵی حەوتەمی کۆچی کە پێغەمبەر ﷺ فەتحی خەیبەری کرد لەو ساڵەدا طوفەیل بەخۆی و هەشتا خێزانەوە هیجرەتیان کرد بۆ مەدینە کاتێ گەیشتنە مەدینە پێغەمبەر ﷺ بە ( لا اله الا الله) و (الله أکبر) کردنەوە بە دەنگی بەرز پێشوازیان کردن و ئەوانیش هەموویان بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر ﷺ طوفەیل لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بتی ( ذالکفین)ی شکاند لە دوای وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ طوفەیل سەربازێکی بەوەفاو گوێڕایەڵ بوو بۆ ئەبوبەکر – خوای لێ ڕازی بێ - وە لە شەڕی(یەمامە) دا لەگەڵ باوکی و کوڕەکەی دا بەشداریان کرد دژی موسەیلەمەی درۆزن ڕۆژی یەکەم باوکی طوفەیل شەهید بوو لە بەیانی ڕۆژی دوایشدا طوفە یل بە کوڕەکەی وت : کوڕی خۆم ئەمشەو لە خەومدا بینیم سەرم تاشراوەو لەوە دەچوو باڵنەیەکیش لە دەم بێتە دەرێ و ئافەرتێکیش باوەشی بۆ کردمەوەو زۆر بەسۆزەوە گرتمیە خۆی تۆش کوڕی خۆم دەتویست بەخێرایی پێم بگەیت بەڵام نەگەیشتی جا من بەوە لێکی دەدەمەوە کەسەرتاشینەکەم پەڕینی سەرم بێ و باڵندەکەش گیانم بێ کە دەردەچێ و ئافرەتەکەش زەوی یە کە باوەش بۆ دەکاتەوەو بە شەهیدی ئەمگرێتە خۆی بە خوا دەمێکە ئاواتی بۆ دەخوازم وە ئەوەش کە پێم نەگەیشتی بەوەی دەزانم کە لە گەڵما شەهید نابێت و دەشزانم کە هەوڵی شەهید بوونتە خواش بۆخۆی چاکتر دەزانی کوڕی خۆم گوێم لێ بگرە من دەزانم شەهید دەبم و بۆنی بەهەشت دەکەم وەسیەتم بۆتە ئەوەیە لە ڕێ ی خوادا تێ بکۆشە تێکۆشانێك کە مردن و شەهادەتت ئاواتت بێت و خەم مەخۆ بۆ مردنی باوکت و برا شەهیدەکانی ئەم شمشێرەشم دوای من بۆ تۆ بیوەشێنە لە ڕێ ی خوادا و هێرشی پێ بکەرە سەر دوژمن لە ڕاستی ئەوان لە پێناوی (طاغوت) دا دەجەنگن و ئێمەش لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی فەرموودەی خواو ژێر خستنی ووشەی کافراندا دەجەنگین وە ئیتر بڕۆ بەلای کارتەوە کوڕی خۆم هەرگیز خوات لەیاد نەچێ پەروەردگا دەفەرموێ: ( یا ایهالذین امنوا اذا لقیتم فئة فاثبتو واذکروا الله کثیرا لعلکم تفلحون) پاش ئەم ئامۆژگاری یە بەنرخە طوفەیل

چووە ناو شەڕەکەوە دوژمنی تارو مارکردوە بەڕەنگێك حەماسەتی هەبوو هەڵمەتی دەبرد تا پێکراو شەهید بوو وە گەیشتە ئاواتی هەتاهەتایی عەمری کوڕی طوفەیلیش لەسەر ڕێبازی گیان فیدایی و فیداکاری بەردەوام بوو لەسەر وەسیەتەکەی باوکی تا لە جەنگی (یەرموك) دا ئەویش شەهید بوو چووە ڕیزی ئەو ئیماندارە خواناسانەی کە پەروەردگار لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

( من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدو الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلوا تبديلا).[٣٥٣]

واتە لەناو ئەو بڕوا دارانەشدا پیاوانی وایان هەبوو ئەو پەیمانەی بە خوایاندابوو ڕاستیان لەگەڵکردو زۆر بەباشی پابەندیشبوون پێیەوەو کاتێکیش کەوتنە جەنگەوە مەردانە جەنگیان کرد، ئینجا بووشیان نەزرو پەیمانی خۆی بردە سەرو جەنگەوەرانە جەنگی کرد تا شەهید کرا هەشیان بوو هەردەم چاوەڕوانی شەهیدی بوو لە ڕێی خوادا بە هیچ جۆرێکیش لانەبوون و پەیمانی خۆیان نەگۆڕی .

## ٣٦١. ﴿بەرەکەتی خوای گەورە بە ئاشکرا دیاربوو بە نان و گۆشتەکەوە﴾

ئەبو یەعلا موحەممەدی کوڕی مونکە دیرەوە لە جابرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەی چەند ڕۆژ بوو شتێکی وای نەخواردبوو کە مرۆڤ هێزو تاقەت و توانای لێ وەربگرێ سەردانی هەموو خێزانەکانی کرد بەڵام لای هیچیان خواردنێکی باشی دەست نەکەت پێغەمبەر ﷺ چوو بۆماڵی کچەکەی فاتیمەو فەرمووی : ( يا بنية هل عندك شئ أكله فإني جائع) واتە : ئەی کچی شیرینم هیچت لایە بیخۆم چونکە بە ڕاستی من زۆرم برسی یە ؟ فاتیمە وتی : نە بەخوا بابە گیان بە قوربانت بم هیچمان نیە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك لەلای فاتیمەی کچی دانیشت و پاشان بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە زۆر دوور نەکەوتبۆوە کە دراوسێ یەکی ماڵی فاتیمە دوو کولێرەی گەرم و هەندێ گۆشتی برژاوی بۆ هێنان هەر خێرا خاتوو فاتیمە کولێرەو گۆشتەکەی لە نانەبەرەیەکەوە پێچاو لە دڵی خۆیدا وتی شەرت بێ هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی نەخوات خۆم و هاوسەرو منداڵم دەمی لێ نەدەین ئینجا بانگی حەسەن

---

[٣٥٣] سلسلة اعلام الصحابة (سيف الدين الكاتب) ( طفيل بن عمرو الدروس ).

یان حوسێنی کوڕی کردو ناردی بە شوێن پێغەمبەری خواداو بانگی کردەوە کە پێغەمبەری خواﷺ هاتەوە بۆماڵی فاتیمە خاتوو فاتیمە فەرمووی باوکە گیان خوای گەورە شتێکی بۆ ناردووین بۆتۆ شاردومەتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئادەی بیهێنە فاتیمە دەفەرموێ منیش چووم ئانەبەرەکەم هێنا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا کردمەوە تەماشامان کرد پڕە لە کولێرەو گۆشت کاتێ تەماشام کرد حەپەسام خوایە گیان خۆ هەر دوو کولێرە بوو چۆن ئێستا ئەو هەمووە یەکسەر زانیم ئەمە بەرەکی خوای گەورەیە زۆر سوپاسی خوام کردو صەڵاواتم لەسەر پێغەمبەردا پێغەمبەری خواش کە ئەو هەموو خواردنەی بینی زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد ئینجا فەرمووی ئەی کچی شیرینم ئەمەت لەکوێ بوو؟ وتم :( یا أبت هو من عندالله، إن الله يرزق من يشاء بغير حساب) واتە ئەی باوکی شیرنم ئەمە ڕزقێکە لەلایەن خواوە، خوای گەورە بیەوێ ڕزقی هەر کەسێ بدات ئەیدات بەبێ حیساب پێغەمبەری خوا سوپاسی خوای گەورەی کردوو فەرمووی :

( الحمد الله الذي جعلك يا بنية شيبة بسيدة نساء بني إسرائيل ) واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەی کچەکەم کردوویتی بە هاوشێوەی گەورەی ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل کە مەریەمەیە چونکە ئەویش هەرکات ڕزق و ڕۆزیەکی لابوایە و پرسیاری لێ بکرایە ئەمەت لەکوێ بوو ؟ دەیفەرموو: ئەمە لەلایەن خواوەیە و بەڕاستی خوای گەورە ڕزقی هەر کەسێ دەدات کە بیەوێ بەبێ حیساب ئینجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن عەلی داو پاشان هەموو خێزانەکانی داو لەسەریەك سفرە دانیشتن لەگەڵ ئیمامی عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین و هەموو خێزانە بەڕێزەکانی ئانەکەیان بەیەکەوە خوارد هەموو تێریان خوارد هێشتا ئانەبەرەکە پڕ بوو خاتوو فاتیمە دەفەرمووی ئەمجا بەشی دەرو دراوسێکانم لێ داو بەمشێوەیە خوای گەورە بەرەکی بەسەردا ڕشتین.

## ٣٦٢.﴿بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی عەدیی کوڕی حاتیم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ﴾

عەدیی دەڵێت : هیچ پیاوێکی عەرەب لەمن زیاتر رقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو کاتێ ناویم بیست پیاو ماقووڵێك بووم و نەصرانی بووم و چواریەکی دەست کەوتی هۆزەکەم بۆ خۆم وەرئەگرت من بۆخۆم دیندار بووم و پادشای قەومەکەشم بووم کاتێك کە هەواڵی پێغەمبەری خوام ﷺ بیست رقم لێی بوو خزمەت گوزارێکی عەرەبیم هەبوو کە وشتری بۆم بەخێو ئەکرد پێم ووت : ماڵت کاول بێ لەناو وشترەکانم دا کۆمەڵە وشترێکی تیژڕەوو قەڵەو جیا بکەرەوەو لەنزیکم دا بیان بەستەرەوە جا ئەگەر بیستت سوپای موحەممەد ڕووی لەم ناوە کردووە ئەوا ئاگادارم بکەرەوە نیوەڕۆیەکیان هاتە لام و ووتی : ئەی عەدیی هەر کاتێك نیازت بوو بی کەی ئەگەر سوارچاکانی موحەممەد دایان بەسەرت دا ئێستە بی کە چونکە من چەند ئاڵایەکم بینین و دەربارەیان پرسیارم کرد ووتیان : ئەمە سوپای موحەممەدە ئەڵێ ووتم : دەی وشترەکان بێنە پێشەوە ئەویش هێنایە پێشەوە ئەوەبوو کەس و کارو ماڵ و منداڵم سوارکردن پاشان وتم  خۆم ئەگەیەنمە نەصارا هاودینەکانم لە شام رێگەی جەوشەبەم گرتە بەر و لە شوێنی خۆمان کچێکی حاتیمم بەجێ هێشت سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەر طە ی و خەڵکێکی زۆر بەدیل گیرا بە تایبەت سەفانەی خوشکی عەدیی ئەویش هێنرایەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوایش ﷺ هەواڵی عەدیی ئەزانێ کە بەرەو شام هەڵاتوەو خوشکەکەشی لەگەڵ ئافرەتە دیلەکان دا لە ژوورێکی نزیك دەرگای مزگەوت دا بەند ئەکرێت کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ  تێپەڕی کە ئافرەتێکی ژیری سەلیقەدار بوو هەستاو ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا باوکم کۆچی دوایی کردو خاوەنەکەشم دیار نیە چاکەم لەگەڵدا بکەو ئازادم بکە خوا چاکت بۆ بکات فەرمووی  ( ومن وافدك) واتە  خاوەنەکەت کێ یە ؟ وتی  عەدیی کوڕی حاتیم فەرمووی :(الفار من الله و روسوله) واتە : ئەوەی کە لەخواو پێغەمبەرەکەی هەڵ هاتووە؟ ئیتر بە جێی ئەهێڵێ بۆ سبەینێ بە هەمان شێوە لەبەر دەمیا ئەوەستێ و هەمان وت و وێژ ڕوونەداتەوەو بەجێی ئەهێڵێ بۆ دووسبەی سەفانە دەست لە تکا کردن ئەشوا بەڵام پیاوێك لە دوای پێغەمبەرەوە ئاماژەی بۆئەکات هەتا قسە بکات ئیتر هەڵئەستێت و ئەڵێت  ئەی پێغەمبەری خوا باوکم کۆچی دوایی کردووە خاوەنەکەشم دیار نیە چاکەم لەگەڵ بکەو ئازادم بکە خوا چاکت بۆ بکات فەرمووی: ( قد فعلت، فلا تعجلي بخروج حتى تجدي من قومك من

یکون لك تقة، حتی یبلغفك إلی بلادك، ثم اذنبینی) واتە باشە بەڵام پەلە مەکە بۆ دەرچوون هەتا خزمێکی متمانە پێکراوت دەست بکەوێ و بت گەیەنێتە وڵاتی خۆت ئەوسا ئاگادارم بکە سەفانە پرسیاری ئەوکەسە ئەکات کە ئاماژەی بۆ ئەکات ئەڵێن عەلی کوڕی ئەبو تالیب بووە دوای ماوەیەك کەس و کارو ناسراوانی پەیدا ئەبن و پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار ئەکات کە پیاوی متمانە پێکراوی دەست کەوتوون پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشتەی ئەکات و وڵاغی بۆ سواربوون ئەداتێ و پارەی مەسرەفی ئەداتێ و لەگەڵ پیاوە ناسراوەکاندا دێت هەتا ئەگاتە شام لە کاتێکدا کە عەدیی لەناو ماڵو منداڵی دا دانیشتبوو سەیر دەکات وا ئافرەتێك لەناو کەژاوەیەکدا بەرەو ئەوان دێت ئەڵێت : کچەکەی حاتیمە سەیر ئەکات ئەبینێ ئەوە کە ئەگاتە بەرەوە دەست بە گلەیی و لۆمەی عەدیی ئەکات و ئەڵێت : هەی ڕەحم بڕی ستەمکار ژن و منداڵەکەی خۆتت دەربازکردو شەرەف و نامووسی باوکتت بەجێ هێشت وتی : خوشکە گیان من کردم تۆ ئەی کەی ماوەیەك لای ئەبێت ئەوسا لێی ئەپرسێ: ئەم پیاوەت چۆن دێتە بەرچاو ؟ ئەڵێت بەخوا من وای بەچاك ئەزانم بە زووترین کات خۆت بگەیەنیتە لای خۆ ئەگەر پێغەمبەر بێ ئەوا هەرکەس زووتر شوێنی بکەوێ فەزڵ و پایەی زیاتری دەست دەکەوێ و گەر پادشایش بێ پیاوی وەك تۆ هەرگیز بەلایەوە بێ ناز نابێ ئەڵێت : بەخوا ئەم بۆچوونە ڕاستە عەدیی بەرەو مەدینە ئەکەوێتە ڕێ و خۆی ئەگەیەنێتە خزمەتی پێغەمەبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە لەمزگەوتدا دەبێ سەلامی لێ ئەکات ئەویش دەپرسێ کە ئەم پیاوە کێ یە ئەویش دەڵێ عەدیی کوڕی حاتیمم بۆ زیادە ڕێز لێ گرتن لە عەدیی ئەی باتەوە بۆ ماڵەوە لە ڕێگا پیرەژنێکی لاواز ڕێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگرێت و ماوەیەکی زۆر ئەی وەستێنێ و باسی پێویستی خۆی ئەکات بۆی عەدیی لە دڵی خۆی دا دەڵێ : بەخوا ئەمە پادشا نیە دوای ئەوە پێکەوە چوونەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە تەنها پشتی یەکیان بۆ دانیشتن هەبوو کە لەچەرم دروست کرابوو بەرپیشاڵیش پڕکرابۆوە دای نا بۆ عەدیی تا لەسەری دانیشێ و فەرمووی ( إجلس علی هذه) ئەڵێت : بەڵکو تۆ لەسەری دابنیشە فەرمووی : (بل انت) ئیتر عەدیی لەسەری دائەنیشێ و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لەسەر زەوی یەکەدا دائەنیشێ دیسان عەدیی بەخۆ ئەڵێ : بە خوا ئەمە کاری پادشا نیە لە ریوایەتێکدا عەدیی ئەڵێت : شاهیدی ئەدەم کە تۆ بەرزی و دەسەڵات و خراپەکاری سەر زەویت ناوێت کە هاوەڵانی بینیان پشتی یەکەی بە عەدیی داو خۆی لەسەر زەویەکە دانیشت ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەی بە تۆوە دیتمان تا ئێستە بە کەسمانەوە نەدیوە فەرمووی : ( هذا کریم قوم، فإذا

أتاكم كريم قوم فأكرموه) فەرمووی عەدیی سەردارو پایەداری کۆمەڵێکە هەر کە گەورەی کۆمەڵێك هاتە لاتان رێزی لێ بگرن پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( أيه ياعدي ابن حاتم ألم تكن ركوسيا) واتە تۆ لەسەر دینی رکسوسی نەبوویت؟ ڕکوسی دینێك بووە لەنێوان نەصاراو صابیئە دا ئەویش ئەڵێت : بەڵێ ئەپرسێ ( أو لم تكن تسير في قومك بالمرباع) واتە : ئەی تۆ چواریەکی دەست کەوتەکانی قەومەکەتت ئەبرد بۆ خۆت؟ ئەویش ئەڵێت بەڵێ : ئەفەرمووێ (فإن ذلك لم يكن يحل للك في دينك) واتە : لە دینەکەت دا بۆت حەڵاڵ نەبوو ئەڵێت ئەرێ بەخوا ئیتر بەمە بۆ عەدیی ساغ ئەبێتەوە کە پێغەمبەرمو ئەوەی کە خەڵك نای زانێ ئەو ئەی زانێ پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (لعلك ياعدي إنما يمنعك من دخول في هذا الدين ماترى من حاجتهم فوالله ليوشكن المال أن يفيض فيهم فلا يوجد من يأخده، ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه ماترى من كثره عدوئهم و قلة عددهم، فوالله ليوشكن أن تسمع بالمرأة تخرج من القادسية على بعيرها حتى تزور البيت لا تخاف ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه انك ترى أن الملك والسلطان في غيرهم، وأيهم الله ليوشكن أن تسمع بالقصور البيض من أرض بابل قد فتحت عليهم) واتە : ئەی عەدیی لەوانەیە ئەو دەست کورتی یەی کە بە مسوڵمانەکانەوە ئەی بینی لە مسوڵمان بوون قەدەغەت بکات دەبەخوا هاکا سامان لە ناویاندا ئەوەندە زۆربوو کە کەس وەری نەگرێ لەوانەش ئەو زۆربەی دوژمنان و کەمی یەی مسوڵمانان کە ئەبینی لە مسوڵمان بوون قەدەغەت بکات دەبەخوا هاکا بەرگوێت بکەوێ کە ئافرەتێك لە قادسیەوە بە تەنیا سواری وشترەکەی ببێت و بێت زیارەتی ماڵی خوا بکات و لەهیچ نەترسێ لەوانەشە کە ببینی وا موڵك و دەسەڵات لە دەستی غەیری مسوڵمانەکان دایە لە مسوڵمان بوون قەدەغەت بکات دەبەخوا هاکا بیستت کە کۆشکە سپی یەکانی بابل بە دەستی مسوڵمانەکان فەتح کراون ئیتر عەدیی مسوڵمان ئەبێت لە ریوایەتی ئیبن جەریردا واهاتوو کە عەدیی ئەڵێ : هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و خاچێکی زێڕین لە ملم دابوو فەرمووی : ( ياعدي أطرح هذا الوثن من عنقك) واتە : عەدیی ئەو بتە لەملت دا فڕێ بدە منیش فڕێم دا کە گەیشتمە لای لە سورەتی (براءة) بوو قورئانی دەخوێند ئەوەبوو ئایەتی ( اتخذوا أحبارهم وربما نهم اربابا من دون الله)ی ئەخوێند منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە قەشەکان نا پەرستین فەرمووی : ( اليس يحرمون مأحل الله فتحرمونه ويحلون ما حرم الله فتحلمونه؟) واتە : ئەی شتێ کە خوا حەڵاڵی کردبێ ئەوان حەرامی ناکەن و ئێوەش حەرامی بکەن و شتێکیش کە خوا حەرامی کردبێ ئەوان حەڵاڵی ناکەن و ئێوەش حەڵاڵی بکەن؟ ئەڵێ : وتم

:بەڵێ فەرمووی ( فتلك عبادتهم) واتە دەی ئەوە پەرستنیانە لە ریوایەتێکی تردا بەڵێنی دەست خستنی گەنج و گەوهەرو زێرو زیوی کیسرای کوری هورمزی پێ دا لەلایەن مسوڵمانەکانەوە عەیدش بەسەر سوڕمانەوە ئەپرسێ: کیسرای کوری هورمز؟ ئەفەرمووێ: کیسرای کوری هورمز سێ جار ئەفەرموێ هاکا رۆژێ هات کابرا بگرێ بەدوای کەسێکا زەکاتەکەی لێ وەربگرێ کەچی دەستی نەکەوێ جا عەدیی دەری ئەبڕێ کە لەو سێ بەڵێنە بەڵێنی هاتنی ئافرەت لە حیرەوە یان قادسیەوە بە تەنیا بۆ حەج و دەست کەوتی گەنج و گەوهەری کیسراو زۆربوونی پارەکە هیچ کەس زەکات وەرنەگرێ دوانیان هاتوونەتە دیی ئافرەت لە حیرەوە بەتەنیا ئەچێ بۆ حەج و خۆیشی لەگەڵ ئەو ئەسپ و سوارانەدا بووە کە هێرشیان کردۆتە سەر مەدائینی پایتەختی ساسانی دوای ئەوە سوێند ئەخوا کە سێ هەم بەڵێنیش دێتە دیی چونکە فەرمابشتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.[٣٥٤]

## ٣٦٣.﴿ بەسەرهاتی نوعەیمان و حوشتری عەرەبە بیابان نشینەکە ﴾

کابرایەکی عەرەبی خەڵکی بیابان هاتە شاری مەدینەو حوشترەکەی لە پەنای مزگەوتی پێغەمبەرەوەﷺ بەستەوەو بۆ خۆشی چووە مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوەﷺ دەستی کردە نوێژکردن و پاشان مایەوە بۆ ئەوەی پشویەکیش بدات هەندێ لە صەحابەکان بانگی کەسێکیان کرد کە ناوی ( نوعەیمان) بوو کەسێکی زۆر سوعبەتچی و قسە خۆش بوو بانگی نوعەیمانیان کرد بردیان بۆلای حوشترەکەی کابرای عەرەب و ووتیان : (لو نحرتها فأكلناها) واتە : خۆزگە هەر ئێستا ئەم حوشترەت سەر ببڕیایەو بمانخواردایە بەڕاستی ئێمە مرخمان لە گۆشتەکەی خۆش کردووەو حەیفە ئەم گۆشتە جوانەمان لەدەست بچێ نوعەیمان وتی : ئەی باشە کابرای خاوەنی چی ؟ ئەی کێ بۆی دەبژێرێ؟ صەحابەکان ووتیان تۆ حەقت نەبێ پێغەمبەری خواﷺ خۆی پارەکەی دەدات ئەم کابرایە ئەم حوشترەی بۆ فرۆشتن هێناوەو ئێستا پشوویەك بدات دەیبات بۆ بازاڕ دەیفرۆشێ جا حەیف نیە ئێمە نەیخۆین و لەدەستمان بچێ پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ئێمە ناشکێنێ و مافی خاوەنەکەی دەداو بایی چەندێ بێ لە بازاڕ پارەکەی دەداتێ بەڵێ نوعەیمان پەلاماری حوشترەکەی داو سەری بڕی لەو کاتەدا کابرای خاوەن حوشتر لە مزگەوت هاتە دەرەوەو کە حوشترەکەی بەسەر بڕاوی بینی پڕ بەدەنگی هاواری کرد ئای

[٣٥٤] ژیانی ئازیزمان (ﷺ) بەرگی دووەم لاپەڕە ٦٨١-٦٨٧

فریام کەون حوشترەکەیان سەر بڕیم پێغەمبەری خوا لەماڵەوە گوێ ی لە دەنگی بوو بە پەلە هاتە دەرەوەو کە ئەمەی بینی فەرمووی : (من فعل هذا ؟) واتە : ئەمە کێ ئەم کارەی کردووە؟ صەحابەکان ووتیان نوعەیمان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕا بە شوێنی نوعەیمان دا بەڵام دیار نەبوو ئیتر دەستی کرد بە گەڕان بە شوێنیدا لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ هەتا لە ماڵی (طیاعة بنت ازبیر بن عبدالمطلب) دۆزیەوە کە نوعەیمان خۆی لە چاڵێکدا شاردبۆوەو لقی خورمای بەسەر خۆیدا دابوو پیاوێك ئاماژەی بۆ چاڵەکە کردو بە ئەسپایی وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم بینیوە زەحمەتە لێرەبێ بە پەنجەش ئاماژەی بۆ چاڵەکە دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر چاڵەکە نوعەیمانی گرت و دەری هێناو سەیری کرد هەموو دەم و چاوی نوعەیمان خۆڵاوی بووە فەرمووی : ( ما حملك ما صنعت؟) واتە ئەی نوعەیمان ئەوەچی پاڵی پێوەنای تا ئەم کارە بکەی؟ نوعەیمان وتی (الذین دلولك علی یا رسول الله، هم الذین أمرونی) واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خوا هەر ئەوانەی کە شوێنی خۆشاردنەوە کەمیان نیشانی جەنابت دا هەر ئەوانەش بوون کەپێیان ووتم : حوشتری ئەو کابرایە سەر ببڕم و تۆ پارەکەی بدەی ( فجعل رسول الله ﷺ یمسح التراب عن وجهه ویضحك ثم فرح وأعطاه ثمن الناقة) واتە ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ تەپ و تۆزو خۆڵەکەی لەدەم و چاوی نوعەیمان سڕی و پێکەنی پارەی حوشترەکەی دا بە خاوەنەکەی و هەمووات تێر گۆشت بوون بەدەم گاڵتەو قسەی خۆشەوە.[٣٥٥]

---

[٣٥٥] الاستیعاب، لابن عبدالبر ١٥٢٨) والسیرة الحلبیة ج٣، ص٣٧٥

## ٣٦٤.﴿بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی زەیدی کوڕی سەعنە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ﴾

حاکم ریوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە کە دەڵێت کاتێك خوا ویستی هیدایەتی زیدی کوڕی سەعنە بدات زەید ووتی : هیچ نەماوە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی لە موحەممەد نەیبینیم تەنها دووشت نەبێت کە حیلەمەکەی پێش هەڵچوونی دەکەوێ وە هەر چەندە زیاتر تورە بکرێ زیاتر ئارام دەگرێ بۆیە دەمویست لێی نزیك ببمەوەو خۆم تاقی بکەمەوە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە هاتە دەرێ و عەلی لەگەڵدا بوو پیاوێکی دەشتەکی بە سواری وڵاخەکەیەوە هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی فلان دێ مسوڵمان بوون وە من پێم وتبوون ئەگەر مسوڵمان ببن ڕزق و ڕۆزیتان زۆر دەبێ وا ئێستاش تووشی ووشکە ساڵێ بوون ئەترسم وەك چۆن بەخۆشی ماڵ و چاکەوە موسڵمان بوون ئاوا لێی دەرچن لەم بارو زرووفەدا ئەگەر دەتوانیت بەڵکو هەندێ یارمەتیان بۆ بنێرێ پێغەمبەریش ﷺ بە ئیمامی عەلی فەرموو : هیچمان لەبەر دەستایە بۆیان بنێری؟ وتی نەخێر هیچمان لانەماوە زەید دەڵێ منیش فرسەتم زانی وتم : ئەی موحەممەد هەندێ خورمام بدەنێ لە فلان باخ و بێستان لە پێشەوە پارەکەیت دەدەمێ ئەویش فەرمووی : نا ئەی جوولەکە خورمات دەدەمینێ، هەقی ئەو پارەیە بەڵام مەرج نیە هی فلانە باخ بێت منیش وتم : باشەو هەشتا مسقاڵ ئاڵتونم دایە کە دوایی خورمام بدەنێ ئەویش دایە کابراو فەرمووی : بڕۆ بەعەدالەت بەشی بکە لەناویاندا زەید دەڵێ پێش ئەوەی کاتی دانەوەی قەرزەکە بێت بە ئەنقەست هاتم و یەخەیم گرت و بە تووڕەیی وتم : هەقەکەم بدەرێ ئەی موحەممەد بە خوا ئێوەی (بەنی عەبدولموتەلیب) هەروا قەرز کوێرن خۆم هەر دەمزانی وان لەم قسانەی من عومەر رقی هەستاو سەیری کردم و پێی وتم: ئەی دوژمنی خوا چۆن ئاوا بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێیت ؟ بەو خوایەی کە بەهەق ناردوویەتی ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە لەگەردنم ئەدایت پێغەمبەریش ﷺ بە هێمنی و زەردەخنەوە سەیری عومەری کردو فەرمووی ئەی عومەر ئێمە هەردووکمان شتێکی ترمان لەتۆ دەویست کە بەمن بڵێ ی بە چاکی قەرزەکەم بدەمەوەو بەویش بڵێ ی بە جوانی داوابکاتەوە وە ئینجا برۆ هەقەکەی بدەرەوەو بیست صاعیشی بۆ زیاد بکە جا کە عومەر زیادەی دامێ وتم : ئەمەیان بۆچی یە وتی : ئەوە لەبەر ئەوەیە کە تۆم ترساندووە پێم ووت : دەمناسی ؟ وتی : نەخێر تۆ کێیت ؟ وتم : زەیدی کوری سەعنە وتی : تۆ زانای جوولەکەیت ؟ وتم : بەڵێ وتی : باشە چی وای لێ کردووی ئاوا بکەیت بە پێغەمبەر ﷺ ئاوای پێ بڵێیت ؟

وتم ، ئەی عومەر من هەموو نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی ئەوم لا ئاشکرا بوو تەنها دوان نەبێت کە حیلمەی پێش تووڕەیی دەکەوێ و چەندەش زیاتر تورەی بکەی زیاتر ئارام دەگرێ و هەڵناچێ وەمنیش ئێستا ئەوەم لێ بینی ئەی عومەر تۆ بە شایەتبە ئەوا من رازیم کە خوای پەروەردگام بێ و ئیسلام ئاینم بێ و موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرم بێ وەمن دەوڵەمەندترینی جولەکەکانم بە شایەت بە کە نیوەی ماڵەکەم خێربێت بۆ ئوممەتی موحەممەد ﷺ عومەر وتی : بەشی هەمووی ناکات بڵێ : هەندێکیان منیش ووتم : هەندێکیان ئینجا زەید لەبەردەم پێغەمبەر ﷺ و یارانیدا وتی (أشهد أن لا اله الالله و اشهد أن محمداً عبده ورسوله) .

## ٣٦٥.﴿عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێ – بەدەنگی بەرز گریا کە چاوی بەحاڵی پێغەمبەر ﷺ کەوت﴾

ڕۆژێك پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەکەی خۆیدا دەبینی پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیرێك ڕاکشاوە کە حەسیرەکە لەبەر کۆنی قەراغەکانی نەماوەو پێغەمبەری خواش ﷺ سەری لە سەر سەرینێك بوو پێستێکی خۆشەکراوی دابوو بەسەریدا لاتەنیشتەکانی وێنەی حەسیرەکەی لێدەرچووبوو لە قوژبنێکی ژوورەکەشدا هەندێ جۆ لە قاپێکدا دانرابوو لەگەڵ هەندێ لەو گیایەی کە پێستەی پێ خۆش دەکرێ کاتێك ئیمامی عومەر ئەم دیمەنە دەبینێ دەست دەکات بە گریان و خۆی پێناگیرێ و دەنگی گریانی بەرز دەبێتەوەو پێغەمبەری خواش تەماشای عومەری دەکرد بە خوڕ فرمێسك لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە پرسیاری کردو فەرمووی : ئەوە دەگریت ئەی کوڕی خەتتاب؟ پێشوا عومەر وەڵامەکەی قوڵپەی گریان و خوڕزمی فرمێسکەکانیدا تێکەڵ بوو بوون و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نەگریم وا دەبینم ئەو حەسیرە چۆن کاری لەسەر لاتەنیشتت کردووەو وێنەی لەسەر پەراسوەکانت دەرچووە ئەوەش خەزێنەکەتە کەچی تێدایەو دیارە؟ ئەوەش کیسراو قەیسەرە چۆن دەژین و لەسەر قەرەوێڵەی ئاڵتون و دۆشەکی ئاوریشم دەنوون و تۆش لەسەر ئەو حەسیرە زبرە ئەوان لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەی خوادا لەناو باخ و باخاتی پڕ لە میوەداو تۆش ئاوا دەژیت؟ لە کاتێکدا تۆ پێغەمبەر و هەڵبژێردراو و خۆشەویستی خوای پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەم زەردەخەنەوە فەرمووی : ئەی کوڕی خەتتاب

ئەمانە خۆشیەکانی ژیانیان بۆ پێشخراوە بەڵام لە بڕان و کۆتاییدایە ئێمەش کۆمەڵێکین خۆشیەکانمان بۆ هەڵگیراوە بۆ دوارۆژ ئایا ڕازی نیت؟ ئێمە ژیانی نەبڕاوەی دوا ڕۆژمان هەبێ و ئەوانیش ژیانی کەم و کورتی دونیا؟ ئیمامی عومەر وتی : بەڵێ.[٣٥٦]

ئینجا ئیمامی عومەر وتی ئایا ناکرێ ڕاخەرێکی لەم حەسیرە نەرمتر بۆ ڕاخەین ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ( مالي وللدنيا؟ ما مثلي ومثل الدنيا الا كراكب سار في يوم صائف، فاستظل تحت شجرة ساعة ثم راح وتركها).[٣٥٧]

واتە : من لەکوێ و دنیا لە کوێ؟ نموونەی من و دنیایەك وەك سوارێك وایە کە لە گەرمای هاویندا بەدەشتێکی چۆڵدا دەڕوات و لەبەر گەرما ماوەیەك لەبن سێبەری دارێکدا دەمێنێتەوە پاشان دەڕوا بەجێی دەهێڵێ.

---

[٣٥٦] رواه الحاكم ٤/١٠٤، وابن حبان ٤١٨٨، وأحمد ١/١٣٣

[٣٥٧] رواه الترمذي (٢٣٧٧) وابن ماجه (٤١٠٩).

## ٣٣٦.﴿پێغەمبەر ﷺ وەسفی قەیسی کوڕی سەعدی کرد بەوەی کە لەلانەی سەخاوەتدا گەورە بووە﴾

پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی رەجەبی ساڵی هەشتەم دا بانگی کردە ئەبو عوبەیدەو ئاڵای فەرماندایەتی سێ سەد پیاوی موهاجیرو ئەنصاری دایە دەست کە عومەری کوڕی خەتتابیشیان لەگەڵ دابوو فەرمانی بەسەردا دا تا بەسریەکەیەوە هێرش بکاتە سەر هۆزی جوهەینە کە تا ئەوکاتەش مسوڵمان نەبوو بوون و ناوچەکەشیان لە مەدینەوە پێنج شەو دووربوو، پیاوانی ئەم سریەیە هەر هەموویان پیادەبوون و تەنها چەند وشترێکیان پێ بو بۆ هەڵگرتنی نان و خۆراکیان جا مێژوو نووسان ئەوەیان باس کردووە کە بەرلەوەی بگەنە ناوچەی جوهەینە تووشی برسیەتیەکی وەهابوون کە گەڵای خەبەطیان خواردووە (خەبط) ناوی گەڵای درەختێکە کە ئەوەرینرێ و ووشك دەکرێتەوەو ئەهاڕرێ و تێکەڵ بە ئارد دەکرێت لەبەرئەوەی کە ئەم سوپایە ئەوەندە برسی بوون سەربازەکان گەڵای خەبەطیان ئەخوارد بۆیە ناونرا سریەی خەبەط بەو برسیەتیە ئەوەندە لاوازبوون کە ئەگەر تووشی دوژمن ببوونایە توانایان نەبوو بچن بەگژی دا لەم غەزایەدا کە سریە مسوڵمانەکە خەریك بوو لەبرساندا تیا بچێ سەخاوەتی گەنجێکی ئەنصاری دەرکەوت، کەناوی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە بوو لەگەڵ سریەکەدا بوو دیارە سەعدی کوڕی عوبادەی باوکی سەرداری خەزرەج بوو قەیسیش بە سەخاوەت ناوبانگی دەرکردبوو قەیس گەنجێکی بێ ماڵ و سامان بوو کە دیتی وا سریە مسوڵمانەکە بەدەست برسیەتیەوە گیریان خواردووە چوو بۆلای ئەعرابیەکی بنەماڵەیەکی دۆستی مسوڵمانان لە جوهەینەو داوای لێ کرد کەچەند وشترێکی پێ بفرۆشێ تا سەریان ببڕێ بۆ سوپا مسوڵمانەکە بەو مەرجەی کە لە مەدینە خورمای بداتێ کابرای جوهەینی بە قەیسی وت : بەخوا نات ناسم تۆ کێیت؟ وتی : من قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی دلەیمم ئەعرابیەکە دەری بڕی کە دۆستایەتیەکی پتەوی لەگەڵ سەعدی سەرداری یەثریب هەیە ئەوەبوو پێنج وشتری پێ فرۆشت هەریەکە بە دووبار خورمای ووشك لە خورمای ئالی دلەیم دوای ئەوەی داوای شاهیدی کرد قەیس چەند هاوەڵێکی ئەنصارو موهاجیری لەگەڵدا بوون و کردنیە شاهید کە یەکێکیان عومەر بوو عومەر ووتی من شاهیدی نادەم ئەمە قەرزدار دەبێت و سامانیشی نیە بەڵکو سامان هی باوکیەتی کابرای جوهەینی وتی بەخوا سەعد لەسەر کێشێك خورما دەست لە کوڕەکەی هەڵناگرێت دەم و چاوێکی گەشاوەو رەفتارێکی

مەردانەش ئەبینم قەیس وشترەکانی هێنان و هەر ڕۆژە یەکێکیانی سەر دەبڕی کە ڕۆژی چوارەم هاتە بەرەوە ئەبو عوبەیدەی ئەمیر نەی هێشت وشتری چوارەم سەر ببڕێ و پێی وت : ئەتەوی قەرزەکەت بدرێتەوە بێ ئەوەی سامانت هەبێ؟ نابێت سەری ببڕیت قەیس ووتی: ئەبو عوبەیدە تۆ وای ئەبینی کە باوکم قەرزی خەڵکی ئەداتەوە و یارمەتی لێ قەوماو ئەدات و لەگرانی دانان ئەدات، کێشێك خورمای کۆمەڵێك جیهادکار لە پێناوی خوادا نەبژێرێ؟ خەریك بوو ئەبو عوبەیدە نەرم ببێ و وازی لێ بهێنێ کەچی عومەر وتی عەزیمەی لەگەڵدا بەکاربهێنە ئەوش بریاری دا و نەی هێشت وشتری چوارەم سەر ببڕێ بەمە دوو وشتری پێ مانەوە ئەوەبوو لە ڕێگا بە نۆبە سواری هەردووکیان ئەبوون هەتا گەیشتنەوە مەدینە دەنگ و باسی برسیەتی سوپای ئیسلام بەسەعد گەیشت وتی : ئەگەر من قەیس بناسم ئاژەڵیان بۆسەر ئەبڕێت کە قەیس گەیشت و سەعدی باوکی تووشی بوو لێی پرسی لەکاتی برسیەتی ئەو خەڵکەدا چیت کرد؟ وتی : ئاژەڵم سەر بڕین وتی : چاکت کردووە وتی : پاشان چی ؟ وتی سەرم بڕی وتی : چاکت کردو وتی : پاشان چی ؟ وتی : سەرم بڕی وتی : چاکت کردووە سەر ببڕە وتی : پاشان چی؟ وتی : قەدەغەکرام : وتی کێ قەدەغەی کردیت؟ وتی ، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحی ئەمیرم وتی : بۆچی ؟ وتی : وای ئەگەیاند کەمن سامانم نیە بەڵکو سامان هی باوکمە منیش وتم : باوکم قەرزی دوورینە ئەبژێرێ و یارمەتی لێ قەوماو ئەدات و لەگرانی دا نان ئەدات ئەوە لەگەڵ من دا ناکات ؟ سەعد وتی : چوار باخچەت پێشکە بن دەربارەی ئەوەش کیتابێکی بۆ نووسیم و هێنای بۆ ئەبو عوبەیدە و ئەویشی کردە شاهێد بۆلای عومەریش بۆ ئەویش شاهێدی نەداو وتیان: کەمترین باخچە پەنجا بار خورمای تیا ئەبێت کابرای بیابان نشین هات و قەیسیش قەرزەکەی بۆ بژاردەوەو وشتری دایە بۆ سواربوون و جل و بەرگی پێشکەش کرد کە ئەم دەنگ و باسە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (إنه في بيت جود) واتە: ئەو لەلانەی سەخاوەت دا گەورەبووە.[٣٥٨]

---

[٣٥٨] ژیانی ئازیزمان ﷺ بەرگی دووەم، لاپەڕە ٤٩٧-٤٩٩

## ٣٦٧.﴿خەزێنەی خوای پەروەردگار گەورەیە﴾

جارێك پیاوێك بەسەرو پێی پەتی و جل و بەرگێکی شڕەوە دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای یارمەتی دەکات و پێغەمبەری خواش ﷺ یارمەتی دەدات جارێکی تر داوا دەکات هەر یارمەتی دەدات بۆ جاری سێیەم داوا دەکات پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی پێ نامێنێت یارمەتی بدات بە زەردەخەنەوە بەکابرا دەڵێ برای خۆم هەر شتێکت پێویستە برۆ لە بازاڕ هەڵیبگرە لەسەر من کاتێك شتێك هاتە دەستم قەرزەکەت بۆ دەدەمەوە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا هەتا هەتبوو یارمەتیتدا ئیتر کە نیتە هاوکاری بکەیت خوای پەروەردگار تەکلیفی شتێك ناکات کە مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەریدا نەبێت بەم ووتەیەی عومەر پێغەمبەری خوا ﷺدەم و چاوی گۆڕاو ڕەنگی تێکچوو و پێی ناخۆش بوو، بەڵام پیاوێك کە لە تەنیشتیانەوە بوو وتی : پێغەمبەری خوا ﷺچۆن حەزت لێ یە ببەخشە چونکە خەزێنەی پەروەردگار گەورەیە ئیتر بەو قسەیەی کابرا پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کر وەك پشتگیریەك بۆ قسەکەی.[٣٥٩]

## ٣٦٨.﴿خاوەن شت شایستە ترە کە شتەکەی هەڵبگرێت﴾

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەو هورەیرە – خوای لێ ڕازی بێ – ڕۆیشت بۆ بازاڕ پارچەیەك قوماشی بە چوار درهەم کڕی، کاتێك خاوەنی قوماشەکە هات بۆ ئەوەی قوماشەکە بیپێوێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : بیپێوە بەزیادەوە کابرا وتی : ئەم قسەیەم لەکەسی تر نەبیستووە ئەبو هورەیرە – خوای لێ ڕازی بێ وتی بەسە بۆ ئاوا ساردو سڕی ؟ ئایا پێغەمبەرەکەت ناناسی ؟ کابرا مەترەکەی فڕێداو کەوت بەسەر دەستی پێغەمبەردا تا ماچی بکات پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کابرای دوورخستەوە فەرمووی : ئەوە چی دەکەی: ئەوە عەجەمەکان بەرامبەر پاشاکانیان دەیکەن من پاشا نیم بەڵکو پیاوێکم لە ئێوە ئینجا کابرا قوماشەکەی پێواو پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرت ئەبو هورەیرە- خوای لێ ڕازی بێ – وویستی هەڵیبگرێت پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو پێی فەرموو خاوەن شت کە نەتوانێت ئەوکاتە برا مسوڵمانەکەی هاوکاری دەکات.[٣٦٠]

---

[٣٥٩] رواه الترمذي : ٣٤٨.

[٣٦٠] چیرۆکی ڕەوشتە جوانەکان ، لاپەڕە ٩٧.

## ٣٦٩. ﴿پێغەمبەر ﷺ کە گوێ بیستی سکاڵای پیاوەکە بوو تووڕە بوو﴾

جارێکیان کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی کرد (یا رسول الله إني لأتأخر عن الصلاة في الفجر مما يطل بنا فلان فيها) واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستی من بێبەشم و بەشداری ناکەم لە جەماعەتی نوێژی بەیانی دا ئەو هەموو خێرو پاداشتە گەورەم لەدەست دەچێ بەهۆی ئەوەی کە فلان کەس پێشنوێژیمان بۆ دەکات و ئەوەندە نوێژەکە درێژ دەکاتەوە بەڕاستی من خۆم بۆ ڕاناگیرێ و ئیتر لەبەرئەوە ناچم بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانیەکەم لەماڵەوە دەکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بیست: ( فغضب رسول الله ﷺ مارأيته غضب في موضع كان اشد غضبا منه يؤمئذ، ثم قال : يايها الناس إن منكم منفرين، فمن أم الناس فليتجوز ، فإن فيهم الضعيف والكبير وذالحاجة).[٣٦١]

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەیەکی و تووڕەبوو کە هەرگیز لە هیچ جێگایەکدا ئاوا تووڕە نەبوو بوو پاشان فەرمووی ئەی خەڵکینە بەڕاستی هەندێ لە ئێوە هەن کە خەڵکی دووردەخەنەوە لە ئیسلام لە ڕەحمەتی خوا لە پاداشتی زۆر لە مزگەوت لە جەماعەت لە جومعە دەی ئاگاداربن و بزانن هەرکەسێ پێش نوێژی بۆ خەڵکی کرد با پێش نوێژیەکی کورت و پوخت بێت ئەوەندە درێژ نەکاتەوە خەڵکی بێزار ببن چونکە بەڕاستی لەناو ئەو کەسانەدا کە نوێژی لە دواوە دەکەن کەسانێکی تێدایە کە لاوازەو بەساڵاچووەو توانای زۆر وەستان و مانەوەی نیە وە کەسانێك لە ڕیزی جەماعەتەکەدا کە خاوەن کارن و ئیش و کاریان هەیەو چاوەڕێ ی ئەوەن نوێژەکەیان بکەن و بڕۆنەوە سەر کارەکانیان.

[٣٦١] متفق عليه بخاري (٧٠٤) ومسلم (٤٦٦).

## ٣٧٠. ﴿حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی ناشتنی سەعدی کوڕی مەعاز بوون﴾

سەعدی کوڕی مەعاز – خوای لێ ڕازی بێ – ئەم هاوەڵە ئازیزە لە شەڕدا بریندار بوو پاشان بەو برینەوە لە ماڵەوە وەفاتی کرد پێغەمبەر ﷺفەرمووی : ( إهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ) متفق عليه.

واتە : عەرشی خوا هاتە جووڵەو لەرزە بۆ مردنی سەعدی کوڕی مەعاز، واتە : لە خۆشی بەرزبوونەوەی رۆحی پاکی سەعدی کوڕی مەعاز بۆ بارەگای خوای گەورە عەرشی خوا هاتە جوڵان کاتێك سەعد وەفاتی کردو هەواڵیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەند بەپەلە ڕۆیشت هاوەڵان کە لە گەڵیدا بوون پەتی نەعلەکانیان پچڕا ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ واخێرا دەڕۆیت ؟

فەرمووی : ( إني أخاف أن تسبقنا إليه الملائكة فتغسله كما غسلت حنظلة) واتە : بەڕاستی لەوە ترسام کە فریشتەکان پێش ئێمە بگەنە سەری و بیشۆرن، هەروەکو حه نظله له یان شوشت، پاشان کە چوونە مزگەوتەوە بۆ ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی کۆدەکردەوەو خۆی بچووك دەکردەوە عەرزیان کرد بە قوربان خۆ جێگا زۆرە فەرمووی نەماوە هەموو مزگەوتەکە ئەوەندەی فریشتە تێدایە جێگا نەماوە هەموو ئەو فریشتانە هاتوون نوێژی مردووی لەسەر بکەن ئەمجا کە بردیان بۆ سەر قەبران و تەسلیم بە خاك کرا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ( هذا العبد الصالح تحرك له العرش) واتە ئەم بەندە چاکە عەرشی بۆ هاتە جوڵان ( وفتحت أبواب السماء) واتە هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرانەوە (وشهده سبعون ألفا من الملائكة) واتە : حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی ناشتنی بوون کە (لم ينزلوا إلى الأرض قبل ذالك) واتە : ئەو فریشتانە پێش ئەم جارە هەرگیز نەهاتبوونە سەر زەوی ( لقد ضم ضمة ، ثم أفرج عنه) واتە زەوی گۆشی بە گوشینێکی تووند پاشان بەریدا.[٣٦٢]

[٣٦٢] رواه النسائي و صححه الألباني في صحيح الجامع .

## ٣٧١. ﴿عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە داواکاریەکی جوانی خستە ڕوو لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ﴾

( ابن جریر ) لە محمەدی کوری ( کعب ) ی ( قرظی )یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : عبدالله ی کوری ڕەواحە بەپێغەمبەری خوای ووت : مەرج بگرە لەسەرمان بۆ خوا و نەفسی خۆت ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی ( مەرجی پەروەردگار ئەوەیە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ پەیدا نەکەن ، مەرجی خۆشم بریتییە لەوەی چۆن پارێزگاری لەخۆتان و ماڵ و منداڵتان دەکەن ئاواش پارێزگاری لەمن بکەن ، ئەوانیش وتیان : ئەگەر وامان کرد چیمان دەستگیر دەبێت ؟ فەرمووی : بەهەشت ، وتیان : بەراستی بازرگانیەکی سودمەندە بۆیە نەدەیگۆڕینەوە و نە دەستیشی لیٚ دەکێشینەوە ئینجا ئایەتی (إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللّهِ فَاسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ {١١١}) واتە : بەراستی خوا گیان ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانە و بەشیانە ئەو بڕوادارانە جەنگ دەکەن لەڕێی خودا و ئینجا بیٚ باوەران دەکوژن و خۆشیان شەهید دەبن ئەوە بەڵێنێکی راستە و خوا بڕیاری داوە لەسەر خۆی لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا جا کێیە بەڵێن و پەیمانی ىخۆی وەفادارترە لە خوا ؟ کەواتە مژدە بەخشین و شادمان بن بەو فرۆشتنەتان کە مامەڵەتان پیٚ کرد بەراستی هەر ئەوەیە گەیشتن بە ئامانجی زۆر گەورە .

## ٣٧٢.﴿ خودای گەورە هەر پاکە و هەر پاکیش وەردەگرێت ﴾

( واحدی ) و ( اصبهانی ) لە ( ترغیب ( دا لە جابیرەوە دەگێرنەوە : دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لە حەرام کردنی مەی دەکرد عەرەبێکی دەشتەکیش هەستا و وتی : من پیاوێکم پیشەم بازرگانی بوو بەشەرابەوە و لەرێگەی ئەم بازرگانیەوە ماڵێکم کۆ کردەوە ئایا ئەو ماڵە بەکەڵکم دێت ئەگەر لە ئێستا بەدواوە گوێ رایەڵی خوا بکەم و لەو ماڵەش ببەخشم ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : خوای گەورە پاکە و بەتەنهاش هەر پاك و بێگەرد وەردەگرێت پەروەردگاریش بۆ چەسپاندن و شاهیدی دان لەسەر ئەو قسەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی ( قُل لاَّ يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُواْ اللّهَ يَا أُوْلِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ {١٠٠})

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان بڵێ : پیس و پاك یەکسان نین هەرچەندە زۆریەتی ئەو پیسیە سەرنجی راکێشابێت کەواتە ئەی هۆشمەندان لەخوا بترسن و پارێزکار بن بۆ ئەوەی سەرفراز و سەرکەوتوو بن .

## ٣٧٣.﴿مالیکی کوری صەیف سەرپێچی نواند بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ﴾

( ابن ابی حاتم ) لە سەعیدی کوری جوبەیرەوە دەگرێتەوە دەڵێت : پیاوێك بەناوی مالیکی کوری صیف هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپێچی نواند لەبەرامبەر پێغەمبەردا ، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو : سوێندت دەدەم بەوەی تەوراتی دابەزاندووە بۆ سەر ( موسا ) ئایا لە تەوراتدا باسی ئەوە کراوە پەروەردگار خەشم و قینی لە قەشەی قەڵە و گرتووە ؟ مالیکیش قەشەیەکی قەڵە و زل بوو بۆیە توڕەبوو ووتی : خوا هیچ نیگایەکی نەناردووە بۆ سەر مرۆڤ ، هاورێکانیشی وتیان : ئەی هاوار ئەوە تۆ چی دەڵێیت ئەی بۆ ( موسی) نیگا دانەبەزیوە ؟ ئینجا پەروەردگار ئایەتی (و ما قدروالله حق قدره) دابەزاند .

## ٣٧٤.﴿راسپاردەکەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بۆ رافعی کوری موعەللا﴾

لە ئەبو سەعیدی کوری رافعی کوری موعەللاوە هاتووە کەلە مزگەوت نوێژی کردووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داویەتی بەلایدا بانگی کردووە یەکسەر وەڵامی نەداوەتەوە ئەبو سەعید ووتی : نوێژەکەم تەواو کرد لەپاشاندا چوومە خزمەتی ئەبو سەعید ووتی : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : چی رێگری لێ کردی کە وەڵام نەدەیتەوە ؟ وتی : نوێژم دەکرد بۆیە وەڵامم نەدایتەوە فەرمووی : مەگەر خوای گەورە نافەرموێت (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَحُولُ بَيْنَ الْمَرْءِ وَقَلْبِهِ وَأَنَّهُ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ {٢٤})

واتە : ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامە و رێبازێك کە دەتانژیەنێتەوە و ژیان بەخشە ؟ جا فەرمووی : پێش ئەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە گەورەترین سورەتت پێ نیشان دەم لە قورئان ؟ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا فەرمودەکەت لەبەر دەکەم فەرمووی : ئەو سورەتە سورەتی ( الحمدلله رب العالمين )ە کە ناویشی حەوت ئایەتی دووبارە بووەوەیە هەروەها ناویش قورئانی گەورەیە کە بەمن بەخشراوە.[٣٦٣]

---

[٣٦٣] ( سنن ابوداود ) رقم ( ١٤٥٨ ) وصححه الشيخ الالباني.

## ٢٧٥.﴿ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئامۆژگاری عوسمانی کوری مە ظعونی کرد کە دوور بکەوێتەوە لە گۆشەگیری ﴾

عوسمانی کوری مە ظعونی ( خوا لێی رازی بێت ) ئەوەندە زیادەرەوی کردبوو لە خواپەرستیدا خەریك بوو لە سنوری ناوەندێتی و میانەرەوی دەردەچوو لە ترسی خوای پەروەردگار بەلام مامۆستای مرۆڤایەتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) عوسمانی گێرایەوە ناو بازنەی ناوەندێتی و ( اعتدال ) لە عائیشەوە ( خوا لێی رازی بێت ) دەڵێت : خێزانی عوسمانی کوری مە ظعون کە ناوی (خەولەوی کچی حەکیم) بوو هاتە لام سەر و شکڵی نا رێك و پێك بوو واتە : دیاربوو گوێ بەخۆی نادات پرسیم چیتە ؟ بۆچی بەم شێوەیەیت ؟ ئەویش وتی : هاوسەرەکەم شەو تا بەیانی شەونوێژ دەکات و رۆژیش بە رۆژوو ئەبێت واتە : کاتی نیە بۆ نافرەتان کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆلای عائیشە خاتوون ، عائیشە ئەمەی بۆ باس کرد پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە عوسمان گەیشت و پێی فەرموو : ( يا عثمان ان الرهبانية لم تكتب علينا ، امالك في اسوة ؟ فوالله انـي اخشاكم لله ، و احفظكم لحدودة).[٣٦٤]

واتە : فەرمووی : ئەی عوسمان گۆشەنشینی بۆ ئومەتی ئیسلام نەنوسراوە مەگەر تۆ ناتەوێ شوێن من بکەوی و چاو لە من بکەیت ؟ دەی سوێند بەخوا من لە هەموتان زیاتر لەخوا ئەترسم و لە هەموتان زیاتر سنورەکانی دەپارێزم.

---

[٣٦٤] (ابن سعد ) (٢٨٧/١/٣).

## ٣٧٦. ﴿ بەسەرهاتی جولەیبیب و چۆنیەتی ژن هێنانەکەی ﴾

خاوەنی ئەم چیرۆکە لە دنیادا جگە لە باوەڕەکەی هیچی شك نەبرد ئەبو بەرزەی ئەسلەمی چیرۆکی ژن هێنانی (جولەیبیب ) بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە و دەڵێت :

جولەیبیب یەکێك بوو لە پشتیوانان و هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عادەتیان وابوو ئەگەر کچیان هەبوایە نەیاندەدا بەشوو هەتا پێغەمبەری خوایان (ﷺ) لێ ئاگادار نەکردەوە تا بزانن ئەو ئەیەوێ یان نا ئەوەبوو جارێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پیاوێکی لە پشتیوانان فەرموو ( یافلان زوجنی ابنتك ) واتە : ئەی فلان کچەکەتم بدەیە ئەویش ووتی : بەڵێ جاکێ لەتۆ باشترە فەرمووی : ( انی لست لنفسی اریدها ) واتە : من بۆ خۆم داوای ناکەم وتی : ئەی بوکێ فەرمووی : بۆ جوله یبیب وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بابزانم دایکی کچەکە دڵێ چی هات بۆ لای دایکی کچەکە وتی : داخوازی کچەکەتی کردووە وتی : بەسەرچاو جا چی لەوە باشترە کچەکەم ببێتە خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش وتی : نایەوێ بۆ خۆی بەڵکو بۆ جولەیبیب وتی : بەراستتە ؟ سوێند بەخوا نایدەمە جولەیبیب ، ئەوە بوو کاتێ باوکی کچەکە هەڵسا بگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە وەڵامەکەی پێ بگەیەنێت کچەکەیان بەشەرمەوە ووتی : کێ منی لە ئێوە خواستووە ؟ ووتیان : پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی : دەی دەتانەوێ فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەت کەنەوە بمدەنەوە دەستی دڵنیام کە بەڕاستی ئەو وێڵم ناکات ئەوەبوو باوکی کچەکە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ووت : ئەوا دەیدەمە دەستی تۆ بفەرموو بیدە بە جولەیبیب (ئیسحاقی کوری عەبدوڵای کوری ئەبو تەلعە) بە ثابتی وت : ئەزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ دوعایەکی بۆ ئەو کچە کرد ؟ پرسی چ دوعایەکی بۆ کرد ؟ وتی : فەرمووی ( اللهم صب علیها الخیر صبا ولا تجعل عیشها کداکدا ) واتە : ئەی خوای پەروەردگار خێر و بێری بەسەردا برێژە و مەهێڵە ژیانی مەینەتی و کوێرەوەری بێت . ثابت دەڵێت : ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) کچەکەی لە جولەیبیب مارەکرد وەلەیەکێ لە غەزاکانیدا پێغەمبەری خوا (ص) پرسی ؟ ( هل تفقدون من احد ؟ ) واتە : کەس هەیە دیارنەبێ و بەدوایدا بگەڕێن ؟

ووتیان : فلان و فلان دیارنین دیسان فەرمووی : ( هل تفقدون من احد؟ ) وتیان : فلان و فلان ، ئەمجارەشیان فەرمووی : ( هل تفقدون من احد ؟ ) ووتیان : نەخێر شیتر هەر ئەوانەی کە وتمان فەرمووی : (ولکن افقد جليبيبا فاطلبوه في القتلي ) واتە : بەلام من بەدوای جولەیبیب دا دەگەڕێم لەناو کوژراوەکاندا بۆی بگەڕێن گەران تا دۆزیانەوە لەنێوان حەوت کەسدا کەوتبوو کە کوشتبوونی و دواتر خۆیشی شەهید کرابوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( هذا منی و انا منه ، اقتل سبعة ثم قتلوه ؟ هذا منی و انا منه ، اقتل قتله ؟ هذا منی و انا منه ) واتە : پێغەمبەری (ﷺ) دەفەرموێ : جولەبیب لە منە و منیش لە حەوت کەسی کشتووە و ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵیگرت و هاوەڵانیش گۆڕیان بۆ هەڵکەند ئەو جێیەکی نەبوو لەسەری دابینێن بێجگە لە باڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا خستیانە گۆڕەکەی ثابت دەڵێت : ئەوەبوو لەناو ئەنصاردا هیچ بێوەژنێك نەبوو لە بێوەژنەکەی جولەبیبیب بژێوی باشتر بێت و بە بژێوی تر بێت.[٣٦٥]

---

[٣٦٥] هەیپەمی دەڵێت : لە صحیحدا هاتووە بەبێ باس کردنی داخوازی و زەواج وە احمد گێڕایەتەوە و پیاوانیش پیاوانی صەحیحن ( الجمع ) ژمارە (١٥٩٧٧ ).

## ٣٧٧.﴿پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جاهیمەی سەلەمی راسپارد کـە چـاکە کـاربێ بەرامبەر دایکی﴾

هەمیـشە هـاوەڵان راویـژیان بـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـرد رۆژێـك کـاتێ مـسوڵمانان سـەرقاڵی خـۆ ئامـادەکردن بـوون بـۆ جیهـاد کەسـێك بـەناوی جاهیمـەی سـەلەمی ( خـوا لێـی رازی بێـت ) ویـستی لەگەڵیانـدا دەربـچێت ، چـووە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) تـا راویـژی پـێ بکـات کـاتێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەمـەوێت بـڕۆم بـۆ غـەزا هـاتووم راویـژت پـێ بکـەم ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) لێـی پرسـی : ئایـا دایکـت هەیـە ؟ وتـی : بـەڵێ ، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەمووی : بـڕۆ خزمـەتی دایکـت بکـە چونکە بەهەشـت لـەژێر پێـی ئـەو دایـە چونکە پێغەمبـەر (ﷺ) دەیزانـی دایکـی جاهیمـە پێویـستی بـە خزمـەت و چـاودێری هەیـە و کەوتۆتـە تەمەنـەوە تـەنها ئـەو کورەشـی هەیـە بۆیـە ئامۆژگـاری کـرد کـە بـڕوات خزمـەتی بکـات ئـەوا جیهـادە لـە پێنـاوی خـوادا فەرمووی ( فالزمها فان الجنة عند رجليها ).[٣٦٦]

---

[٣٦٦] أخرجه : النسائي و احمد و الطبراني في الاوسط و رجاله ثقات.

## ٣٧٨. ﴿پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بە بوردەکەی شانی موبارەکی فاتیمـەی کـچی ئەسەدی کفن کرد﴾

کاتێ عەبدول متەلیبی باپیری پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستی بـەوەکرد کە ئەجـەلی نزیـك بوەتەوە ئەبو تالیبی کوری راسپارد کە (محمدی کوری عبـدالله)ی بـرازای بگرێتـە خـۆی واتـە : سەرپەرشتی بکات لەوانەیە عەبدول متەلیب مەبەستی لەوە بوبێت کە دەستی سۆزو ئەمین لە مـاڵی ئـەبو تالیـب دایـەو بەتایبـەتی لای فاتیمـەی خێزانـی بـۆ بـاش سەرپەرشـتی کردنـی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بوو فاتیمە (رەزای خـوای لێبێـت)ی ئەوپـەری پارێزگـاری لێکـردو لەگـەڵ هاوسەرەکەیدا ئەبوتالیب چاودێریان لێکرد و هەمیشە دەبینی کە ئەو خواردنەوەی موحەمەد (ﷺ) لەگـەڵ منداڵەکانیـدا بەشـداری لـە خواردنـدا دەکـرد بـە بەرەکـەت بـوو لـە راسـتیدا ئـەم ئافرەتــە رێــزدارە چــاودێریەکی تایبــەتی پێغەمبــەری (ﷺ) دەکــرد و جیــاواز لــە هــەموو منداڵەکانی لە سیرەی (الحلبیه ١٨٩/١) دا نوسەرەکەی باسی حاڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات لە ماڵی مامیداو دەڵێت : منداڵەکانی مـامی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کەلەخـەو هەڵدەسـان ڕوو هەڵبرسکاوو سەرو پرچ هەڵبرسکاو چاویان ریپوقاوی بوو, بـەلام پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کـاتێ لە خەو هەڵدەسا دەم و چاوی رەونەقی دەداو چاوی پر لەکل بوو لە(ئەنەس)ی کوری مالیکەوە دەڵێت :کاتێ فاتیمەی کچی ئەسەدی دایکی ئیمامی عەلی – رەزای خوایان لێبێت – وەفاتی کرد پێغەمبەری خودا (ﷺ) چوە ژورەوە و بۆلای و لەلای سەریەوە دانیشت و فەرمووی :(( رحمـك الله یا أمی, کنت بعد أمـی تجـو عـین و تـشبعینی , وتعـرین وتلـسینی وتمـنعین , نفـسك طیبـا و تطمعینی , تـریدین بذلك وجه الله والدارا الاخرة) واتە :- رەحمەتی خوات لێبێت دایـە لـە دوای دایکم تۆ خۆت برسی دەکرد و منت تێر دەکرد تۆ خـۆت بـێ بـەرگ بـووی بـەلام هەمیـشە مـن پۆشراو بووم هەموو خواردنێکی باشت لەخۆت حەرام دەکـرد و دەرخـواردی منـت دەدا هـەموو ئەمانـەش لەبـەر خـاتری خـواو رۆژی دوایـی بـوو , وە دوایـی فـەرمانی کـرد کـە سـێ جـار بشۆردرێتە ئینجا ئەو ئاوەی کە کافوری تێدابوو گەیـشت پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) بـە دەسـتی خۆی کردی بەسەریداو کراسەکەی خۆی داکەندو کردیە بەری فاتیمە و – خوا لێی رازی بێت ,

بەو بوردەش بەسەر شانیەوە بوو کفنی کرد, بوردە جل و بەرگێکی خەتدارە یان پۆشاکێکی خورییە دەپێچرێت لەخۆوە بۆ سەرما پاشان ئوسامەی کوری زەیدو ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و عومەری کوری خەتاب و غولامێکی بانگ کرد بۆ گۆر هەڵکەندن ئەوانیش گۆرەکەیان هەڵکەند تا گەیشتە گۆریچکە (اللحد) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆی هەڵیکەندو بەدەستی خۆی خۆڵەکەی لابرد و کاتێ لێبۆوە لە ناویدا راکشاو فەرمووی: (( الله الذی یحي و یمیت وهو حي لایموت, اغفر لامی فاطمة بنت اسد, ولقنها محتها, ووسع علیها مدخلها , بحق نبیك والانبیاء الذین قبلی فإنك ارحم الرّاحمین)) واتە: ئەی ئەو خوایەی دروست کراوەکان دەژێنێت و دەیانمرێنیت وە خۆی هەرگیز نامرێت لە دایکم فاتیمەی کچی ئەسەد خۆشبە زمانی پاراوکە بۆ پرسیارەکانی گۆر و گۆرەکەی بۆ فراوان بکە بەهەقی پێغەمبەرەکەت و ئەو پێغەمبەرانەی پێش من هاتوون چونکە بەراستی تۆ بە بەزەیترین کەسی لە دوایدا چوار جار تەکبیری لەسەر کردوو دواتر لەگەڵ عباس و ئەبەبەکری صدیق دا – خوالێیان رازی بێت – خستیانە ناو گۆرەکەوە وە لە عبدالله ی کوری عباسەوە دەڵێت: کاتێ فاتیمەی دایکی ئیمامی علی – خوالێی رازی بێت وەفاتی کرد پێغەمبەری خودا (ﷺ) کراسەکەی خۆی لەبەرکرد و لەگەڵیدا لە ناو گۆرەکەدا راکشاو ووتیان : ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێشتر ئەمەمان لەتۆ نەبینیوە فەرمووی (( أنە لم یکن احد بعد ابي طالب أبربي منها, انما البستها قمیصي لتکسی من حلل الجنة وافطبعت معها لیهون علیها)).[٣٦٧] واتە : لەراستیدا لە دوای ئەبو تالب هیچ کەس هێندەی ئەم چاکەی بۆم نەبوە وەبۆیە کراسەکەی خۆمم لەبەرکرد تاوەکو لە جل و بەرگی بەهەشت بپۆشێ و لەگەڵیدا لە گۆرەکەیدا راکشام تاوەکو نارەحەتی گۆر لەسەری سوك بێت.

---

[٣٦٧] (( هه یثه می دە ڵێت:– لە (المجمع) (٢٥٧/٩) دا طه بە رانی لە (الأوسط) دا گێراویەتیەوە و تیایدا سەعدانی کوری وەلیدی السابری هە یە کە نەمناسیوە جگە لە و هەموو پیاوانەی تری فەرموودەکە جێی متمانەن).

## ٣٧٩.﴿ ڕەحم و سۆزی خوای گەورە زۆر فراوانە ﴾

کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ گەیشتە مزگەوت و دابەزی وڵاخەکەی بەستەوە و ئینجا چووە مزگەوت و لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد لەدوای ئەوەی لەنوێژ تەواو بوون بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد ووتی :- خودایە ڕەحم بەمن و محمد بکەی وەهیچ کەسێکی تر مەخەرە ژێر ڕەحم و بەزەیت، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەستایەوەو ڕونیکردەوە بۆ ئەو کابرایەو سەرجەم باوەڕداران فەرمووی :( ڕەحم و سۆز و بەزەی خوا زۆر بەرفراوانە بەڵام تۆ ئەی کابرا هەستای ئەو ڕەحمەتەت بچوك کردەوە تەنها بۆ دوو کەس کاری وامەکە چونکە خوای گەورە خاوەنی ڕەحم و بەزەییە، بەزەی خودا سەد بەشە یەك بەشی ناردووە بۆ سەر زەوی ئەوەتا جنۆکەو مرۆڤ و ئاژەڵ و درەخت و هەموو شتەکانی گرتۆتەوە نەوەد و نۆ بەشەکەی تری داناوە بۆ دوارۆژ کە تایبەتە بە باوەڕدارانەوە.[٣٦٨]

## ٣٨٠.﴿ ئوم سەلەمە پاداشتی ئارامگری دەسکەوت ﴾

ئوم سەلەمە –خوالێی ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بیستومە فەرموویەتی((هەر مسوڵمانێك توشی بەڵایەك بێت بڵێت :- ئێمە لای خودا هاتووین دەگەڕێینەوە بۆلای ئەو : ئەی پەروەردگار پارمەتیم بدە لەو بەڵایەوە لەبری ئەو باشترم پێببەخشە خوای گەورە پاداشتی بەڵاکەی نافەوتێنێت . لەو بەخششە باشتری پێدەبەخشێت دەڵێت : منیش بە باشی لەبەرمکرد و لە دوای ماوەیەك مێردەکەم (ئەبوسەلەمە) مرد ئەمووت: ئایا چ مسوڵمانێك هەیە لە ئەبوسەلەمە باشتر بێت خۆڕاگربووم داوای پاداشتم لەخوای گەورەکرد وە نزام کرد، بەو نزایەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێکردبووم لەدوای ئەوەی چوارمانگ و دەرۆژ ڕۆیشت بەسەر مردنەکەیدا شووم کرد بە پێغەمبەری خودا ﷺ منداڵەکانی بۆ بەخێوکردم دەیوت: چۆنی دەفەرموو پێغەمبەری خوا وام ووت : خوای گەورەش لەو باشتر پاداشتی دامەوە کە ئەویش پێغەمبەری خودا(ﷺ)بوو هەربۆیە (ئوم سەلەمە) بووە خێزانی پێغەمبەری خودا(ﷺ)بۆ دایکی باوەڕداران ئەمەش بە بەرەکەتی ئارامگری.[٣٦٩]

---

[٣٦٨] (رواه البخاري).

[٣٦٩] (٣٤١/٣) ارواه المسلم.

## ٣٨١.﴿عەبدوڵای کوری عومەر پابەندبوو بــە ســووننەتەکانی پێغەمبــەری خودا( ﷺ )﴾

عبداللـەی کـوری عومـەر زۆر دەسـتی دەگـرت و پابەنـدبوو بەسـووننەتەکانی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ), لـە نافعـەوە دەڵێـت:-عبداللـەی کـوری عومـەر شـوێن پێـی پێغەمبـەری خـودای (ﷺ)هەڵدەگرت ,لەهەر شوێنێك نوێژی تێدا بکردبایا هەتا جارێکیـان پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لەژێر دارێکدا دابەزی دوای ئەوە عبداللەی کوری عومەر –خوالێی رازیبێت- زوو زوو دەچۆ لای ئەو دارەو ئاوی دەدا تا ووشك نەبێت.[٣٧٠]

هەر لە نافعەوە لە عبداللەی کوری عومـەرەوە دەڵێـت :- پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)فـەرمووی ((لـو ترکنـا هـذا البـاب للنـساء)) واتـا: ئەگـەر ئـەم دەرگایـەمان جێهێـشتبایە بـۆ ئافرەتـان بـاش بوو,نافع دەڵێت : دوای ئەوە عبدالله لەو دەرگایەوە هاتوو چۆی نەدەکرد تا وەفاتی کرد.[٣٧١]

هەر لە نافعـەوە لـە عبداللـەی کـوری عومـەرەوە خـوا لێـی رازیبێـت لەسـەر رێگـای مەککـە سەری وولاٌخەکەی دەگرت لغاوەکەی و پێچی پێدەکردەوەو دەیووت بەڵکوو سمێك بکەوێتە سەر سـم واتـە :بـەڵکو ئەمـە وا دەرچێت پێـی وولاٌخەکـەی بکەوێتـە سـەر شـوێن پێـی وولاٌخەکـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ), وادیارە پێغەمبـەری خـودای (ﷺ)ی بینیـوە کەلەوشـوێنە وولاٌخەکـەی تێپەراندووە.

---

[٣٧٠] (٣٤١/٣) ارواه المسلم.

[٣٧١] ( اسد غابه ).

## ٣٨٢.﴿ چیرۆكی ئەبو قەتادەی ئەنصاری لە جەنگی حونەیندا ﴾

ئـەبو قـەتادە دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: لـە ڕۆژی جـەنگی حونـەین لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) چـوبوونە دەرەوە كـاتێ بـە دوژمنـان گەیـشتین پیـاوێكم بـینی چـووبووە سـەرووی موسوڵمانان لە دواوە بۆی چووم و شمشێرێكم دا لە گەردنی و درعەكەیم بڕی ڕووی تێكردم و وەك ئەوەی خۆی فرێدایە باوەشم دەمزانی بۆنی مردنی لێدێت ئەو جار بەریدام و كەوت و مرد وە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ڕۆژە فەرمووی (من قتل قتلا له بینه، فله سلبه): واتە هەر كەسێك یـەكێك بكوژێـت وە بـە لگـەی هـەبێت ئـەوا غەنیمەتەكەی بـۆ خـۆی دەبێـت دەڵێت: منیش هەڵسام ووتم كێ شایەتیم بۆ دەدات ؟ و چیرۆكەكەم بۆ گێرایەوە پیاوێك هەڵسا ووتی:ڕاست ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)وە غەنیمەتەكەی ئەو پیـاوەش لای منـە ئـەبو بـەكر ووتـی : نـا بـەخوا هـەرگیز شـێرێك لـە شـێرەكانی خـوا نـا جـەنگێ لـە پێنـاو خـواو پێغەمبەرەكەیدا و غەنیمەتەكەی بە تۆ بدات پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی : ئەبوو قەتادە ڕاست دەڵێت ئەوجا غەنیمەتەكەی پێدام و درعەكەم فرۆشت دام بە باغێـك لـە بـەنی سـەلەمە ئەمە یەكەمین شتێك بووو لە ئیسلامدا دەستم كەوت.[٣٧٢]

---

[٣٧٢] (صحیح المطأ ٢/١٠/١٢٠ ( بوخاری و موسلیم و غەیری ئەوانیش ریوایەتیان كردووە

# ٣٨٣. ﴿چیرۆك و بەسەرهاتی ئەبا عامر لەجەنگی حونەین دا﴾

دوای ئــەوەی پێغەمبــەری خــودا(ﷺ) لــە حونــەین بوویــەوە ئــەبا عــامری بەســەر سـوپای(اوطـاس) ەوە نـارد ئـەوەبوو بـە (دورەیـدی كـوری صـمە) گەیـشت كوشـتی و خـوای پەروەردگار شكستی بە هاورێكانی (دورەید) هێنا بەلاّم پیاوێك بە تیرێـك دای لـە ئـەژنۆی ئـەبا عامر و لە جێگای خۆی خستی, ئەبو موسا دەڵێت :وتم : مامە گیان كێ بوو تیرەكەی لێدایت؟ ئەویش ئاماژەی بۆ كرد رۆیشتم بەدوایدا پێی گەیشتمەوە كەمنی بینی پشتی هەڵكردو رایكرد پێم ووت : شەرم ناكەیت ؟ مەگەر عەرەب نیت؟ بۆچی ناوەستی پیاوانـە شـەر بكـەین؟دەڵێت : ئـەو جـا وەسـتاو بەیـەك گەیـشتین یـەك و دوو لێـدان لەنێوانمانـدا روویـدا و كوشـتم پاشـان گەرامـەوە بـۆ لای ئـەبا عـامر پـێم ووت: خـوای پـەروەردگار ئـەوی دا بـە كوشـت كـە تیرەكـەی لێدابوویت ووتی:ئەم تـیرە لـە ئـەژنۆم دەربێنـە منـیش دەرمهێنـا دەبینـم ئـاوی لێدێتـە دەرەوە ووتی: برازا گیان برۆ بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ)و سەلامی منی پێبگەیەنە و پێی بڵێ: داوای لێخۆش بوونم بۆ بكات, ئەوجا ئەبا عامر منی لـە جێـی خـۆی دانـا بەسـەر خەڵكەكـەوەو زۆری نەبرد خۆی وەفاتی كرد كە گەیشتینەوە لای پێغەمبەری خـودا(ﷺ) هەواڵەكـەم پێـدا ئـەویش هەڵسا دەست نوێژی گرت و دەستەكانی بەرز كردەوەو فەرمووی((خوایە خۆشبە لە بەندەكەت ئەبا عامر ئەوەندە دەستی بەرزكردەوە سپیایی ژێر باڵیم چاو پێكەوت, پاشان فەرمووی((اللهم اجعله یوم القیامة فـوق كـثیر مـن خلقـك))واتـە : ئـەی پـەروەردگار لـەرۆژی قیامەتـدا بیخـەرە سەروی زۆرێك لە دروستكراوانت منیش ووتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ منیش داوا بكە ؟ فەرمووی (( اللهم اغفـر لعبـد الله بـن قـیس ذنبـه, وأدخلـه یـوم القیامـة مـدخلا كریمـا)) واتـە پەروەردگار لە تاوانی عەبدوڵلای كوری قەیس خۆش بـە چونكە ئـەبو موسـا نـاوی:عبـدوڵلای كوری قیس بوو وە لە رۆژی قیامەتدا جێگایەكی رێزداری بۆ ئامادە بكە.[٣٧٣]

[٣٧٣] (صحیح رواه البخاری ومسلم.

## ٣٨٤.﴿پیاوە ئەنصاریەکە کە گوێ بیستی ئایەتەکە ی قورئان بوو دەست بەرداری هەردووك کورەکەی بوو﴾

ڕیوایەت کراوە کە پیاوێکی ئەنصاری لە نەوەی سالی کوری عەوف پێش هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو کوری دەبن بە گاور کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچ دەکات بۆ مەدینە و پیاوەکە مسوڵمان دەبێت دووکورەکەی لەگەڵ چەند پیاوێکی گاوردا ڕۆنیان پێ دەبێت و دێنەوە بۆ مەدینە, باوکەکە کە یەخەی دوو کورەکەی ئەگرێ و پێیان ئەڵێ : هەتا مسوڵمان نەبن وازتان لێناهێنم ئەم ناکۆکیە دەگەیەننە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و پیاوەکە ئەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا ڕەوایە بە چاوی خۆم سەیر بکەم و هەندێکم بچێتە ناو ئاگرەوە؟ واتە: کورەکانم بەشێکن لە خۆم بۆ ئەم بابەتە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ((لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)) واتە: بەهیچ جۆرێك زۆری کردن لە دین دانیە بۆ هاتنە ناو ئیسلام چونکە بەراستی لەیەك جیابۆتەوە ڕێنموونی و شارەزای لە گومرایی و سەرلێشێواوی ئەم ئایەتە تایبەتە بە ئەوانەی ئاینی ئاسمانیان هەیە ئینجا هەرکەس لەرێی بێ بڕوای بگەرێتەوە بێ باوەربێت بەهەر پەرستراوێك جگە لەخوا وەبروا بێنێت بەخوا ئەوا بێگومان بەتوندی دەستی گرتووە بەدەستە گیرەیەکی قایمی بەهێزی وا کە ئیسلام یان ئیمانەکەیەتی کە پچران و بەربوونی بۆ نییە وەخوا بیسەری زاناییە ڕۆیشت دەست بەرداری هەردوو کورەکەی بوو.[٣٧٤]

---

[٣٧٤] (ژیانی ئازیزمان (ﷺ) بەرگی یەکەم لا ٥٦٨).

## ٣٨٥. ﴿ چیرۆکی( صرمة )ی کوری قەیس لەخزمەتی پێغەمبەری خودا( ﷺ ) ﴾

ئیمامی ئەحمەد لە موسنەددا لە موعازی کوری جەبەلەوە لە فەرمودەیەکی درێژدا دەربارەی نوێژو زەکات ریوایەتی کردووە کەوتویەتی :- مسولمانەکان مادام نەخەوتبوون خواردنیان ئەخوارد و ئاویان ئەخواردەوە وە ژن و مێردیان ئەکرد کە ئەخەوتن دەستیان ئەگرت و پاشان ئەوەبوو پیاوێکی ئەنصاری کەپێی ئەوترا (صرمة) واتە: کوری قەیس بە رۆژوو بوو و کاری ئەکرد هەتا ئێوارەی لێهات هاتەوە ماڵەوەو نوێژی عیشای کردوو خەوت ئیتر نە نانی خواردوو نە نانی خواردەوە هەتا رۆژی لێبویەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ)چاوی پێکەوت و زۆر ماندوو دیاربوو بۆیە فەرمووی((مالی أراك قد جهدت جهدا شديدا) واتە : فەرمووی: چی یەوا زۆر ماندوو هیلاك ئەتبینم؟ ئەویش هەواڵەکەی دایە هەروەها عومەریش دوای ئەوەی کە خەوی لێکەوتبوو چوبوە لای ژنەکەی ئەویش هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)و لە پەشیمانی کارەکەی دا ئەگریاو باسەکەی بۆ گێرایەوە ئەوەبوو خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:-

((أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ اللّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُواْ مَا كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ الصِّيَامَ إِلَى الَّليْلِ وَلاَ تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ {١٨٧})) البقرة.

واتا: رێتان پێدراوە لە شەوانی رۆژووی رەمەزاندا درووست بوون لەگەڵ ژنەکانتان ، ئەوان بۆ ئێوە پۆشاکن و وە ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن خوا دەیزانی کە ئێوە ناپاکیتان لە خۆتان دەکرد بۆیە پەشیمانی لێگیراکردن وە لێتان خۆش بوو ئیتر لە ئێستاوە لە شەودا بچنە لایان وە بە دڵ بخوازن ئەوەی کە خوا بۆی نوسیون لە منداڵ وە بخۆن و بخۆنەوە هە تا بۆتان جیا دەبێتەوە روشتەی سپی رۆژ لە روشتەی رەشی شەو لە شەبەقدا لە پاشان رۆژوەکەتان تەواو بکەن تا شەوی دوایی وە مەچنە لای ژنەکانتان لە کاتێکدا کە لە مزگەوتدا مابنەوە بۆ خوا پەرستی ئەمانە سنورانی خوان و نزیکیان مەکەونەوە ئاوا خوا باسی فرمانی خۆی دەکات بۆ خەڵکی تا خۆیان بپارێزن.

## ٣٨٦. ﴿ پێغەمبەری خودا( ﷺ ) فەرمانی کرد بە موغیرەی کوڕی شوعبە کە سەیری دەستگیرانەکەی بکات ﴾

سەعیدی کوڕی مەنصور و ئیبن نەجار لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە (خوا لێی ڕازی بێت)هێناویانە کە وتویەتی : کچێکی ئەنصارم خوازبێنی کرد بۆ پێغەمبەریشم(ﷺ) باس کرد ئەویش پێمی فەرموو (رأيتها ؟ ) واتا : بینیوتە؟ ووتم : نەخێر ، فەرمووی ( فأنظر اليها فإن احدى أن يؤدم بينكما ) سەیریکە چونکە ئەوە ئەبێتە مایەی هۆگریتان منیش چووم بۆ لای و ئەوەم بۆ دایك و باوکی باس کرد و ئەوانیش هەر یەکەیان سەیری ئەوی تری کرد منیش هەستام و لە ماڵەکە هاتمە دەرەوە کچەکە ووتی : ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەنەوە ئەوە بوو لە پشتی پەردەکەوە وەستاو ووتی : ئەگەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێدابیت بە سەیر کردنم ئەوا سەیرم بکە ئەگینا ماوەت نادەم سەیرم بکەی ئیتر سەیرم کرد و مارەم کرد ئیتر هیچ ئافرەتێکی ترم مارە نەکردوە کە بە لامەوە لەو خۆشەویستر و بەڕێزتر بێت.

## ٣٨٧.﴿ پیاوە ئەعرابیەکە لەگەڵ خوادا ڕاستی کرد گەورەترین سەرفرازی بۆخۆی مسۆگەر کرد ﴾

بەیهەقی و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە کە پیاوێکی ئەعرابی دێتە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیمان دێنێت و شوێن ئیسلام دەکەوێ ئەڵێت : لەگەڵتدا کوچچ دەکەم ئەویشی دایە دەست یەکێك لە هاوەڵان کە لە غەزای خەیبەر هاتە بەرەوەو پێغەمبەری خودا(ﷺ)شتێکی دەست کەوت دابەش کردو بەشی کابرای ئەعرایشی داو بەشەکەی دایە دەست هاوەڵەکانی چونکە ئەو خەریکی لەوەڕاندنی ووشترەکانیان بوو , کە ئەعرابیەکە گەڕایەوە بەشەکەیان پێدا ئەویش ووتی : ئەمە چییە؟ووتیان بەشی خۆتە پێغەمبەری خودا(ﷺ)بۆتی داناوە بەشەکەی هەڵگرت و هێنایە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)ووتی ئەمە چییە؟ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی: ((قسم قسمت لك)) واتە: واتا بەشی خۆتە بۆم داناویت , ووتی: من بۆ ئەوە شوێنی تۆ نەکەوتووم بەڵکو بۆ ئەوە شوێنت کەوتووم کە تیرێك بێت و بدا لێرەم ئاماژەی بۆ قورگی کرد ووتی بمرم و بچمە بەهەشتەوە فەرمووی :((إن تصدق الله يصدقك)) واتە: فەرمووی ((ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاست بکەیت خواش ڕاستت بۆ دێنێتە پێش پاشان هەستان بۆ جەنگی دوژمن ئەوەندەی پێنەچوو بە شەهیدی هێنایانەوە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئەمە خۆیەتی؟ ووتیان بەڵێ: فەرمووی:(صدق الله فصدقه) واتە: لەگەڵ خوادا ڕاستی کرد و خوداش ڕاستی بۆ هێنایە پێش پێغەمبەری خودا(ﷺ)بە جبەکەی خۆی کفنی کرد پاشان هێنایە بەردەمی و نوێژی لەسەر کرد و یەکێ لە دوعاکانیشی ئەوە بوو(اللهم هذا عبدك خرج مهاجرا في سبيلك فقتل شهيداً وانا عليه شهيد))

واتە: فەرمووی:خوایە ئەمە بەندەی خۆتە و لەپێناوی تۆدا کۆچی کردووە وە بە شەهیدی سەری ناوەتەوە و منیش لە سەری شاهێدم.

## ٣٨٨.﴿چیرۆك و بەسەرهاتی مسوڵمان بوونی عەبدوڵڵای ذوالبجادین لە خزمەتی پێغەمبەری خودا( ﷺ )﴾

محمدی کوری سەعید دەڵێت: (ذوالبجادین) هەتیوێکی نەداربوو باوکی مردو هیچی بۆ بەجێنەهێشت بوو مامی بوە کەفیلی بەخێوکردنی تاوەکو برێك حاڵی باش بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە مەدینە (ذوالبجادین) دەرونی تامەزرۆی ئیسلام بوو لەبەر مامیشی نەدەوێرا باسی بکات هەتا ساڵان و چەند غەزایەك تێپەرین ئینجا بە مامی ووت: مامە من دەمێکە چاوەرێم بەڵکو مسوڵمان بیت بەڵام وادیارە تۆ موحەممەدت ناوێت دەی مۆڵەت بدە من بامسوڵمان بم, مامی ووتی : سوێند بەخوا ئەگەر شوێن موحەممەد بکەویت هەرچیەکی پێمداویت لێت ئەسەنمەوە هەتا جلەکانیشت ئەویش ووتی: دەی سوێند بەخوا من شوێنی موحەممەد کەوتووم و بەرد پەرستیم واز لێهێناوە ئەمەش لە دەستمدایە هانێ بیبە, ئەویش هەموو شتەکانی لێسەندەوە و جلەکانیشی لەبەریدا دامالی, ئەویش هات بۆلای دایکی پارچە بجادێکی بە دووبەش بۆ بری یەکێکیانی کردە شەرواڵ واتە : نێوانی ناوك و ئەژنۆی پێداپۆشی و ئەویتریشیانی دا بەسەر شان و ملیدا وە پاشان هات بۆ مەدینە لە بورقان کە کێوێکە لەلای راستی تێپەربوونە لە مەدینەوە بۆ مەککە دەمەو بەیان لە مزگەوت راکشا پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەیانیان لە خەڵکی ورد دەبویەوەو تەماشای دەکرد ئەوەش تا بزانێ غەریب و کەسی نەناسراو دەرنەکەوتووە, دەبینێت عبدالله لەوێیە پرسی (من انت؟) واتە : تۆ کێیت؟ ئەویش ناوی خۆی پێووت و پێشی ووت: کە مسوڵمانە وە ناوی عبدول العزی بوو ,پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو : تۆ عبدالله ی خاوەنی دوو بجادی پاشان فەرمووی : ((أنزل مني قريبا)) واتە لە نزیك منەوە بمێنەرەوە, ئەوەبوو زۆر لەگەڵیدا لەمیوانەکانی دەمایەوە هەتا وای لێهات قورئانێکی زۆری خوێندو لەبەریکرد.[٣٧٥]

---

[٣٧٥] (بروانە صفة الصفوة (١/٣٤٤).

## ٣٨٩. ﴿ چیرۆك و بەسەرهاتی طلیحە ی كوری خویلید كە ناسراوە بە هەڵگەراوەی تۆبەكار ﴾

(طلیحە) ناوی طلیحە ی كوری خویلیدی كوری نوفلی ئەسەدیە هاوەڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و كەسێكە لە ئازایەتیدا بە نموونە دەهێنرێتەوە, لە بەنی ئەسەدە كە یەكێكە لەو تیرانەی لە نێوان نەجد و فورات دا نیشتەجێبوون ساڵی نۆی كۆچی شاندی بەنەی ئەسەد كە(طلیحە) شیان لە ناودابوو هاتنە مەدینە تا لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیسلام بوونی خۆیان رابگەیەنن (طلیحە)مسوڵمان بوو بەلاَم دواتر لە دین هەڵگەرایەوە بەوەش ستەمی لەخۆی كرد و لە (نجد)بانگەوازی پێغەمبەرایەتی كرد چەند رووبەرووبونەوەیەكی لەگەڵ مسوڵماناندا هەبوو كە تیایدا شكستی هێناو سەر شۆر بوو ئەوە بوو پێش وەفاتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاژاوە سەری كێشابوو كە(طلیحە)یەكێ بوو لەوانەی دەستیان تیایدابوو ئەوەبوو (خیال)ی برای نارده لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) تا هەواڵی ئەوەی پێبدات ئەمیش وەكو ئەو بوەتە پێغەمبەرو بانگی بكات بۆ وازهێنانی لە دوژمنایەتی كردن و ئاشت ببنەوە ئەم جۆرە پەخشانانەی ئەوتەوە (والحمام والیمام , والصرد والصرام, قد صمن قبلكم بأعوام, لیبلغن ملكنا العراق والشام) واتە: باڵندەو كۆتر بازوریَ كە جۆرە باڵدارێكە ئازاو پاڵەوان چەندین ساڵ پێش ئێوە بەرۆژوو بوون تا بگەنە عێراق و شامی موڵكمان. پێغەمبەری خودا(ﷺ) زراری كوری الازوری ئەسەدی نارد تا رووبەرووی طلیحە ببنەوە ئەوە بوو (ضرار) طلیحە توشی ترس كرد مسوڵمانان لە زیاد بووندا بوون. هەرچی كۆمەڵەكەی طلیحە ش بوو كەمیان دەكرد تاوەكو چرار شمشێرەكەی بۆ هێنایەوە بەروودا بەلاَم طلیحە خۆی لێ لادا ئەوەبوو طلیحە شەر كەرێكی ناوازەبوو لە هێزدا ئەوەی قۆستەوەو ووتی: كە چەك كاری تێناكات و لەو ماوەیەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) وە فاتی كردوو خەڵكی لای (ضرار) یان چۆڵكردوو لە دەوری طلیحە كۆبونەوە هەرچی ضرار و ئەوانەی لەگەڵێدا مابوونەوە لە دەستی طلیحە خۆیان رزگار كرد, ئینجا مەترسی طلیحە بۆ سەر مسوڵمانان زیادیكرد لەبەر ئەوە پێشەوا خەلیفە ئەبوبەكر چەند لیوایەكی ئامادەكرد بۆ شەركردن لەگەڵ هەڵگەراوەكاندا و خالیدی كوری وەلیدی لەگەڵ پێنج هەزار سەربازدا نارد بۆ طلیحە و لەگەڵ طلیحە بەیەك گەیشتن كەسوپاكەی زیاتربوو لە سوپاكەی خالید طلیحە لە ماڵ دانیشتبوو شەریش لە حەوشەی ماڵەكەیدا هەڵگیرسابوو ئەوە بوو (عیینەی كوری حصن) زوو زوو لەنێوان طلیحە و

سوپاکەیدا دەهات و دەچوو لێی دەپرسی جبریل نەهاتە لات؟ ئەویش ئەیووت نەخێر شەریش بەردەوام بوو خەریك بوو شکستیان ئەهێنا و لە کۆتایدا ئیدیعای کرد کەوا سروشتی بۆ دابەزیوە و پێی ئەڵێت: (ان لك رحا کرحاة, وحدیثا لاتنساه)واتە تۆیش دەستهارێکت هەیە هاوشێوەی ئەو وەفەرمایشتێکت هەیە کەلەبیری ناکەیت(عیینە)خێرا هاواری کرد لە خەڵکەکە ووتی: ئەوە سوێند بەخوا درۆزنە لەبەرئەوە برۆن و هەڵبێن طلیحە ش پاش شکست هێنانی دانی نا بە درۆکەیداو خێزانەکەی هەڵگرت و بەسواری ئەسپەکەی رایان کردوو ووتی : هەرکامتان توانی وەك من با ماڵ و خێزانەکەی رزگار بکات و رابکات شەر لەسەر رەچەڵەکتان بکەن هەرچی ئاینیشە شەری لەسەر نەکەن واتە : مەبەستی لەوە بوو کە طلیحە پێی راگەیاندبوون چونکە ووجودی نەبوو. طلیحە بۆخۆی رێکیخستبوو بەوجۆرە رایکرد بۆ شام و جەنگەکەی کۆتای پێهات طلیحە لە شام خۆی گەیاندە(ال جفنە)ی غەسانی،[٣٧٦] لەوێدا بەخۆیدا چوەوەو هاتەوە باوەشی ئاینی راست و دروست و پاك و پر بەرەکەتی ئیسلام و چوە دەرەوە بۆ عەمرە ئەوە بوو کە بەلای مەدینەدا تێپەربوو لەرێی مەککەدا بە ئەبوبەکری صدیق-خوالێی رازیبێ-یان ووت:ئەوە طلیحە یە فەرمووی : چی لێبکەم وازی لێبێنن ئەو خوا رێنمونی کردووە بۆ ئیسلام طلیحە لە شام مایەوە تا ئەبوبەکر-خوالێی رازیبێت- وەفاتی کرد ئەوەبوو ئەبوبەکر رێگری کردبوو لەوانەی پێشتر لە ئیسلام هەڵگەرابوونەوە لە ناو سوپادابن و بەشداری(فتوحات) بکەن بۆیە طلیحە لە ماڵی خۆیدا مایەوە پاشان پێشەوا عومەری کوری خەتاب- خوالێی رازیبێت- رێگەی پێدان بە مەرجێك سەرکردایەتیان پێنەسپێرێت طلیحە هات بەیعەت بە عومەر بدات ئەو ووت و وێژە لەنێوانیاندا روویدا, عومەر ووتی: بە طلیحە تۆ بکوژی عکاشەی کوری محصنی پیاو چاکیت لەگەڵ ثابتی (اقرم) دا سوێند بەخوا هەرگیز خۆشم ناوێت ئەوەبوو طلیحە کەسێکی قسە ئامادەبوو ووتی: ئەی ئەمیری باوەرداران ئەوان دوو پیاون خوا لەسەر دەستی من رێزی لێنان و منی سەر شۆر نەکرد بە دەستی ئەوان وە خەڵکیش لەگەڵ بوونی پێشینەی خراپیش ئەکرێت رێك بکەون خەلیفە عومەریش قسەکانی بەدڵ بوو و لێی رازی بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی:-

((یضحك الله الی رجلین قتل احدهما الاخر, یدخلان الجنة, یقاتل هذا في سبیل الله فیقتل , ثم یتوب الله علی القاتل فیسلم, فیقاتل فی سبیل الله فیستشهد) رواه البخاری ومسلم.

---

[٣٧٦] (سیر اعلام النبلاء (٣١٧/١) البدایە والنهایە (١٩٦/٥).

واتە خوای پەروەردگار بەدەم دوو پیاوەوە پێدەکەنێ کەیەکێکیان ئەوەی دیکەی کوشتووە دەچنە بەهەشتەوە یەکەمیان: کەلە پێناوی خوادا جەنگاوەو کوژراوە پاشان لە بکوژەکەی خۆش دەبێت و مسوڵمان دەبێت و ئەویش لە پێناوی خوادا دەجەنگێت و شەهید دەبێت.....

ئەوە بوو طلیحە چوە ژێر ئالآی ئیسلام وەك خەباتکارێك لە پێناوی خوادا ساڵی چواردەی کۆچی لەگەڵ سوپای سەعدی کوری ئەبو وەقاص دا بۆ ڕزگارکردنی عێراق کەوتە ڕێ سوپای موسوڵمانان زیاد لە سی هەزار جەنگاوەر بوون کە سێ هەزاریان لە بەنی ئەسەد بوون و طلیحە یەکێك بوو لەوان سەرکردایەتی نەدەکردن هەرچی سوپای فارسەکانە خۆی دەدا لە سەدو بیست هەزار سەعد حەزی کرد سەرەتا قەرەوڵێکی پشکنین بنێرێت و یەکێك لە سوپاکەی فارس دیل بکات تا وەکو هەواڵی لێوەرگرێت، ئەوەبو بۆ ئەم جۆرە کارانەش کەسانی شیاوو زۆر بە جەرگ و لێهاتوونە بوایە هەڵیاندەبژارد ئەوەبوو (عمر کوری معد)ی لەگەڵ چوار کەسدا بە جیا نارد طلیحە شی بە تەنها نارد و هەرچی عمر و هاوەڵەکانی هەرکە بینیان سوپای فارسەکان لە قادسیە نزیك دەبنەوە گەڕانەوە، بەڵام طلیحە بە تەنها ڕۆیشت تا لە شەودا بە دزیەوە چووە ناو سەربازگەکەی ڕۆستەم و مایەوە و چاودێری سوپاکەی دەکرد لە کۆتایی شەودا ئەسپێکی بە دڵ بوو بە شمشێرەکەی کەمەندەکەی بڕی و بۆی دەرچوو ئەوەبو ئاگر پەرستەکان هەستیان پێکرد و بە دوایدا ڕۆیشتن بەڵام پێی نەگەیشتن، پیاوێکیان نەبێت کە لە طلیحە نزیك بویەوە و ڕمەکەی بۆ هەڵدا لە دواوە بەڵام طلیحە خۆی لێلادا و نەیپێکا هەرچی سوارەکەیە بەردەم طلیحەی گرت بەڵام طلیحە دەستپێشخەری کرد و ڕمەکەی زوتر بۆ هاویشت و کوشتی، ئەم جارە یەکێکی تر شوێنی کەوت ئەویش هەر وەك ئەوی تر بە دەستی طلیحە کوژراو یەکێکی تریش کە شوێنی کەوت طلیحە دیلی کرد و لەگەڵ خۆی ڕاپێچی کردو دایە دەست سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص- خوا لێی ڕازا بێت- ڕۆستەم بە خۆی و فیلەکانیەوە هات و شەڕ هەڵگیرسا طلیحە یەکێك بوو لەوانی ووتاری بۆ سوپای ی موسوڵمانان دەدا و ئەوپەڕی هیمەت و کۆششی دەکرد بە گرنگترین کار هەڵدەستا ئەویش هێرشکردنە سە فیلەکان بوو جێدەستی خۆی وەك پاڵەوان دیاری کرد ئەوەبوو خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب –خوا لێی ڕازی بێت- چوار شمشێر و چوار ئەسپی نارد بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص وەك خەڵات

بۆ پاڵەوانانی سوپا طلیحەش شمپێرێکی لەوانە بەرکەوت وە لە جەنگێکی تردا کە لە جەلەولا ڕویدا دیسان طلیحە پاڵەوانی جەنگەکە بوو، لە جەنگی نەهاوەندیشدا فارسەکان ژمارەیەکی یەکجار زۆر سەربازیان کۆکردبۆوە بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوەی موسوڵمانان ئەوەبوو خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب نەعمانی مقرنی بە سی هەزار جەنگاوەرەوە بۆ ناردن و فەرمانی کرد کە لەگەڵ هەریەکە لە طلیحە و عمری کوڕی معدی یەکریب و عەمر ی کوڕی سەلەمەیدا ڕاوێژ بکات ئەوەبوو نەعمانیش وەك پێش قەرەوڵێکی پشکنین ناردنی و هەریەکەیان لە ڕێگەیەکەوە ڕۆیشتن ئەو دوانە عەمری کوری مەعد یەکریب و عەمری کوری ئەبی سەلەمە هەروا گەرانەوە هیچیان پێنەکرا طلیحە ش بەتەنها (١٣٠)کم ڕۆیشت تا گەیشتە نەهاوەندوو لەوێ ئەوەی ویستی بۆی دەرکەوت، پاشان گەرایەوە ئەوبوو کە ماوەیەکی زۆر دیار نەما، مسوڵمانان وایان گومان برد کە دووبارە هەڵگەراوەتەوە لە ئاین، بەڵام هەرکە بینیان وا گەرایەوە دەستیان بە الله اکبر کرد، ئەویش هەرچی بینی بووی گێرایەوە بۆ نەعمان هەردوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن ئەو ڕۆژە . طلیحە گەورەترین شەری کردوو بەهەزار سوارچاك هەژماردەکرا هەروەك خاوەنی (الطبق الطبقات)،[٣٧٧] باسی دەکات ئەوڕۆژە نەعمان-خوالێی رازیبێت-شەهید کراو طلیحە ش خوا لێی رازیبێت پاش ئەوەی کارگەلێکی بە سوپای فارس کرد شەهید کرا، پێشەوا زەهەبی دەڵێت : طلیحە – خوالێی رازیبێت – ڕۆژی نەهاوەند ئەرکی خۆی جێبەجێکرد بەزیادەوە و پاشان شەهید بوو.

---

[٣٧٧] (موحەمەدی کوری سەعد لە (الطبقان)داو لە (الطبقة)( الرابعة من الصحابة)دا باسی طلیحە ی کردووە دەڵێت: لە ئازایەتی و بەرچاو رونیدا لە جێی هەزار پیاو بوو لە جەنگدا، البدایە/٥/١٩٦

## ٣٩٠.﴿پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەصفی (ذول بجادین)ی کرد بە تۆبەکار﴾

لە عوقبەی کوری عامرەوە – خوالێی رازیبێت- دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پیاوێك کە بە(ذول بجادین) ناودەبرا فەرمووی:(انه اواه) واتە : کەسێك زۆر ئاه و هەناسە هەڵبکێشێت و پەرێشان بێت لەبەر ئەوەی بە بەسەرکردنەوەی قورئان زۆر یادی خوای دەکردوو لە دوعا کردنـــدا دەنگـــی بـــەرز دەکـــردەوە لـــە(الادرع)ەوە دەڵێـــت : پاســـەوانیم بـــۆ پێغەمبـــەری خودا(ﷺ)شەوێك بۆ کارێکی خۆی چووە دەرەوە منی بینی دەستی گرتم و ڕۆیشتین لەڕێگا بە پیاوێك گەیشتین نوێژی دەکرد و بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێند پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی ووت : ((عسى ان يكون مرائيا)) واتە : ئەشێ ریاباز بێت دەڵێت منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژ دەکات و دەنگی بۆ قورئان خوێندن بەرز دەکاتەوە ,؟ دەڵێت : پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی بەردام و پاشان فەرمووی: ((إنكم لن تنال و هذا الامر بالمغالبة)) واتە ئێوە ئەم نایەنە بەسەر یەکتربوندا زاڵبوون بەدەست ناهێنن. پاشان شەوێکی تر چوە دەرەوەو منیش پاسەوانیم دەکرد, دەستی گرتم و بەلای پیاوێکدا تێپەڕین دەنگی بۆ قورئان خوێندن بەرز کردبۆوە.

ووتم: ئەشێ کەسێکی ریاباز بێت, پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((كلا انه أواب)) نەخێر بەڵکو ئەوە کەسێکە زۆر دەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری و داوای لێخۆش بوونی لێدەکات سەیرم کرد دەبینم عبداللەی کوری (ذول البجادينة).[٣٧٨]

---

[٣٧٨] (هه يثه مى دەڵێت:احمد گێراویەتیەوە پیاوانی فەرموودەکە صەحیحن(المجمع) بە ژمارە (١٥٩٨٢).

## ٣٩١.﴿چیرۆکی نوسەیبەی کچی کەعب و خۆشەویستیە بێسنوورەکەی بۆ پێغەمبەری خودا ( ﷺ )﴾

نوسەیبە کچی کەعبی ئەنصارییە – خوالێی رازیبێت – براکەی عبداللەی کوری کەعبی مازنیە کەیەکێکە لەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە, هەرەها عبدالرحمن ی برای لەوانەبوو کە هەمیشە چاو بەفرمێسك بوو لەترسی پەروەردگاری, ئوم عەمارەشیان پێووتووە واتە: بەنوسەیبەی کچی کەعب لەشەوی عەقەبەدا بەشداربووە, هەروەها لە ئوحود و حودەیبیەو حونەین و یەمامەدا بەشداربوە, ئافرەتێکی تێکۆشەربوەو لەشەردا کارگەلێکی ئەنجامداوەو هەروەك لە غەزادا دەستی براوە،[٣٧٩] خاتوو نوسەیبە لەگەڵ هاوسەرەکەی غەزییەی کوری عەمرو هەردوو کورەکەیدا بەشداری ئوحودیان کردووە , لەوشەردا بۆ ئاودان بە جەنگاوەرەکان چوبو کوندەیەکی پێبوو ئەیگێراو لەگەڵ ئەوەشدا شەریشی دەکردوو لە دوانزە لاوە بریندار کرا پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو :(لمقام نسيبة بنت كعب اليوم , أى يوم أحد , خير من مقام فلان و فلان) واتە: جێگای نوسەیبەی کچی کەعب لەم ڕۆژەدا واتە: لەڕۆژی ئوحودا لە جێگای فڵان و فڵان باشترە لەو ڕۆژەدا نوسەیبە- خوا لێی ڕازی بێت- بە توندترین شێوە دەجەنگاو جلەکانی بە کەمەریەوە توند کردبوو تا سیانزدە جار بریندار کرا خەمرەی کوڕی سەعیدی مازنی باسی ئەنکی دەکرد لە ئوحودا بەشداری کردبوو بۆی گێرابۆوە کە چاوی بە ئیبن و قومیئە کەوت کە بە شمشێردەیدا لە دەماری ملی نوسەیبە کە ئەمە گەورەترین برینی بوو یەك ساڵی تەواو تیماری دەکرد پاشان بانگەوازی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاواری کرد بچن بۆ لای( حمراو الاسد ) نوسەیبەش جلەکانی توند کردەوەو هەرچەندی دەکرد خوێنی برینەکەی نە دەگیرسایەوە – ڕەزای خوای لێبێت ئوم عەمارە دەڵێت ڕۆژی ئوحود بینیم پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە تەنها ماوەو چەند کەسێکی کەم نەبێ لە دەوری بوون کە ژمارەیان لە دە کەس تێپەڕی نەدەکرد من و کوڕەکانم و هاوسەرەکەم لە دەورو بەری ماینەوەو پارێزگاریمان لێدەکرد لە کاتێکدا خەڵکی بە شکاوی تێدەپەڕین پێغەمبەری

---

[٣٧٩] سير اعلام النبلاء (٢/٢٧٨).

خودا(ﷺ) منی بینی کە قەڵغانم پێنەبوو کابرایەکیش لەولاوە خەریك بوو هەڵدەهات قەڵغانێکی بە دەستەوە بوو پێی فەرموو قەڵغانەکەت بدە بە کەسێك شەر بکات ئەویش قەڵغانەکەی داناو منیش هەڵم گرت بەردەوام پێغەمبەری خودام (ﷺ) پێدەپاراست ئای لەو ڕۆژە ئەسپ سوارەکان کە خالیدی کوڕی وەلید پێش موسوڵمن بوونی سەرکردەیان بوو پیان پێکردین خۆ ئەگەر وەك ئێمە بە پیادە شەڕیان بکردایە ئەوا بە یارمەتی خوا تێکمان دەشکاندن ئەوە بوو کابرایەك بەسەر ئەسپەکەیەوە بەرەو ڕووم هاتوو ویستی لێمدا منیش بە قەڵغانەکەم ڕێگریم لێکرد و نەیتوانی هیچ بکات و پشتی هەڵکرد عورقوب دای لە ئەسپەکەی ئەویش لە سەری کەوتە خوارەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاواری کرد (یا ابن ام عمارە، امك امك ) واتا ئەی کوڕی ئوم عومارە دایکت دایکت دەڵێت : کوڕەکەشم یارمەتیدام تا کابرام کوشت عەبدوڵای کەڕی زەیدی کوڕی ئوم عەمارە دەڵێت : ئەو ڕۆژە برینداز کرام و خوێنی برینەکەم نە ئەوەستایەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی برینەکەت ببەستە دایکم هات بۆ لام و برینەکەی بۆ بەستم و پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی :( انهض بني، فضارب القوم) واتا هەڵسە کوڕم لێیانبەو، بەردەوام دەیفەرموو ئەوەی تۆ بەرگەی دەگری کێ هەیە بەرگەی بگرێ ئەی ئوم عەمارە، ئوم عەمارە دەڵێت ئەو کابرایەی کە لە کوڕەکەمی دابوو هات بەرمو ڕوومان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرممی (هذا ضارب ابنك ) واتە ئەوەبوو لە کوڕەکەتی دا دەڵێت: منیش ڕیگام پێگرت و لە لاقیمدا و بەسەر ووڵاخەکەیەوە کەوتە خوارەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد تا کاکیلەیم بینی فەرمووی :( الحمدالله الذي ظفرك ) واتا سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەری خستیت وە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەیری برینەکەی ئوم عەمارەی دەکرد و بە کوڕەکەی دەفەرموو : ( امك امك اعصب جرحها اللهم اجعلهم رفقائي في الجنة ) واتا دایکت دایکت برینەکەی بۆ ببەستە ئەی پەروەردگار بیانکە بە هاوەڵم لە بەهەشتدا ئوم عەمارە دەڵێت ووتم ئیتر هیچ باکم نیە لە دنیا هەرچیم بەسەر بێت.[380]

[380] (ابن سعد ٨/٤١٤).

پاش ئەوەیش کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەفاتی کرد و بەرەو رەحمەتی پەروەردگاری رۆشت، ئوم عەممارە بەردەوام بوو لە تێکۆشان لە پێناو ئاینەکەیدا و بەوەفابوو بۆی تا دواهەمین هەناسەی لە موحەمەدی کوری یەحیای کوری حەبانەوە دەڵێت : ئوم عەممارە لە ئوحوددا لە دوانزە لاوە بریندار کراو لە رۆژی یەمامەدا دەستی پەری و هەر لەو رۆژەدا جگە لە دەستی لە پانزە لاوە بریندار کرا ئەوە بوو بە برینداری هاتە مەدینە بینرا کە ئەبوبەکر – رەزای خوای لێبێت – لەو کاتەدا کە پێشەوای مسوڵمانان بوو , سەردانی دەکردوو هەواڵ پرسی لێدەکرد.[٣٨١]

حبیبی کوری زەید کە موسەیلەمەی درۆزن لەت و پەتی کرد کوری ئوم عەممارە بوو پاش گەشتێکی موبارەکی پر لە بەرەکەت کاتی ئەوە هاتبوو ئەو جەستە ماندووە خەباتکارە بگاتە ئەو مەنزڵەی کە پەروەردگار پەیمانی پێدابوون.ئەوە بوو فەرمانی خوای پەروەردگاری بەجێهێناو رۆحی پاکی بۆ ئەو جێیە فڕی. کە پەروەردگار دەفەرموویت : (( في مقعد صدق عند مليك مقتدر)). سوره القمر ايه ٥٥.

واتە : (( لە نشینگەیەکی پەسندان لای پاشایەکی بە دەسەڵاتی توانا )) دەسا خۆشی لەخۆت ئەی ئوم عمارە.[٣٨٢]

---

[٣٨١] (ابن سعد ٨/٤١٦).

[٣٨٢] (البداية والنهاية(٥/٨).

## ٣٩٢.﴿جبریل ( سەلامی خوای لێبێت ) وەڵامی سـەلامەکەی عبـدالله ی کـوری عەمر کوری عاص ی دایەوە﴾

لە عبدالله ی کوری عەمر کوری عاصەوە دەڵێت : رۆژێکیان لەگەڵ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لە ماڵیان بووم فەرمووی: ((هل تـدری مـن معنـا فی البیـت؟)) واتـە : دەزانـی ئێـستا کێمـان لـەم جێیەدا لەگەڵ دایە ؟ پرسیم : کێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی : ((جبریل "سەلامی خوای لێبێت" ووتم :سەلام و رەحمەتی خوات لەسەربێت ئەی جبریل))

پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی : ((انــه قـد رد علیـك الـسلام)) واتـە : جبریـل جـوابی سەلامەکەتی دایەوە.[٣٨٣]

## ٣٩٣- ﴿ئەبو( غزة )ی شـاعیر پاشـگەزبۆوە لـەو بەڵێنـەی کـە دابـووی بـە پێغەمبەری خودا ( ﷺ )﴾

لە (حمراء الاسد) پێغەمبەری خـودا(ﷺ)ئـەبو (غـزة)ی شاعیری کەوتـەوە بەردەست , کە لەگـەڵ سـوپای کافرەکـان هـاتبوو بـۆ جـەنگی نوحـود لەکاتێکـدا کـە ئـەو کەسـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) لە غەزای بەدردا چاکەی لەگەڵدا کردبـوو, بەریـدا بـوو لـەدوای ئـەوەی کـە بـەڵێنی دابوو کە بە هیـچ شێوەیەك جارێکی تـر بـە هۆنـراوەکـانی خـەڵك هـان نـەدات دژی پێغەمبـەری خودا(ﷺ) و لـە دژی مـسوڵمانان نەجـەنگێت, پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمانیـدا بـە کوشـتنی ئەویش ووتی: ئەی موحەممەد چاکەم لەگەڵدا بکـەو وازم لێبهێنـە لەبـەر خـاتری کچەکانم, وە پـەیمانت دەدەمـێ کـە جـارێکی تـر پـەیمان ناشـکێنم وەك ئـەوەی کـە شـکاندم پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ((نا بەخوا بەرت نادەم تا ئـەم جارەش بـچیتەوە بـۆ مەککـەو دەسـت بـە سمێڵتدا بهێنیت و بڵێیت فێڵم لە موحەممەد کرد؟دووجـار چـونکە مرۆڤـی بـروادار دووجـار لـە کونێکـەوە ناگـەزرێت فـەرمووی: (( بـدە لـەملی ئـەی زوبـەیر،[٣٨٤] ئـەویش لـە ملـی داو تۆڵـەی پەیمان شکێنەکەی وەرگرت.......

---

[٣٨٣] (حدیث: حسن رواه ( الطبرانی) المجمع (١٥٩٠٤) ).

[٣٨٤] ( رواة البیهقي في السنن الکبری) کتاب السیر/باب مایفعلة بالرجال البالغین منهم :٦٥/٩ وأصل الحدیث: في الصحیحین.

# ٣٩٤.﴿کەعبی کوری زوهەیری کوری ئەبو سەلما بەتەوبەکاری و مسوڵمانی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ)﴾

کـەعبی کـوری زوهـەیر یـەکێك بـوو لەوانـەی کـە زۆرێـك هـەجووی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)کردبـوو و ئـەویش خـوێنی ئـەوەی حـەلاڵ کردبـوو جـا کاتێـك کـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) لە طائیف گەرایەوە کەعبی کوری زوهەیر کە خۆیش و باوکیشی شاعیر بوون دنیای لێهاتبۆوە یەك و نەیدەزانی خۆی لەکوێ حەشار بدات ئەوە بـوو بوجـەیری بـرای هـەڵنا تـا بـە تەوبە کاری و مسوڵمانبوونەوە بێتە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ),ئەگینا دوای بۆخـۆی گـیر دەخـوات ئـەوە بـوو لـە ستایـشی پێغەمبـەری خـوادا قەصـیدە بەناوبانگەکـەی(بانـد سـحاد)ی رێکخست و هاتـە مەدینـە و کـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـە نوێـژی بـەیانی بـۆوە کـەعب هاتـە خزمـەتی و لەبەردەمیـدا دانیـشت و دەسـتی خـستە نـاو دەسـتی و پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) نەیدەناسی و ووتـی : کـەعبی کـوری زوهـەیر بەتۆبـەو مـسوڵمانیەتی هاتـە خزمـەتت و داوای ئەمانەت لێئەکات ئایا لێی وەرەگریت؟ پیاوێکی ئەنصاری هـەڵی کوتایـە سـەری و ووتـی : ئـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لێم گەرێ بۆ دوژمنی خوا تا لەملی بدەم فـەرمووی: ((دعـه عنـك فقـد جاء تائبا نازعا)).

واتە: وازی لێبێنە بە تەوبەکاری وکۆڵدانـەوە هـاتووە پاشـان قـصیدەکەی ووت : ئـەڵێن کـە ئەو قصیدەیە بە سەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) دا ئەڵێت, عەباکەی سەرشانی خۆی ئەدا پێی کە ئەوە بوو پاشان کەوتە دەست خەلیفەکان.[٣٨٥]

---

[٣٨٥] (قه سطه لانی له (المواهب)دا ٣/ ٧٠ وتویەتی لەریوایەتی ئەبوبەکری کوری ئەنباریدا هاتووە کە کاتێ ئەگاتە ئەو دێرە:

إن الرسول لنور يستضاء به مهند من سيوف الله مسلول

پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوردەیەکی لەبەردابوو هەڵیدا بۆی و مەعاویە دەهەزاری پێدا بەلام کەعب ووتی إیثاری هیچ کەسێك ناکەم بۆ کراسی پێغەمبەری خودا(ﷺ)کاتێك کەعب کۆچی دوای کرد معاویە بیست هەزار درهەمی بۆ وەرەسەکەی ناردوو بوردەکەی لێوەرگرتن جا ئەو بوردەیە ئەوەیە کە لەلای سولتانەکانە.

## ٣٩٥.﴿سەد و چل هەزار مەلائیکە دابەزین بۆ نوێژکردن لەسەر جەنازەکەی معاویەی کوڕی معاویەی موزەنی ﴾

لە فەرمودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) جەخت کراوەتەوە لەسەر گەورەیی و بەرەکەتی سورەتی (ئیخلاص) بۆ نمونە : پیاوێك گوێی لە پیاویکی تر دەبێت ( قل هو الله احد) زۆر دووبارە دەکاتەوە دێت بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و باسی ئەو پیاوەی بۆ دەکات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە وەڵامی دا فەرمووی : بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە (قل هو الله احد) یەك لەسەر سێی قورئانە بوخاری گێراویەتیەوە جارێکی دیکەش پێغەمبەری خودا(ﷺ) سریەیەك دەنێرێ و پیاویك دەکاتە سەرکردەیان ئەویش کاتێك پێش نوێژیان بۆ دەکا لە کۆتایی قورئان خوێندنەکانیدا (قل هو الله احد) دەخوێنێ دێنەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی دەکەن، کە ئەو پیاوە (قل هو الله احد) ی زۆر دەخوێنێت ئەویش فەرمووی لێی بپرسن بزانن بۆوا دەکات ؟ کە لێیان پرسی ووتی : ئەو سوورەتە سیفاتی خوای میهرەبانی تیایە و من حەز دەکەم بیخوێنم و خۆشم دەوێ پێغەمبەری خوداش (ﷺ) فەرمووی : هەواڵی بدەنێ کە خوا خۆشی دەوێ ، موسلیم و نەسائی گێراویانەتەوە . معاویەی کوڕی معاویەی موزەنی هاوەڵێك بوو دیار نەبوو ئەوەی پلەی بەرزی ئەوی دەرخست ڕۆژی مردنەکەی بوو ئەوەش بەسەرهاتەکەیەتی ئەو هاوەڵە – خوا لێی ڕازی بێت – لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەشداری غەزای کردووە و گوێرایەڵ و دامەزراو بووە لە ڕۆژی غەزای تەبوکدا توشی گرانەتایەکی قورس دەبێت و چی هەوڵی چارەسەری بۆ ئەدەن چارەسەر نابێ بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێدەدات کە لە مەدینە بمێنێتەوە پاش ماوەیەك بەر لەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بگەڕێتەوە معاویە وەفات دەکات هەر ئەو شەوە جبریل – سەلامی خوای لێبێت- دەچێتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خێمەکەیدا هەواڵی دەداتێ کە معاویە وەفاتی کردووە و فەرمووی : وەرە لە دەرەوەی خێمەکە نوێژی (غائب)ی لەسەر بکە چونکە دوو ڕیز مەلائیکەت لە ئاسمانەوە دابەزیون کە هەر ڕیزەی حەفتا هەزار مەلائیکەتە و چاوەڕێی تۆن ئیمامەتیان بۆ

بکـەیت و ئـەوانیش دەیانـەوێت نوێـژی (غائـب )ی لەسـەر بکـەن پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرمووی: باشە بە چی گەیشتۆتە ئەو پلەیە؟

جبریل-سەلامی خوای لێبێت- فەرمووی: ئەو پیاوە سورەتی((قل هو الله أحد))ی زۆر خۆش ئەویست و هەمیشە ئەیووت ئەو سورەتە سیفاتی خوای پەروەردگاری تیایە.[٣٨٦]

## ٣٩٦.﴿عەبدوللای ( ذو البجادین ) بەختەوەری راستەقینەی دەستکەوت﴾

(ذو البجادین) لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)بەرێکەوت بۆ غەزای تەبووك و لەوێ وەفاتی کردعبدالله ی کوری مەسعود چیرۆکی وەفاتی دەگێرێتەوە و دەڵێت : ناوەراستی شەو هەستام و کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەبووك بووین لەلای سەربازگەکەوە مەشخەڵێکم چاو پێکەوت بە داگیرساوی بەرەو شوێنەکە چووم دەبینم پێغەمبەری خودا(ﷺ) و ئەبوبەکرو عومەر –خوالێیان رازیبێت-

- لەوێن و عبدالله ی(ذو البجادین) وەفاتی کردووە و خەریکن گۆری بۆ هەڵدەکەنن و پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەناو گۆرەکەیدایەو ئەبوبەکرو عومەریش-خوالێیان رازیبێت- دەیدەنە دەستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت :(أدنیا الی اخاکم)واتە :براکەتانم لێنزیك بکەنەوە ئەوانیش نزیکیان کردەوە بۆی کاتێ ئامادەی کردوو لەجێی خۆی داینا فەرمووی : ((اللهم انی قد امسیت راضیا عنه ,فارض عنه)) واتە ئەی خودای پەروەردگار من لێی رازیم دەسا تۆش لێی رازیبە, عەبدوڵا ی کوری مەسعود دەڵێت : خۆزگە خاوەنی ئەم گۆرە من بوومایە.[٣٨٧]

تاوەکو دوعاکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیگرتایەتەوە .

---

[٣٨٦] (لە خزمەت قورئاندا) نووسینی: ئەندازیار عوسمان, لاپەرە :٣٩٩.

[٣٨٧] (ابن حجر لە (الاصابە)(٤/٩٩)باسی کردووە.

## ٣٩٧.﴿چیرۆك و بەسەرهاتی (ابو خیثمة) له غەزای تەبووك دا﴾

(ابـن اسـحاق) دەڵێـت: لـەپاش دەرچـونی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)بەچـەند رۆژێـك (ابـو خیثمة)گەرایەوە ماڵی خۆی لەرۆژێکی زۆر گەرمدا بینی هەردوو خێزانەکەی دوو کەپریان بـۆ ئامـادەکردووە لـەناو باخەکەیـدا و فێنکیـان کردۆتـەوە و خواردنیـان ئامـادە کـردووە ئـەویش تەماشای کردوو ووتی : پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبەر گەرمای خۆربێت و لـەناو تـۆزو رەشـەبا؟ (ابو خیثمة) ش لەسێبەری فێنـك و خـواردنی خـۆش و ئـافرەتی جوان لـە مـاڵی خۆیـدا ئەمـە هەرگیز دادگەری نییە ئینجا ووتی: دانانیشم تاوەکو توێشووم بـۆ ئامـادە نەکـەن بـەڵکو بگەمـە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) له رێگە پێش گەیشتنی بـە تـەبووك لەگـەڵ (عمـر بـن وهـب) بوون بە هاورێ كە گەیشتنە تەبووك (ابوخیثمة) داوای کرد کـە عومـەر دوابکـەوێت و ووتـی : من گوناهێکم هەیە بامن پێش تۆ بچمە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) جا کاتێـك نزیـك بوویـەوە خەڵکەکە ووتیان :سوارێك بـەرەو لامـان دێـت پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی : یـاخوا (ابـو خیثمة) بێت ووتیان: بەڵێ خۆیەتی ئیتر هاتـە لای پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) و سلاوێکی لێکـرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرموو: ئەوە چاکترە ئـەی (ابوخیثمـة) ئینجـا دوعـای چـاکەی بـۆ کرد.[٣٨٨]

---

[٣٨٨] (البداية والنهاية (٥/٨).

## ٣٩٨.﴿پیاوە ئەعرابیەکە زێرەکـەی پێـدرا چـونکە چـاك ستایـشی خـوای پەروەردگاری کرد﴾

تەبەرانی لە (المعجم الأوسط) لە ئەنەسەوە – خوالێی رازیبێت – هێناویـەتی و صـەحیحە دەڵێـت : پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بـەلای دەشـتەکیەکدا ڕۆی کـە نوێـژی دەکـرد دەیـووت: ئـەی ئەوەی چاوەکان نایبینن گومانەکان تێکەڵی نابن وەصفکاران ناتوانن وەصفی بکەن روداوەکان نایگۆرن و ژمارەی دڵۆپی بارانەکان و ژمارەی گەڵای دارەکان و ژمارەی ئەوانە دەزانێت کەشەو تاریـك و رۆژ رۆشـنیان دەکاتـەوە و دەزانـێ چ ئاسمـانێ لـە ئاسمـان و زەویـەك لـە زەویـدا و دەریایەك لە ناخیدا و شاخێ تیایدا چی هەیە چاکترین تەمـەنم لـە کۆتاییـەو چاکترینی کارم لـەکۆتایی تەمـەنم و چـاکترینی رۆژانم ئەوکاتـە دابنێکەتیایـدا دەگەمـەوە پێت پێغەمبـەری خودا(ﷺ) کەسێکی راسپارد تـالای دەشـتەکیەکە بێـت و پێـی فـەرموو (ئەگـەر نوێژەکەی کـرد بیهێنە بۆلام) کاتێ نوێژی کرد هێنـای لـە هەنـدێ کانـەوە بـرێ زێـر بـە دیـاری هێنـرا بـوو بـۆ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) کـاتێ دەشـتەکیەکە هـات زێرەکـەی بـۆ خـستە روو و فـەرمووی : ئـەی دەشـتەکی تـۆ لـە چ هۆزێکیـت ؟ ووتـی :ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) لـە بـەنی عـامری گـوری صەعصەعە فەرمووی:

( هل تدری لم وهبت لك الذهب؟) واتە : دەزانیت بۆچی زێرەکەم پێـدایت ؟ ووتـی :لەبـەر پەیوەنـدی نێـوان ئێمـە و تـۆ ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی : (إن للـرحم حقـا ولكـن وهبت لك الذهب بحسن ثنائك على الله عزوجل)

واتە: خزمایەتی مافی خۆی هەیە بەڵام زێرەکەم پێدایت لەبـەر چـاك ستایش کردنـت بـۆ خوای پەروەردگار.

## ٣٩٩.﴿ دووعـای پـێغەمبەری خودا( ﷺ ) لە ئەبوو عامری فاسق گیرابوو ﴾

لەکاتی گەرانەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەبووك بەرەو مەدینە ئەم ئایەتانە دابەزین:
((وَالَّذِينَ اتَّخَذُواْ مَسْجِداً ضِرَاراً وَكُفْراً وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَاداً لِّمَنْ حَارَبَ اللّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ وَلَيَحْلِفَنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى وَاللّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ {١٠٧} لاَ تَقُمْ فِيهِ أَبَداً لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ {١٠٨})) التوبه.

واتە: لە دوو روەکاندا کەسانی وا هەن وەکو ئەبو عامیری راهیبی عیسایی کە لە مەدینەدا دژ بە پێغەمبەرو مسوڵمانان و بۆ بەهێزکردنی کوفرو بێ باوەری خۆیان و بۆ پەرت کردنی ریزەکانی کۆمەڵی باوەرداران و دورخستنەوەیان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) و بۆ ئەوە بیکەنە کەمین و روانگە بۆ ئەو کەسانەی کە پێشتر بەر لە دروستکردنیدا دژی خواو پەیامبەرەکەی دەجەنگان دەگێرنەوە کە ئەبو عامری فاسق هەمیشە هەرەشەی لە پەیامبەری خوا دەکرد کە بە : هەموو هێزێکی دژایەتی بکاو هەرکەسێکیش شەری لەگەڵ بکات ئەم ئامادە دەبێت هاوکاری بکات, جابە فەرمانی ئەو دژو نەیارەی پێغەمبەرە ئەو مزگەوتەیە کرایەوە, هەتا ببێتە جێگەی پیلان و فاك و فیك دژ بە مسوڵمانەکان کەچی بە هەموو هێزێکیان سوێند دەخۆن کە : تەنها چاکەو خێرمان لە کردنەوەی ئەو مزگەوتەدا مەبەست بووە , خۆ خوابۆخۆی چاك بە ئاگایە کە درۆزنن و دڵیشیان چی تێدایە و مەبەستیشیان چی بووە؟ هەرگیز تۆش ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)لە مزگەوتی وادا رامەوەستەو نوێژ مەکە دڵنیابە ئەو مزگەوتەیە مزگەوتی (قباء) کە هەر یەکەم رۆژ لەسەر بناغەی تەقوا دامەزرا بە هەقترە تۆ نوێژی تیا بکەیت, هەتا مزگەوتی (ضیرار) لەم مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە لە پشتیوانان زۆر حەزیان لە هەموو چڵك و چەپەڵیەك و لە هەر تاوان و گوناهێك پاك ببنەوە دیارە خواش بۆخۆی پاکانی خۆش دەوێت هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزانە : پێش هاتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ مەدینە پیاوێك لە خەزرەج هەبوو ئەبو عامیری راهیبی پێی دەوترا لە سەردەمی نەفامیدا بوو بوە گاور پیاوێك بوو لە ناو عەشیرەتەکەی خۆی رێزیان لێدەگرت

بەڵام كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە مەدینەو مسوڵمانان لە دەوری كۆبونەوە ئەبوو عامر دەستی كردە دژایەتی ئاینی خواو هەڵهات بۆ مەككە جا لە رۆژی ئوحوددا ئەم بێباوەرە هەنێ چاڵی لە نێو ریزەكاندا هەڵكەندبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) كەوتە یەكێكیانەوەو ددانی پیرۆزی شكاو سەریشی بریندار بوو, لەسەرەتای جەنگەكەشەوە ئەبو عامر هات و بانگی ئەنصارەكانی كرد بۆ ئەوەی واز لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بهێنن, ئەوانیش ووتیان : خوا چاوی كەست پێ گەش نەكاتەوە ئەی ناپاكی دوژمنی خوا ئەویش ئەیووت : خزمەكانم پاش خۆم خراپیان بەسەر هاتووە , پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەپێش دا بانگی كرد بۆ ئیسلام و رازی نەبوو بۆیە دوعای لێكرد لە دوریدا بە دەربەدەری بمرێت , دوعاكەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ی لێگیرابوو. چونكە پاش جەنگی ئوحود رۆیشت بۆلای هیرقل بۆ هاندانی لەسەر جەنگی مسوڵمانان هەر لەوێ مایەوەو نامەی نوسی بۆ منافقەكانی مەدینەو داواشی لێكردبوون جێگایەك دروست بكەن وەكو مەڵبەندێك بێت ئەگەر گەرایەوە بۆ لایان ئەوانیش ئەو مزگەوتەیان دروست كردوو داوایان كرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی تێدا بكات, بەڵام پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوای خست تاوەكو گەرانەوەی لە تەبووك پێش گەرانەوەشی جبریل- سەلامی خوای لێبێت- ئاگاداری كردەوە لە مەبەستیان لە دروست كردنی مزگەوتەكە, بۆیە پێش گەیشتنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆ مەدینە فەرمانی كرد ئەم مزگەوتەیان روخاند.[٣٨٩]

---

[٣٨٩] (تفسير ابن كثير ٢/ ٣٨٨).

## ٤٠٠. ﴿بەسەرهاتی سێ هاوەڵ کەلە ئاسمانەوە خوا چاوپۆشی لێکردن﴾

بەسەرهاتی ئەم سێ کەسە لەسەر زاری کەعبی کوری مالیك –خوالێی رازیبێت- باس کراوە لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمودەوە تەفسیر بەچەند ریوایەتێك نزیکن لە یەکتریەوە , صحیحی بخاریش بەورترین شێوە باسی ئەم بەسەرهاتەی کردووە, کەعبی کوری مالیك –خوالێی رازیبێت-خۆی باسمان بۆ ئەکات و ئەڵێت : لە هیچ غەزایەك دوانەکەوتووم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ), لە تەبووك نەبێت , لە غەزای بەدریش دواکەوتبووم بەلأم کەس لەسەر دواکەوتنی بەدر لۆمەی نەکرا . لەشەوی حەقەبەش لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بووم , نەنانەت ئاواتم نەدەخواست لە جیاتی ئەوە ئامادەی بەدر بوومایە , ئەگەرچی بەدر زیاتر لەناو خەڵکی باس دەکرێت, من لەکاتی غەزای تەبووکدا لەهەموو کاتێکم بەتواناو خۆش گوزەرانتربووم, هەرگیز پێشتر دوو ولأخم پێکەوە نەبووە , پێش کاتی ئەو غەزایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هیچ غەزایەکدا راستەوخۆ باسی نەدەکرد بۆکوێ دەچێت, جگە لەم غەزایە کەلە گەرمایەکی سەختدا بوو , رێگەکەشی زۆر دور بوو بۆیە بە راشکاوە باسی ئاراستەی غەزاکەی کرد بۆ ئەوەی مسوڵمانان ئامادەی خۆیان وەرگرن, ژمارەی مسوڵمانانیش زۆر بوو لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) , بەلأم تۆمارگەیەك نەبوو کە ناوی هەموویانی تیادا کۆبکرێتەوە , بۆیە هەرکەسێك بیویستایە دوابکەوێت دەرنەدەکەوت ئەگەر وەحی ئاشکرای نەکردبایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو بۆ ئەم غەزایە, لەکاتێکدا بەروبووم و سێبەر خۆش بوو, ئەوان ئامادەبوون و منیش دەستم کردە خۆ ئامادەکردن , بەلأم دەگەرامەوەو هیچم دیارنەبوو, لەدڵی خۆمدا ئەم ووت من توانای دەرچوونم هەیە, کات تێپەردەبوو منیش هێشتا خۆم ئامادە نەکردبوو ووتم : لەپاش دەرچونیان بە رۆژێك دوورۆژێك فریایان دەکەوم, هەر بریارم دەداو جێبەجێم نەدەکرد تاوەکو تەواو دورکەوتنەوەم, خەریك بوو دەربچم و خۆزگە دەربچومایە , بەلأم قسمەتم نەبوو. کە دەردە چوم بۆ بازار جێگای داخ بوو ئەوانەی دەم بینین یان منافق بوون یان کابرایەکی لاواز بوو . کەخوا رێگەی داوە دواکەوێت ئینجا پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی منی نەکرد تاوەکو گەیشتە تەبووك

ڕۆژێكیان لەوێ فەرمووی: (كەعب چی كرد؟) پیاوێك لە بەنی سەلەمەوە ووتی : جلەكانی و لەخۆبای بوونی دوای خست موعازی كوری جەبەل ووتی: بەراستی قسەیەكی خراپت كردسوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) جگە لە چاكە هیچمان لێی نەبینیوە, بەلاّم پێغەمبەری خودا(ﷺ) بێدەنگ بوو لەوكاتە پیاوێكی پۆشاك سپی بینی تراویلكە دەیشاردەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: یاخوا ئەبو خە یثە مە بێت و ئەو بوو . هەرئەویش بوو كە كەمێك خورمای بۆ غەزاكە بەخشی و مونافیقەكان تانەیان لێدا كەعبی كوری مالیك دەڵێت : كاتێك زانیم سوپاكە بەرەو مەدینەدەگەڕێتەوە خەم و خەفەت دایگرتمەوە ئینجا دەمووت : سبەی چۆن لە تووڕەیی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربچم لەو بارەشەوە پەنام بردە بەر هەموو كەسێكی ژیر و هۆشمەند لە كەس وكارم كاتێك ووتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نزیك بوویەوە نیازی پوچەڵم لەسەر لاچوو دڵنیاش بووم كە بەهیچ شتێك ڕزگارم نابێت بۆیە بریارمدا قسەی راست بكەم كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەگەرایەوە مەدینە سەرەتا دووركات نوێژی دەكرد لە مزگەوتەكە ئینجا بۆ خەڵكی دا دەنیشت كاتێك ئەوەی كرد دواكەوتوەكان دەهاتن و پۆزشیان دەهێنایەوە سوێندیان دەخواردوو زیاتر لە هەشتا كەس دەبوون پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەكانی لێوەرگرتن و داوای لێخۆش بوونی بۆ كردن راستی ئەوانیشی حەواڵەی خوا كرد. منیش هاتم و سەلامم كرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەردەخەنەیەكی كردوو وەكو زەردەخەنەی تورەگراو فەرمووی: وەرە منیش ڕۆیشتم لەبەر دەستیدا دانیشتم فەرمووی: بۆ دواكەوتی؟ ئایا ولاّخت نەكریبوو؟ ووتم بەڵێ : سوێند بەخوا ئەگەر لەلای كەسێكی دونیا وویست دانیشتبام دەمتوانی لە تورەی دەربچم لە راستیدا توانای قسەكردنیشم هەیە, بەلاّم بەخوا ئەگەر ئەمرۆ درۆیەكت لەگەڵ بكەم و رازیت بكەم دورنیە خوای گەورە تۆ تورەبكات لێم ئەگەر قسەیەكی راستیش بكەم و دلگرانبیت لێم خوازیارم لە خوای گەورە سەرەنجامی باش بێت سوێند بەخوا هیچ پاساوێكم نەبوو سوێند بەخوا هەرگیز ئەوەندەی ئەوكاتە بەتواناو خۆش گوزەرانتر نەبووم كەدواكەوتم لەو غەزایە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ئەمە راستی كرد هەڵسە تاكو خوای گەورە حوكم دەكات لەم مەسەلەی تۆ پیاوانێك لەبەنی سەلەمە شوێنم كەوتن و پێیان ووتم: سوێند بەخوا پێشتر ئەمان بینیویت گوناهێكت كردبێت

ئایا نەتتوانی پۆزشێك بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)بهێنیتەوە, وەکو ئەوانی تر ئەوەندە بەس بوو. کە تەوبەت بکردایە و پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لێخۆش بوونی لەخوا بۆ بکردبای ,سوێند بەخوا ئەوەندە سەرزەنشتیان کردم تاوەکو خەریك بوو بگەڕێمەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ووتم:کەسی تر ئەم قسانەی منیان کردووە ؟ ووتیان: بەڵێ : دووکەسی ترئەوانیش ئەم قسانەی تۆیان کردووە هەمان وەلامی تۆش درانەوە ووتم: کێ بوو ؟ ووتیان: (مراره بن الربیع العمری)و(هلال بن امیة الواقفی) باسی دوپیاویان بۆ کردم ئامادەی بەدربونەوە پێشەنگێکی باشن کاتێك باسی ئەو دوو کەسەیان بۆ کردم رۆیشتم ئینجا پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەنێوان هەموو ئەوانەی دواکەوتن لە غەزا کە قەدەغەی کرد لە مسوڵمانان قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسەدا بکەن, ئیتر خەڵکی لێمان دورکەوتنەوە و هەموویان گۆران بەرامبەرمان, تەنانەت هەستم کرد زەویش بەرامبەرم گۆڕاوە, ئەو زەویە نیە کە دەمناسی پەنجا شەو بەوشێوەماینەوە دوو هاورێکەم لەماڵ دانیشتن و دەگریان بەلام من لەوان لاوترو بەهێزتربووم, دەردەچووم و دەچومە نوێژەکان و لەبازار دەگەرام, بەلام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم ئیجا دەهاتمە نوێژەکان سلاوم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکردو لەدڵی خۆمدا ئەمووت : ئایا لێوی جولاندەوە بۆ وەلامی سەلامەکەم؟ ئینجا لە نزیکی نوێژم دەکردو بەدزی سەیرم دەکرد ئەگەر برۆیشتام بۆ نوێژ تەماشای دەکردم ئەگەر تەماشام بکردبایا رووی لێوەردەگێرام . کاتێك ئەم حاڵە هەر بەردەوام بوو چومە سەر دیواری ماڵی ئەبو قەتادە کە ئامۆزام بوو زۆریش خۆشەویست بوو لەلام سلاوم لێکرد بەلام سلاوەکەی وەلام نەدامەوە ووتم :ئەی ئەبو قەتادە سوێندت دەدەم بەخوا ئایا تۆ نازانی من خواو پێغەمبەرم خۆش دەوێت؟ بێدەنگ بوو دووبارەم لێکردەوە هەر بێدەنگ بوو سێیەم جار سوێندم دا ووتی: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن فرمێسکی چاوم هاتە خوارێ و گەرامەوە و ئینجا بەناو بازاری مەدینەدا رێم دەکرد یەکێکم بینی لەو جوتیارانەی لەشامەوە دێن و خواردن دەهێنن بۆ مەدینە دەیفرۆشن ووتی : کێ کەعبی کوری مالیکم پێ نیشان دەدات, ئیتر خەڵکەکە ئاماژەیان بۆمن کرد , ئەویش هات و نوسراوێکی لە پاشادی غەسسانەوە دایە دەستم, تیایدا نوسرابوو پێمان گەیشتووە کە هاوەڵەکەت لالوت بوە لێت خوایش تۆی نەخستوەتە وولاتی شەرمەزاری و

لە ناوچوون بۆیە وەرە لامان دڵنەوایت بکەین کاتێك خوێندمەوە ووتم : ئەمەش بەڵایەکی تر نامەکەم بردوو خستمە نێو تەنورەکەوە, کاتێك دەرۆژی مابوو بۆ تەواو بوونی پەنجا رۆژەکە کەسێك لەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و فەرمانی پێکردم لە خێزانەکەم دوربکەومەوە , ووتم : لێی جیاببمەوە یان چیبکەم ؟ ووتی : نەخێر تەنها نزیك مەبەوە لێی هاورێکانیشم هەروایان پێوترا.

دەڵێت: بەخێزانەکەم ووت:برۆ لای کەس وکارت تاکو خوای گەورە لەم مەسەلەیە حوکم دەکات ئینجا خێزانی هیلالی کوری ئومەییە چوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ووتی: مێردەکەم پیاوێکی پیرەو کەس نیە بەخێویبکات ئایا پێت ناخۆش نییە خزمەتی بکەم؟ فەرمووی : نەخێر بەڵام لێت نزیك نەکەوێتەوە, ووتی : سوێند بەخوا خەریکی گریانە لەو رۆژەوە, منیش هەندێك پێیان ووتم : داوای مۆڵەت بکە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتم: وەڵامی چۆن دەبێت کەمن پیاوێکی گەنجم , دەڵێت : دەشەوی تر بەم شێوە مامەوە, بۆ پەنجا رۆژ لەو رۆژەوە قسەمان لەگەڵ نەدەکرا, نوێژی بەیانیم کرد لەسەربانی خانویەك بووم یادی خوام دەکردو زۆر نارەحەت بووم دنیام لێ تەنگ ببو, گوێم لە بانگ کەرێك بوو لەسەر کێوی سەڵعەوە هاواری دەکرد ئەی کەعبی کوری مالك مژدەت لێبێت, منیش یەکسەر سوژدەم برد بۆ خوا و زانیم شادیمان بۆ هات لەکاتی نوێژی بەیانیشدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکی ئاگادار کردەوە لە وەرگیرانی تەوبەکەمان, خەڵکی پیرۆزباییان لێدەکردین کەسێکیش بەسەر ئەسپێکەوە هاتە لام و کەسێکیتریش لە ئەسلەم بەپەلە هاتە لام دەنگی سەر کێوەکە پەلە تربوو لەسەر ئەسپەکە کاتێك مژدە دەرەکە هات بۆلام هەردوو پۆشاکەکەم داکەندو پێم بەخشی لەم رۆژەشدا هەر ئەوەم هەبوو دوو پۆشاکی ترم خواست و لەبەرم کرد رۆشتم بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) و خەڵکی دەستە دەستە دەهاتنە لام و پیرۆزبای تەوبەکەیان لێدەکردم. کەعب دەڵێت : چومە مزگەوتەکەو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دانیشتبوو خەڵکیش بەدەوریدابوون, تەڵحەی کوری عوبەیدوڵڵا بەراکردن هاتە لام و تەوقەی لەگەڵ کردم و پیرۆزبای لێکردم, سوێند بەخوا هیچ کام لە مجاهیدەکان هەڵنەسا جگە لەو هەرگیزیش ئەوەی ئەو لەبیر ناکەم.

کەعب دەڵێت : کاتێك سلاَوم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرویەکی گەشەوە پێی ووتم : مژدەت لێبێت بە چاکترین رۆژ تێپەربووە بەسەرتدا, لەو رۆژەوە لەدایك بویتە ووتم : ئایا لەتۆوەیە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) یان لە خواوەیە؟ فەرمووی : بەڵکو لەلای خواوەیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە دڵی خۆش دەبوو, ڕوومەتی وەك مانگ دەدرەوشایەوە ئینجا لەبەر دەستی دانیشتم و ووتم : ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەرچی ماڵم هەیە دەیکەمە خێر بۆ خواو پێغەمبەرەکەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەندێك ماڵت بابمێنێت چاکترە, ووتم : کەواتە : بەشەکەی خەیبەرم دەهێڵمەوە ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوای گەورە بەراستگۆی رزگاری کردم, بۆیە هەتا ماوم هیچ قسەیەك ناکەم ڕاستی نەبێت سوێند بەخوا کەس ناناسم لەرێگەی راستگۆییەوە ئەوەندەی من چاکەی دەستکەوتبێت, لەو رۆژەشەوە هەرگیز درۆیەکم نەکردووە,داواکارم خوای گەورەش بمانپارێزێت. لەوەندەی تەمەنم ماوە دەڵێت : ئینجا خوای گەورە ئایەتەکانی دابەزاند:

(((لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ {١١٧} وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ {١١٨} يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ {١١٩})) التوبه.

واتە:چون بۆ جیهاد فەرمان و کارێکی بڕاوەی خوایە بۆیە هەرجۆرە دواکەوتنێك بێت بێ بیانوی شەرعی وەرناگیرێت و ناپەسەندە و تۆڵەی هەیە و بۆیە خوا لەو کارەی پەیامبەریش خۆش بوو کەمۆڵەتی دەستەیەك لەدوو روەکانیدا کە : لەگەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبووك وەلە کۆچکەران و پشتیوانانیش کە هەندێکیان چوونە جیهاد و هەندێکیشیان خۆیان بە زەویدا نووساند خۆش بوو ئەوانەیان کەلەجەنگە سەختەکەی تەبووك دا دوای پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم)کەوتن و پەیرەویان لێکردوو چوونە تەبووك پاش ئەوە خەریك بوو هەندێکیان دڵیان لارێ بێت و نەچنە جیهادەکەوە,پاشان دووبارە خوا تەوبەکەی لێوەردەگرت, چونکە

بەراستی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە زۆریش لەگەڵیان بە میهرە خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کە خۆیان لە غەزاکە گرتە دواوە واتە : لە مەدینە مانەوەو نەچونە جەنگی تەبووك تا لە خەفەتدا وای لێهات ئەم زەویە فراوانەیان لا تەنگ بوو. لەخەم و خەفەتا لەگیانی خۆیان بێزار بوون چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیاری دابوو نابێ هیچ کەسێك تەنانەت سلاویشیان لێ بکات هەتا فەرمانی خوا دێت ئیتر زانیان کەهیچ پەنایەکیان نەماوە مەگەر هەر پەنا بەخوا بەرن لەپاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن بۆ ئەوەی تەوبە بکەن ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کردوو خوا بەخشینی بەڕاستی تەنها ئەو خوایە قەبولکاری تەوبە و لێبوردەیە زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەنافەرمانی خوا پارێز بکەن و هەمیشە لەگەڵ دەستەی ڕاستان بن گەرەترین نیعمەتی خوای گەورە لەسەرم پاش موسڵمانیەتی ڕاستگۆییم بوو لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ).[٣٩٠]

**وأخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين**

**وصلى الله على حبيبنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

---

[٣٩٠] البخاري كتاب المغازي رقم ٤٤١٨، صحيح السيرة النبوية ٦١٤.

# سەرچاوەکان

١. پوختەی تەفسیری قورئان : ئامادەکردنی مامۆستا موحەممەد ملا صالح .

٢. تەفسیری ئاسان : مامۆستا بورهان موحەممەد ئەمین .

٣. تەفسیری ڕامان لەمانا و مەبەستی قورئان : نوسینی ئەحمەد کاکە مەحموود .

٤. موفرەداتی ئاسان بۆ لێکدانەوەی ووشە و زاراوەکانی قورئان ئامادەکردنی ڕزگار کەریم و ناصح فەتاح .

٥. البداية والنهاية : الامام ابن كثير

٦ السيرة النبوية : لابن هشام

٧. سيرة الرسول جمع و ترتيب محمود المصري

٨. سير اعلام النبلاء : الامام الذهبي

٩ صحيح السيرة النبوية : ابراهيم العلي

١٠. نور اليقين في سيرة سيد المرسلين : تأليف الشيخ محمد الخضري

١١. الاساس في السنة وفهما السيرة النبوية: سعيد حوى

١٢. اصحاب الرسول جمع وترتيب محمود المصري

١٣. صيفة الصفوة : الامام ابن الجوزي

١٤. پوختەی صەحیحی بوخاری : وەرگێڕانی لیژنەیەك

١٥. پوختەی صەحیحی موسلیم داناني زكي الدين عبدالعظيم عبدالتوى المنذرى وەرگێڕانی لیژنەیەك .

١٦. التاج الجامع للأصول في احاديث الرسول (ﷺ) دانراوی مامۆستا شێخ مەنصور علی ناصف وەرگێڕانی نووری فارس حەمە خان .

١٧. ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) خستنە ڕووی ڕوداوەکان و شیکردنەوەی بەسەرهاتەکان : نوسینی : دکتۆر . علی محمد صلابی . وەرگێڕانی : ئیحسان برهان الدین .

١٨. ژیانی ئازیزمان (ﷺ) . : نوسینی : مامۆستا حەبیب محمد سعید .

١٩. حياة الصحابة كاندهلوى ته حقيقى فه رمووده كان شێخ موحەممەد ناصرالدين الالباني . وەرگێڕانی : نیهاد جەلال .

٢٠. سۆمای دیده : عادل شاسواری .

٢١. ژیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەقورئان و فەرموودەکاندا : نووسینی موحەممەد مەلا فائیق شارەزووری .

٢٢. رياض الصالحين : دانراوی ئیمامی نه وه وی وەرگێڕانی نوری فارس حەمه خان .

٢٣. ژوانگەی سەروەران : نووسینی مامۆستا موحەممەد سەنگاوی

٢٤. انيس المؤمنين دۆستی بڕواداران ئامادەکردنی صەفوك صەعدولا الوختار وەرگێڕانی عەبدولا حەسەن سەعید .

٢٥. استمتع بحياتك – چێژ له ژیانی خۆت وەرگره . نوسینی :دکتۆر موحەممەد عەریفی . وەرگێڕانی : ئەبوبەکر تۆفیق .

٢٦. پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێشەوایه : فاتح مەلا ڕەسوڵ شارەستێنی .

٢٧. دین و ژین لەژێر ڕۆشنایی راسپاردەکانی (رب العالمين) نووسینی : فاتح مەلا ڕەسوڵ شارەستێنی .

٢٨. نووری مینبەر : فاتح مەلا رەسوڵ شارەستێنی .

٢٩. ئاسوودەیی ئیسلام : فاتح مەلا ڕەسوڵ شارەستێنی .

٣٠. پیاوان و ئافرەتانی دەووری پێغەمبەر(ﷺ) نوسینی سعد يوسف ئەبو عزيز وەرگێڕانی : تارا حمه سعيد حمه کەریم .

٣١. نوسراوەکانی ئەندازیار عوسمان موحەممەد ڕەشید .

٣٢. چیرۆکی ئادابه ئیسلامیەکان : نوسین و وەرگێڕانی دەستەیەك له مامۆستایان .

٣٣. چیرۆکی ڕەوشته جوانەکان . : نوسین و وەرگێڕانی دەستەیەك له مامۆستایان .

٣٤. سونەنی ئەبو داود : نوسینی : ئەبو داود سلێمان بن الاشعث السجستانی : وەرگێڕانی : ناصح ابراهیم سازانی .

# ناوەڕۆك




**خوێنەری بەڕێز:**

ئەم کتێبەی بەردەستت پێکهاتووە لە (٤٠٠) چیرۆک و بەسەرهاتی ڕاستەقینە کە لەماوەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕوویانداوە تێکڕای ئەم چیرۆک و بەسەرهاتانەش ڕاستەقینەن لە فەرموودە صەحیحەکان و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانەوە وەرگیراون وە هەریەکێک لەمانە مایەی سەرنج و تێرامانە و سوود و پەندی تایبەتی لێوەردەگیرێت هیوادارم تۆی بەڕێزیش ئەم کتێبە بەچاوی دڵ بخوێنیتەوە و لە ئاکاری ڕۆژانەو شەوانەو ناختدا ڕەنگ بداتەوە





ژمارەی سپاردن (1499) ی ساڵی ٢٠١٤ ی دراوەتێ
نرخ (٧٠٠٠) دینار